# حەجاج کوڕی یوسفی سەقەفی

## پیاوە زۆردارەکەی بەنی ئومەییە

وەرگێڕانی م. هیلال کەرکوکی



خوێنەرانی خۆشەویست بۆ دەست کەوتی
کتێبەکان و سود بینینتان لە بابەتەکان جۆینی ئەم گروپە بکەن
ئەم گروپە تاکە ئامانج بۆ دامەزراندنی خزمەت کردنە
بە چینی خوێنەرو قوتابیان و نوسەرو وەرگێڕەکانمان








## کتێبخانەی ( PDF ) >

PUBLIC GROUP · 74K MEMBERS

# حەجاج

## کوڕی یوسفی سەقەفی

پیاوە زۆردارەکەی بەنی ئومەییە

وەرگێڕانی: م.هلال کەولۆسی

چاپی دووەم
٢٠١٨

له بڵاوکراوەکانی خانەی چاپ و پەخشی ڕێنما
زنجیرە(٥٤٩)



## ناسنامەی کتێب


- ناوی کتێب: حەجاج، کوڕی یوسفی سەقەفی
- ئامادەکردنی: دەستەیەک
- وەرگێڕانی: م، هیلال کەوڵۆسی
- دیزاین بەرگ و: فواد کەوڵۆسی
- شوێنی چاپ: چاپەمەنی گەنج
- ساڵی چاپ: ٢٠١٨
- نۆبەتی چاپ: چاپی دووەم
- تیراژ: ١٠٠٠ دانە

لەبەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارە سپاردن: (١٧٠٦)ی ساڵی ٢٠١٥ی پێدراوە


ناونیشان:

سلێمانی ـــ سابوونکەران، نێوان گەراجی عوسمانی تەمین و شوقەکانی تەکییە ڕووتە.

ژمارەی مۆبایل: (٠٧٧٠١٥٧٤٢٩٣)، (٠٧٥٠١١٩١٨٤٧)

# پێڕست

# وتەی وەرگێڕ

خوێنەری هێژا ئەم پەرتوکەی بەردەستت پەرتوکێکی مێژووییە، باسێکە لەو باسە گرنگانەی کە زۆر کەس تامەزرۆن لەبارەیەوە بزانن، باسی کەسایەتیەکی دیار و گرنگی ناو مێژوو، کە پانتاییەکی لە مێژووی سەردەمی خەلافەتی ئەمەویەکاندا داگیرکردووە، ئەویش حەجاج کوڕی یوسفە، ئەو پیاوەی زۆرکەس بوونە قوربانی دەستی و زۆری تریش قازانجیان کرد لەدەستی، قوربانیەکان نەیارەکانی دەوڵەتی ئەمەوی و سیستمی پاشایەتی بۆماوەیی بوون و قازانجکردوانیش فەرمانڕەواکانی ئەو دەوڵەتە بوون، حەجاج بڕندەترین شمشێری دەستی ئەمەویەکان بوو بەتایبەتی لەسەردەمی خەلیفە عەبدولمەلیک و وەلیدی کوڕیدا، بەجۆرێك سەری نەیارەکانی خەلیفەی دەپەڕاند و بەدیاری دەینارد بۆ خەلیفە، ئەم حەجاجە پەڵەیەکی ڕەشە بەمێژووی دەوڵەتی ئەمەویەوە، هەڵبەت دەوڵەتی ئەمەوی لەگەڵ ئەو پەڵە ڕەشەشدا پانتاییەکی بەرفراوانی لە سەروەری و خزمەتکردن بە ئیسلام و دەوڵەتی ئیسلام هەبووە و لەو سەردەمەدا چەندین کاری گەورە کراوە و ئیسلام بە زۆر شوێنی دورە دەستی ناوچەکانی جیهان گەیەنراوە لەسەردەستی هەندێك ڕۆڵە و سەرکردەی نەبەردی ئیسلام کە لەو چاخەی حەجاجدا ئەوانیش لە دەوڵەتی ئەمەویدا کاربەدەست بوون و کاریان بۆ هەمان ئەو خەلیفانە دەکرد کە حەجاج لە پێناویاندا سەری هەزارانی پەڕاند، ئێمە لەم پەرتوکەدا وەك وەرگێڕێك کەس بە باش و کەسیش بە خراپ نادەین لە قەڵەم و تەنها هەمان فکرە و

باس و خواسی عەرەبیمان وەرگێڕاوە بۆ زمانی کوردی تاکو خوێنەرانی کورد لە مێژوی ئەو پیاوە ئاگادارین .. جگە لەوە ئەم پەرتوکە لە میانەی باسکردنی حەجاجەوە باسێکی پوخت و جوان و وردی دەوڵەتی ئەمەویش دەخاتە ڕوو کە چۆن دروست بووە و خەلیفەکانی بە زنجیرە و پشتاو پشت کێ بوون.. هیوادارم توانیبێتم لەئاستی ئەو کارەدا بوبم کە پێی هەستاوم و هیچ کارێکیش بێ کەموکوڕی نیە.. سوپاس بۆ ئەو کەسەی هەڵەیەکم بۆ ڕاست دەکاتەوە پێشنیارێکم بۆ دەکات بۆ ئەوەی کارەکانی دواترمی پێ جوانتر و باشتر بکەم... یەزدانی مەزن پشتیوانی هەموان بێت.....

م.هلال کەوڵۆسی

# پێشەکی

پاش سوپاس و ستایش و داوای پارمەتی و لیّ خۆشبوون لەخودای پەروەردگار و درود ناردن بۆ گیانی پاکی پێغەمبەری سەرداری مرۆڤایەتی (درودی خوای لیّ بێت) و یار و یاوەران و شوێنکەوتوانی.... ئێمە لەم پەرتوکەدا کەسایەتیەکی گرنگ دەناسین کە لە گرنگترین ماوەکانی فەرمانڕەوایەتیەکەیدا کاریگەریی لە مێژوی ئیسلام کرد و یەکێك بووە لە فەرمانڕەواکانی دەوڵەتی ئەمەوی (بەنی ئومەییە)، ئەویش حەجاجی کوڕی یوسفی سەقەفیە[1].

کەسێتیەکی سەیر و سەرسامکەربوو، زۆر تایبەتمەندی دژیەکی هەبوو، وای دەکرد کە شیکارانی بواری تایبەتمەندیە کەسیەکان و لێکۆڵەرانی ئەو ماوەیەی مێژوی ئیسلام دووپاتی بکەنەوە کە ئەو حەجاجە ( لە تێڕوانینی ئەو خەلیفەیەی کردیە بەرپرس) پیاوی گونجاو بووبێت بۆ شوێن و کاتی گونجاو.

ئەو کتێبانەش زۆرن کە لەبارەی مێژوی ئەم پیاوەوە دەنگیان داوەتەوە و دەرچوون، زۆرترین ئەو کتێبانەش باس لەوە دەکەن کە ئەم پیاوە زۆردار بووە و یەکێك بووە لە فەرمان بەدەستە توندوتیژ و بێ بەزەییەکان، بەهۆی ئەو کوشتارە زۆرەی کە دەیکرد بەرامبەر بەرهەڵستکارانی دەوڵەتی ئەمەوی و ئەم یەکێك بوو لە سەرکردە سیاسی و سوپاسالارەکانی ئەو دەوڵەتە لە شەوەزەنگترین ماوەکانی دەوڵەتەکەدا، لەپاش موعاویەی کوڕی ئەبو سوفیان دامەزرێنەری دەوڵەتی ئەمەوی وپاش شۆڕشەکەی

---

[1] لەبەر ئەوەی پیتی (ث) لە کوردیدا نیە بۆیە لەجیاتی (ثقفي) دەنوسین (سەقەفی).

عەبدولای کوڕی زوبێری کوڕی عەوام – ڕەزای خوای لێبێت – حەجاج لەو دەوڵەتەدا بەدەرکەوت.

دەرکەوتنی حەجاجی سەقەفی بۆ ئەوەبوو تەرازوی هێزی سیاسی و سەربازی بگێڕێتەوە بۆ دەوڵەتی ئەمەوی، پاش ئەوەی عەبدولمەلیکی کوڕی مەروان رای سپارد بۆ ئەو کارە قورسە کە ئەویش گێڕانەوەی بەرقەراری و جێگیربوونی ئاسایش و هێز و دەسەڵات بوو بۆ ئەمەویەکان لە وڵاتانی ئیسلامیدا، وەك ناوچەی عێراق و وڵاتی فارس و حیجاز کە کەوتبونە ژێر دەستی ئیبن زوبێرەوە، ئەو جەنگانەی کە حەجاج درێژەی پێدا و هەروەها گەمارۆدانی مەککە و سەرکەوتنی بەسەر ئیبن زوبێردا و پاشانیش پتەوکردنی دەسەڵاتی خەلیفە عەبدولمەلیکی کوڕی مەروان وای کرد وەك چۆن باسمان کرد بە کەسێکی گونجاو بۆ شوێنی گونجاو دابنرێت لە تێڕوانینی خەلیفەی ئەمەویەکاندا.

حەجاج فەڵەمڕەویی مەترسیدارترین وڵاتی لە هەڵگیرسانی شەڕو شۆڕ و یاخی بووندا گرتە دەست، ئەویش خاکی عێراق بوو، حەجاج بە توندوتیژیەکی زۆرەوە فەرمانڕەوایەتی عێراقی کرد و لە ساڵانی دەسەڵاتیدا ملی سەدان لە خەواریج (هەڵگەڕاوەکان) و بەرهەڵستکارانی فەرمانڕەوایی ئەمەویەکانی پەڕاند، هەربۆیە حەسەنی بەصری – رەحمەتی خوای لی بێت– لەبارەیەوە دەیفەرموو : ( حەجاج سزای خوایە، بەدەستی خۆتان خۆتان مەگلێنن بە سزای خواییەوە، بەڵام پێویستە ملکەچ و گوێڕایەڵ بن بۆ خوا و بپاڕێنەوە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلَقَدْ أَخَذْنَاهُمْ بِالْعَذَابِ فَمَا اسْتَكَانُوا لِرَبِّهِمْ وَمَا يَتَضَرَّعُونَ﴾[١].

حەجاج سەرەتا ناوی (كُليب) بوو دواتر ئەم نازناوی (حجاج)ەی هەڵگرت، لەبەر زۆری ئەو ئێسك و پروسکانەی کە بەزۆر و ستەم و شەڕەکانی دەیشکاند، ئەو کەسانەی لەسەردەمی ئەودا ژیاون و لەدوای ئەوەوە هاتوون ڕاجیابوون لەبارەی کەسێتی

---

[١] . المؤمنون: ٧٦.

حەجاجەوە، تەنانەت هەندێك کەس بە بێ باوەڕیان زانیوە، بە دوژمنی موسوڵمانان و ئاینی خوایان ناوبردووە.

لەبارەیەوە وتویانە: زۆردار و ستەمکار و توندوتیژ و پیس و خوێنڕێژ بووە، هی تریش وتویانە: زیرەك و زمان پاراو و ڕەوان بێژ و ڕوبێژ و کارامە و ڕێزگربووە لەقورئان، یەکەم کەس بووە کە پاش هاوەڵان شارێکی ئیسلامیی دامەزراندووە، ئەویش شاری (واسط)ی عێراقیە.

پێشەوا زەهەبی – بەڕەحمەت بێت – لەبارەیەوە دەفەرموێت: حەجاج زۆردارێکی ... ستەمکاری ... بەدکرداری .. خوێن ڕێژبوو... هەروەها ئازا و بوێر و فێڵباز و زمان پاراو و ڕەوانبێژ و ڕێزگر بوو لە قورئان.

پاشان دەفەرموێت: ئێمە سەرزەنشتی دەکەین و خۆشمان ناوێت، بەڵکو ڕقمان لێیەتی لەبەر خودا، کە بەڕاستی بێ بەش بوو لە باوەڕ، کردەوە گەلێکی باشی هەیە کە لەناو دەریای تاوانەکانیدا نقوم بوون، خودا خۆی ئەو کارانەی لەگەڵ یەکلایی دەکاتەوە.

بەڵێ بەڕاستی کار و لێپرسینەوەی حەجاج و والی و فەرمانڕەواکان و مرۆڤەکان لای خوای دروستکەرە، لەبەر ئەمە ئێمە کاتێك سەرگوزەشتەی ژیانی دەخەینە ڕوو دادگایی کردەوەکانی دەدەینە دەستی خودا و دەیسپێرین بەئەو یەزدانە.

داوا لەخودا دەکەین سەرکەوتوومان بکات بۆ دەرکردنی ئەم کارە بەو جۆرەی کەخۆی پێی ڕازیە و لێی ڕازیە و لێمان وەردەگرێت، ئەم کارە و ئەوانی تریش بکاتە کردەوەی چاك بۆمان و لە تەرازوی چاکەکانماندا بۆمان هەڵبگرێت تاکو ڕۆژی دوایی.. کە هەر خۆی بەتوانایە بۆ ئەو کارە... درودو سلاویش لە سەروەرمان محمد و یار و یاوەر و شوێنکەوتوانی...............

نوسەر

١

# خێڵی (ثقیف) لەنێوان درۆزن و خوێنڕێژەکەدا

- خێڵی (سەقیف) و خێڵی (هوازن) و ڕەچەڵەکی دێرینیان و لقی نوێیان.
- خێڵی (سەقیف) و هاوپەیمانێتی لەگەڵ (هەوازن) لە پەلاماردانی موسوڵمانان دا پاش ئازادکردنی مەککە.
- موسوڵمان بوونی خێڵی (هەوازن) و (سەقیف)

# خێڵی (سەقیف) و (هەوازن) خەڵکی شاری (طائف)ن

حەجاجی کوڕی یوسف لە خێڵی (سەقیف)ەو هەر بەناوی ئەو خێڵەشەوە ناسراوە، ئەم هۆزە لە (تائیف[1]) کە شارێکی حیجازیە و خاوەن پێگەیەکی ستراتیژیە نیشتەجێن، دژایەتی ئیسلام و پێغەمبەری ئیسلامیان کردووە – درودی خوای لێبێت – تاکو دوای ئازادکردنی مەککە.

زۆرینەی دانیشتوانی شاری (تائیف) لە هۆزی (هەوازن) و (سەقیف)ن، کە دوو هۆزن لە گەورەترین هۆز و خێڵەکانی عەرەب، لە نیوە دورگەی عەرەبی، هەروەها دێرینترین و ڕەسەنترینیان، هاتنە ناوەوەشیان بۆ ناو ئیسلام کاریگەریی و شوێنەواری گەورەی هەبوو لە بڵاوکردنەوەی ئیسلام و فراوانکردنی جێ پێی دا.

(هەوازن) خێڵێکی ناسراو و ناودارن و دەگەڕێنەوە بۆ لقێکی سەرەکی لە عەرەب، ئەویش (هەوازنی کوڕی مەنصوری کوڕی عەکرەمەی کوڕی خەصفەی کوڕی قیس عیلان)ە، بەهەموو تێگەیشتنێك لە عەرەبە عەدنانیەکانن، مێژوو و شەڕەکانیان ناوی دەرکردووە لە پەرتوکە مێژووییەکانی پێش ئیسلام و دوای ئیسلامیشدا، خزمەتەکانیشیان دیارە و لەژمارە نایەت لە سەرخستنی ئیسلام و خەڵکەکەیدا.

---

[1] . طائف: بەلام لەبەر ئەوەی پیتی (ط) لە زمانی کوردیدا نیە گەر بمانەوێت وشەکە لەنوسیندا بکوردێنین ئەوا دەیکەینە (تائیف).

ئەمڕۆکە بە چڕوپڕی بەناو جیهانی عەرەبیدا بڵاوبوونەتەوە، یەکێك لە گەورەترینی ئەو خێڵ و تیرانەش کە لەم هۆزە بوونەتەوە ( عتیبە)ی بەناوبانگە، بوونێکی لاوازیان هەیە لە (فەڵەستین)دا.

بەڵام هۆزی (سەقیف) یەکێکە لە گەورەترین و ڕەسەنترین خێڵی ناو نیوە دوورگەی عەرەبی، ئەم هۆزە ڕۆڵێکی کاریگەر و کارا و بەرچاوی هەبووە لە پێش ئیسلام و دوای ئیسلام دا، ئەم هۆزە ڕیشەکەی دەگەڕێتەوە بۆ باوکە گەورەیان (قسی) کە (ثقیف)ی کوڕی (منبة) ی کوڕی (بکر) کوڕی (هوازن) کوڕی (منصور) کوڕی (عکرمة) کوڕی (خصفة) کوڕی (قیس عیلان) کوڕی (مضر) کوڕی (نزار) کوڕی (معد) کوڕی (عدنان)ە.

(سەقیف) یەکێکە لەو هۆزانەی کە زۆر درەنگ چونە ناو ئیسلام، یەکێك لەو هاوەڵانەی پێغەمبەر کە سەر بەم خێڵە بوو، هاوەڵی بەرز و بەڕێز (موغەیرەی کوڕی شەعبەی سەقەفی) بوو، هەریەك لە (سەقیف) و (قورەیش) بەشداربوون لە بەرەنگاربوونەوە و ڕووبەڕووبوونەوەی ئەو کەس و هۆزانەی کە لە ئیسلام هەڵدەگەڕانەوە پاش کۆچی دوایی پێغەمبەر – درودی خوای لێبێت – ، وەك چۆن ڕۆڵێکی گەورە و کاریگەری هەبوو لە بەهێزکردن و پتەوکردنی پایەکانی خەلافەتی ئەمەوی دا، بە نەوەکانی و لە دەستپێکیشیاندا (حەجاجی کوڕی یوسفی سەقەفی) و (محمدی کوڕی قاسمی سەقەفی) و هەتا ئێستاش زۆربەی تاکەکانی ئەم هۆزە لەشاری (تائیف) لە شانشینی عەرەبی سعودی بڵاوبوونەتەوە[١].

هۆزەکانی (هەوازن) سێ بەرەباب کۆیان دەکاتەوە، کە هەموویان دەگەڕێنەوە بۆ (بکر کوڕی هوازن) ئەوانیش:

١– بەنو سەعد کوڕی بکر.

٢–بەنو معاویە کوڕی بکر.

---

[١]. (حافظ ابن عبدالبر) لە پەرتوکی (الإنباه علی قبائل الرواة) دا باسی کردووە کە ڕەچەڵەکی (ثقیف) دەگەڕێتەوە بۆ (قیس عیلان) بەڵام (ابن أثیر) باسی ڕەچەڵەکەکەی کردووە کە دەگەڕێتەوە بۆ (قسی کوڕی منبه کوڕی بکر کوڕی هوازن... هتد) لە پەرتوکی (الکامل في التأریخ)دا.

٣-بەنو (منبه) کوڕی بکر.

(عەبدولمەلیکی کوڕی مەڕوان) پرسیاری لە حەجاجی کوڕی یوسف کرد لەبارەی ڕەچەڵەکی (سەقیف)ەوە کە ئایا ئەوان لە (أیاد)ن ؟! حەجاج وەڵامی دایەوە: پەنا بەخوا ئەی ئەمیری بڕواداران، ئێمە لە (قیس)ین، ڕیشەمان دیار و نەگۆڕە، پەلوپۆشمان درێژ و زۆرە، هۆزەکەشمان ئەوە دەزانێت و هۆنیارەکەشمان دەبێژێت:

وإنّا معشر من جذم قيس فنسبتهم و نسبتنا ســـواء

همو آباؤنا وبنوا علينــا كما بنيت على الأرض السماء

واتە: ئێمە گرۆیەکین لە بنەچەی قەیس ڕیشەی ئێمە و ڕیشەی ئەوان هاوتایە

ئەوان باوباپیری ئێمەن و ئێمەیان بونیات نا وەك چۆن لەسەر زەوی ئاسمان بونیات نرایە.

هەندێك لە (ڕەچەڵەك ناسانان) پێیان وایە کە (سەقیف) لە (إیاد)ە.

پەرتوکەکانی ژیننامە و مێژوو دەگێڕنەوە کە خێڵی خەسعەم (خثعم) گردبورنەوە و یەکیان گرت لە (یەمەن) – واتە باشوری تائیف – و لە تائیف ڕووبەڕوی (سەقیف) بوونەوە، ئینجا (غیلان کوڕی سەلەمە)یان لە (سەقیف) بۆ دەرنەپەڕێ و شەڕێکی توند دەکات لەگەڵیان و تێکیان دەشکێنێت، کوشتارێکی زۆریان لێدەکات، هەر لەڕۆژگاری ئەواندا ڕۆژی (وج) بەرپا دەبێت لەنێوان (سەقیف) و (خالد بن هوذة)دا ، شەڕێکە بەناوی (وج)، (وج)یش دۆڵ و شیوێکە لە تائیف، لەوێشەوە (بەنو عامر بن ربیع) لەناو خۆیان و هاوپەیمانەکانیشیاندا کۆبوونەوە ، پاشان بە شەو ڕۆیشتن بەرەو (سەقیف) لە تائیف، (بەنی نصر بن معاویه) هاوپەیمانی سەقیف بوون، کاتێك بەنو سەقیف گەیشتنە ڕێڕەوی بەنو عامر، (بەنی نصر) هاتن بە فریایانەوە، ئینجا سەقیف دەردەپەڕێت بۆ بەنو عامر، ئەو ڕۆژگارە (غیلان بن سلمه) سەرۆکی سەقیف دەبێت، ڕووبەڕویان دەبێتەوە و شەڕێکی

قورسیان لەگەڵ دەکات، ئینجا بەنو عامر و ئەوانەشی لەگەڵی بوون تێك دەشكێن، کوژراوی زۆریش لەو شەڕەدا لە بەنو عامر بوو.

یەکێکی تر لە ڕۆژەکانیان لە ژیاننامەی پێغەمبەردا ئەوەیە، پاش فەتحی مەککە پێغەمبەر – درودی خوای لێ بێت – ساڵی ٨ك، ساڵی (فتح) لە مەککە نیشتەجێ بوو، نیو مانگ زیاتر نەبوو تاکو (هوازن) و (سەقیف) هاتن و لە (حنین) بارگەیان خست، ئەمڕۆ ئەو شوێنە پێی دەڵێن (الشرائع)، دەیانویست شەڕ دژی پێغەمبەر بکەن، ئافرەت و ماڵ و منداڵیان لەگەڵ خۆیان هێنابوو، (مالیکی کوڕی عەوفی نەصری) سەرۆکایەتی هەموویانی دەکرد، کاتێك پێغەمبەر – درودی خوای لێبێت – بەمەی زانی بەخۆی و ئەو سوپایەوە کە فەتحی مەککەی پێ کرد بۆیان دەرپەڕی و ئەوەش کە پاش ئازادکردنی مەککە موسوڵمان بووبوون کۆی کردنەوە، ڕۆی هەتا چووە شیوی (حنین)، هەر کە دوژمنان چاویان پێیان کەوت دەست بەجێ نەوەستان و لە هەموو لایەکەوە بەر تیریان دان ، ئەوەبوو هەر لەسەرەتاوە موسوڵمانەکان تێك شکان، پێغەمبەر بە ژمارەیەکی کەمەوە لە سەربازە ئازا و نەبەردەکانی موسوڵمانان خۆی ڕاگرت و نەبزوا لەجێی خۆی، دەیفەرموو: من پێغەمبەرم و درۆی تیا نیە، من کوڕی عەبدولموتەلیبم.

پاشان چواردەوری سەقیف و هەوازنیان گرت و تێکیان شکاندن، سوپای ئیسلام ڕاویان نان بەرەو (أوطاس) وە غەنیمە و دەستکەوتێکی باشیان بەدەستهێنا و پێغەمبەر درودی خوای لێبێت دابەشی کرد بەسەریاندا، بەتایبەت بۆ ئەو کەسانەی کە ڕۆژی ئازادکردنی مەککە موسوڵمان بووبوون.

پاشان پێغەمبەر خۆی ئامادەکرد بۆ هێرشکردنە سەر تائیف، هات بۆ تائیف و لە ڕۆژهەڵاتەوە گەمارۆی دا، دواتر وازی هێنا و ئەوێی جێ هێشت. پێیان وت: بپاڕێرەوە بۆ سەقیف.

ئەویش فەرمووی: خودایە هیدایەتی سەقیف بدە و ڕێنوێنیان بکە بۆ ناو ئیسلام.

ئەوەبوو لە ساڵی ٩ی کۆچی دا پاش گەڕانەوەی پێغەمبەر لەجەنگی تەبوك، سەقیف هاتن بۆ مەدینە پەیمانیان دا و موسوڵمان بوون، داوایان لە پێغەمبەر کرد کە بتەکانیان

نەشکێنێت بەدەستی خۆیان نەبێت، ئەویش ڕازی بوو، لەگەڵیان (ئەبو سوفیانی کوڕی حەرب) و (مغیرە کوڕی شعبە)ی نارد بۆ شکاندنی (لات)[١] و پارچەپارچەیان کرد، دوای ئەوە ئیتر هیچ ئاسەوارێکی نەما و کەس شوێنە کۆنەکەشی نەدەزانی مەگەر ئەو کەسە تایبەتانەی کە مێژووزان بوون، بەم جۆرە خوای گەورە بت پەرستیی بۆ گۆڕیتەوە بە دینی ئیسلام و یەکتاپەرستی.

(سەقیف) ساڵی ٨٢ک لەگەڵ حەجاجی کوڕی یوسف بەرەنگاری (عبدالرحمن بن محمد بن الأشعث) بوونەوە و تێکیان شکاند، پاش ئەوە سەقیف چوونە نێو پشو و ئارامیەوە لە کەشوهەوای سەرسوڕهێنی تائیف دا، ئەگەرچی یەکێك نەبوون لە هۆزە هێرشبەرەکان، بەڵام هۆزەکانی تر لە هێرشەکانیان دەترسان، کۆتا هەواڵیشیان ئەوەبوو کە بەشدار بوون لە سوپاکەی (عبداللەی کوڕی حسین) لە پەلاماردانی تورکەکاندا، لەمیانەی شۆڕشی گەورەی عەرەبییەوە، لەپاڵ گەورەکاندا دژی هێزەکانی (خالد بن لؤي) وەستایەوە کاتێك پەلاماری تائیفی دا لە ساڵی ١٣٤٣ك دا.

لە بنەتیرەی سەقیفی کۆندا ئەمانە هەبوون: بەنو جەهم بن سەقیف، بەنو عەوف بن سەقیف.ناسرابوون بە (أحلاف)، لەوانیش (بەنو مالیك) کەوتبوویەوە، شەڕێکی خوێناویش ڕوویدا لەنێوان (بەنو مالیك) و (أحلاف) دا لە (نخب) و کوشتارێکی زۆری تیا بوو، ئیدی هەموو بەنو مالیك یان بەشی هەرەزۆری دورکەوتنەوە و کۆچیان کرد.

ئەمڕۆکە سەقیف دابەش دەبێت بەسەر حەوت (بنەتیرە)دا، ئەوانیش بریتین لە: (طویرق) و (النمور) و (عوف) و (بەنی سالم) و (بەنی سفیان) و (الحمدة) و (ثمالة).

سەقیفی (ترعة): بەشێکی گەورەن لە خێڵی سەقیف، لە باشوری تائیف نیشتەجێن، لەنێوان نەوەکانی بەنی سەعد و بەنی مالك دا، سەقیفی (ترعە) دابەش دەبێت بۆ:

١- بەنو جاهل: الحمدة، آل مسعود، القثاورة، المفدة.

---

[١] - یەکێك بوو لەو بتانەی عەرەبە نەفامەکان لەپێش هاتنی ئیسلام دەیانپەرست.

٢-الندبة: ئال یەعلی و ئال محمد، لە ئال یەعلی: (ئەلمەدائن و مویل و وەقها) هەن، لە ئال محمدیش (الدارین) یان (أهل الدارین) هەن.

٣-بەنو یوسف: المجاورة، العسلة، البقمة، کە پێیان دەوترێت: الفرعین.

سەقیف دانیشتوی تائیف و دەوروبەرن، ئێستا چەند خێڵێکن بە دابەشبوونەکانیشیانەوە دەیانخەینە ڕوو:

یەکەم: (الحمدة) کە پێیان دەوترێت (الحمیدی)، زۆربەیان لە گوندی (الملیسا )ن لە دۆڵی (القیم) باکوری تائیف، هەندێکیشیان لە (المثناه) نیشتەجێن و ئەم تیرانەیانە لێ بۆتەوە:

١- الزربات: لەوانیش: ئال صالح و ئال مسفر و ئال سەعد و ئال ئەحمەد و ئال محمدعلی و ئال دەخیلەلا.

٢-العرافیة: لەوانیش: الزراریق، ئال عید، ئال زائر.

٣-الزوامرة: لەوانیش: ئال عبدالسلام و ئال محمد.

٤- القواسم.

٥- العقلان.

٦-الجرشان.

٧-المطالقة.

٨-ذو هندی.

٩- ئال سەمیح.

دووەم: بەنو سوفیان (سوفیانی)، زۆربەیان لە ناوچەی باشوری ڕۆژئاوای تائیف نیشتەجێن، کە ناسراوە بە ناوچەی (الشفا) و بەناوبانگترین ئەو دۆڵانەشی لێی نیشتەجێن: شیوی (وادی الفرع)ە.

بەنو سوفیان ئەمڕۆکە دابەش دەبن بۆ:

١- ئال شەریف: کە دابەش دەبن بۆ:

أ - ئال ساعد: لەوانیش: ئال مەنصور، ئال عوبەید، ئەلواعیدە، ئال حسن، ئال حرجل.

ب - ئال حجة: لەوانیش: ئال عیسا، ئال منیف، ئال ئەبولدەم، الخُمس، البهادله.

٢- بەنو عومەر: دابەش دەبن بۆ:

أ- الخضرة.

ب- ئال تەمیم.

ج- العسران.

٣- ئال عایشە.

سێ یەم: (طویرق) ناسراو بە (طویریقي)، لە ناوچەی باکوری ڕۆژئاوای تائیف نیشتەجێن، خەلکی گوندەکانن، ناوی گوندەکانیشیان: مملکة، محشکة، المبیرز، ..هتد، دەبن بە دوو بەشەوە:

١- طویرق الخضر، لەوانیش:

أ- الزحاریة.

ب- الفصل.

ج - الخصافین.

د - السواوید.

هـ- الهنادیة.

ح - الدهامین.

٢- طویرق البدو: لەوانیش:

أ- الروسان.

ب- العبدە.

ج - الکلبة.

د – الظفارین.

هـ – الحُمران.

ح – الجعیدات.

خ – الزمتە.

ز – السفاریة.

چوارەم: (النمور) پێیان دەڵێن (نەمریەکان – النمری) لەناوچەی (الهدی) لە (وادی محرد) نیشتەجێن. دەبن بە چوار بەشەوە:

١– الغریة.

٢– الخولة.

٣– الخضرة.

٤– أهل الدار البیضاء.

پێنجەم: بەنی سالم (سالمی)، لە باشوری (وادی لیە) نیشتەجێن و شارەکەشیان ناسراوە بە شاری (بەنی سالم)، لە دیارترین گوندەکانیشیان: النصیة، أبو غیل، کە ئەمانیش دابەش دەبن بەسەر چەند لقێکدا.

شەشەم: عەوف، پێیان دەڵێن (عەوفی)، لە (وادی لیە) نیشتەجێن و دەبن بەچەند لقێکەوە.

حەوتەم: ثمالة، پێیان دەڵێن (ثمالي) لە (وادی جفن) نیشتەجێن و پێشی دەوترێت (وادی ثمالة).ئەمانیش دەبن بەچەند لقێکەوە.

هەشتەم: (الصخیرة) پێیان دەوترێت (صوخەیری) و لە (وادی الصخیرة) نیشتەجێن، کە ڕۆژهەلاتی (وادی لیە) و دەبن بە چەند لقێکەوە.

**دوویەم:** سەقیفی ترعة: پێیان دەڵێن سەقەفی، ئەوان لە بنەڕەتدا لە تائیفن، بەڵام کاتێك شەڕ ڕوویدا لەنێو سەقیف خۆیدا، لەنێوان (عەوفی ئەحلاف) و نێوان (بەنی مالك) دا و بەنو عەوف تیایدا سەرکەوتن و بەنو مالیك لە سەقیف دورکەوتنەوە وکۆچیان کرد بۆ ناوچەی (المسماه) ئێستا ناسراون بە سەقیفی (ترعه)، سەقیفی ترعه دەکرێت بەم لقانەوە:

١- بەنو جاهل: ئەوانیش: ئال مسعود، المغدة، الحمدة، الغشاورة، الأحلاف....هتد ن.

٢- الندبة: ئەوانیش: (ئال محمد، ئال یەعلی، الدارین)ن.

٣- بەنی یوسف: ئەوانیش (المجاردة ، العسلة)ن.

ئەمە هۆز و تیرە ناسراوەکانی ئێستای سەقیف بوون، هەیە هەر لەکۆنەوە سەقەفیە و لە تائیف کۆچی کردووە ، یان لە فتوحاتە ئیسلامیەکاندا چوونەتەدەر، بۆ نمونە هەیانە لە مەغریبی عەرەبیە، یان لە شام و یەمەن و کەنداوە... یان لە ولآتانی تری عەرەبیە.

***

## خێڵی (سەقیف) و هاوپەیمانیتی لەگەڵ (هەوازن) دا بۆ شەڕی دژی موسوڵمانان پاش فەتحی مەککە (غەزای حونەین)

خێڵی (سەقیف) یەکێك بوو لە سەرسەخترین خێڵەکان کە دوژمنایەتی پێغەمبەری خودا و موسوڵمانانیان دەکرد، هەروەها یەکێك بوو لەو خێڵانەی کە دوای هەموو خێڵەکان هاتنە ناو ئیسلامەوە.

ئازادکردنی مەککە لە ڕەمەزانی ساڵی ٨ك دا کاریگەرییەکی زۆری هەبووە لە جوڵاندنی ڕق و کینەی هۆزە عەرەبەکانی ڕکابەری (مضر) بەگشتی و (قورەیش) بەتایبەتی، خێڵ و بنەتیرەکانی (قیس عیلان) دوژمنداری دێرینیان هەبووە لەگەڵ خێڵ و بنەتیرەکانی (مضر) دا، هەربۆیە کاتێك موسوڵمانان فەتحی مەککەیان کرد، تیرەکانی (هەوازن) و (سەقیف) و (بەنی هلال) کۆبوونەوە و بڕیاریاندا دژی موسوڵمانان بجەنگن ، بەهاندەری دژایەتی ئیسلام و دوژمنایەتی تیرەیی و نەژادییەوە.

هەربۆیە سەرکردەی گشتی هاوپەیمانانی بێ باوەڕانی (هەوازن و سەقیف) (مالیکی کوڕی عەوفی نەصری) بڕیاریدا کە لەگەڵ سوپاکەیدا ماڵ و منداڵ و ئافرەتانیش بداتە بەر تاکو گوڕ و تین و حەماسی بێ باوەڕان زیاتر بکات بۆ شەڕ و وایان لێ بکات تا مردن شەڕ بکەن، گەر بۆ سەرکەوتنیش نەبێت ئەوا بۆ پارێزگاری لە ماڵ و منداڵیان، سوپای هاوپەیمانان ڕۆیشتن تا گەیشتنە دۆڵی (أوطاس)، کە نزیکەی ڕۆژە ڕێیەك لە مەککەوە دورە، ئەم بۆچونە بەلای یەکێك لەسەرکردەکانی سوپای (مخضرمین)ەوە کەخاوەنی ئەزمون و شارەزایی بوو باش نەبوو؛ ئەو سەرکردەیەش (دُرَید بن الصمة)بوو، بەڵام

(مالیکی کوڕی عەوف) سووربوو لەسەر بڕیارەکەی، ئیدی سوپاکەی بەگوێیان کرد ئەگەرچی بۆچوونەکەشی بێ ئەرزش بوو، دوای ئەوە ئیتر نازناوی (گەمژەی بەگوێ کراو – الأحمق المطاع) ی وەرگرت.

ئینجا پێغەمبەر – دروودی خوای لێبێت – و ئەو موسوڵمانانەشی لەگەڵیدا بوون بۆی دەرپەڕین، سوپاکەی پێغەمبەر زۆرێك لەو کەسانەی لەخۆ گرتبوو کە تازە هاتبوونە ناو ئیسلام و هێشتا ئیسلام لەدڵیان جێگیر نەبووبوو، سوپاکە گەورە بوو بەشێوەیەك موسوڵمانانی سەرسام کرد، متمانەی تەواوی خستە دڵیانەوە تارادەی لەخۆباییبوون و متمانەیان بە بردنەوە و سەرکەوتن، هەندێکیان دەیانگوت: ئیتر ئەمڕۆ لەبەر کەمی نابەزین.

مالیکی کوڕی عەوف هەستا بەدانانی سوپاکەی لەسەر شێوەی بۆسە و کەمین لە دەروازە و باریکە ڕێکان و بەشەکانی دۆڵ و شیوی (حنین)دا، موسوڵمانان پەلەیان کرد بۆ چوونە ناو دۆڵەکە، پلانەکەشی کتوپڕ بوو بۆ موسوڵمانان کاتێك بەهاتنە ناوەوەیان بۆ دۆڵەکە دەست بەجێ بە تیری ژەهراوی تیربارانی کردن.

لە ڕۆژی ١٠ی شەوالی ساڵی ٨ك و لەبەرەبەیاندا موسوڵمانەکان چوونە دۆڵی (حنین)ەوەو ئەیاندەزانی کە بۆسەی دوژمنی لێ یە، لەناکاو تیریان لە گشت لایەکەوە تێ گیراو دوژمنیش بە یەکرا هێرشیان هێنا، ئیتر موسوڵمانەکان تۆشی شۆك و شپرزەیی بوون، بەناڕێکوپێکی گەڕانەوە هەریەك بەلایەکدا، لەو کاتەدا هەندێك لەو کەسانەی تازە هاتبوونە ناو ئیسلام وەك (ئەبوسوفیانی کوڕی حەرب) پڕ بە گەرو و سنگیان هاواریان دەکرد، ئینجا پێغەمبەر – دروودی خوای لێبێت – هەستایەوە و لای ڕاستی گرت و پاشان بانگی موسوڵمانانی کرد، بانگەکەشی تایبەت بوو بە کۆچکردوو و پشتیوانان (المهاجرین و الانصار) و ئەوانەی بەتەواوی بەیعەتیان دابوو، هەتا سەد کەس لە هاوەڵە تایبەتەکانی لەدەوری کۆبوونەوە، ئینجا مشتێك خۆڵی هەڵگرت و هاویشتی بەڕوی دوژمناندا و فەرمووی : " شاهت الوجوه " ، چەند کاتژمێرێکی کەم تێپەڕی دوژمن شکستێکی گەورەی

بەخۆوە بینی و هەڵاتن و ڕایانکرد بەرەو چەند جێ یەکی جیاواز، بەشێکیان بۆ (أوطاس) و بەشێکی تر بۆ (نەخلە) و زۆربەشیان ڕوویان کردە قەڵاکانی (تائیف).

موسوڵمانان هەستان بە ڕاوەدونانیان بەرەو قەڵاکانای تائیف ، پاش ئەوە پێغەمبەر – درودی خوای لێبێت – ڕوی کردە قەڵاکانی سەقیف، کە (مالیکی کوڕی عەوف) خۆی تێدا شاردبوونەوە، ئابڵۆقەیەکی توندیان خستە سەر تائیف و لەو سەروبەندەشدا دەستەویەخەبوونێکی توند لەنێوان بەرگریکارانی قەڵاکە و موسوڵماناندا ڕویدا، بەهۆیەوە زۆرێك لە موسوڵمانان بریندارببوون، پێغەمبەری– درودی خوای لێبێت – هەوڵی دا زۆریان بۆ بهێنێت بە بڕینی باخە ترێکانیان، بەڵام داوایان لێکرد وازی لێ بهێنێت لەبەر خودا و بەزەیی هەبێت، ئەویش لەبەر خوا وازی لێهێنان، پاشان ڕایگەیاند کە هەرکەس بێتە دەر لە خەڵك و کۆیلەکانی سەقیف بۆناو موسوڵمانان ئەوا ئازادە، دوای ئەوە بیست و سێ پیاو هاتنە دەر بۆناو موسوڵمانان، دواتر سوپای ئیسلام هەوڵی هێرشکردنی دا بە توندی بەڵام خەڵکی قەڵاکە بەشی ساڵێك ئازوقە و کەلوپەلی شەڕیان خستبوو و باکیان نەبوو.

ئابڵۆقەی پێغەمبەر – درودی خوای لێبێت – بۆسەر تائیف نزیکەی ٤٠ ڕۆژ بەردەوام بوو، کە تیایدا چەندین شەڕ و دەستەویەخەبوون و ڕووبەڕووبوونەوە لەنێوان موسوڵمانان و بێ باوەڕاندا ڕویدا، جاڕدەری پێغەمبەر بانگەوازی کرد کە : هەر بەردەیەك لەناو قەڵاکە بێتە دەرەوە بۆ ناو موسوڵمانان ئەوا ئازادە، ئیدی نزیکەی ١٠ – ٢٠ پیاو هاتنە دەر، پێغەمبەریش – درودی خوای لێبێت – باوەشی بۆ کردنەوە، هەرپیاوێك لەو پیاوانەی دایە دەست موسوڵمانێك تاکو پێداویستی و کاروبارەکانی جێ بەجێ بکات.

کاتێك ئابڵۆقەکەی پێغەمبەر درێژەی کێشا و هەندێك لە موسوڵمانان بریندارو شەهیدبوون، پێغەمبەر – درودی خوای لێبێت – پرس و ڕاوێژی بە هەندێك لە موسوڵمانان کرد، پاشان بڕیاری شکاندن و لابردنی گەمارۆ و ئابڵۆقەکەی دا و ئەویی جێ هێشت.

لە (عبدالله کوڕی عەمر)ەوە فەرمووی: پێغەمبەر – درودی خوای لێبێت – گەمارۆی خەڵکی تائیفی دا و هیچ شتێکی لێیان چنگ نەکەوت، فەرمووی: ئێمە دەکشێینەوە

لەشەڕ، هاوەڵانی وتیان: ئایا دەکشێینەوە و تائیف فەتح ناکەین، فەرمووی: باشە بچن و بەردەوام بن لە شەڕ، کەچون بریندارێکی زۆریان لێکەوتەوە، پێغەمبەر دیسانەوە فەرمووی: دەکشێینەوە، ئەوانیش خۆشحاڵ بوون و سەریان سوڕما، پێغەمبەریش زەردەخەنەیەکی کرد"[1].

ئەم شەڕە لەڕاستیدا درێژکراوەی شەڕی (حنین)بوو، چونکە زۆربەی هەڵاتوانی هەوازن و سەقیف چوونە تائیفەوە لەگەڵ سەرکردەی گشتی دا (مالیکی کوڕی عەوف) و لەوێ خۆیان شاردەوە، هەربۆیە پێغەمبەری خوایان – درودی خوای لێبێت – بۆ چوو پاش تەواوبوونی لە شەڕی (حنین) و کۆکردنەوەی غەنیمەت و دەستکەوتەکانی شەڕ لە (جعرانة[2]) لەهەمان ساڵدا واتە مانگی شەوالی ساڵی ٨ك.

گەمارۆدانەکە ماوەیەکی تاڕادەیەك زۆر درێژەی کێشا، کە دەڵێن (٤٠) ڕۆژ بووە، مێژونوسانیش ڕای جیاوازیان هەیە، دەڵێن: بیست ڕۆژ یان دە و چەند ڕۆژێك، یان هەژدە ڕۆژ، یان پانزە ڕۆژ....هتد.

لەم ماوەیەدا تیر لەیەکتر هاویشتن زۆر ڕوویدا، موسوڵمانان سەرەتا کە گەمارۆی قەڵاکەیان دا خەڵکی ناو قەڵاکە زۆر بەتوندی تیربارانیان کردن، هەروەکو کوڵلە تیریان داباراند بەسەریاندا، تاکو چەند کەسێك لە موسوڵمانان بریندار بوون و دوانزە پیاویان لێ کوژرا، ناچاربوون لە سەربازگەکەیانەوە بڕۆن بەرەو مزگەوتی (تائیف)ی ئەمڕۆ و لەوێ بارگەیان خست.

ئەوەی لەم شەڕەدا تێبینی دەکەین ئەوەیە پێغەمبەر – درودی خوای لێبێت – ئامێرەکانی شەڕکردنی تیابەکارهێنا، وەکو مەنجەنیق (ئاگر بار)، بەو مەنجەنیقە ئاگرباران و بەردبارانی کردن، تاکو شکاندنی و پێوەی چونە ناو دیواری قەڵاکە تاکو بیسوتێنن، بەڵام دوژمن شیشی ئاسنی گەرمکراوی ئاڕاستەکردن، ئەوانیش لەژێر دیواری قەڵاکە هاتنە دەرەوە و تیریان پێوەنان و چەند پیاوێکیان لێ کوشتن.

---

[1] .متفق علیه.

[2] . جعرانة: شوێنێکە لە نێوان مەککە و تائیف....(سەرچاوە: قاموس المعاني – عربي – عربي .(almaany.com

هەروەها یەکێك لەو شتانەی کە پێغەمبەر – درودی خوای لێبێت – فەرمانی پێکرد وەك یەکێك لە سیاسەتەکانی شەڕ بۆ ئەوەی دوژمن هانا بۆ خۆبەدەستەوەدان و ئاشتی بێنێت فەرمانکردنی بوو بە بڕینی میوەکان و ڕەزەکانیان، موسوڵمانان گورج بڕیان، ئینجا سەقیف داوایان کرد لەبەر خوا لێی گەڕێ، ئەویش لێی گەڕا.

کاتێك ئابلۆقەکە درێژەی کێشا و قەلاکە ملیان نەدا و موسوڵمانان ئەوەی بەسەریان هات هات لە تێگرتنی تیرەکان و ئاسنی گەرمکراو، خەڵکی قەلاکەش پێویستی و ئازوقە و کەلوپەلی یەك ساڵیان پێ بوو، پێغەمبەر – درودی خوای لێبێت – ڕاوێژی بە (نەوفەلی کوڕی معاویەی دەیلی) کرد، فەرموی: ئەوان ڕێوین لە کوندا ئەگەر ڕاوەستی و بەردەوام بی لەسەری دەیگری، ئەگەریش وازی لێ بێنیت و جێی بهێڵی زیانت پێ ناگەیەنێت، ئەوکات ئیدی پێغەمبەر بڕیاریدا گەمارۆی سەر قەلاکە لابەرێ و بڕۆن، فەرمانی بە (عومەری کوڕی خەتاب) کرد، بەناو خەلکیدا بانگەوازی کرد : ئێمە بەیانی دەکشێینەوە – ان شا الله – ، هاوەلانی قورس بوو لەسەریان و وتیان: ئایا دەکشێینەوە تائیف فەتح ناکەین، فەرمووی: باشە بچن و بەردەوام بن لە شەڕ، کەچون برینداریکی زۆریان لێکەوتەوە، پێغەمبەر دیسانەوە فەرمووی: دەکشێینەوە، ئەوانیش بەوە دڵخۆش بوون و بەگوێی پێغەمبەریان کردو ئامادەی ڕۆیشتن بوون ، پێغەمبەریش پێدەکەنی".

کاتێك ئەو شوێنەیان جێهێشت فەرموی بڵێن: "گەڕاینەوە بە تۆبە و بەندایەتی و سوپاسگوزاریمانەوە بۆ خوای گەورە".

وتیان ئەی پێغەمبەری خودا بۆ سەقیف بپاڕێرەوە، فەرمووی: " خودایە هیدایەتی سەقیف بدە و بیانهێنە سەر ڕێی ڕاست".

خوای گەورە لە شەڕی (حنین) دا چەند ئایەتێکی دابەزاند کە تاڕۆژی قیامەت دەخوێنرێتەوە لە سورەی (تەوبە) دا و دەفەرموێت: ﴿لَقَدْ نَصَرَكُمُ اللَّهُ فِي مَوَاطِنَ كَثِيرَةٍ وَيَوْمَ حُنَيْنٍ إِذْ أَعْجَبَتْكُمْ كَثْرَتُكُمْ فَلَمْ تُغْنِ عَنْكُمْ شَيْئًا وَضَاقَتْ عَلَيْكُمُ الْأَرْضُ بِمَا رَحُبَتْ ثُمَّ وَلَّيْتُمْ مُدْبِرِينَ (٢٥) ثُمَّ أَنْزَلَ اللَّهُ سَكِينَتَهُ عَلَى رَسُولِهِ وَعَلَى الْمُؤْمِنِينَ وَأَنْزَلَ جُنُودًا لَمْ تَرَوْهَا وَعَذَّبَ الَّذِينَ كَفَرُوا وَذَلِكَ جَزَاءُ الْكَافِرِينَ (٢٦)﴾.

# موسوڵمان بوونی خێڵی (هەوازن) و (سەقیف)

خێڵی (هەوازن) پێش هۆزی (سەقیف) چوونە ناو ئیسلامەوە، ڕاستەوخۆ دوای شەڕی (حنین)، بەجۆرێك پاش دابەشکردنی غەنیمە و دەستکەوتەکانی شەڕی (حنین) چەند نێردراوێك لە (هەوازن) هاتن بۆلای موسوڵمانەکان و موسوڵمانبوونی خۆیان ڕاگەیاند، ژمارەیان چواردە پیاو بوو، سەرگەورەکەیان (ئیبن صورەد) بوو، لەناویشیاندا مامی شیریی پێغەمبەر (ئەبو بورقان) هەبوو، داوایان لێکرد دیل و سامانەکانیان بداتەوە، ڕێیان بۆ دانان کە بڵێن :ئێمە بۆ پێغەمبەر بڕواداران دەکەینە تکا کار و لای بڕوادارانیش پێغەمبەر دەکەینە تکاکار کە دیلەکانمان بۆ بگێڕنەوە.

کاتێك نوێژی سبەینان کرا هەستانەوە و ئەوەیان وت کە تەگبیریان بۆ کرابوو، ئیدی پێغەمبەری خودا فەرمووی: " ئەوەی کە بۆ من و بەنی عەبدولموتەلیب بوو بۆخۆتان، داواش لەخەڵکی دەکەمەوە بۆتان" ئینجا کۆچکردوو و پشتیوانان وتیان ئەوەی بۆ ئێمەش بوو ئەوە بۆ پێغەمبەری خوایە و هی ئەوە، ئینجا (ئەقرەع کوڕی حابس) وتی: بەڵام من و بەنو تەمیم نا.... (عویەینە کوڕی حیصن) وتی من و بەنو فەزارەش نا، (عەباسی کوڕی میرداس) وتی: بەڵام من و بەنو سولەیمیش نا، ئینجا بەنو سولەیم وتیان: ئەوەی بۆ ئێمە بووە ئەوە بۆ پێغەمبەری خوا بووە، ئیدی عەباس وتی: پشتتان شکاندم.

دواتر پێغەمبەر فەرمووی: ئەو خەڵکە هاتوون بە موسڵمانی، ئەوا من دیلەکانیانم دانەوە، سەرپشکم کردن جا هەرکەس شتێکی ئەوانی لایە با خۆی پاك بکاتەوە بە گێڕانەوەی، هەرکەسیش دەیەوێت مافەکەی خۆی وەربگرێتەوە با وەڵامیان بداتەوە

خەڵکەکە وتیان: ئەوا خۆمان پاك کردەوە بۆ پێغەمبەری خودا و خۆمان دایە دەستی ئەو.

فەرمووی: " ئێمە نازانین کێ لەئێوە ڕازیە و کێ نارازی، بگەڕێنەوە هەتا زانا و گەورە و ناسیاوەکانتان کاری ئێوەمان تێدەگەیەنن.

پاش ئەوەی وەڵامیان دایەوە، پێغەمبەریش یەك یەك دیلە (قیبتیەکان)ی پۆشتە کردەوە.

کاتێك پێغەمبەر – درودی خوای لێبێت – تەواو بوو لە دابەشکردنی دەستکەوتەکان لە (جعرانة) خۆی ئامادەکرد عەمرە بکات، عەمرەکەی بەجێ گەیاند و لە (ذي القعدة)ی ساڵی ٨ی کۆچی (عەتاب کوڕی ئوسەید)ی کردە فەرمانڕەوای مەککە بۆ ماوەی شەش شەویش لەوێ مایەوە و پاشان بەرەو مەدینە گەڕایەوە.

پاش شەڕی تائیف و گەمارۆدانی (سەقیف) لەلایەن پێغەمبەر و یاوەرەکانیەوە و پاشان گەڕانەوەی بۆ مەدینە، خێڵی سەقیف هەر لە سەر بێ بڕوایی و کەللە ڕەقی خۆیان مانەوە، تاکو شەڕی تەبوك ڕویدا و موسوڵمانبوونی (عوروەی کوڕی مەسعودی سەقەفی) هاتە کایەوە.

عوروەی کوڕی مەسعودی سەقەفی یەکێك بوو لە گەورەپیاوانی (سەقیف) بە سەرکەوتنی موسوڵمانانی لە خاکی تەبوکدا زانیبوو، هات بۆلای پێغەمبەر پێش ئەوەی بچێتە مەدینەوە، لەسەر دەستی پێغەمبەر موسوڵمان بوو، ئیزنی خواست کە بچێتەوە بۆ تائیف، تاکو هۆزەکەی بانگ بکات بۆ ئاینی یەکتاپەرستی، پێغەمبەریش هۆشداری دایە سەبارەت بە مەترسیەکانی ئەم کارەی، چونکە پێغەمبەر دەیزانی کە ئەوان سیفەت و هەستی ڕێگری و قایل نەبوونیان تێدایە بۆکەسێ کە لەخۆیانە.

پێی فەرموو: دەتکوژن.

عوروە فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا منیان لە چاویان خۆشتر دەوێت.

لەناویاندا بەوجۆرە بوو خۆشەویست و بەگوێ کراو، بەڵام سیفەتی فیز و خۆبەگەورەزانینیشیان تێدابوو و ڕێگر بوو لە ملکەچبوونیان بۆ ڕاستی، لەو ڕوانگەیەوە

پێغەمبەر پێی ڕاگەیاند کە دەیکوژن، پێشتر خودی خۆیشی بانگی کردن بۆلای ئیسلام و بەردبارانیان کرد.

هەربەو جۆرەش کاتێک (عوروە) بانگی کردن بۆلای ئایینی ئیسلام تیرباران کرد، لەدواساتەکانی تەمەنیدا و دوا هەناسەکانیدا دەیفەرموو: خوا ڕێزێکی لێنام، شەهیدبوونێکی بەرەو لای من هێنا و کردیە دیاری بۆمن[1]، من هیچم لەدڵدا نیە ئەوەی ناو دڵی ئەو شەهیدانەدا نەبێت کە لەگەڵ پێغەمبەری خوادا بوون و لەپێناوی خوادا کوژران، کەواتە مەر لەگەڵ ئەوانیش بمنێژن".

ئابەو جۆرە عوروە کاتێک بانگی هۆزەکەی کرد بۆ ڕێی ڕاست بەدەستی خۆیان کوشتیان، وە بوویە هاو وێنەی کەسێتی (یس) کە باسەکەی لە سورەی (یس)دا هاتووە، پێغەمبەر – درودی خوای لێبێت – کاتێک هەواڵی کوژرانی عوروەی پێگەیشت فەرمووی: " نمونەی ئەم لەناو هۆزەکەی وەک کەسێتی (یس) وایە لەنێو هۆزەکەی ئەویش هەر بانگی کردن بۆلای خێر، کەچی کوشتیان".

دووابەدوای کوشتنی (عوروە) پیاوانی سەقیف بەتوندی لە کارەکەیان پەشیمان بوونەوە و بۆیان دەرکەوت کە ئیتر ژیان بۆیان سەهل و ئاسان نیە لەناو جەرگەی حیجازدا، کە لەگشت ناوچەکانیدا بەیداخی یەکتاپەرستی شەکاوەتەوە، بەتایبەت پاش ئەوەی گشت کێڵگەکان و ڕێگاکانی بازرگانی کەوتە دەست موسوڵمانەکان، هەربۆیە لە (کۆبوونەوەیەکی ڕاوێژکاریدا) کە بەسترا بۆ چارەسەری کێشەکانیان بڕیاریان دا کە نێردراوێك بنێرن بۆ مەدینە تاکو لەگەڵ پێغەمبەر دانوستان بکات و دان بنێ بە ئامادەیی هۆزەکەیاندا بۆ هاتنە ناو ئیسلام و ئایینی یەکتاپەرستیەوە بەپێی چەند مەرجێکی دیاریکراو، لەناوخۆیاندا ڕێککەوتن لەسەر ناردنی (عبدیالیل) بۆ مەدینە بۆ گەیاندنی پەیامەکەیان بە پێغەمبەری خوا.

بەڵام (عبدیالیل) ئامادە نەبوو ئەو ئەرکە ئەنجام بدات، گوتی: من ئەو کارە ناکەم تاکو چەند پیاوێك لەگەڵم نەنێرن، چونکە متمانەی نەبوو کە لە بۆچونەکەیان پاشگەز نەبنەوە، دەترسا چیان بەسەر (عوروە) هێنا وایش بەسەر ئەم بهێننەوە، دواتر لەسەر

---

[1] - سەیری (المغازي – للواقدي) و (السیرة النبویة – لإبن هشام) بکە.

ئەوە ڕێککەوتن پێنج پیاوی سەقیف لەگەڵی بنێرن تاکو گشتیان پێکەوە بچن بۆلای پێغەمبەری خودا و دانوستانی لەگەڵ بکەن.

ئەم وەفدە شەش کەسیە ڕوویان کردە مەدینە، پاش بڕینی مەودایەکی زۆر لەدەرەوەی مەدینە دابەزین و لایان دا، لەوێدا چاویان بە (مغیرەی کوڕی شعبەی سەقەفی) کەوت، کە ئەسپ و وڵاخی هاوەڵانی پێغەمبەری دەلەوەڕاند.

کاتێک (مغیرە) پیاوانی هۆزەکەی دیت و ئامانجەکەیانی زانی، وڵاخەکانی لای سەقەفیەکان جێهێشت و بە پەلە چوو بۆ مەدینە بۆ ئەوەی مزگێنی بدات بەپێغەمبەری خودا و بڕیاری هۆزەکەی (سەقیف) بە پێغەمبەری خودا بگەیەنێت کە دەمێک بوو کەللەڕەقیان دەنواند، پێش ئەوەی بچێتە لای پێغەمبەر ئەبوبەکری بینی، (مغیرە) هەواڵی کاروانی سەقەفیەکانی بە ئەبوبەکر گەیاند، ئەبوبەکریش تکای تیا کرد ڕێگەی بدات ئەم مژدەکە بە پێغەمبەری خودا بدات، پێش ئەوەی مغیرە باسی بکات، ئەویش ڕازی بوو، چوونە لای پێغەمبەر و هەواڵەکە گەیەندرایە پێغەمبەر و موغەیرەش گوتی کە سەقەفیەکان دەیانەوێت بێنە ناو ئیسلامەوە، بەڵام چەند مەرجێکیان هەیە، بۆیە پێغەمبەر فەرمانی کرد بە ڕێزەوە پێشوازی و میوانداریان لێ بکرێت و خێوەت و چادرێکیان لە دەورووبەری مزگەوتەکە بۆ هەڵبدەن، (خالیدی کوڕی سەعید)ی ڕاسپارد کاروبارەکانی میوانداریەکە بگرێتە ئەستۆ.

پاشان وەفدی سەقیف هاتنە لای پێغەمبەر و لەگەڵ ئەوەی کە (مغیرە) فێری کردبوون کە چۆن سڵاو بکەن، کەچی ئەوان هەر بەسڵاوکردنی سەردەمی نەزانی و نەفامی سڵاوەکەیان کرد، لەبەر فیز و خۆبەگەورە زانی، پاشان بۆچوون و ڕای سەقەفیەکانیان خستە بەردەم پێغەمبەر و گوتیان ئەوان ئامادەن بێنە ناو ئیسلام بەڵام چەند مەرجێکیان هەیە کە لەدانیشتنی دواتردا دەیخەنە ڕوو!!

دانیشتن و دانوستانەکانی پێغەمبەری خودا لەگەڵ وەفدەکەی سەقیف بۆ چەند ڕۆژێک بەردەوام بوو، (خالیدی کوڕی سەعید) لەنێوانیاندا گەیەنەری ڕاکان و داواکاریەکان بوو و دەهات و دەچوو.

پاش چەند دانوستانێك کەلە ڕەقی ئەم هۆزە و ئارامگریی پێغەمبەریش لەگەڵیان زۆر بەجوانی بە دەرکەوت، پێغەمبەری خودا زۆرێك لە مەرجەکانی سەقیفی پەسەند کرد، تەنانەت پاراستنی خەڵکی تائیفی گرتە ئەستۆ، ئەو پەیمانە گرەنتی ئاسایشی ناوچەی تائیف و ئەوەی کە پەیوەست بوو بە تائیفیەکانەوە لە پاراستنی خاکەکەیانی تێدابوو، بەلام هەندێك لە مەرجەکانیانی پەسەند نەکرد وەکو ئەوەی وەفدی سەقیف بە پێغەمبەری خوایان گوت: هۆزەکەمان ئامادەیە بێتە ناو ئیسلامەوە بەمەرجێك بتخانەکانیان وەك خۆی بمێنێتەوە و دەستکاری نەکرێت و (لات) بۆماوەی سێ ساڵ بپەرستن، کە بتی گەورەی هۆزەکەیان بوو، پێغەمبەریش ڕازی نەبوو و پشتی کردە ئەم مەرجە.

کاتێك توڕەبوونی پێغەمبەریان بینی و زانیان پشتی تێکردوون ئیدی دەستیان بە سازش کردن و کەمکردنەوەی ئەو ماوەیە کرد کە دیاریان کردبوو ساڵ ساڵ، ئەویش هەر ڕازی نەبوو، هەتا وای لێهات داوای یەك مانگیان لێکرد بەلام سەروەر - درودی خوای لێبێت - ڕازی نەبوو کە تەنانەت یەك ڕۆژیش پاش ڕێککەوتنەکە ئەو بت و بتخانانە بمێننەوە.

لەبەر ئەوە کاتێك وەفدەکە هەستیان بە ناشیرینی داوا و مەرجەکەیان کرد دەستیان کرد بە پۆزشهێنانەوە و پاساو بەوەی کە ئەوان ویستویانە بەو جۆرە ژن و وردە و ساویلکەکانی هۆزەکەیان ڕازی بکەن، بەجۆرێك ئەوان حەزناکەن هۆزەکەیان بترسێنن بە شکاندنی بتەکان، هەتا موسوڵمانیان دەکەن، جا ئەگەر پێغەمبەر بەدڵی نەبوو ئەوا کەسێك لەگەڵیان بنێرێت کە لەهۆزی خۆیان نەبێت بۆ شکاندنی بتەکەیان، پێغەمبەر لەسەر ئەم مەرجە ڕازی بوو، چونکە پێغەمبەر دەیویست گشت پەرستیوە پوچ و درۆکان لەژیانی مرۆڤایەتی بسڕێتەوە و بکاتە دەرەوە، جا لەسەر دەستی خێڵەکیەکان بێت یان بێجگە لەوانیش.

مەرجی کۆتاییشیان ئەوەبوو کە پێغەمبەر لە (نوێژکردن) بیان بەخشێت.

پێیان وابوو کە پێغەمبەر دەتوانێت دەست بخاتە بڕیار و حوکمە خودابیەکانەوە، وەك چۆن ئەهلی کیتاب (گاور و جو) دەیکەن، بەپێی بۆچوونی خۆیان، کۆمەڵێك کەس ڕادەسپێرن بە ئەنجامدانی ئەم بڕیار و حوکم و فەرزانە و کۆمەڵێکی تریش دەبەخشن لێی.

ئەم مەرجە دەری خست کە ئەوان هێشتا گیانی خۆبەدەستەوەدانی تەواوەتی لەدڵیاندا نەچەسپیوە، هاتنە ناوەوەشیان بۆناو ئیسلام سەرەنجام و لێکەوتەی هەندێك بارودۆخە کە پاڵی پێوەناون بۆ ئیسلامەتیەکی ڕوکەش، ئەگەرنا هیچ بیانوو و هۆیەك نەبوو بۆ باوەڕهێنان بە هەندێك لە پایە و شتەکانی ئیسلام و پابەند نەبوونیان بە هەندێکی تریەوە، لایەکی پەسەند بکەن و لایەکەی تری پەرچ بکەنەوە.

چونکە ئیسلامی ڕاستەقینە خۆبەدەستەوەدانی تەواوەتیە بۆخودا و پێغەمبەرەکەی لەگشت کاروبارەکانی ژیاندا.

لەبەر ئەم مەرج و قسانەیان بوو سەرورمان وەڵامی دانەوە و فەرمووی: خێر نیە لە دینێکدا نوێژی تیا نەبێت"، ئینجاکاتێك هەردولایان ڕێککەوتن لەسەر مەرجەکانیان پەیماننامەیەکی گشتگیر دانرا کە گشت برگە و مەرجە لەسەر کۆکەکانی تێدابوو، پێغەمبەر واژوی لەسەر کرد و هەرئەوکاتیش ڕێی دا بە وەفدەکە بگەڕێنەوە بۆ لای هۆزەکەیان، گەنجترینیانی هەڵبژارد کە (عوسمانی کوڕی ئەبو عاص)بوو و لەهەموویان زیاتر حەزی بە تێگەیشتن و زانیاریەکانی ئاینی ئیسلام و فێربوونی قورئان هەبوو، لەو ماوە کەمەی کە لە مەدینە بوو، هەربۆیە پێغەمبەر ئەوی کرد بە پێشەوای هۆزی سەقیف و ڕای سپارد کە نوێژی بە کۆمەڵ (جەماعەت) بە خەڵکی بکات، هەروەها ڕەچاوی لاواز و پیرەکانیان بکات لەکاتی نوێژەکەیدا، فەرمووی: " نوێژ زۆر بکە و خەڵکی بە لاوازترینەکەیان بپێوە، چونکە ئەو نوێژخوێنانە گەورە و بچوك و لاواز و خاوەن پێداویستیشیان تێدایە".

پاشان پێغەمبەری سەروەر – درودی خودا لەخۆی و خانەوادەکەی بێت – (ئەبو سوفیانی کوڕی حەرب) و (مغیرەی کوڕی شعبە)ی ڕاسپارد لەگەڵ وەفدەکەی سەقیف بچن بۆ تائیف بۆئەوەی بتەکانی ناری بشکێنن و بەم چەشنە سەقیف پاش کەللە ڕەقیەکی زۆر هاتنە ناو ئیسلام و کۆتا هۆزیش بوون لەو هۆزانەکەی کە هاتنە ناو ئیسلامەوە.

***

(٢)

# دووباره دارِشتنەوەی دەوڵەتی ئەمەویی

- دەوڵەتی ئەمەوی هەڵکشان و داکشانی.

- قۆناغی یەکەم لە دارِشتني دەوڵەتی ئەمەوی دا.

- عەبدولمەلیکی کوری مەروان و دوبارە دارِشتنەوەی دەوڵەتەکە بە گێرانەوەی ئەو وڵاتانەی لەژێر حوکمی ئەمەویەکاندا بوون بۆ ژێر دەستی خۆی.

## دەوڵەتی ئەمەوی هەڵکشان و داکشانی

هەموو دەوڵەتێك قۆناغی هەڵکشان و بالاکردن و قۆناغی داکشان و ڕوخان و کۆتاییهاتنی هەیە، دەوڵەتی ئەمەویش هەر بەو جۆرە بوو کە معاویەی کوڕی ئەبو سوفیان دایمەزراند پاش ململانێی زۆری لەگەڵ پێشەوا عەلی کوڕی ئەبو تالیب– ڕەزای خوای لێ بێت–، پاش گرتنە دەستی جڵەوی خەلافەت لەلایەن معاویەوە سەردەمی خەلافەتی ڕاشیدین کۆتایی پێ هات کە سی ساڵی خایاند و ئیتر فەرمانڕەوایەتی بوویە پاشایەتی و بنەماڵەیی..

ئەمەویەکان یان کوڕانی ئومەییە یەکەمین خانەوادە بوون کە حوکم بگرنە دەست لە دەوڵەتەکەدا، لەنێوان ساڵانی ٦٦٢ز بۆ ٧٥٠ ز دا جڵەوی دەسەڵاتیان لەدەست بوو و دیمەشق پایتەختی دەوڵەتەکەیان بوو.

ئەوان لە ماڵە گەورەکانی قوڕەیش بوون، ماڵە سەردارەکانی ئەوی، ئومەییە (شەمسی کوڕی عەبدی کوڕی عەبد مەناف کوڕی قوصەی کوڕی کیلاب)ی باوکەگەورەی ئەمەویەکان بوو، یەکێك لە بەناویانگترین گەورەکانی بەنی ئومەییە (ئەبو سوفیان) بوو، کە ناوی (صەخری کوڕی حەرب) بوو، گەورە و سەرداری قوڕەیش بوو لەسەردەمی پێغەمبەردا و ساڵی ئازادکردنی مەککە موسوڵمان بوو.

دامەزرێنەری خانەوادە و بەرەبابی دەسەلاتداری ئەمەوی لە دیمەشق معاویەی کوڕی ئەبو سوفیان بوو، کە (یەزیدی کوڕی ئەبو سوفیان)ی برای والی و فەرمانڕەوای شام بوو لە سەردەمی خەلیفەی یەکەمی موسوڵماناندا (ئەبوبەکر – ڕەزای خوای لێبێت)، پاش

کۆچی دوایی ئەبوبەکریش ساڵی ٦٥٧ز هەر خۆی نێردرایەوە بۆ فەرمانڕەوایەتی ئەوێ لەلایەن خەلیفەی دووەمەوە (عومەری کوڕی خەتاب – ڕەزای خوای لێبێت).

پاش ئەوەی کە موسوڵمانان کۆبوونەوە لەسەر خەلافەت دان بە موعاویە و سازشکردنی (حەسەنی کوڕی عەلی کوڕی ئەبو تاڵیب – ڕەزای خوای لێبێت) لە ساڵی ٤١ کۆچیدا معاویەی کوڕی ئەبو سوفیان خەلافەتی گرتە دەست و دیمەشقی کردە پایتەختی دەوڵەتی ئیسلامی، بەوەش خەلافەت گوازرایەوە بۆ لقی سوفیانی لە کوڕانی ئومەییەدا، معاویە دەوڵەتی ئەمەویی دامەزراند و هەموو پایەکانی قایم و جێگیر کرد وەك دەوڵەت و خەلافەتێکی بەهێز کە گشت نەیارانی ڕاکێشا بۆ ملکەچی و گوێڕایەڵیکردنی و پایەکانی دەوڵەتەکەی پتەوکرد و کاری کرد لەسەر یەکڕیزیی موسوڵمانان.

فەرمانڕەوایەتی ئەو تایبەتمەند بوو بە دانایی و لەسەرخۆیی کە دامەزراندنی کەشتیگەلی دەریایی موسوڵمانان دەگەڕێنەوە بۆ دانایی ئەو، تیشکی شارستانیەتی ئیسلامی لە دیمەشقەوە گەیاندە ناوچە دوورەدەستەکانی جیهان تاکو دەوڵەتی ئەمەوی بکاتە گەورەترین دەوڵەتی ئیسلامی کە مێژوو بەخۆیەوە دیبێتی.

پاش معاویەی کوڕی ئەبو سوفیان خەلافەت گوازرایەوە بۆ کوڕەکەی (یەزیدی یەکەمی کوڕی معاویە) ، دەوڵەتی ئیسلامی لەسەردەمی ئەمیشدا بەردەوام بوو لە پەرەسەندن، هەروەها ڕووداوی (کربلا ) ڕوویدا، کە تیایدا نەوەی پێغەمبەر (ئیمام حسین) کاتێك لە خەلافەتی یەزید خروجی کرد (دەرچوو) و خەلافەتەکەی پەرچ کردەوە شەهیدکرا – ڕەزای خوای لێبێت– ، پاش ئەو ڕوداوە (عەبدوڵای کوڕی زوبێری کوڕی عەوام) لە یەزیدی کوڕی معاویە ڕاپەڕی و خەڵکی حیجاز و یەمەن و جەزیرە و عێراق بەیعەتیان پێدا و شۆڕشەکەیشی بەردەوام بوو هەتاپاش مردنی یەزید و سەرەتای فەرمانڕەوایەتی عەبدولمەلیکی کوڕی مەروان.

مەروانی کوڕی حەکەم دادەنرێت بە دامەزرێنەری ڕاستەقینەی خەلافەتی دووەمی ئەمەویەکان، بەجۆرێك لەپاش خۆی یەك بەدوای یەك کوڕەکانی هاتنە سەر تەخت، لەسەردەمی ئەواندا ئازادکردن و فتوحاتەکان بەردەوامیان هەبوو لەڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوادا،

خودی مەروان چەند مانگێکی کەم لەسەر حوکم مایەوە و دواتر کۆچی دوایی کرد، پاش خۆی کوڕەکەی بەناوی (عبدالملك) جڵەوی خەلافەتی گرتە دەست.

کە ئەو دامەزرێنەری لقی مەروانیەکانە لە خەلافەتی ئەمەویەکاندا و دامەزرێنەرێکی کردەیی پایەکانی دەوڵەتی بەهێزی ئەمەویە.

خەلیفە عەبدولمەلیکی کوڕی مەروان توانی زاڵبێت بەسەر کاروبارەکاندا و هەڵگەڕاوەکان (خەواریجەکان) ملکەچ بکات و بهێنێتە ژێر بار لەسەر دەستی (مهلب کوڕی ئەبو صفرە)، هەروەها توانی ئاگری شۆڕشەکانی عێراق و بەرهەڵستکارانی دەوڵەتەکە بکوژێنێتەوە، وەك شۆڕشەکەی (عبداللەی کوڕی زوبێر) لەسەر دەستی (حەجاجی کوڕی یوسفی سەقەفی) پاش ئابڵۆقەدانی مەککە بۆ ماوەی ٦ مانگ و دواتر جێگیرکردنی ئاسایش لە ناوچەکانی وڵاتدا.

هەروەها لە سەردەمی عەبدولمەلیکی کوڕی مەرواندا زانستەکان گەشەیان کرد و پرۆژەی لێدانی سکە و دراوی ئیسلامی ئەمەوی بە ئەنجام گەیەنرا، کتێبخانەکان دامەزران و هانی زانایان دراو و گرنگیان پێدرا، لەدیمەشق زۆر خولی زانستی و خوێندنگە و زانستی دینی و خولی پەرستش کرانەوە و زانایان و بیرمەندان و فەقیهەکان ڕاکێشرانەوە ناو گۆڕەپانەکەوە.

هەروەها لە سەردەمی خەلیفە عەبدولمەلیکدا نوسراوە حوکمیەکان کرانە عەرەبی پاش ئەوەی کە نامە و تۆمارەکان بە (ڕۆمی) دەنوسران، مزگەوتی (قوبیە صەخرە) لەسەر ئەو شێوازەی ئێستای کرایەوە ، هەروەك دیسان لەسەردەمی عەبدولمەلیکدا پێگە و خاکی دەوڵەتەکە زیادی کرد و فراوانتر بوو.

پاش (عەبدولمەلیکی کوڕی مەروان) خەلافەتی ڕادەستی یەکەم منداڵی خۆی کەناوی (ولید) بوو کرد و بزوتنەوەی ئازادکردن و غەزاکانی موسوڵمانان بەردەوامیی هەبوو و ئەمەویەکان زۆرێك لە وڵاتانیان ئازادکرد لە ئاسیای خۆرهەڵاتەوە تاکو ئەورووپای ڕۆژئاوا، تاکو دەوڵەتی ئیسلامی - ئەمەوی و (دیمەشق)ی پایتەختی ببێتە گرنگترین و گەورەترین ئیمپراتۆریەت لە مێژوودا بە ڕەهایی، بەجۆرێك ساڵی ٧١١ز لە ڕۆژئاوا و

ئەورووپاوە گەیشتە ئیسپانیا، لە ڕۆژهەڵاتیشەوە هەتا سنوورەکانی هیند و صین لە ناوەڕاستی ئاسیادا فراوان بوو، پاشان ساڵی ٧١٥ز غەزای بوخارا و سەمەرقەند و تەواوکردنی ئازادکردنی ئەندەلوس و بەدەر لەوانیش لە وڵاتان دەوروبەر لە هەموو لایەکەوە، لە سەردەمی خەلیفە وەلیدی کوڕی عبدالمەلیك دا مزگەوتی ئەمەوی (مزگەوتی گەورەی دیمەشق) دروستکراو و گرنگی درا بە دروستکردنی و ڕازاندنەوەی بە نەخش و نیگار و جوانکاری، بۆئەوەی مزگەوتی ئەمەوی ببێتە بەبایەخترین سیمبولی ئیسلامی، زانست و زانایان و ئەدیبان و شاعیرانیش ڕووبەڕێکیان هەبوو لە بایەخپێدانەکانی (وەلید) و هانی دەدان، گرنگیی دا بە دارشتنی چەندین باڵەخانە لە (دیمەشق)ی پایتەختی دەوڵەتەکە و لە شارەکانی تری ئیسلامدا بەگشتی، هەروەها هونەری بیناسازی بەدەرکەوت کە دوای ئەوە بوویە خاڵی جیاکەرەوەی سەردەمی ئەمەویی لە سەردەمەکانی تر.

ئەوەی جێگەی باسە ئەوەیە کە لە سەردەمی ئەمەویەکاندا خەلافەت پەرەی سەند و گەشەی کرد بەهەموو پێکهاتە و هێزەکانیەوە، دەسەڵاتی ئەمەوی لەهەموو لایەکەوە فراوان بوو لە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاواوە، هەروەها کاریان کرد لەسەر بەهێزکردنی پایەکانی دەوڵەتی ئیسلامی کە گەیشتبووە ئەوپەڕی فراوانی بەشێوەیەك هیچ دەوڵەتێکی تری ئیسلامی پێی نەگەیشتبوو لە گشت سەردەمەکانی پێشوو و دواتردا، دەوڵەتی ئیسلامی وەك ئیمپراتۆریەتێکی گەورە و زەبەلاح دەرکەوت بەهەموو پێوەرەکان ڕوناکیەکەی گەیشتە ناوچە دوورەکانی جیهان، لەسەردەمی ئەمەویەکاندا زانست و بیناسازی و وێژە و شیعر و هونەر و پیشەسازی گەشەیان کرد.

خەلیفەکانی ئەمەوی یەك بەدوای یەك دەهاتنە سەر تەخت، کە پاش ئەوە خەلیفە (سلیمان کوڕی عبدالملك) و خەلیفەی دادپەروەر (عومەری کوڕی عبدالعزیز کوڕی مەروان) هاتنە سەرتەخت، ئەو خەلیفە ئەمەویەی کە بە دادپەروەری و پشت کردنە دونیا و بەخشندەیی بەرامبەر ژێردەستەکانی نازناوی پێنجەم خەلیفەی ڕاشیدینی بەسەردا برا و تەنانەت کەسێك نەبوو لەسەردەمی ئەودا زەکاتی پێ بشێت، دواتر بە ژەهرخوارکراوی

کۆچی دوایی کرد و پاش ئەویش خەلیفە یەزید کوڕی عبدالملك هات کە دەیویست لەگەڵ خەڵکی هەمان ڕێچکەی (خەلیفە عمر) دوبارە بکاتەوە بەڵام بەهۆی ئەوەی پەراوێزی خراپەکاریی هەبوو نەیتوانی، پاشان خەلیفە هشام کوڕی عبدالملك و پاشانیش وەلیدی کوڕی یەزید هاتنە سەر تەخت.

(ئیبن کثیر) ڕەحمەتی خوای لێبێت لەبارەی فتوحاتەکانی ئیسلامەوە دەفەرموێت:

بازاڕی جیهاد لە نێو بەنی ئومەییەدا گەرم بوو، هیچ کارێکیان نەبوو جیهاد و فتوحات نەبێت، وشەی ئیسلام بڵندبووبوویەوە لە ڕۆژهەڵات ورۆژئاوای زەوی و وشکانی و دەریایی دا، بێ باوەڕییان زەبون و لاوازکردو و دڵی بێ باوەڕان پڕ بوو لەترس لەئاست موسوڵمانانداو، موسوڵمانان ڕویان لەهەر بستەخاك و ناوچەیەك بکردایە لەچنگی بێ باوەڕانیان دەردەهێنا و پاکیان دەکردەوە، لە سەربازگە و لەشکرەکانیاندا کەسانی پیاوچاك و بۆخوا صوڵحاو و زانایان لەگەورەکانی شوێنکەوتوان(تابعین) هەبوون، لەهەر لەشکرێکدا دەستەیەکی گەورەیان تێدابوو کە خودا دینەکەی خۆی پێ سەردەخستن.

ئەمەویەکان بۆ خۆیان ئاگری ئەم جیهادەیان گڕ دەدا و خۆیان دەبوونە نمونە و سەرمەشق لە قوربانیدان و سەرکردایەتیکردنی لەشکرەکان و وەستاندنی دوژمناندا، وەك ئەوەی کە معاویە یەزیدی کوڕی خۆی نارد بەسەرکردایەتی لەشکرێك بۆ گەمارۆدانی (قوستەنتینیە) و (عبدالملك)یش چەندین جار وەلیدی کوڕی نارد بۆ غەزا لە وڵاتی ڕۆم، کوڕی دووەمیشی (مسلمە) سوپاسالاری (جەبهەی ڕۆم)بوو، غەزاکانیشی زیاترن لەوەی مەزەندە بکرێن، ئابلۆقەی ڕۆم – قوستەنتینیە – ی دا، براکەشی محمد کوڕی مەروان پێشەوای جەزیرە بوو، لەزۆربەی کاتەکاندا جڵەوی غەزاکانی بەدەست بوو ، نەوەکانیشی وەلیدی کوڕی عبدالملك و عەباس و عبدالعزیز و عمر و مەروان سەرپەرشتی غەزاکانیان دەکرد لە وڵاتی ڕۆم، هاوکاری مامیان دەکرد (مسلمەی کوڕی عبدالملك) لەو کارەدا، وەك چۆن سولەیمانی کوڕی عبدالملك (داود)ی کوڕی سەر لەشکری هێزە جەنگاوەرەکانی وڵاتی ڕۆم بوو.

هەرچی هیشامی کوڕی عەبدولمەلیکە غەزای کردبووە ئەرك لەسەر هەموو (بەنی مەروان) هەرکامیانیش دوا بکەوتایە لە غەزا (موچە)ی لێ قەدەغە دەکرد، منداڵەکانیشی لەپێشەوەی شەڕدا بوون، لەوانیش: معاویە و سولەیمان و مسلمە و سەعید و..هتد، بەڵام مەروانی کوڕی محمد بۆخۆی سەرلەشکری سوپاکان بوو و لە شەڕدا زۆر بەرگەگر بوو.

وەك پێشتر ئاماژەمان پێ کرد ئەمەویەکان دیمەشقیان کردە پایتەختی خۆیان و بوویە سەکۆیەك بۆ زانست و زانایان، خەلیفە ئەمەویەکان بایەخی زۆریان دەدا بەبیناسازی و ئاوەدانکردنەوە و دروستکردنی مزگەوتەکان کە ئەمڕۆکە بە گرنگترین هێماکانی ئیسلامی دادەنرێن و زۆر وڵات و شاریان لە ڕۆژهەڵاتەوە تا سنوری صین و لەڕۆژئاواوە تاکو ئەندەلس لە دەستی بێ باوەڕان ڕزگار و ئازاد کرد، بوو بە گەورەترین خەلافەت لە مێژوی ئیسلامدا کە دەسەلاتی بەهەموو ئاراستەکاندا پەلی هاوی و دیمەشقی پایتەختیش بوویە گرنگترین شاری جیهانی ئیسلامی.

ئەمەویەکان گرنگیان دەدا بە خوێندگە زانستیەکان و بیناسازی و دروستکردن و نۆژەنکردنەوەی مزگەوتەکان وەکو مزگەوتی ئەمەوی لە دیمەشق و مزگەوتی ئەقصا لە قودس و مزگەوتی پێغەمبەر لە مەدینەی منەووەرە و مزگەوتی قورتوبە و بێجگە لەوانیش لە گشت پەلەکانی خەلافەتدا کە بەهەموو لایەکدا بلاوەی کردبوو.

یەکێکی تر لە کارەکانی خەلافەتی ئەمەویەکان فراوانکردنی خەلافەتی ئەمەوی بوو لە چەندین وڵاتی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوادا، خەلافەتەکەی زۆر پێدراوی بەخشیە شارستانیەتی ئیسلامی، خەلیفەکان بایەخیان دا بە ژیانی ئابوری لە وڵاتە ئیسلامیە جۆربەجۆرەکاندا و والی و فەرمانڕەواکانیان دادەمەزراند، لە لقە پەلهاویشتووەکانی خەلافەتەکەدا لێپرسینەوەیان دەکرد لەوانەش کە کەمتەرخەمبوون، بەوێنە: لە(دیمەشق)ی پایتەخت گرنگیان دەدا بە پیشەسازی و زانستی دینی و پزیشکی و خەستەخانەکانیان (چارەسەرگا)کانیان دادەمەزراند و چارەسەریان دەدایە خەڵکی و زاناکانیان هان دەدا بۆ زانستی زیاتر و کتێبخانەکانیان دەکردەوە، هەروەها یەکەمین دراوی ئیسلامییان لێدا بەناوی (دیناری ئەمەوی).

خەلیفەکانی ئەمەوی کاریان دەکرد لەسەر کۆکردنەوەی موسوڵمانان و یەکسانی و فەرمان کردن بە دادگەری و قورئان و سوننەتیان کردبووە سەرچاوە و مەرجەعی بەڕێوەبردنی کاروبارەکانی خەلافەت، دیسانەوە بەشداربوون لە بڵاوەپێکردنی ئاینی ئیسلام بەشێوەیەکی گەورە لە ناوەڕاستی ئاسیادا و تەنانەت دەورووبەری پاریس و یەکەمین کەشتیگەلی دەریایی ئیسلامی لە سەردەمی خەلافەتی ئەمەوییدا دامەزرا.

مزگەوتی گەورەی (بەنی ئومەییە) لە دیمەشق (وەلیدی کوڕی عبدالملك) دروستی کرد، لە ئەتڵەسی مێژوی ئیسلامدا (ل:٥١) باسێکی خەلافەتی عەباسیەکان و ئەمەویەکان پێکەوە دەکات و تیایدا هاتووە: (خەلافەتی عەباسی گەر ئاگاداری ڕاستی ئەرکەکەی بووایە وەك خەلافەتێکی ئیسلامیی کە بریتیە لە بڵاوکردنەوەی ئیسلام نەك تەنها پارێزگاری پێوەکردنی وەك چۆن وا دەرچوو، گەر بەپەیامەکەیەوە پابووەستایەتەوە و هەموو تورك و مەغۆلی بخستایەتە ناو ئیسلامەوە، ئەوا بۆ ئیسلام و شارستانیەتی مرۆڤایەتی گەورەترین و بەپێزترین خزمەتی بەجێ دەهێنا و لە لاپەڕەکانی مێژودا لەسەری تۆمار دەکرا، بەڵام وا نەبوو خەلافەتی عەباسی لە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوادا ئیسلامی دواخست، لە ڕۆژهەڵات پێش نەکەوت و نەیتوانی هەموو تورك و مەغۆل بخاتە ناو ئیسلامەوە، وەك چۆن خەلافەتی ئەمەوی توانی ئێرانیەکان و زۆرینەی تورکەکان بخاتە ناو ئیسلامەوە و دەروازەکانی هیندی کردەوە بەڕوی ئەم دینەدا. بۆیە لێرەدا پەی دەبەین بە جیاوازی بەرچاوی نێوان خەلافەتی ئەمەوی و عەباسیەکان.

چونکە خەلافەتی ئەمەوی پێگەی ئیسلامی فراوانتر کرد لە زۆربەی خاکەکانی ئیمپراتوریەتی بیزەنتی دا، پێکهاتەکانی (بەربەر)ی هەموو خستە ناو ئیسلامەوە، پاشان نیمچە دورگەی ئیبریا (ئەندەلس)ی دارنی لە گەروی ڕۆژئاواییەکان و پاشان وڵاتی (فەرەنگیەکان)ی بەئیسلام ئاشنا کرد، وە سێ جار هەوڵی دا دەست بگرێت بەسەر قوستەنتینیەدا.

ئەو ماوەیەی کە دوای مردنی (یەزیدی کوڕی معاویە) دێت و پشتکردنی (معاویە)ی کوڕی لە خەلافەت و مردنیشی پاش چل ڕۆژ لە بەیعەت پێدانی و دانەنانی هیچ

جێگرەوەیەك (وەلی عهد) ێك لەژیانیدا بۆ شوێنی خۆی، ئەم ماوەیە بە ناوبڕێك یان سوڕی مێبوون دادەنرێت لە دەوڵەتی ئەمەوییەکاندا، بەجۆرێك (عبداللەی کوڕی زوبێر) پاش ئەمە پلەوپایەی بەرزبوویەوە و دەستی گرت بەسەر زۆربەی وڵاتانی ئیسلامیدا و ئەمەوییەکان نەیانتوانی بەری پێ بگرن هەتا ئەوکاتی کە عبدالملك کوڕی مەروان هات کە بە پاڵپشتی حەجاجی کوڕی یوسفی سەقەفی توانی شۆڕشی خەواریجەکان بەکۆتا بێنێت و بەرەنگاری (ئیبن زوبێر) ببێتەوە لە خەلافەتدا .

کەواتە ماوەی سەرەتای هاتنە سەر تەختی خەلیفایەتی عبدالملك وەك ناوبڕێك وابوو بوو لە ژیانی دەوڵەتی ئەمەویدا کە خەریك بوو کۆتایی پێ بێت و دواتریش گەر خودا بیەوێت ڕونی دەکەینەوە.

***

# دوباره دارشتنەوەی دەوڵەتی ئەمەوی و ڕەوشی جیهانی ئیسلامی پاش کۆچی دوایی یەزیدی کوڕی معاویە و هاتنە سەر تەختی (معاویە)ی کوڕی

پاش کۆچی دوایی یەزیدی کوڕی معاویە ڕادەی لێکترازان و دوبەرەکیەکان لە دەوڵەتی ئەمەویدا زیادی کرد، تەنانەت ئەمەویەکان (کۆنگرەی جابیە)یان بەست بۆ بەیعەتدان بە (مەروانی کوڕی حەکەم) و ڕێککەوتن لەسەر ئەوەی کە (خالدی کوڕی یەزیدی کوڕی معاویە) و پاشان (سەعیدی کوڕی عاص) ببنە جێنشین لە پاش (مەروان).

بەڵام مەروانی کوڕی حەکەم ئەو ڕێککەوتنەی هەڵوەشاندەوە و بەیعەتی بە (عبدالملك)ی کوڕی و پاش ئەویش (عبدالعزیز)ی کوڕی دا، چاوی داخست لە ئاست (خالدی کوڕی یەزید) کە گەنجێکی کەم ئەزمون بوو لە بەڕێوەبردندا بەو هۆکارانەی کە هەبوون، ماوەی خەلافەتی مەروانی کوڕی حەکەم درێژەی نەکێشا و چەند مانگێکی خایاند، ئیدی دەوڵەتی ئیسلامی دابەش بوو بوو بەسەر دوو خەلافەت دا: یەکەمیان: (عبداللەی کوڕی زوبێر)ی لەسەر بوو حیجاز و عێراقی لەخۆ دەگرت، دووەمیان: (عبدالملك کوڕی مەروان) فەرمانڕەوای بوو و پاش کۆچی دوایی باوکی گرتیە دەست و تەنها شام و مصری لەخۆ دەگرت، عەبدولمەلیکی کوڕی مەروان سەرکەوتوبوو لە جڵەوکردنی کاروبارەکان و لەناوبردنی فیتنە و ئاژاوەکاندا، دەوڵەتەکە لەو بێتە و

بەردەیەی پێی گەیشتبوو ڕزگاری بوو، ئیدی ئەمن و ئاسایش گەڕایەوە بۆ باری ئاسایی خۆی.

لە کوفە (موختاری کوڕی عوبەیدوڵای سەقەفی) بەدیارکەوت و لەدەوریشی شیعەی عەلەوی خڕبوونەوە، ئەم موختارە شوێن بکوژانی حسێن کەوت و زۆرێکیشی لێ کوشتن و لەسەرو هەمووشیانەوە (عومەری کوڕی سەعدی کوڕی ئەبو وەققاص) ڕابەری ئەو سوپایەی جەنگی دژی حسێن کردو (عوبەیدوڵای کوڕی زیاد)ی ڕابەری عێراقی سەر بە ئەمەویەکانی کوشت، سوپاکەی لە ٤٠ هەزار سەرباز پێکهاتبوو، هەروەها (حصین کوڕی نمیر)ی کوشت و دەستی گرت بەسەر موصڵدا و بانگی (محمدی کوڕی حەنەفیەی کوڕی ئیمام عەلی) بە (ئیمام مەهدی) دەکرد و دەیویست بڵێت (مهدی منتظر)ە، ئەمە ئەو هۆکارە بوو کە بوویە دەسپێك بۆ لەناوچوونی دەوڵەتی ئەمەوی بەتێپەڕینی ڕۆژگار، ئەو کەسانە و لەسەر هەمووشیانەوە (مختار) لەو کاتەدا ئامانجیان بوو خۆیان بدەنە پاڵ محمدی کوڕی حەنەفیە تاکو سود وەربگرن لەو خۆدانە پاڵە لە بەدەستهێنانی زیاتری پشتیوانان و ڕق لەدڵان بەرامبەر بەنی ئومەییە و ڕاپەڕیوان لەپێناوی داواکردنی خوێنی حسێن دا – ڕەزای خوای لێبێت–.

ئاشکراشە کە (محمد کوڕی حەنەفیە) زانایەکی لەخواترس بوو و پەرچی کردبوویەوە کە بەیعەت بدات بە هیچ کام لەو دوو خەلیفەیە: ( ئیبن زوبێر) و (ئیبن مەروان) و گووتی نا، هەتا هەموو خەڵکی بەیعەت دەدەن، ئەگەر هەموو بەیعەتیان دا ئەوا منیش بەیعەت دەدەم، عبداڵلەی کوڕی عەباسیش هەر بەم جۆرەی کرد ،هیچ تەمایەکی نەبوو لە خەلافەت یان ڕوخانی ماڵی ئەمەویەکان و لەناوبردنی عبداللەی کوڕی زوبێر دا.

هەربۆیە بانگەشە بەناوی محمدی کوڕی حەنەفیەوە عبداللەی کوڕی زوبێری توڕەکرد و براکەی خۆی بەناوی موصعەبی کوڕی زوبێر نارد بۆ ئەوەی ببێتە فەرمانڕەوای عێراق، فەرمانیشی پێکرد بە لەناوبردنی مختاری سەقەفی.

هەرواش بوو موصعەب سەرکەوتوو بوو لە ئابلۆقەدانی موختار لە کوفە و کوشتنیشی، ئیدی حیجاز و عێراق بوویە هی ئیبن زوبێر و مصر و شامیش بوویە هی عبدالملك کوری مەروان.

لە سالی ٧٠ی کۆچیدا عبدالملك چوو بۆ عێراق بۆ ئەوەی لە ئیبن زوبێری بسەنێتەوە، لەنێوان ئەو و موصعەبدا چەندین شەڕی گەرم ڕوویدا، دواجار عبدالملکی کوری مەروان توانی موصعەبی کوری زوبێر لەناوبەرێت و بچێتە کوفەوە کە ملکەچ و گوێڕایەڵی ئیبن زوبێر بوون و بەیعەتیان پێدابوو، ئینجا بەیعەتی لە خەلکەکەی سەندەوە بۆ خۆی و لەلای خۆیەوە والی و فەرمانڕەوایەکی بۆ عێراق دانا.

حەجاج و ئیبن زوبێر:

هیچ شوێنێك نەمایەوە عبداللەی کوری زوبێر دەسەلاتی بەسەریدا هەبێت بێجگە لە مەککەی حیجاز نەبێت، ئیدی کاتی چرکەساتی هەستانەوە هات، ساتەوەختی بڕیاری یەکلاکەرەوە، هەربۆیە عەبدولمەلیکی کوری مەروان فەرمانی بە حەجاجی کوری یوسفی سەقەفی کرد لە (طائف)ی زێدی لەدایك بوونی خۆی بنکەیەك بۆ کردەوە سەربازیەکانی دروست بکات ، تاکو لەڕوی عبداللەی کوری زوبێردا بووەستێتەوە کە لە مەککەی پیرۆز گەمارۆ درابوو.

لەشکرەکەی حەجاج لە (تائیف)ەوە بەڕێ کەوت بۆ مەککە و گەمارۆی ئیبن زوبێری دا، وەك چۆن (حصین کوری نمیر) ئەو کارەی لەپێشتردا کرد ، بە مەنجەنیق عبداللەی کوری زوبێری ئاگرباران کرد و تەواو خۆی و پشتیوانەکانی تەنگیان پێ هەلچنرا هەتا زۆربەی پشتیوانەکانی لێی جیابوونەوە، بەلام ئیبن زوبێر خۆی نەدا بەدەستەوە هەتا سالی ٧٢ك کوژرا و خەلافەتەکەی نۆ سالی خایاند.

بەکوژرانی (ئیبن زوبێر) حیجاز سەرلەنوێ چوویەوە ژێر فەرمانڕەوایەتی کوڕانی ئومەییە و حەجاج وەك والی حیجاز لەلایەن عبدالملکی کوری مەروانەوە هەتا سالی ٧٥ك مایەوە.

عبداللـەی کـوڕی زوبێـر – ڕەزای خوایـان لێبێت – لـە حیجـاز و عێـراق و ئـەوەی سەرییەوێیە لەوپەڕی ڕۆژهەڵاتی لانەی ئیسلام بەیعەتی پێدرا و لەمیصر و ئـەوەی بـەدوایا دێ لەوپەڕی وڵاتانی ڕۆژئاوا و ناوچەی شامیش بەیعەتیان پێدا هەندێك بەشی نەبێ، ئینجا لـەناو دیمەشقدا (ضحاك کوڕی قەیسی فـەهری) بەیعـەتی بـە (ئیبن زوبێر)دا.لـە حمص (نوعمانی کوڕی بەشیر) بەیعـەتی پێدا، لـە (قنسرین) (زەفـەری کـوڕی حارسـی کیلابی) و لە (فەلەستین) (نائیلی کوڕی قەیس) بەیعـەتیان پێدا، (ڕوحـی کـوڕی زنبـاعی جەزامی) لێی هەڵگەڕایەوە و بەیعەتی پێ نەدا، لە شامیش کـەس لـەژێر بەیعـەتی (ئیبن زوبێر) نەچوویە دەرەوە ناوچەی (بەلقا ) نەبێت، بەتایبەت لەناویاندا (حسان کوڕی مالك کوڕی بەحدەلی کەلبی) دانی بە خەلافەتەکەیدا نەنا.

سەرچاوەکان کۆکن لەسەر ئەوەی کە گشت ناوچەکان شوێن خەلافـەتی ئیبن زوبێـری خەلیفەی موسوڵمانان کەوتن و بەیعەتیان پێدا، لەبەر ئەوە زۆرێك لـە زانـا و مێژوونوسان دانیان بەوەدا ناوە کە بەیعەتدان بە ئیبن زوبێر بەیعەتێکی شەرعی بووە و ئەو لەپێشتر بووە کـە ببێتـە خەلیفـە وەك مـەروانی کـوڕی حەکـەم، (ئیبن عبدالبر ) لـە (مالك)ەوە دەگێڕێتەوە کە ووتوویەتی : ئیبن زوبێر باشتر بـووە لـە مـەروان و لەبـەرتر بـووە لـەو و لەکوڕەکەشی عبدالملك بۆ جێنشینایەتی.

(ئیبن کثیر) دەفەرموێت: (ئیبن زوبێر) پاش مردنی (معاویەی کوڕی یەزید) پێشـەوایە و گومانی تێدا نیە، ئەو لەپێشتر و پێگەیشتووتر بـووە لـە (مـەروانی کـوڕی حەکـەم) کە دژایەتی ئیبن زوبێری کرد ئەگەرچی هـەمووان قسـەیان یـەك خست لەسـەری و هـەمووان بەیعەتیان پێدا لە دوور و نزیك.

هەریەك لە (ئیبن حەزەم) و (سیوطی)ش جەخت لەسەر شەرعی بـوونی ئیبن زوبێـر دەکەنەوە و مەروانی کوڕی حەکەم و کوڕەکەشی بە زۆردار و بە هەڵگەڕاوە لە خەلافـەتی ئیبن زوبێر دادەنێن، هەروەها پێشەوا (زەهـەبی) شـەرعیەت بـە ئیبن زوبێـر دەدات و بە ئەمیری بڕواداران دادەنێت.

خەڵکی حیجاز هەڵپەیان کرد بۆ بەیعەت دان بە ئیبن زوبێر، (ئیبن سەعد) دەیگێڕێتەوە کە لەیەکەمینەکانی ئەوانەی بەپەلە بەیعەتیان دا بە ئیبن زوبێر (عبداللەی کوڕی موطیعی عەدەوی)، ( عبداللەی کوڕی رضوانی کوڕی ئومەییەی جەمەحی) و (حارسی کوڕی عبداللەی کوڕی ئەبی رەبیعە) و( عوبەیدی کوڕی عومەیر) و (عوبەیدوڵای کوڕی عەلی کوڕی ئەبو تالیب) و (عبداللەی کوڕی جەعفەر) بوون.

هەندێکیش هەبوون ڕێگریان کرد لە خەلافەتی ئیبن زوبێر و لەسەرو هەموویانەوە ئەم سێ کەسایەتیە بوون:(عبدالله کوڕی عومەری کوڕی خەتتاب) و (ئیبن عەباس) و (محمدی ئیبن حەنەفیە)[1].

بەڵام عبداللەی کوڕی عومەر بەیعەتی دا بە یەزید بۆ خەلافەت و پابەند بوو بە بەیعەتەکەیەوە و هەوڵیدا ئیبن زوبێریش قایل بکات، قەدەغەی کرد ئاژاوە هەڵبگیرسێنێت و لە جێنشینایەتی یەزید هەڵبگەڕێتەوە، پاش مردنی معاویەی کوڕی یەزید بەیعەت درا بە ئیبن زوبێر بۆ جێنشینی و داوای کرد لە ئیبن عومەر بەیعەتی پێبدا ئەویش پەرچی کردەوە بە بیانوی ئەوەی: من دەستم ناخەمە دەستی کەمێك و تایشیگێڕمەوە لەکۆمەڵەیەك (واتە من لەگەڵ زۆرینەدام ، هەرکەس زۆرینە بەیعەتیان پێدا ئەوا منیش لەگەڵ ئەوم). ئیبن زوبێریش هەوڵی ئەدا ئیبن عومەر ناچار بکات لەسەر بەیعەت پێداتی.

قایل نەبوونی ئیبن عومەر لەسەر بەیعەت دان بە ئیبن زوبێر کاریگەرییەکی نەرێنی هەبوو، چونکە ئیبن عومەر پێگەیەکی بەرزی هەبوو بەتایبەت لە حیجازدا و کاریگەرییەکەی لەسەر خەڵکی بە قایل نەبوونی لەسەر بەیعەت دان وای لە هەندێك کرد لاسایی بکەنەوە و هەمان هەڵوێست بگرنە بەر، ئەوەشی لە کاریگەریە نەرێنیەکەی زیاتر کرد لەسەر جموجوڵەکەی ئیبن زوبێر ئەوەبوو کە ئیبن عومەر ئەو کەسانەی کەئەم هەبوو بەسەریاندا ناچاری دەکردن هەمان هەڵوێستی ئەو بگرنە بەر، بەڵام لەگەڵ هەموو

---

[1] . کوڕی ئیمامی عەلیە لە ئافرەتێکەوە کە لە (بەنی حەنەفی)ە، لەبەر ئەوە پێی دەوترا (ئیبن حەنەفیە).

ئەمەشدا ئیبن عومەر مەترسیەکی ڕاستەقینە نەبوو لەسەر ئیبن زوبێر چونکە ئەو تەما و کەلکەڵەی دەسەڵات و خەلافەت لەسەریدا نەبوو.

هەرچی عبداللەی کوڕی عەباسە هەڵوێستی جیاواز بوو لە هەڵوێستی ئیبن عومەر لە بەرامبەر ئەو فیتنە و ئاژاوەیەی کەئەو سەردەمەکەی تێ کەوتبوو، لە هەر دوو ڕوداوی (جەمەل) و (صەفین)دا لەگەڵ ئیمامدا بوو، کاتێک ئەمەویەکان هاتنە سەر حوکم و معاویەی کوڕی یەزید کرایە خەلیفە، ئیبن عەباس دەستپێشخەری کرد لە بەیعەت پێدانیدا و پابەندبوو پێیەوە، بەڵام دوژمنایەتیشی دژی ئیبن زوبێر ئاشکرا نەکرد، پەیوەندی نێوان ئەو دووانە دەستی بە چوونە ناوەوە بۆ قۆناغێکی نوێ کرد پاش کۆچی دوایی یەزیدی کوڕی معاویە، بەیعەت درا بە ئیبن زوبێر، ئینجا ساڵی ٦٤ك لە کۆبوونەوەی ئەمەویەکاندا کە مەروانی کوڕی حەکەم هەڵبژێردرا وەك جێنشین، ئیبن زوبێر داوای کرد لە محمدی کوڕی حەنەفیە و ئیبن عەباس بەیعەتی پێ بدەت، وتیان: هەتا گشت وڵاتان لەدەورت خڕدەبنەوە و خەڵکی یەك دەنگ نەبن لەسەرت بەیعەت نادەین.

ئیبن زوبێر هەوڵی ئەدا لەسەرەتادا ناچاریان بکات لەسەر بەیعەت دان و پەیوەندی نێوان ئیبن زوبێر و ئیبن عەباس دەستی بە باشبوون کرد، ئەوە لە چەندین گێڕانەوەدا هەستی پێدەکرێت کە ئاماژەیە بۆ هەستی ئیبن عەباس بەرامبەر ئیبن زوبێر و پشتگیریکردنی لەمەندێك لە هەڵوێستەکانیدا، یان لە ستایشی ڕاستەوخۆیدا بۆ ئەو و ئەوەی کە شیاوی بووە.

عبدالرزاق لە پەرتوکەکەیدا بەناوی (مصنف) دەگێڕێتەوە کە ئیبن عەباس (قازی) دادوەری ئیبن زوبێر بووە لە مەککە، دواتر ئیبن عەباس چوو بۆ (تائیف) و لەوێ مایەوە هەتا کۆچی دوایی کرد، ئیبن عەباس زۆرجار ستایشی ئیبن زوبێری دەکرد، کاتێك باسی ئەوی لا دەکرا دەیگوت ئەو قورئانی خودا دەخوێنێتەوە، لە ئیسلامەکەیدا باوکی ناوی زوبێرە، دایکیشی ئەسمایە باپیری ئەبوبەکرە و پوری لە باوکەوە خەدیجەیە و پوری لەدایکەوە عائشەیە و داپیرەشی صەفیەیە.

محمدی ئیبن حەنەفیە[1]، پاش مردنی یەزید بڕیاری دا کە بەیعەت بە کەس نەدا مەگەر لە حاڵەتی کۆدەنگی خەڵك لەسەری، ئیبن زوبێر لەسەرەتادا هەوڵی ئەدا ئیبن حەنەفیە ناچار بکات لەسەر بەیعەت پێدان، بەڵام بەردەوامیش ئەبوو لەسەر سیاسەتی نەرمونیانیانانەی لەگەڵ ئیبن حەنەفیەدا، پاش ئەوەی پێگە و پلەی بەرزبوویەوە و بەیعەتی شار و ئاوەدانیەکانی بۆمات و خەریك بوو ئوممەت لەسەری کۆدەنگ بن هەستی کرد کاتی ئەوە هاتووە ئیبن حەنەفیە بەیعەتی پێ بدات لەسەر بەڵێنەکەی خۆی، ئەوە بوو جارێکی تر بانگێشتی کرد بۆ بەیعەت پێدانی ساڵی ٦٥ك، بەڵام ئیبن حەنەفیە ڕازی نەبوو بەیعەتی پێ بدات و ئیبن زوبێریش لە مەککە بەندی کرد.

وادەرەکەوێت ئیبن زوبێر ترساوە لە بانگکردنی (مختاری کوڕی ئەبی عوبەیدی سەقەفی) لەکوفە، ئەگەرچی مختارە یەکێك بووە لە توندترین بەرگریکاران لە ئیبن زوبێر ئەو ڕۆژانەی کە لە مەککە گەمارۆ درابوو ساڵی ٦٤ك لەلایەن سوپای (حصین کوڕی نمیر)ەوە، بەڵام تەمای بەرزی بۆ پلە و پایە هەبووە و فێڵباز و زۆرزان بووە بۆیە ئیبن زوبێریش بانگی نەکردووە بۆلای خۆی.

توانی لەڕێی بانگەشەی ئەوەی کەگوایا پشتیوان و سەرخەری ئالوبەیتە و بەرزکردنەوەی دروشمی سەندنەوەی خوێنی حسین کۆمەڵێك پشتیوان و هەوادار و ئەوانەشی ڕقیان لە حوکمی بەنی ئومەییە بوو لەدەوری خۆی کۆبکاتەوە، هەروەها توانی دەستبگرێت بەسەر کوفەدا.

مختار بەوەی زانی بوو کە لەنێوان ئیبن زوبێر و ئیبن حەنەفیەدا ڕویدابوو، بانگەشەی ئەوەی دەکرد گوایا ئەو لایەنگری محمدی کوڕی حەنەفیەیە بۆ تۆڵەسەندنەوەی خوێنی حسین، بەڵام ئیبن حەنەفیە خۆی بێ بەری کرد لە مختار و نکۆڵی کرد کە ئەو ناردبێتی بۆ عێراق، موختار ساڵی ٦٦ك لە بۆنەی حەج دا سوپایەکی نارد بۆ مەککە بۆ دەرهێنانی

---

[1]. محمدی کوڕی حەنەفیە محمدی کوڕی ئیمامی عەلیە – ڕەزای خوای لێبێت – لە ژنێکی ترەوە نەك خاتو فاتیمەی کچی محمد پێغەمبەر – درودی خوای لێبێت –، ئەم ژنەیانی پاش وەفاتی خاتو فاتیمە هێنا، بۆیە پێی دەوترا (ئیبن حەنەفیە) چونکە دایکی سەر بەهۆزی (بەنی حەنەفیە) بوو.

ئیبن حەنەفیە لە بەندیخانە، ئیبن حەنەفیە نەهی کرد لە سوپاکە کە شەڕ بکەن لەگەڵ ئیبن زوبێردا بەهۆی ئەوەی ڕەوا نیە (حەڵاڵ)نیە شەڕ لە حەرەمی مەککەدا بکرێت.

ئیبن زوبێر هەستی کرد کە سەرچاوەی هێزی ئیبن حەنەفیە خۆی حەشارداوە لە پاڵپشتیکردنی مختاری کوڕی ئەبی عوبەیدەدا بۆی، لەبەر ئەوە بیری کردەوە موختار لەناو ببات، هەربۆیە (مصعەب)برای کە فەرمانڕەوای بەصرە بوو نارد و فەرمانی پێکرد شەڕبکات لەگەڵ مختار دا.

موصعەبی کوڕی زوبێر توانی لە ڕەمەزانی ساڵی ٦٧ك دا موختار لەناو ببات.

ئیبن سەعد دەگێڕێتەوە کە: ئیبن زوبێر برایەکی خۆی کەناوی (عوروە) بوو نارد بۆلای ئیبن حەنەفیە تا داوای لێ بکات بەیعەتی پێ بدات و هەڕەشەی شەڕی لێکرد ئەگەر سووربێت لەسەر پەرچکردنەوەی بەیعەت، لەم هەڕەشەیە و فشارەکانی ئیبن زوبێردا دەرفەتێك بۆ ئیبن حەنەفیە و دەربازگەیەکی بۆ هەڵکەوت ئەویش بریتی بوو لە بانگێشتکردنی لەلایەن عبدالملکی کوڕی مەروانەوە بۆئەوەی بچێت شام، دەستبەجێ ئەم دەرفەتەی قۆستەوە و ڕوی کردە شام بەخۆیی و شوێنکەوتوانیەوە، هەروەها ناوچەی (بەئیلە)یان هەڵبژارد، ئەم شارە ئەگەرچی لە وڵاتی شام بوو ناوچەی هێز و دەسەڵاتی عبدالملکی کوڕی مەروان بوو کەچی لەهەر چوارلایەوە بەرەو حیجاز ناوچەیەکی دووربوو لە دەسەڵاتی هەردووکیانەوە.

بەڵام دواتر عبدالملك کوڕی مەروان پێشنیازی بەیعەتدانی بۆکرد لەبەرامبەر ماڵ و سامان و هەندێك خەڵات و بەخشیندا یان دەرچوون لە وڵاتی شام، ئیبن حەنەفیەش بەیعەت نەدانی هەڵبژارد و ویستی بگەڕێتەوە بۆ مەککە بەڵام ئیبن زوبێر نەیهێشت بێتەوە ناوی، ئیدی ڕوی کردە (تائیف) و دەشڵێن ڕوی کردۆتە (مەدینە) و لەوێ مایەوە هەتا ئەو کاتی کە ئیبن زوبێر کوژرا لەلایەن حەجاجی کوڕی یوسفی سەقەفیەوە ساڵی ٧٣ك.

بەڵام (خەواریجەکان) لەسەرەتادا ڕێککەوتبوون لەگەڵ ئیبن زوبێردا کە بەرگری لە مەککە بکەن هەتا کۆچی دوایی یەزید، ئینجا کاتێك مەترسیەکە نەما سەرۆکەکەیان چوویە مەککەوە و ویستیان بیروبۆچوونی ئیبن زوبێر بزانن سەبارەت بە (عوسمانی کوڕی

عەفان – ڕەزای خوای لێبێت – ) ئەویش وەڵامێکی داتەوە کە بەدڵی ئەوان نەبوو، ئەوەی پێی وەصف دەکرا لە باوەڕ و ڕاستگۆیی و دادگەری و چاکەکاری و سەرگوزەشتەی باش و گەڕانەوە بۆ حەق و ڕاستی خستیە ڕوو، ئەوکاتە پشتیان تێکرد و لێی جیابوونەوە و دەستیان گرت بەسەر زۆێك لە شار و وڵاتەکاندا، بۆ شەڕکردنیش لەگەڵیان (مهلب کوڕی ئەبی صفرە) کرابوویە فەرماندە، ئیبن زوبێر فەرمانی کرد شەڕکردن لەگەڵیان لە ئەستۆ بگرێ، ئەویش فەرمانەکەی بەجێ گەیاند، سەرکردەی هەڵگەڕاوەکانی ئەزاریقە (نافیعی کوڕی ئەزرەق) بوو، کە (مهلب کوڕی ئەبی صفرە) توانی تێکیان بشکێنێت و فەرماندەکەشیان (نافیعی کوڕی ئەزرەق) بکوژێت و هەڵگەڕاوەکانیش تێکشکان بەرەو وڵاتی فارس.

بەڵام لە شامدا مەروانی کوڕی حەکەم پاش ئەوەی بوویە سەرۆکی ئۆپۆزسیۆنی ئەمەوییەکان، دەستی کرد بە یەکخستنەوەی ڕیزەکانی و چوونە نێو بەربەرەکانێی ئیبن زوبێرەوە، مەروان بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی ئیبن زوبێر لە حیجازەوە دەستی پێنەکرد ، بەڵکو سەرەتا لە هەرێمە دوورەکانەوە دەستی پێکرد، ئەوەش بۆئەوەی سەرەتا دەسەڵات و هێز و هەژموونی ئیبن زوبێر کەم بکاتەوە و دواتریش لەناوبردنی ئاسانتر دەبێت بۆی ، مەروانی کوڕی حەکەم وەك پێشتر ئاماژەمان پێکرد پاش بەستنی (کۆنگرەی جابیە)ی خەڵکی شام و ڕێککەوتنی ئەمەوییەکان لەسەری وەك جێنشینێك هاتە سەر تەخت، بەمەرجی ئەوەی (خالیدی کوڕی یەزید) وەلی عەهدی بێت (جێگرەوەی بێت).

ئەردەن وەك مەڵبەندی (کەلبییەکان) لەسەر دڵسۆزیی و پشتگیرییان بۆ خانەوادەی ئەمەوی مانەوە ، هەندێك لە گەورەکانی شامیش سووربوون لەسەر ئەوەی کە خەلافەت هەر لەشام بێت نەك جێگەیەکی تر، تەنانەت (حصین کوڕی نمیر) بەیعەتدانی خۆی بە ئیبن زوبێر دەربڕی بەمەرجێك بیگوازێتەوە بۆ شام، ئەوەش پاش کۆچی دوایی یەزیدی کوڕی معاویە.

(قیسیەکان)یش لە باکوری شام بەیعەتیان دایە ئیبن زوبێر، هێزی (قیسیەکان) زیادی کرد بە یەکگرتنی (ضحاکی کوڕی قەیسی فەهری) لەگەڵیاندا، زەحاك ئەو کەسە بوو کە

لە سەردەمی معاویە و (یەزید)ی کوڕیشیدا خزمەتی هەبوو، ئەو کاتە سەرپەرشتی کاروبارەکانی دیمەشقی دەکرد لەدوای کۆچی دوایی معاویەی دووەمەوە.

لە (جابیە)دا (کەلبیەکان) کۆنگرەی خۆیان بەست و پرس و ڕاوێژیان کرد لەسەر بەیعەت و خەلافەت، کۆنگرەی جابیە کۆنگرەیەکی مێژوویی بوو کەسایەتیە پێگەدار و بەهێز و خاوەن ڕا و بۆچونەکانی خەڵکی شام ئامادەی بوون، ئەو کەسانەی بانگهێشتی ئەو کۆبوونەوەیە دەکران کەسانی کاریگەر و خاوەن بڕیاری چارەنوسساز بوون و دەبایە خەڵکی شام ڕەزامەندبوونایە لەسەریان.

کاتێك باڵەکەی (مەروانی کوڕی حەکەم) سەری گرت چەند هۆکارێکی هەبوو، یەکێ لەو هۆکارانە لەو بۆچونەدایە کە (روح کوڕی زنباعی جوزامی) وێنای دەکات و دەڵێت: ئەی خەڵکینە ئێوە لەبیرتانە (عبدالله) کوڕی (عومەر کوڕی خەتاب)ی هاوڕێی خۆشەویستی پێغەمبەری خوایە - درودی خوای لێبێت - دەشزانن کە چ کاریگەریی و هێزێکی بەخشی بە ئیسلام کاتێك هاتە ناو ئیسلامەوە، بەڵام (عبدالله)ی کوڕی پیاوێکی لاوازە و کەسی لاوازیش کاروباری ئوممەتی محمدی پێ بەڕێ ناکرێت، ئەوەشی خەڵکی باسی دەکەن لەبارەی (عبداللەی کوڕی زوبێر)ەوە و بانگەشەی بۆ دەکەن لە کاروفرمانی، ئەوە بەخوا ئەو کوڕی زوبێری هاوەڵی پێغەمبەری خودایە و کوڕی ئەسمای کچی ئەبوبەکری صدیقە، زۆریش دەزانن لەبارەی جێ دەستی لەباشە و چاکەدا، بەڵام ئیبن زوبێر (دووڕووە) دوو خەلیفەی لە خەلیفایەتی لابرد، کە یەزید و معاویەی کوڕی یەزید بوون، خوێنی ڕشت، یەکڕیزی موسوڵمانانی تێکدا، کەسی دووڕووش نابێت کاروباری ئوممەتی محمد بگرێتە دەست.

بەڵام سوێند بەخوا مەروانی کوڕی حەکەم هەر درز و کەلێنێك کەوتبێتە ناو ئیسلامەوە مەروانی کوڕی حەکەم ئەو درزەی چاك کردۆتەوە، ئەو بوو کە لە شەڕی (یوم الدار)دا بەرگری لە (عوسمانی کوڕی عەفان) کرد، هەروەها بەرگری لە (علی کوڕی ئەبو تالیب)

کرد لە شەڕی (جمل) دا، بۆیە ئێمە پێمان باشە خەڵکی بەیعەت بەپیاوی گەورە بدەن هانی بچوکیش بدەن و بەرزی بکەنەوە[1].

ئەوەبوو دەنگی خەڵك یەکی گرت لەسەر ئەوەی کە بەیعەت بە (مەروان) بدەن و دوای ئەویش (خالیدی کوڕی یەزید) و دواتریش (عەمری کوڕی سەعیدی کوڕی عاص) ببنە جێگرەوە، ئەم هاوسەنگ کردنە وایکرد کە هەموو بیروبۆچونەکان کۆبکاتەوە و هەموان ڕازی ببن، مشتومڕ و گفتوگۆیەکی زۆر کرا و ژمارەیەك لە گەورەی هۆزەکان و سەرکردەکانی بەنی ئومەییە ئامادەبوون، لەو گەورە سەردارانەش (حسان کوڕی مالك کوڕی بەحدەلی کەلبی) و (حصین کوڕی نمیری سکونی) و (ڕوح کوڕی زنباعی جوزامی) و (مالکی کوڕی هوبەیرەی سکونی) و (عبداللەی کوڕی مەسعەدەی فەزاری) و ( عبداللەی کوڕی عوضاتی ئەشعەری) و بێجگە لەوانیش لە کەسایەتیە کاریگەرەکان و بەرهەڵستکارانی ئیبن زوبێر، چەندین بیر و بۆچون ئاڵوگۆڕیان پێکرا تاکو بیروڕای هەمووان لەسەر مەروانی کوڕی حەکەم جێگیر بوو.

بەلام هێشتا عبداللەی کوڕی زوبێر وەك خەلیفەیەکی بەهێز جڵەوی زۆرێك لە ناوچەکانی کردبوو و دەستی گرتبوو بەسەر زۆربەی ولاتانی ئیسلامیدا جگە لە شام و میصر، خەلافەتیش تەنها پاش کوشتنی ئەو کەوتە دەستی بەنی ئومەییە.

ئەگەر چی کۆنگرەی جابیە بوویە هۆی گواستنەوەی خەلافەتی ئەمەوی لە باڵ و ماڵی سوفیانیەوە بۆ باڵی مەروانی، چونکە بەیعەت درایە مەروان، کە ئەوەش هەنگاوێکی کاریگەر و یەکلاییکەرەوە بوو، بەلام هەرواش ئاسان نەبوو هێشتا چەندین ئاستەنگ و بەربەستی گەورە و کێشە و گرفت و شەڕ لەبەردەم (مەروان)دا بوو لەلایەن نەیارەکانیەوە، وەك (ضحاکی کوڕی قەیس) گەورەی (قیسیەکان) کە پشتیوانی ئیبن زوبێر بوو، دوای ئەو ڕوداوە چوو بۆ مێرگ و پێدەشتی (راهط) و (نوعمانی کوڕی بەشیری ئەنصاری) هاتە ڕیزەکانیەوە، دواتر چوو بۆ حیمص و (زەفەری کوڕی حارسی کیلابی)

---

[1]. مەبەستی لە گەورە (مەروانی کوڕی حەکەم)ە و لە بچوکیش (خالدی کوڕی یەزیدی کوڕی معاویە)یە.

هاتە ریزیەوە کە ئەمیری (قنسرین)بوو، ئاشکرابوو کە ئەوان خۆیان ئامادە دەکەن بۆئەوەی ڕووبەڕووی ئەمەویەکان ببنەوە، پێویست بوو لەسەر مەروانیش کە بیسەلمێنێت ئەو پیاوی بەرپرسیارێتیە و هەلگری باری خەلافەتە و بەرگری لێدەکات، ئەوەبوو پشتیوانانی مەروان یەکەمین سەرکەوتنیان بۆ خۆیان بەدەستهێنا بە دەستگرتن بەسەر دیمەشقدا و دەرکردنی دەستوپێوەندی زەحاك لێی.

پاشان مەروان هەستا بە تەیارکردنی پشتیوانەکانی لە هۆز و تیرەکانی (کەلب و غەسان و سەکاسك و سکون)ی یەمەنی لە شامدا، (عەمری کوڕی سەعید)ی کردە دەستە ڕاستی خۆی و (عوبەیدوڵا کوڕی زیاد)یشی کردە دەستە چەپی، پاشان ڕوی کردە مێرگی (راهط) و شەڕێکی گەرم ڕوویدا، ئەم شەڕە دۆخەکەی لە شام بۆ بەنی ئومەییە و بەتایبەتیش مەروان یەکلاکردەوە، بەجۆرێك (قیسیەکان) کە پشتیوانی ئیبن زوبێر بوون تێکشکان ، هەروەها (زەحاکی کوڕی قەیس) و ژمارەیەکی زۆریش لە گەورەپیاوانی (قەیس) لە شام کوژران، شایانی باسە ئەم شەڕە لە کۆتایی ساڵی ٦٤کۆچیدا بوو و ماوەی نزیکەی بیست ڕۆژی خایاند.

ئەم شەڕە خاوەندارێتی و دەسەڵاتی گێڕایەوە بۆ بەنی ئومەییە پاش ئەوەی مەترسی ڕوخان و لەناوچونی لەسەربوو، هەروەها دەسەڵات لە باڵی سوفیانیەوە چوویە دەست باڵی مەروانی.

ئینجا ئەمەویەکان ڕزگاریان بوو لە (زەحاکی کوڕی قەیس) کە بە ئۆپۆزسیۆنێکی بەهێز دادەنرا بەرامبەر ئەمەویەکان و شوێنکەوتوویەکی ئەلقەلەگوێ و دڵسۆز بوو بۆ ئیبن زوبێر[1].

(قنسرین) کەوتە دەستی ئەمەویەکان و (زەفەری کوڕی حارس) کە فەرمانڕەوای ئەوێ بوو هەڵات بۆ (قەرقیسیا) کە (عیاضی حارسیی) فەرمانڕەوای بوو.

(فەلەستین) کەوتە دەستی ئەمەویەکان.

---

١ . سەیری (الكامل في التأريخ)ی (ابن أثير) بکە.

(حیمص) کەوتە دەستی ئەمەویەکان و (نوعمانی کوڕی بەشیر)ی فەرمانڕەوای ئەوێ کوژرا، کە یەکێك بوو لە کاریەدەستەکانی ئیبن زوبێر.

سەرکەوتنی مەروان لە شەڕی (مێرگی راهط) دا وای کرد دارشتنەوەی دەوڵەتەکەی لە شامدا بۆ ئاسان بکات و هێزی بەسەریدا بشکێت، هەروەها وایکرد هەنگاوەکانی دواتریشی بەرەو میصر بۆ سەندنەوەی لە دەستی ئیبن زوبێر و دەست بەسەرداگرتنی کارێکی قورس نەبێت.

پاشان مەروان بەخۆی و سوپایەکەوە بەڕێکەوتن بەرەو مصر، (عەمری کوڕی سەعید) و (خالیدی کوڕی یەزیدی کوڕی معاویە ) و(حسان کوڕی مالیك) و (مالیکی کوڕی هویەیرە ) و (عبدالعزیز)ی کوڕی خۆی لەگەڵیدا بوون، لەنێوان (مەروان) و (ئیبن جەحدەم) دا زنجیرەیەك شەڕ رویدا و مەروان تیایدا سەرکەوت و ئیبن جەحدەم رایکرد، پاشان هاتەوە بۆلای مەروان و داوای لێخۆشبوونی لێکرد بەوەی کە بروات بۆ مەککە، مەروان بەداواکەی رازی بوو لێی خۆش بوو.

بەڵێ مەروان لە سەندنەوەی میصر لە دەستی ئیبن زوبێرد سەرکەوتوو، لە (جەمادی دووەمی) ساڵی ٦٥ك دا، دوو مانگ لە میصر مایەوە بۆ ڕێکخستنەوەی باروذۆخەکان و دڵنیابوون لێی، کاتێك بریاری گەڕانەوەی دا بۆ شام (عبدالعزیز)ی کوڕی کردە والی و فەرمانڕەوای ئەوێ.

پاش ئەم سەرکەوتنانە مەروان پەشیمان بوویەوە لە ڕێککەوتنەکەی جابیە، بەیعەتی بۆ دوو کوڕەکەی خۆی (عبدالملك کوڕی مەروان) و (عبدالعزیز کوڕی مەروان) وەرگرت، وەك بەرجەستەکردنی ڕێبازی میراتگریی، ئەوەش پێش مردنی بوو بە کەمتر لە دوو مانگ و پاش سەرکەوتنی لە گێڕانەوەی میصر دا بۆ ژێر فەرمانڕەوایەتی ئەمەویەکان.

مەروانی کوڕی حەکەم لە دیمەشق ساڵی ٦٥ك لە تەمەنی نزیکەی شەست و سێ ساڵیدا کۆچی دوایی کرد و کوڕەکەی بەناوی (عبدالملك) لەپاش ئەو چووە سەر تەخت.

## عەبدولەلیکی کوڕی مەروان و
## دووبارە داڕشتنەوەی دەوڵەتی ئەمەوی

(عەبدولمەلیك) کوڕی (مەروان)ی کوڕی (حەکەم)ی کوڕی (ئەبی عاص)ی کوڕی (ئومەییە)ی کوڕی (ئەبو وەلید)ی ئەمەویە و دایکیشی (عائیشە)ی کچی (معاویە)ی کوڕی (مغیرە)ی کوڕی (ئەبی عاصی) کوڕی (ئومەییە) یە.

لەدایك بوونی ئەم و (یەزیدی کوڕی معاویە) لە ساڵی ٢٦ك دا بوو، عەبدولمەلیك پێش گرتنە دەستی خەلافەت یەکێك بوو لە خواپەرستە لەخواترسە زانا و فەقیهەکان و زۆر هۆگری مزگەوت بوو.

(نافیع) دەڵێت: ((وامدەزانی لە مەدینە گەنجێك بوونی نیە لە عەبدولمەلیك چوست و چالاکتر و زیرەکتر لە فیقهدا و زۆر خوێنتر لە قورئانی پیرۆزدا))، هەروەها(ئەعمەش) لە (ئەبی زەناد)ەوە دەڵێت: فەقیهەکانی مەدینە چوار بوون: (سەعیدی کوڕی موسەییەب)، (عوروە و قبیصة کوڕی ذۆیب) و (عبدالملك) پێش ئەوەی بچێتە دەسەلاتەوە.

دەگێڕنەوە کە ئیبن عومەر فەرمویەتی: ((خەڵکی منالیان خستەوە و مەروانیش باوك)) ، واتە ئەو لەتەمەنی خۆی گەورەتر بووە ، مەبەستی ژیری و گەورەیی عەبدولمەلیك بووە.

لە یەحیای کوڕی سەعیدەوە دەگێڕنەوە وتی: یەکەم کەس کە نوێژی لەنێوان نیوەڕۆ و عەسردا کرد عبدالملکی کوڕی مەروان بوو لەگەڵ دوو گەنج، ئینجا سەعیدی کوڕی

**موسەییەب گوتی:** پەرستش بە زۆر نوێژکردن و ڕۆژوو نیە، بەڵکو پەرستش بیرکردنەوە و تێرامانە لە کاروبارەکانی خودا و خۆپاراستنە لە حەرامکراوەکانی خودا.

شەعبی دەڵێت: لەگەڵ هەر کەس دانیشتبێتم فەزڵ و باشەم هەبووە بەسەریدا بێجگە لە (عەبدولمەلیکی کوڕی مەروان) بەجۆرێك هەر فەرمودەیەکم بگوتایە و لەبەرم بووایە ئەو لەمن زیاتری لەلابوو، هەر هۆنراوەیەکم لەبەر بووایە و بمگوتایە ئەو لەمن زیاتری دەگوت.

بەلام هەڵوێستی بەرامبەر ئیبن زوبێر لەپێش ئەوەی خەلافەت بگرێتە دەست ئەوەبوو پەنای دەگرت بەخوا کە خەلیفە سوپا بنێرێت بۆ مەککە بۆ کوشتنی ئیبن زوبێر و یاوەرەکانی چونکە بە تاوانێکی گەورەی دەزانی.

یەحیای غەسانی دەڵێت: کاتێك (موسلیمی کوڕی عەقەبە) کە نازناوی (مسرف[1])ی لێ نرابوو دابەزیە مەدینە ، چوومە مزگەوتی پێغەمبەری خودا – درودی خودای لێبێت – دانیشتم لە تەنیشت عەبدولمەلیکەوە، پێی گووتم: ئایا تۆ لەم سوپایەدای ؟

گوتم : بەڵێ.

گوتی: دایکت ڕۆڵەڕۆت بۆ بکات! ! ئایا دەزانی هاتووی شەڕ لەگەڵ کێ بکەی ؟ یەکەم (لەدایك بوو)ی ئیسلام، کوڕی حەواریەکەی[2] پێغەمبەری خودا، ئەوەی ئەبوبەکری صدیق، صدیق، ئەو کەسەی کە پێغەمبەری خودا مەلاشوی بۆ هێنایەوە، سوێند بەخودا ڕۆژ بێی دەبینی بەڕۆژووە و شەو بێی دەبینی هەستاوە بۆ شەو نوێژ، ئەگەر بێتو خەلکی زەوی هەموو لەدژی خڕبنەوە خودا هەموویان لە ئاگردا ڕۆ دەکات.

بەلام هەڵوێستی لەپاش خەلافەت گۆڕا و سوپایەکی ئامادەکرد بەسەرکردایەتی (حەجاجی کوڕی یوسف) و ناردی بۆ مەککە و ئیبن زوبێری پێ گەمارۆ دا لە کەعبە و

---

[1] . واتە ئەو کەسەی زیادە حۆری یان زیادە خەرجی یان زیادەڕۆیی دەکات لەهەر شتێکدا بەلام بەزۆری بۆ زیادە خەرجیەکە بەکاردێت.

[2] . حەواری: هەرکەسێك هاوەڵی هەڵبژاردە و و شاگرد و پشتگیری پێغەمبەران بێت پێی دەگوترێت (حەواری)، بۆیە بە (زوبێری کوڕی عەوام)یشیان گوتووە حەواری پێغەمبەر چونکە هاوەڵێکی هەڵبژاردە بووە.

مەککەی لەژێر گەمارۆدا هێشتەوە هەتا کوژرانی (عبداللەی کوڕی زوبێر)، ئابەم جۆرەیە حاڵی ماڵ و موڵك و پلە و پایەی دونیا.

یەکەمین ڕوداوی سیاسی کە کاریگەری هەبوو لەسەر ژیانی (عبدالملك)، ئەوکاتە بوو کە تەمەنی دە ساڵ دەبوو، شەهیدکردنی عوسمانی کوڕی عەففانی بینی – ڕەزای خوای لێبێت – ئەم ڕوداوە کاریگەری هەبوو لەسەر سیاسەتی عبدالملك کاتێك فەرمانڕەوایەتی گرتە دەست، لەیەکێك لەوتارەکانیدا دەیوت: ئەی خەڵکینە ئێمە بەرگەی هەموو بارێکی گرانی ئێوە دەگرین تاکو دەبێتە دژەستانەوە و هەڵکوتانە سەر بلندگو ئیدی قسەی خۆمان دەبێت.

یەکەمین پلە و پۆست کە وەری گرت لە دەوڵەتدا، لە سەردەمی معاویەی کوڕی ئەبو سوفیاندا بوو، وەزیری کۆچ و کۆچبەران بوو بەمانای سەردەم، پاش کۆچی دوایی (زەیدی کوڕی ثابت) دادگای مەدینەی گرتە دەست، بەشداری جیهادی کرد و سەرکردایەتی هەڵمەتێکی کرد بۆ خاکی ڕۆم ساڵی ٤٢ك.

هەروەها لەگەڵ (معاویەی کوڕی حودەیج) شەڕی ئەفریقای کرد و ڕای سپارد بە ئازادکردنی (جلولا [1]) لە باکوری ئەفریقا.

هەروەها سەردەمی (یەزید) دا لەبارەی (ئیبن زوبێر)ەوە دەیگوت: ئەمڕۆ لەسەر زەویدا کەسێك نیە باشتربێت لە (ئیبن زوبێر)، هەروەها پەیوەندیشی لەگەڵ (موصعەبی کوڕی زوبێر)دا زۆر باش بوو.

بەڵام لەبارەی ڕۆڵ و کاری سیاسییەوە لەسەردەمی (مەروانی کوڕی حەکەمدا) فەرمانڕەوایەتی فەلەستینی گرتە دەست، ، کاتێکیش لە دیمەشق دەمایەوە لەنزیك باوکیەوە، (ڕوح کوڕی زنباع) وەك جێگری ئەو دەنێردرا بۆ فەلەستین بۆ ئەوەی کاروبارەکان بەڕێوە ببات. بەتایبەت ئەو ماوەیەی کە تیایدا باوکی حوکمی گرتە دەست

---

[1] . جلولا : مەبەست لێی ناوچەیەکە لە وڵاتی (مەغریب) نەك ئەو (جلولا)یەی کە ناحیەیەکی جێ ناکۆکە لە نێوان هەرێمی کوردستان و دەوڵەتی عێراقدا.

دەوڵەتەکەی بە دوژمنی ناوخۆیی و دەرەکی دەورە درابوو ، کاتێك باوکی چوو بۆ ئازادکردنی میسر فەرمانڕەوایەتی دیمەشقی گرتە دەست.

هەندێك لە زانایان لە شام بەیعەتیان بە (عبدالمەلیکی کوڕی مەروان) دا، یەکێك لەو کەسە نزیکانەی کە بەیعەتی پێدا (یەزیدی کوڕی ئەسوەدی جەرەشی) بوو.

عبدالملك ڕوبەڕوی کێشە و گرفت و ئاستەنگی زۆر و بەرەنگاری چەندین شۆڕش بوویەوە کە یەکەمینیان (بزوتنەوەی تۆبەکاران)بوو، ئەم بزوتنەوەیە هەر لەکاتی گرتنە دەستی دەسەلآتەوە لەلایەن عەبدولمەلیکەوە سەریان هەلدا، لەولاشەوە ئاژاوە و ناجێگریی ڕوی لە گشت ولآت کردبوو، پاش مردنی (یەزید) و هەلاتنی (عوبەیدوڵای کوڕی زیاد) پشتیوانانی حسین دەستیان کرد بە پەیوەندیکرن بەیەکتریەوە بە ئامانجی دانانی نەخشەیەك بۆ تۆڵە سەندنەوەی خوێنی حسین بەجۆرێك پاش ئەوەی پشتیان بەردا و بەرگریان لێنەکرد و ئەویش شەهید کرا ئیدی پەشیمان بوونەوە و زۆر بە توندی دانیان نا بە هەڵە و تاوانەکەیاندا.

ڕێگەیەکیان نەدیتەوە ئەم کەمتەرخەمیەیانی پێ قەرەبوو بکەنەوە و تۆبە بکەن لای خودا لەم تاوانە گەورەیە جگە لەتۆڵەسەندنەوەی خوێنی حسین، دەستیان کرد بە بەستنی کۆبوونەوەی یەك لەدوای یەك بەسەرۆکایەتی (سولەیمانی کوڕی صەردی خوزاعی) بۆ قسەکردن لەسەر ڕەوشەکە و ئەو شێوازی کارەی کە پێڕەوی دەکەن لە تۆبەکردن و خۆپاککردنەوەدا.

پاشان دەستیان کرد بە کۆکردنەوەی خەلکی لە (نەخیلە[1]) شوێنی کۆبوونەوەکەیان، مانگی (ڕەبیعی یەکەمی) ساڵی ٦٥ك ئەو کاتە بوو کە دیاریان کردبوو بۆ دەرچوونیان، وێستگەی یەکەم لە کاروانە تۆڵەسێنیەکەیاندا لە (کەربەلا) بوو، گەیشتنە سەر گۆڕی حسین و لەوێ پشویان دا و دەستیان کرد بە گریان و تۆبەیان کرد لەوەی کە پشتیان بەردا، پاش ڕۆژ و شەوێك لە گریان گورەتین و حەماس زۆری بۆ هێنان.

---

[1] . گوندێکە لە میسر لەنزیك پارێزگای (أسیوط).

بۆیە بڕیاریان دا بڕۆن بەرەو شام بۆ بەرەنگاربوونەوەی (عوبەیدوڵای کوڕی زیاد)، گوایا ئەو ئەو پیاوە بووە کە فەرمانی بۆ کوشتنی حسین دەرکرد ، سوپای (تۆبەکاران) دایان بەلای شاری (هیت) دا لە کەناری ڕووباری فورات، پاشان سەرەوژور کەوتن لەگەڵ ڕووبارەکەدا تا گەیشتنە (قەرقیسیا )، ئەم شارە دورترین ناوچە بوو لەم ئاراستەیەوە کە دانی نابوو گەر بەناویش بێت بە بەیعەتی ئیبن زوبێردا، فەرمانڕەوای (قەرقیسیا) (زەفەری کوڕی حارسی کیلابی) پێشوازی کرد لە سوپای (تۆبەکاران) بە گوێڕێتینێکی تایبەتەوە، ئەو دوو کۆمەڵەیە بەرژەوەندیەکی هاوبەش کۆیکردبوونەوە کە بریتی بوو لە شەڕکردن دژ بە ئەمەویەکان، (زەفەر) پێشنیاری کرد کە سوپاکەیان یەک بخەن لەگەڵ پشتیوانانی زوبێردا، کەچی ئەوان پۆزشیان هێنایەوە لە پەسەندکردنی پێشنیارەکەی، هەر ئەوەندەی کە لە شارەکە پێداویستیەکانیان چنگ کەوت ، بەڕێی خۆیاندا ڕۆیشتن.

سوپای (تۆبەکاران) لە (عین الوردة)دا لە خاکی (جەزیرە) لەباکوری ڕۆژئاوای (صەفین)دا ساڵی ٦٥ك گەیشتن بە سوپای ئەمەویەکان، شەڕێکی بەزیانی نابەرابەریان ئەنجامدا بەهۆی کەمی ژمارەیان بە بەراورد لەگەڵ ژمارەی سوپای ئەمەویەکاندا، ئەمە بوویە هۆی لەناوبردنیان و کوژرانی گەورەکانیان بێجگە (ڕوفاعەی کوڕی شەداد) کە بەو پاشماوە کەمەی بەدەستیانەوە مابوو پاشەکشەی کرد بۆ کوفە، (ئیبن کەسیر[1]) – ڕەحمەتی خوای لێبێت– سەرنجی خۆی لەسەر سوپای (تۆبەکاران) داوە و دەفەرموێت: گەر ئەم کۆبوونەوە و بڕیار و سوربوونە پێش گەیشتنی حسین بووایە بەو پلەوپایە ئەوا بەسودتر دەبوو بۆی، هەروەها پشتیوانێکی باشتر دەبوو، لە یەکگرتنیان بۆ پشتیوانی کردنی پاش چوار ساڵ کە تەمەنی (عومەری کوڕی سولەیمانی کوڕی صورەد) ئەو ڕۆژەی کوژرا نەوەد و سێ ساڵ بوو.

ژمارەیان لە چوار هەزار پیاو تێپەڕی نەدەکرد، ئەم شەڕەیان ئەنجامدا بە بڕوایەکی ڕاستگۆیانە و متمانەیەکی پتەو و بوێریەکی بێ وێنەو و ئارامگریەکی لەڕادەبەدەرەوە

---

[1] ابن كثير.

نزی بیست هەزار سەربازی خەڵکی شام زیانێکی زۆریی گیانیشیان پێگەیاندن، بەڵام دواجار تێکشکان و لەناوبران.

پاشان دوای ئەو بزوتنەوەکەی (مختاری کوڕی ئەبو عوبەیدی سەقەفی) باوکیشی فەرماندە (ئەبو عوبەیدی کوڕی مەسعود کوڕی عەمری کوڕی عومەیری کوڕی عەوفی کوڕی عوقدەی سەقەفی) بوو کە لە ژیانی پێغەمبەردا موسوڵمان بوو، عومەری کوڕی خەتاب – خوا لێی ڕازی بێت – کردیە سەرکردەی سوپایەك، غەزای عێراقی کرد، دانانی (پردەکەی ئەبی عوبەید) دەگەڕێتەوە بۆ پرۆژەی ئەم، (مختار) گەورەبوو و پێگەیی، یەکێك بوو لە گەورەپیاوانی (سەقیف) خاوەن ڕا و بۆچوون بوو، زمان پاراو و ئازا و ژیر و فێڵباز بوو.

(مختاری کوڕی ئەبی عوبەیدی سەقەفی) پاش مردنی (یەزیدی کوڕی معاویە) ساڵی ٦٤ك لەسەر شانۆی ڕووداوەکان دەرکەوت، ئەو لەو کەسایەتیانە بوو کە هەوڵی دەدا ڕۆڵێك ببینێت، هەوڵی بۆ دەسەلآت دەدا بەهەر نرخێك بێت، لە دوژمنێکی بەقینی ئالوبەیتەوە بوویە بانگەشەکاری ئەوەی کە خۆشی دەوێن داواکاری خوێنی (حسین)ە، هەر ئەو بوو پێشنیاری کرد بۆ (سەعدی کوڕی مسعودی سەقەفی) مامی کە (حەسەنی کوڕی عەلی) دەستگیر بکات و ڕادەستی معاویەی بکات، تاکو بەوە پلەوپایەیەك بەدەست بێنێت.

پاشان هەوڵی دا پەیوەندی بکات بە (عبداللەی کوڕی زوبێر) و چونە ڕیزەکانیەوە، چەند مەرجێکی بۆ دانا، یەکێك لەوانە ئەوەبوو ئەو یەکەم کەس بێت دەست وەرداتە کاروبارەکانی و کاروبارەکانی بەبێ ئەو ئەنجام نەدات، گەر لەهەر کوێدا بەدیارکەوت پشتی پێ ببەستێت لە گشت کاروبارە گرنگەکانیدا، بەڵام وەڵامێکی لە ئیبن زوبێرەوە دەست نەکەوت، بۆیە کاتی پشێوی و ئاژاوەکان ڕوی کردە کوفە بەبیانوی داواکردنی خوێنی حوسەینەوە – ڕەزای خوای لێبێت –دەیگوت گوایا ئەو ڕاسپاردەی پێیە و لەو بارەیەوە سەرپشککراوە لەلایەن محمدی کوڕی عەلی کوڕی ئەبی تالیبەوە " محمدی

کوڕی حەنەفیە" بەڵام ڕاستی نەدەکرد لەوەدا، بەڵکو بڕیاری دابوو سوار باڵی یارانی عەلی ببێت تاکو بگاتە ئامانجەکەی لە فەرمانڕەوایەتی و دەسەڵاتدا.

هەر بەڕاستی بانگەشەکەشی سەرکەوتنی بەدەست هێنا و نزیکەی دوو هەزار کەس لەدەوری خڕبوونەوە و زۆربەشیان لەگەڵ (سولەیمانی کوڕی صورەد) مانەوە، سەرەنجام شەڕی (عين الوردة) لە بەرژەوەندیی (مختار) یەکلایی بوویەوە بەسەرکردایەتی (شیعە) و هەڵاتوانیش لە شەڕەکە پەنایان هێنا بۆلای ئەم، ئیدی بزوتنەوەکەی بەهێز و شوێنکەوتوانیشی زیاتر بوون.

پاشان سوپاکەی بەهێزتربوو بە هاتنی (ئیبراهیمی کوڕی ئەشتەری نەخەعی) بۆ ناو ڕیزەکانیەوە، کە یەکێك بوو لە سەرکردە و گەورەکانی کوفە، دوای ئەوە لە (عبداللەی کوڕی موطیعی عەدەوی) کە ئەمیری کوفە بوو لەلایەن عبداللەی کوڕی زوبێرەوە دانرابوو ڕاپەڕی ، لەوێ دەری کرد و زاڵ بوو بەسەریدا، بەوەش دەسەڵاتی (مختار) بەهێزتر بوو، خۆی و ئەوەی لەگەڵی بوو لە کوفە کەوتنە شوێن خوێنی (حسین) و تۆڵەکردنەوە لە بکوژانی.

پاشان سوپایەکی ئامادە کرد و (ئیبراهیمی کوڕی ئەشتەری) کردە سەرکردەی، ناردی بۆ بەرەنگاربوونەوەی (عوبەیدوڵای کوڕی زیاد)، لەپاڵ ڕوباری (خازر)دا لەنزیك (موصڵ) پێی گەیشت، سوپاکەی (ئیبن زیاد)ی تێکشکان، ئیبن زیادیش لە گۆڕەپانی جەنگەکەدا کوژرا ساڵی ٦٧ك، موسوڵمانانیش ئەو ڕۆژە زۆر دڵخۆش بوون بە کوژرانی.

موختار کەوتە شوێن بکوژانی حسین و ئەوانەی لە ڕوداوەکەی (کەربەلا)دا بەشداربوون بوون لەلایەن ئیبن زیادەوە، خەڵکێکی زۆری لێ کوشتن، سەری گەورەکانیانی پەڕاند، وەك (عومەری کوڕی سەعدی کوڕی ئەبی وەققاص) سەرکردەی ئەو سوپایەی کە (حسین)یان شەهیدکرد، (شیمری کوڕی ذي الجوشن) سەرکردەی ئەو هەزار کەسەی کە کوشتنی (حسین)یان لەئەستۆ گرت، (سەنانی کوڕی ئەبی ئەنەس) و (خەولەی کوڕی یەزیدی ئەصبەحی) و خەڵکانێکی تر جگە لەوانە، کوژرانی عوبەیدوڵای کوڕی زیاد لە ڕۆژی عاشورای ساڵی شەست و حەوتدا بوو.

پاشان (ئیبراهیمی کوڕی ئەشتەر) سەری (ئیبن زیاد)ی نارد بۆ (موختاری سەقەفی)، بەسەرکەوتنی موختار بەسەر سوپای ئیبن زیاددا هێز و هەژموون و دەسەڵاتی گەورەتر بوو، دەستی گرت بەسەر باکوری عێراق و جەزیرە دا و دەستوپێوەندەکانی دەکردە والی ماوچەکان و باجی دەسەند و ژمارەیەکی زۆر لە (مەوالیەکان[1]) هاتنە ریزیەوە، لەبەر ڕق بوونەوەیان لە بەنی ئومەییە لە لایەك و لەلایەکی ترەوە لەبەر ئەوەی پارە و سامانی ڕژاندبوو بەسەریاندا.

لە عێراقدا وەك ئەوەی دەوڵەتێکی تایبەتی دروست کردبێت لەنێوان دەوڵەتەکەی ئیبن زوبێر لەحیجاز و عەبدولمەلیکی کوڕی مەروان دا لەشام بەدیار کەوت.

پێشبینی دەکرا کۆتایی (موختار) بەدەستی (عبدالملك) بێت کە کوژرانی (ئیبن زیاد) زۆر خەمباری کرد و دیارترین یارمەتیدەرانی بوو، بەڵام عبدالملك لە فێڵدابوو، پەی بەوە بردبوو کە ئیبن زوبێر گەرچی دەرکەوتنی موختار و زاڵبونی بەسەر سوپای عبدالملك دا لەسەرەتادا دڵخۆشی کردبێت بەڵام ڕێی نەدەدا هێزی زیاد بکات و ببێتە مەترسی بۆ دەوڵەتەکەی و لەناوی ببات، بۆیە عبدالملك چاوەڕێی کرد، لێگەڕا (ئیبن زوبێر) ڕووبەڕوی (موختار) ببێتەوە، چونکە سەرەنجامی ڕوبەڕووبوونەوەکە لە بەرژەوەندی ئەم دەبێت، یەکیان دەبێتە هۆی لەناوبردنی ئەوی تریان، ئەوەی کە دەشمێنێتەوە بێهێز و لاواز و ژمارەی کەم بۆتەوە بۆیە ئاسان لەناو دەبرێت، هەر ئەوەش ڕوویدا کە عبدالملك پێشبینی دەکرد، چونکە موختار هەر بەوە وازی نەهێنا کە سەرکەوت بەسەر سوپای عبدالملك و فراوان بوونی دەسەڵاتیدا بەسەر باکوری عێراق و جەزیرەدا بەڵکو دەستی کرد بە خۆ ئامادەکردن بۆ ڕۆیشتن بەرەو بەصرە بۆ سەندنی لە دەستی موصعەبی کوڕی زوبێر، کە کرابووە فەرمانڕەوا بەسەریەوە لەلایەن عبداللەی کوڕی زوبێری برایەوە پاش ئەوەی خەڵکی بەیعەتیان پێدابوو.

---

[1] ئەم دەستەواژەیە لە سەردەمی فەرمانڕەوایەتی ئەمەویەکاندا بەزۆری بەکارهاتووە بۆ ئاماژەکردن بە موسوڵمانانی (نا عەرەب) – واتە خەڵکی وڵاتانی دەرەوەی خاکی عەرەبی – وەك (فارس و ئەفریقی و تورك و کورد)ەکان. ...سەرچاوە: ar.wikipedia.org.

هەردەبووایە پێکدادان ڕوبدات لەنێوان موختار و ئیبن زوبێردا، موصعەبی کوڕی زوبێر بۆخۆی چوو بۆ بەرەنگاربوونەوەی موختار بە سوپایەکی زۆرەوە، لە کوفە گەمارۆی دا و تەنگی پێ هەڵچنی و سەری پەڕاند.

موختار دەیگوت گوایا نیگای بۆدێت لەلای جوبرەئیلەوە.

گوتیان بە ئیبن عومەر: مختار دەڵێت گوایا نیگای بۆ دێت، ئیبن عومەریش فەرمووی: خواگیان ڕاستی فەرمووە: ﴿وَإِنَّ الشَّيَاطِينَ لَيُوحُونَ إِلَى أَوْلِيَائِهِمْ﴾[1].واتە دڵنیابن کە شەیتانەکان شت دەخەنە دڵی لایەنگرەکانیانەوە تا مشتومڕتان لەگەڵ بکەن و بەرگری لە پوچەکانیان بکەن.

لە عەکرەمەوە دەگێڕنەوە فەرموویەتی: چومە لای موختار و میوانداری لێکردم و ڕێزی گرتم و داینیشاندنم هەتا بەڵێنی لێوەرگرتم شەو لای بمێنمەوە، ئینجا پێی وتم: بڕۆ دەرەوە و قسە بۆ خەڵکی بکە.

وتی چومە دەرەوە و پیاوێك هات و گوتی: چی دەڵێی لەبارەی نیگاوە؟ گوتم نیگا دوو جۆرە: خواگیان دەفەرموێت:﴿ بِمَا أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ هَذَا الْقُرْآنَ﴾[2] واتە: بەهۆی ئەم قورئانەی کە نیگامان بۆ دێنێت... هەرئەو خوایەش دەفەرموێت:﴿ وَكَذَلِكَ جَعَلْنَا لِكُلِّ نَبِيٍّ عَدُوّاً شَيَاطِينَ الْإِنْسِ وَالْجِنِّ يُوحِي بَعْضُهُمْ إِلَى بَعْضٍ زُخْرُفَ الْقَوْلِ غُرُوراً﴾[3]. واتە: هەرپەو جۆرە بۆ هەموو پێغەمبەر و ئیماندارێك دوژمنێکمان لە شەیتانەکانی ئادەمیزاد و پەری سازاندووە کە بەردەوام قسەی زل و ڕازاوە دەدەن بەگوێی یەکدا و خۆیان و خەڵکی پێ سەرگەردان و گومڕادەکەن.

وتی: ئینجا نیازیان بوو بمگرن، گوتم: ئێوە و ئەو کارە لەکوێ، من هەم موفتی و هەم میوانیشتانم، ئیدی وازیان لێ هێنام.

---

[1] . الأنعام: ١٢١

[2] .یوسف:٣

[3] .الأنعام :١١٢.

(ئیبن کثیر) فەرمویەتی: زانایان باسیان کردووە کە (الکذاب) ئەو درۆزنەی پێغەمبەر هەواڵی داوە لە سەقیف بەدیارکەوێت بریتیە لە (موختاری کوڕی ئەبی عوبەید)ە، بەڕوکار شیعەگەر بوو، لەناخەوەش جادوگەر بوو، بۆ دەوروبەری خۆی وای پیشان ئەدا کە نیگای بۆ دێت.

دوای ئەم بزوتنەوە و جموجوڵەکەی (عەمری کوڕی سەعیدی کوڕی عاص)ی (ئەشدەق) سەری هەڵدا، کە عبدالملك خۆی بەرەنگاری بوویەوە، هۆکارەکەشی ئەوەبوو کە بڕیارەکانی کۆنگرەی (جابیە) نوسرابوو لەسەر ئەوەی کە خەلافەت پاش (مەروانی کوڕی حەکەم) بۆ (عەمری کوڕی عاصی ئەشدەق) و (خالیدی کوڕی یەزیدی کوڕی معاویە) بێت ، بەڵام (مەروان) (عەمر)ی تێپەڕاند و (عەبدولمەلیك) و (عبدالعزیز)ی کوڕانی خۆی کردە جێگرەوە و جێنشینی خۆی ، ئەوەش بوویە هۆی تورەیی و دروستکردنی هەستی تۆڵەکردنەوە لای (عەمری کوڕی سەعید)، بەپێچەوانەی (خالیدی کوڕی یەزید)ەوە کە ڕوی کردە فێربوون و خوێندنی زانستەکان بەتایبەت زانستی کیمیا.

لەسەرەتای ساڵی ٦٩ك (عبدالملك) بەخۆی و سەربازەکانیەوە ڕووە و (قەرقیسیا) کەوتە ڕێ، تاکو (زەفەری کوڕی حارس) گەمارۆ بدات تیایدا.

(عەمری کوڕی سەعیدی کوڕی ئەبی عاص) کردە جێگری خۆی لە دیمەشق تادێتەوە کاروبارەکان بەڕێوە ببات، هێشتا عبدالملك بە سوپاکەیەوە لە دیمەشق دەرنەچوبوو، عەمری کوڕی سەعید خۆی تیادا قایمکرد و چی ماڵ و سامان هەبوو گرتیە دەست بۆخۆی.

گێڕانەوەیەکی تر باسی کردووە کە (عەمری کوڕی عاص) لەگەڵ (عبدالملك) بوو کاتێك چوو بۆ قەرقیسیا بەڵام شەو دەرفەتەکەی قۆستەوە، خۆی و کۆمەڵەکەی سوپاکەیان جێهێشت و کشانەوە بۆ دیمەشق، ئینجا (عبدالرحمن کوڕی ئوم حەکەمی سەقەفی) فەرمانڕەوای دیمەشق کە لەلایەن (عبدالملك)ەوە دانرابوو هەڵات و (عەمری کوڕی سەعید)یش چوویە ناویەوە و دەستی گرت بەسەر هەموو گەنجینەکانیدا.

عەمر ناردی بەدوای (عبدالرحمنی ئوم حەکەمدا) و نەیدۆزیەوە، ئینجا فەرمانی کرد ماڵەکەی بڕوخێنن، خەڵکی کۆبوونەوە و عەمر چوویە سەر بڵندگۆ و سوپاسی خودا و ستایشی کرد و ئینجا ووتی: ئەی خەڵکینە هەرکەسێکی قورەیشی پێش من هاتبێتە سەر ئەم بڵندگۆیە پێی وابووە کە بەهەشت و دۆزەخی پێیە، هەرکەس گوێڕایەڵی کرد دەچێتە بەهەشت و هەرکەسیش سەرپێچی کرد بۆ ناو دۆزەخە، بەڵام من پێتان ڕادەگەیەنم کە بەهەشت و دۆزەخ بەدەستی خودایە شتێك لەو بارەوە بەدەستی ئێمە نیە دڵدانەوە و دوعای خێر و پاڕانەوە نەبێت.

عبدالملك هەواڵی عەمری کوڕی سەعیدی پرسی لەناو سوپاکەیدا و بەدوایا گەڕا و نەیدۆزیەوە، بیری کردەوە و گەڕایەوە بۆ دیمەشق، بینی (عەمر) خۆی لەناویدا قایم کردووە، ئیدی ئەوەبوو شەڕێکی گەرم کە شانزە ڕۆژ بەردەوام بوو لەنێوانیاندا ڕوویدا، بەڵام عبدالملك بینی بارودۆخی عەمر بەهێزە و خۆی لەناو قەڵایەکی ڕۆمی قایمدا پەناداوە، بۆیە پێشنیازی ئاشتەوایی کرد و پاشان لەسەر ئاگر بەست و وازهێنان لە شەڕ ڕێککەوتن.

سەعیدی کوڕی عاص مەرجی دانا بۆ عبدالملك کە خەلافەت پاش عبدالملك بۆ خۆی بێت، ئەویش وەك عبدالملك دەستوپێوەند و کاربەدەستی هەبێت، لەهەموو ورد و درشتێکدا پرس و ڕاوێژی پێ بکرێت و دادگا و گەنجینەی میریی موسوڵمانان (بیت المال)ی بدرێتێ.

عبدالملك ناچار بوو مەرجەکانی پەسەند بکات، ئەوەش لەبەر دابەشبوونی هۆزی (کەلب)ی خاوەن هێز و کاریگەریی سیاسی لە ڕووداوەکاندا لەو کاتەدا لەنێوان عبدالملك و عەمری کوڕی سەعیدی ئەشدەق دا، وایکرد کە بردنەوەی شەڕەکە بەهۆی هێزەوە ببێتە هۆی زیانی قورس بۆ هەردوولا لە بەرژەوەندی (کەلب) نەبوو کە ئاشتەواییەکەی سەپاند.

سەربازی دەستگرتنی (عەمری ئەشدەق) بەسەر شاری دیمەشقدا کە ئەوکات پایتەخت بوو و گەنجینەی میریی موسوڵمانان و نوسینگەی سەربازانی لێبوو کە ئەو دووانە

دادەنرێن بە دەماری هێز و بەدەستهێنانی پشتیوانی، هەروەها زۆرینەی هۆزە یەمانیەکانی تر لەژیان وەستابوون و خۆیان نەدەخستە ناو ململانێکەوە، ئەمە وای کرد بڕیاری کردەیی بۆ ئاشتەوایی بەدەستی هۆزی (کەلب ) بێت نەك ئەوانی تر.

هێزی عەمری ئەشدەق لە شام و بەتایبەت لە دیمەشق بوو، دیمەشق پشتیوانیان کرد سەرباری سەرکردە (بەجیلە عبداللە کوڕی کەریزی قەسری) کە سەرۆکی قەڕەوڵ و شورتەی دیمەشق بوو.

پاش ئەوەی ئاگر بەست کرا و عبدالملك چووە ناو دیمەشقەوە، دوای چوار ڕۆژ ناردی بەشوێن عەمر دا کە ئامادەبێت لەلای، پاش نیوەڕۆکەی (عەمر) لەژێر جل و بەرگەکەیەوە قەڵغانێکی پۆشی ، شمشێرەکەی کرد بە لاتەنیشتیدا و کاتێك هەستایەوە لەسەر رایەخەکە هەڵنوتا، بۆیە ژنەکەی و هەندێك لەوانەش کە لەدەوروپشتی بوون وتیان: ئێمە بەباشی نازانین بڕۆی بۆ لای (عبدالملك)، چونکە ئەوان لەسەر قسەی خۆیان نین) و گوێ بە پەیمان نادەن ، بەڵام (عەمر) بەگوێی نەکردن و بە سەد پیاو لە پیاوەکانیەوە ڕۆی بۆلای عبدالملك.

عبدالملك فەرمانی بە بەنی مەروان کردبوو کە ئەوانیش ئامادەبن ، هەروەها فەرمانی بە دەرگەوانەکەی کردبوو تەنها ئیبن سەعید بکاتە ژوورەوە بەبێ هاوەڵەکانی و دەرگاکە دابخات، کە دەرگاکان داخران، عەمری کوڕی سەعید لە عبدالملك نزیك بوویەوە، ئەویش بەخێرهاتنی کرد و لەلای خۆی لەسەر تەختەکە دایینیشاند، ماوەیەکی دوورودرێژ قسەی لەگەڵ کرد، پاشان عبدالملك ووتی : ئەی غولام[1]، شمشێرەکەی لێ وەربگرە.

عەمر گوتی: ئەی ئەمیری بڕواداران ئێمە هی خوداین (انا لله).

عبدالملك پێی ووت: ئایا نیازتە لەگەڵم بدوێیت و شمشێریشت لەخۆت توندکردبێت؟ ئینجا خزمەتکارەکە شمشێرەکەی لێ وەرگرت.

بۆ ساتێك دەستیان بە قسە کردەوە و دواتر عبدالملك گوتی ئەی (ئەبو ئومەییە).

---

[1] غلام: خزمەتکار یان نۆکەر.

ووتی سەرم لەڕێتە ئەی ئەمیری بڕواداران.

ووتی: تۆ کاتێك پشتت لە من کرد سوێندم خوارد ئەگەر چاوم پێت کەوتەوە و تۆم بەردەست کەوت ئەوا بەکۆت و بەند و تەوق بتبەستمەوە، بەنی مەروان گووتیان: پاشان ئازادی دەکەیت، عبدالملك گووتی: ئەرێ دواتر ئازادی دەکەم، نیازم نیە کاری خراپی بەسەر بێنم! ئینجا بەنو مەروان گووتیان: سوێندەکەی ئەمیری بڕواداران مەخە، ئەویش گووتی: ئەوا سوێندەکەم نەخستی ئەی ئەمیری بڕواداران.

عبدالملك لەژێر ڕایەخەکەیدا کۆت و بەندێکی دەرهێنا و خستیە بەردەمی، ئینجا بە خزمەتکارەکەی گووت عەمری پێ کۆت بکە، خزمەتکارەش فەرمانەکەی بەجێ هێنا.

ئینجا عەمر گووتی: تۆخوا ئەی ئەمیری بڕواداران لەکۆت و بەندەکە دەرم بکەیتەوە لەپێش چاوی خەڵکی، عبدالملك پێی گووت: ئایا کە مردن هەبێت فێڵ لەپای چی ئەی باوکی ئومەییە؟

پاشان یەك ڕاکێشان ڕای کێشا دەمی دای بە تەختەکەی دا و ددانەکانی پێشەوەی شکا.

ئینجا عەمر گوتی: ئەی ئەمیری بڕواداران چیت بەسەر هێنام خوای گەورە لەوە خراپتر بەسەر تۆ بێنبێت.

عبدالملك گوتی: بەخوا گەر بمزانیبا بمێنیتەوە و بەوەفا دەبی بۆم و قورەیش ئاشت دەکەیتەوە ئەوا بەرم دەدای، بەڵام هەرگیز دوو پیاو کۆنەبوونەتەوە لە شارێکدا وەك ئەوەی ئێمەی تیاین مەگەر یەکیان هاوڕێکەی خۆی دەرکردووە.

لە گێڕانەوەیەکدا هاتووە: کە (عبدالملك) (عبدالعزیز)ی برای ڕاسپاردە بۆ کوشتنی.

پاشان چوو بۆ نوێژی عەسر و کاتێك گەڕایەوە بینی براکەی نەیکوشتووە، بۆیە سەرزەنشتی کرد و جنێوی بە دایکی دا کە دایکی عبدالعزیز دایکی عبدالملك نەبوو، عبدالعزیز ووتی: ((ئاخر ئەو لێم پاڕایەوە و تکای لێکردم))، کە عەمر کوڕی پووری عبدالملکی کوڕی مەروان بوو (پور لە باوکەوە).

پاشان عبدالملك بانگی کرد: خزمەتکار! خەنجەرێکم بۆ بێنە، بۆی هێنا، ئینجا ڕایوەشاند و لێی دا هیچی لێ نەهات، پاشان دانەیەکی تری لێدا هیچی لێ نەهات، ئینجا بەدەستی دای لە باسکی عەمر دەستی بەر قەڵغانەکە کەوت، پێکەنی و گووتی: دیسان قەڵغانیشت پۆشیوە ؟! هۆی خزمەتکار ئەو شمشێرەم بۆ بێنە ، ئەویش بۆی هێنا و پاشان فەرمانی کرد بە عەمر و خۆی دا بەزەویدا، ئینجا لەسەر سنگی دانیشت و سەری بڕی و دەیگوت:

**یا عمرو إن لاتدع شتمي ومنقصتي أضربك حتى تقول الهامة اسقوني**[1]

پاش ئەوەی سەری بڕی (عبدالملك) موچڕکێکی توندی پیاهات بەجۆرێك دایان بەکۆڵیاندا ئینجا توانیان لەسەر سنگی (عەمر) بەرزی بکەنەوە و بیخەنە لەسەر تەختەکەی و دەیگوت: هیچ کوژراوێکم نەبینیوە هاوشێوەی ئەمە بێت، دونیای دەویست و خۆی نەدەدا بەدەست دواڕۆژەوە.

پاشان سەری (عەمر)ی نارد بۆ (عبدالرحمن کوڕی ئوم حەکەم).

ئینجا هێنایە دەرەوە بۆ ناو خەڵکی و فڕێی دایە بەردەستیان، عبدالعزیزی کوڕی مەروان چوویە دەرەوە و بڕێك پارەی لەگەڵ خۆی برد، هەڵی دا بە ناو خەڵکەکە دا ئەوانیش دەستیان کرد بە پڕپیاکردنی، دەوترێت: پاشان پارەکە گەڕێنراوەتەوە بۆ گەنجینەی میریی موسوڵمانان (بیت المال).

بەم جۆرە عبدالملك ڕزگاری بوو لە ڕکابەرێکی بەهێز و گوێشی نەدا بە پەیمان شکاندن و خوێن ڕشتن، وەك چۆن دوای ئەوەش هەمان کاری کرد لەگەڵ (موصعەبی کوڕی زوبێر)ی هاوڕێی و براکەشی (عبداللەی کوڕی زوبێر).

بە تێڕوانین بۆ پشێویە ناوخۆییەکانی دەوڵەتەکەی، عبدالملك ناچاربوو ئاشتەوایی بکات لەگەڵ ڕۆمەکان بەوەی کە ١٦٥ هەزار پارچە ئاڵتون و ٣٦٠ بەندە و ٣٦٠ ئەسپی ڕەسەنیان بداتێ ساڵانە، هەروەها دەوڵەتی بێزەنتی و ئەمەوی داهات و باجی قوبرص و

---

[1] واتە:ئەی عەمر گەر واز لە جنێودان و سوکایەتی پێکردنم نەهێنیت... ئەوا دەدەم لە گەردنت تاکو سەرت دەڵێت ئاوم بدەنێ...

ئەرمینیا بەش بکەن، هەروەها بارمتەیان لێ گل دانەوە لە (بەعلەبەگ) دایان نا، لەبەرامبەر ئەوەشدا پاشای ڕۆم (جەراجیمەکان[1]) بکشێنێتەوە بۆ ناوەندی ئیمپراتۆریەتی بێزەنتی.

عبدالملك ڕێگر نەبوو لە ڕێککەوتن و ئاشتەوایی کرن لەگەڵ (جەراجیمەکان) لە (چیای لوکام)، ڕازی بوو لەسەر ئەوەی کە هەموو هەفتەیەك هەزار دیناریان بداتێ، بەڵام هەر خێرا دەرفەت ڕەخسا بۆ عبدالملك بۆ ڕزگاربوون لە جەراجیمەکان پاش ئەوەی ڕێککەوتنی لەگەڵ کردن، یەکێك لە سەرکردە متمانە پێکراوەکانی خۆی بەناوی (سەحیمی کوڕی موهاجیر)ی نارد بۆلای سەرکردەی بێزەنتیەکان کە سەرۆکی جەراجیمەکانیش بوو لەهەمان کاتدا، تا بوویە جێی متمانەی ئەو سەرکردەیە، دواتر بە لەشکرێکەوە لەپشتەوە ڕژیشت و سەرکردە بێزەنتیەکەی کوشت.

پاش ئەمە داردەستەی بیزەنتیەکە هەڵاتن و ئەوانەشی مانەوە خۆیان دا بەدەستەوە و دەستیان لێنەدرا، ئیدی کۆیلەکان گەڕێنرانەوە بۆ گەورەکانیان و شتومەکەکانیش بۆ خاوەنەکانیان، هەروەها ڕێککەوتنەکە لەگەڵ دەوڵەتی بێزەنتیەکان زۆر درێژەی نەکێشا چونکە ڕۆمەکان پەیمانەکەیان هەڵوەشاندەوە.

(قیس)یە بەرهەڵستکارەکان لە مێرگی (راهط) لەسەر دڵسۆزی و (ولا )یان بۆ ئیبن زوبێر مانەوە ، (زەفەری کوڕی حارسی کیلابی) ڕای کردبوو بۆ قەرقیسیا و لەوێ خۆی شاردەوە و خۆی لەوێ کۆکردەوە بۆ دەسپێکردنی پەلامارەکانی بۆسەر (کەلب) لە ناوچە دراوسێکان دا، کە ئەوە بوویە شەرمەزاری و ئیحراجیەکی زۆر بۆ عبدالملك کە تەمای بوو گشت شار و وڵاتانی ئیسلامی بگێڕێتەوە بۆ ژێر ڕکێفی خۆی، لەم ماوەیەدا هەموو هەوڵی خۆی خستبوویە گەڕ بۆ سەندنەوەی عێراق لەژێر دەستی (موصعەبی کوڕی زوبێر)، بێگومان هەر دەبوایە گەر بیەوێت عێراق بهێنێتەوە ژێر باڵی خۆی و کۆتایی بە دەسەڵاتی زوبێریەکان بێنێت تیایدا ئەوا یاخی بوونی (زەفەری کوڕی حارس) لە (قەرقیسیا) کۆتایی پێ بێنێت.

---

[1] . جەراجیمە: دانیشتوانی دەوروبەری چیای (ئەمانۆس – لوکام)بوون، لەناوچەی نێوان هەردوو دەوڵەتی ئەمەوی و بیزەنتیدا نیشتەجێ بوون

بەو سوپایەیەوە کە ئامادەی کردبوو بۆ بەرەنگاربوونەوەی (موصعەبی کوڕی زوبێر) چوو بۆ قەرقیسیا و گەمارۆی (زەفەر)ی دا، بەڵام پیاوەکانی زەفەر پاڵەوانی و بوێریەکی سەرسوڕهێنیان پیشاندا و فیز و بەخۆنازینی (عبدالملك)یشیان نەهێشت کە دەیگوت: خوای گەورە پیاوانی خراپ و زیانمەند دور ناخاتەوە، سوێند بەخوا کوشتنیان مایەی ناوزڕان و ئابڕوچوونە و وازهێنان لێشیان داخ و پەژارەیە.

(عبدالملك) پەنای برد بۆ ئاشتەوایی و ڕێککەوتن، هەربۆیە پەیامێکی نارد بۆ (زەفەر) و داوای لێکرد گوێڕایەڵی بێت و هەڕەشەی لێکرد ئەگەر پێشنیارەکەی پەسەند نەکات ڕوبەڕوی دەبێتەوە بەتوندی، پاش چەندین هەوڵ و دانوستان (زەفەر) وەڵامی داواکەی دایەوە و مەرجی دانا کە بژاردە لەدەستی خۆیدا بێت لەوەی کە ئایا وەك دڵسۆزێکی ئیبن زوبێر بمێنێتەوە یان بێتە ڕیزی (عەبدولمەلیك)ەوە و ئەویش ڕازی بوو بە مەرجەکەی، (عبدالملك) خۆی و کوڕەکەی و سەرکردەکەی (هوزەیل کوڕی زەفەر) و گشت پێرەوانیانی دڵدەدا و ئاسایشی بۆ دابین کردن، هەر ماڵ و خوێنێکیشیان لابوو وەری نەگرتەوە لێیان.

بەڵکو بڕێك سامان و پارەی دا بە سەرکردەی (قیسیەکان) تا دابەشی بکات بەسەر شوێنکەوتوانیدا، کۆتا کاریشی ئەوەبوو کە (موسلیمە)ی زڕکچی (زەفەری کوڕی حارس)ی هێنا بۆ کوڕەکەی بۆ جەختکردنەوە و دڵنیاکردنەوەی ڕێککەوتنەکەیان لەڕێی ژن و ژنخوازیەوە.

هەروەها (زەفەر) فەرمانی بە (هوزەیل)ی کوڕی کرد کە بچێتە سوپاکەی (عبدالملك)ەوە کە دەڕوات بۆ شەڕی (موصعەبی کوڕی زوبێر)، چونکو ئەو بەیعەتەی کە بە ئیبن زوبێری دا بوو لەسەر خۆی بوو نەك لەسەر کوڕەکەی.

عبدالملك سور بوو لەسەر بەدیهێنانی هاوسەنگیی لەنێوان هۆزە یەمەنی و قیسیەکاندا، ئەمانەی کردە هاوەڵ و یاوەری خۆی: (زەفەری کوڕی حارسی کیلابی) و (هوزەیلی) کوڕی و (کوثرا) و (عبداللەی کوڕی مەسعەدەی فەزاری) و جگە لەوانیش لەسەرکردەکانی (قیس)، هەروەها لە سەرکردە یەمەنیەکانیش ئەمانەی کردە یاوەری خۆی: (حسانی

کوڕی مالیکی کەلبی) و (ڕوحی کوڕی زنباعی جوزامی) و (ڕەجائی کوڕی حەیوەی کەنەدی) و بێجگە لەوانیش.

ڕوبەڕووبوونەوەکە بوویە شتێکی حەتمی و هەر دەبوایە ڕوبدات لەنێوان (عبدالملك) و ڕکابەرەکەیدا لەسەر فەرمانڕەوایەتی (عبداللەی کوڕی زوبێر)، قۆناغی یەکەم ئەوە بوو بۆخۆی دەستی گرت بەسەر عێراق دا و گووتی: کەسێك بەم کارە هەڵدەستێ کە قورەیشیەکی خاوەن ڕا و زانست بێت، ڕەنگە کەس هەبێ ئازا بێ بەڵام ڕاوبۆچون و زانستی نەبێت، بەڵام من چاوکراوەم لەشەڕدا و ئازام بە شمشێر ئەگەر پێویستیم پێی بوو، (موصعەب)یش ئازایە و لە خانەوادەیەکی ئازایە ، بەڵام هونەر و زانستی شەڕکردی پێ نیە، هەروەها کەسانێکی لەگەڵە ناکۆکن لەگەڵی، منیش کەسانێکم لەگەڵە نەك هەر ناکۆك نین بەڵکو ئامۆژگاریشم دەکەن و ڕێم بۆ دادەنێن.

ئەم ڕوداوەساڵی ٧١ك بوو دوای چوار ساڵ بەسەر لەناوبردنی (موختار)دا پاش ئەوەی (عبدالملك) پایەکانی فەرمانڕەوایەتیەکەی قایم و بەهێز کردبوو لە شام.

عبدالملك بە سوپاکەیەوە ڕوی کردە عێراق و (محمدی کوڕی مەروان)ی برای خستە پێشی لەشکرەکەوە و لەشوێنێکدا بارگەی خست، لەولاوە موصعەب زانیبووی، بۆیە سوپایەکی ڕەوانەکرد بەسەرکردایەتی (ئیبراهیمی کوڕی ئەشتەر) و لە (جمیرا) دابەزی، ئینجا عبدالملك دەستی کرد بە نامە ناردن بۆ گەورەکانی خەڵکی عێراق لەنێو سوپاکەی موصعەبدا بەڵێنی پێدەدان و چاولەبەری دەکردن.

هەروەها نامەی نوسی بۆ (ئیبن ئەشتەر) ئەویش نامەکەی بە پێچراوی دا بە موصعەب.

موصعەب گوتی: چی تێدایە؟ ئەویش وتی: نەم خوێندۆتەوە.

ئینجا موصعەب دەستی کرد بەخوێندنەوەی تیایدا عبدالملك بانگی ئەشتەری کردبوو بۆلای خۆی، بەڵێنی دابوویە کە دەیکاتە والی و فەرمانڕەوای عێراق، ئەویش بە موصعەبی گووت: بەخوا هیچ کەسێك هێندەی من بێ ئومێد نیە لە عبدالملك، هەمان ئەم نوسراوەی ناردووە بۆ یاوەرەکانی تریشت، قایلی کردوون، کەواتە بدە لە گەردنیان.

ووتی: کەواتە هۆز و تیرەکانیشیان بەگژمان ناکەن.

گووتی: تەوقی ئاسن بکە ملیان و بیان نێرە بۆ کۆشکی کیسرا و لەوێ بەندیان بکە، بیاندەرە دەست هۆزەکانی خۆیان.

ئینجا گووتی: ئەی (ئەبا نوعمان) من سەرم لەوە دەرناچێت کە (ئەبو بەحر) بە ڕەحمەت بێت – ئەحنەفی کوڕی قەیس – هەمیشە لەبارەی غەدر و ناپاکیی خەڵکی عێراقەوە هۆشداری دەدامێ، وەك ئەوەی سەیری حاڵی ئێستامان بکات.

بەڵکو عبدالملك ئاشکرای کرد کە ئەوان پێشتر نامەیان بۆ ئەم نوسیوە و بانگیان کردووە بۆلای خۆیان، ئەمە شاراوە نەبوو لە سەربازگەکەی موصعەب دا، جا کاتێك بانگی (مهلب کوڕی ئەبی صفرە)ی کرد کە یەکێك بوو لە سەرکردەکانی موصعەب پرس و ڕاوێژی پێدەکرد، پێی گوت: بزانە کە خەڵکی عێراق نامە لەگەڵ عبدالملك دەگۆڕنەوە، لەخۆم دور مەخەوە.

لەو کاتەش دا کە عبدالملك نامەی بۆ گەورەکانی خەڵکی عێراق دەنوسی لە سەرکردەکانی موصعەب و ئەوانەی ڕازی بووبوون پشت لە زوبێرییەکان بکەن و بچنە ڕیزی عبدالمەلیکەوە هێشتا عبدالملك سوربوو لەسەر ئەوەی لەگەڵ موصعەبدا شەڕ نەکات ، لەبەر ئەو خۆشەویستی و هاوڕێیەتیە دێرینەی کە لەنێوانیاندا هەبوو، هەربۆیە پیاوێکی لە (کەلب)یەکان نارد بۆلای موصعەب، پێی گووت: خوشکەزاکەت سڵاوت لێ دەکات – دایکی موصعەب کەلبی بوو –پێی بڵێ با ئەو دوعا بۆ براکەی بکات، منیش دوعا بۆخۆم بکەم، با کارەکە بە ڕاوێژ بێت.

موصعەب پێی گووت: پێی بڵێ شتێك نیە لەنێوانماندا شمشێر نەبێت.

پاشان عبدالملك هەواڵێکی تری دا، محمدی برای نارد بۆلای تاکو پێی بڵێت : ئامۆزاکەت دادەت دەدا و زیانت پێ ناگەیەنێت.

موصعەب وەڵامی دایەوە: کەسی وەك من دەست بەرداری هەڵوێستی خۆی نابێت بە سەرکەوتن یان بەزین نەبێت.

پاشان شەڕ لەنێوانیان هەڵگیرسا و موصعەب (عتاب کوڕی وەرقا )ی کەیەکێك بوو لەوانەی نامەیان بۆ عبدالملك نوسی نارد بۆ یارمەتیدانی ئیبراهیمی ئەشتەر، ئیبراهیم لەوە ترسا و گووتی: پێم گووت مەینێرە بۆ یارمەتیم إنّا لله و إنّا إليه راجعون.

عتاب بەخۆی و خەڵکەکەوە بەزین، بەڵام ئیبن ئەشتەر بەرگەی گرت، پاشان کوژرا، کوشتنیشی زیان و دۆڕانێکی گەورەبوو بۆ موصعەب چونکە کەسێکی ئازابوو، لەبەر ئەوە کاتێك شەڕەکە گەرم بوو موصعەب زۆری بۆ هاتبوو، هاواری دەکرد و دەیگوت: ئیبراهیم تۆ لەکوێی؟ ئەمڕۆ ئیتر ئیبراهیمێکم نیە.

خەڵکی عێراق دەستبەرداری موصعەب بوون و پشتیان تێکرد، تەنانەت کەسی لەگەڵ نەمایەوە حەوت پیاو نەبێت، بەڵام هەر دەجەنگا و شەڕی دەکرد بە مەردی و ئازایەتیەوە هەتا شەکەت بوو و لە جەمادی دووەمی ساڵی ٧٢ك دا کوژرا.

کاتێك عبدالملك گەیشتە سەر تەرمەکەی گووتی: بینێژن بەڵام بەخوا ڕێزی نێوانمان لەمێژینەبوو، کەچی ئەم دەسەڵاتە نەزۆکە و هیچی لێ سەوز نابێت.

بە کوژرانی موصعەب شەڕ دوایی هات، ئینجا عبدالملك چووە کوفەوە و خەڵکەکەی بەیعەتیان پێدا، عێراق گەڕایەوە ژێر ڕکێفی ئەمەویەکان، عبدالملك (بشر)ی برای کردە فەرمانڕەوای ئەوێ، پێش ئەوەی جێی بهێڵێت سوپایەکی ئامادە کرد بۆ لەناوبردنی (عبداللەی کوڕی زوبێر) لە مەککە و سەرکردەی ئەو سوپایەش حەجاجی کوڕی یوسفی سەقەفی بوو.

بە گرتنی عێراق لەلایەن عەبدولمەلیکەوە دەسەڵات و هێزی عبداللەی کوڕی زوبێر بەرتەسك بوویەوە لە مەککەدا و لەناوبردنی هێز و دەسەڵاتەکەشی کارێکی ئاسان بوو بە گەمارۆدانی لەلایەن (حەجاجی کوڕی یوسفی سەقەفی) کە ئەمەش بوویە هۆی بەرزبوونەوە پلەی حەجاج و درەوشانەوەی ئەستێرەی بەختی و سەرکەوتنی بەسەر ئیبن زوبێر و لەناوبردنیدا.

***

٣

# ئیبن زوبێر وەك شۆڕشگێڕ و خەلیفە

- عبداللـــەی کـــوڕی زوبێـــر، وەك شۆڕشـــگێڕ و ڕاپـــەڕیو لـــەدژی فەرمانڕەوایەتی بۆماوەیی ئەمەویەکان.

- ئیبن زوبێر وەك خەلیفەی موسوڵمانان پاش کۆچی دوایی یەزیدی کوڕی معاویە و بەیعەتدانی زۆرێك لە موسوڵمان پێی.

- هەڵگەڕانـــەوەی مـــەروانی کـــوڕی حەکـــەم و کوڕەکـــەی لـــە خەلافەتەکەی ئیبن زوبێر.

# عبداللەی کوڕی زوبێری کوڕی عەوام
# وەك شۆڕشگێڕ و خەلیفەی موسوڵمانان

لە کۆتایی سەردەمی سێیەم خەلیفەی ڕاشیدین ( عوسمانی کوڕی عەففان) دا – ڕەزای خوای لێبێت – ناکۆکی سیاسیی گەیشتە لوتکە، ئەم ناکۆکیەش بە دروستبوونی ئاژاوەیەکی گەورە و کوژرانی خەلیفەش کۆتایی هات، پاشان ئاژاوەکە گەورەتربوو تا ئەو ڕادەیەی موسوڵمانان دابەشبوون بەسەر سێ بەرەدا: دوو بەرەیان دژ بەیەك بوون و سێیەمیش بێ لایەن بوو لە ئاژاوەکەدا و خۆی لێ لادەدا.

هەموو ئەمانەش لە سەدەی یەکەمی کۆچیدا بوو، ئەگەرچی ئەم ناکۆکیە کۆتایی پێهات بە سازشکردنی حسەینی کوڕی عەلی – ڕەزای خوای لێبێت – لە سەر خەلافەت و وازلێهێنانی بۆ ڕکابەرەکەی (معاویەی کوڕی ئەبو سوفیان) ساڵی ٤١ك و ناونانی ئەم ساڵەش بە ساڵی یەکڕیزی (عام الجماعة)، کەچی ناکۆکیەکە زۆر بەتوندی سەری هەڵدایەوە کاتێك معاویە بەیعەتی وەرگرت بۆ (یەزید)ی کوڕی و کردیە جێگرەوە و جێنشینی خۆی.

ئینجا (حسەینی کوڕی عەلی) –ڕەزای خوای لێبێت– ڕازی نەبوو بەیعەت بە (یەزیدی کوڕی معاویە) بدات، و لێی ڕاپەڕی و شۆڕشی بەرپاکرد، ڕاپەڕینەکەشی بەکوژرانی خۆی لەسەر دەستی (یەزید) لە (کەربەلا) کۆتایی پێهات و حسەین و هاوەڵانی شەهیدکران، کە بەرگریان لە (شورا) ڕاوێژ دەکرد، یان بە مانایەکی وردتر گەڕاندنەوەی شورا و ڕاوێژ بۆ ناو حوکمی ئیسلامی.

پاش ئەم ڕوداوە (عبداللەی کوڕی زوبێری کوڕی عەوام) لە دژی یەزید شۆڕشی بەرپاکرد و خۆی ناونا (خەلیفەی موسوڵمانان)، ئینجا یەزید سوپاکەی نارد بۆ بەرەنگاربوونەوەی شۆڕەکەی و لە مەککە گەمارۆیدا ، بەڵام ئەم گەمارۆدانە زۆری نەخایاند و کۆتایی پێهات بە مردنی یەزید لە شام، بەجۆرێك بوویە هۆی گەورەبوونی پێگە و پلەوپایەی عبداللەی کوڕی زوبێر و جێگیربوونی لەسەر کورسی خەلافەت بەتایبەت چونکە (معاویەی کوڕی یەزید) کە پاش کۆچی دوایی باوکی (یەزیدی کوڕی معاویە) خەلافەتی گرتە دەست زاهید و خواپەرست و کەسێکی دونیا نەویست بوو، هەر بەگەنجی پاش نزیکەی چل ڕۆژ لە گرتنە دەستی خەلافەت کۆچی دوایی کرد و لەو ماوەیەشدا نەچووە دەرەوە لە کۆشکی خەلافەتی دیمەشق، بێجگە لەوەش لەدوای خۆی هیچ کەسێکی نەکردە جێنشین و میراتگری خەلافەت (ولي عهد).

هەربۆیە بوونە خەلیفە و جێنشین بوویە کارێکی ئاسان و بێ گرفت لەبەردەم ئیبن زوبێردا.

**ئایا (عبداللەی کوڕی زوبێر)ی شۆڕشگێڕ و خەلیفە کێ یە؟**

ئەو: (عبدالله)ی کوڕی (زوبێر)ی کوڕی (عەوام)ی کوڕی (خوەیلید)ی کوڕی (ئەسەد)ی کوڕی (عەبدولعوزا)ی کوڕی (قوصەی) کوڕی (کیلاب)ی کوڕی (موڕڕە)یە.

زوبێری کوڕی عەوام باوکیەتی – خوا لێی ڕازی بێت – کە حەواری پێغەمبەری خودا بوو – درودی خوای لێبێت – ڕەچەڵەکی لەگەڵ پێغەمبەردا لە (قوصەی کوڕی کیلابی کوڕی موڕڕە)دا یەکدەگرێتەوە، هەروەها کوڕە پوری پێغەمبەر درودی خوای لێبێت – (صەفیەی کچی عەبدولموتەلیب)ە، یەکێکە لە دە مزگێنی پێدراوەکەی بەهەشت (عشرة مبشرة) لەلایەن پێغەمبەرەوە ، کاتێك موسوڵمان بوو تەمەنی شانزە ساڵ بوو لە مەککە.

بەڵام خزمی (عبداللەی کوڕی زوبێر) لە دایکیەوە بریتیە لە ڕاستگۆی ئوممەت ئەبوبەکری صدیق ڕەزای خوای لێ بێت، یەکەمین کەس کە موسوڵمان بوو لە پیاوان، یەکێك لە دە مزگێنی پێدراوەکەی بەهەشت و یەکەمین خەلیفەی ڕاشیدین و یارەی

پێغەمبەر بوو کاتێك کە کۆچی کرد بۆ مەدینە بەنهێنی (ثاني اثنين)، هەروەها چاکە و پیاوەتی و جوامێرییەکانی زۆر و ناسراون لە مێژووی ئیسلام دا.

دایکی عبدالله بریتیە لە ئەسمای کچی ئەبو بەکری صدیق، پورێشی بریتیە لە خاتو عائیشەی کچی ئەبوبەکری صدیق دایکی ئیمانداران ڕەزای خوای لێبێت و خێزانی پێغەمبەر دروودی خوای لێبێت.

عبداللەی کوری زوبێر یەکەمین لەدایك بووی موسوڵمانان بوو لە ماوەڵە کۆچکردووەکان لە مەدینەی مونەووەرە پاش کۆچی پێغەمبەرایەتی بۆئەوێ؛ (ئەسما)ی دایکی لە (قوبا ) (عبدالله)ی بوو، وەك کۆچکردوویەك لە مەککەوە هاتبوو، لەو کاتەدا جولەکە کردبوویانە پڕ و پاگەندە کە موسوڵمانان کوڕیان نابێت و بەهۆی ئەو جادووەی لێیان کردبوون، هەربۆیە موسوڵمانان دڵخۆش بوون کاتێك (عبدالله) هاتە دونیاوە.

لە ئەسمای کچی ئەبوبەکرەوە لەبارەی لەدایك بوونی (عبداللە)ی کوڕیەوە فەرموویەتی: من دەرچووم لە مەککە و ماوەی سکپڕیم تەواو کردبوو هاتمە مەدینە و لە (قبا ) لامدا و لەوێ منداڵەکەم بوو و پاشان هێنام بۆ پێغەمبەری خودا و لە ژورەکەی دامنا و دوعای خوێند بە دەنکە خورمایەکدا و خورماکەی جوی و پاشان تفی کردە دەمیەوە، کەواتە یەکەمین شت چوویە ناوسکیەوە لیکی (تف)ی پێغەمبەری خودا بووپاشان (مەلاشوی شیرین کرد)بە خورما و نزای بۆ کرد و پیرۆزی کرد، ئەو یەکەمین منداڵ بوو کە لە ئیسلامدا لەدایك بوو، هەربۆیە زۆر دڵخۆش بوون پێی، چونکە پێیان وترابوو کە جولەکە جادوی لێکردون و کورتان نابێت، پێغەمبەریش – دروودی خوای لێبێت – ناوی نا: (عبدالله)[1].

یەکێك لەو شێوازی خۆشی دەربڕینەی کە بەهۆی لەدایك بوونیەوە و وەك بەدرۆخستنەوەی پڕوپاگەندەکەی جولەکە نیشاندرا ئەوەبوو (ئەبوبەکری صدیق)ی

---

[1] بوخاری لە صەحیحەکەیدا گێڕاویەتیەوە.

باپیرەی کردیە باوەشی و بە شاری مەدینەدا سوڕایەوە و هاوەڵانیش (تەکبیر)یان دەکرد بۆ هاتنە دونیای و زۆر زۆر شادومان بوون.

کاتێك حەوت یان هەشت ساڵان بوو زوبێری باوکی فەرمانی پێکرد کە بڕوات بۆلای پێغەمبەر و بەیعەتی پێ بدات ئەویش وای کرد، کاتێك پێغەمبەر بینی هاتووە بۆ بەیعەت پێدانی زەردەخەنەیەکی بۆکرد.

کتێبەکانی ژیننامە بەو جۆرە باسی عبداللەی کوڕی زوبێر دەکەن کە: ڕەنگی ئەسمەر (بۆر)بووە، لاواز بووە و درێژ نەبووە، لەنێو چاوانیدا شوێنی سوژدە بەدی دەکرا و زۆری پەرستش دەکرد بۆ خودا و زمان پاراو بووە، زۆر بەڕۆژوو بووە و زۆر شەونوێژی کردووە، بەهێز و ئازا و ورە بەرز بووە، زانا و لەسەرخۆ و سەنگین بووە، لەنوێژدا زۆر خشوع و ملکەچیی هەبووە، یەکێك بووە لەو چوار (عەبادیلە)[1]ی کە لەدیندا شارەزا و زانا بوون لە مەدینەی مونەووەرە، هەروەها یەکێك بووە لە گێڕەرەوەکانی فەرمایشتە پیرۆزەکانی پێغەمبەر.

وەك دەگێڕنەوە لەبارەی پەرستش و کڕنوشیەوە لە نوێژدا، ڕۆژێك نوێژی دەکرد و مارێك لە بنمیچەکەوە کەوتە خوارەوە ئالاّ بەدەوری سکی (هاشم)ی کوڕیدا ، ژنان دەستیان کرد بە قاوقیژ و هات وهاوار و خەڵکی ناو خانووەکە کەوتنە مەراقەوە و کۆبوونەوە بۆ کوشتنی ئەو مارە، ئینجا کوشتیان و کوڕەکەش بێ وەی و سەلامەت بوو، هەموو ئەمەیان کرد و ئیبن زوبێر هەر لەنوێژەکەیدا بوو و ئاوڕی نەدایەوە و ئاگاشی لەوە نەبوو کە ڕوویدا هەتا سەلامی دایەوە.

شۆڕەسوارێکی ئازا و نەبەرد بووە و تەمەنی لە حەفتا تێپەڕی بوو هێشتا دەیتوانی بەشمشێر شەڕ بکات وەك گەنجان و کەس چاری نەدەکرد.

---

[1]. عبادلة. واتە (عبدالله)کان... کە مەبەست لێیان: عبداللەی کوڕی زوبێر و عبداللەی کوڕی عەباس و عبداللەی کوڕی عەمری کوڕی عاص و عبداللەی کوڕی عومەری کوڕی خەتاب بووە -ڕەزای خودا لە هەموویان- .

(عوسمانی کوڕی طلحة) لەبارەیەوە ووتوویەتی: ئیبن زوبێر لە سێ شتدا کەس شانی نەدەدا لەشانی: لە ئازایەتی و لە پەرستش و لە ڕەوان بێژیدا.

هەروەها یەکێك بووە لە وتاربێژە زمان پاراوەکانی قورەیش و لە وتاربێژیدا لە ئەبوبەکری صدیقی باپیری دەچوو ڕەزای خوایان لێبێت لە جوڵە و ئاماژە و تۆنەکانی دەنگ و بەرز و نزمکردنەوەی دەنگیدا، هەر کەس بیدیایە و گوێی لێ بووایە وەك ئەوەبوو ئەبو بەکری صدیق ببینێت.

لە بەخشندەییدا وەك خەلیفەکانی ڕاشیدین بوو نە دەست قونجا و نە دەست بڵاو بووە، زۆر پێداگریبووە لەسەر ماڵی گشتی موسوڵمانان کاتێك خەلافەتی گرتە دەست، تەنانەت (حەمزە)ی کوڕی بەند کرد لەبەر ئەوەی ماڵێك یان بابڵێین (بڕێك پارەی) لاسوو دابەشی کردبوو بەسەر کەسوکاریدا، ئینجا ئیبن زوبێر پێی گوتبوو:

((ئەوە نە هی خۆتە نە هی باوکتە))، پاشان بەندی کردبوو.

(ئیبن کثیر) لە (البداية والنهاية)دا باسی کردووە کە معاویەی کوڕی ئەبو سوفیان گوێی لێ بووە پیاوێك هۆنراوەی گووتوە بەم جۆرە:

**ابن رقاش ماجد سميدع يأتي فيعطي عن يد أو يمنع**[1].

ئەویش پێی وتووە: ئەوە عبداللەی کوڕی زوبێرە.



[1] . کوڕێ ئازا و شکۆمەند و بەخشندەیە. ..بەدەستێك دەیبەخشێت و بەدەستێك ڕێ لە بەفیڕۆدان دەگرێت.

# عبداللەی کوڕی زوبێر وەك شۆڕشگێڕێك
# دژی حوکمی بنەماڵەیی و بۆماوەیی ئەمەویەکان

وەك باسمان کرد معاویەی کوڕی ئەبو سوفیان - ڕەزای خودای لێبێت - پاش گرتنە دەستی خەلافەت بە مەرجی ئەوەی کە حەسەنی کوڕی عەلی -ڕەزای خوای لێبێت- جێگرەوە و جێنشینی بێت لەپاش خۆی، کەچی حەسەن کۆچی دوایی کرد بەهۆی ژەهرخوارکردنەوە لە ژیانی معاویەدا و وای کرد معاویە بە ڕاوێژ (موغیرەی کوڕی شعبە) بخاتە یاسای فەرمانڕەوایەتی بۆماوەییەوە لە یاسای دەوڵەتی ئیسلامیدا و (یەزید)ی کوڕیشی کردە جێگرەوە (ولی عەهد - میراتگر) تاکو ببێتە جێنشین لەدوای خۆی، لە ژیانی خۆیدا بەیعەتی بۆ وەرگرت، بەلاَم هەندێك کەسایەتی وەك (حسەینی کوڕی عەلی) و (عبداللەی کوڕی زوبێر) پەرچیان کردەوە بەیعەت بدەنە (یەزد) و سووربوون لەسەر درێژەدان بە یاسای فەرمانڕەوایەتی وەك چۆن بوو لەپێشتردا بە بژاردە و ڕاوێژ و بەیعەت وەرگرتن لە موسوڵمانان.

(یەزید) پاش باوکی لە ڕەجەبی ساڵی ٦٠ك دا کاروباری گرتە دەست و کاربەدەست و دەستوپێوەندەکانی باوکی لەسنوری قەڵەمڕەویەکەیاندا دانایەوە و (وەلیدی کوڕی عوتبەی کوڕی ئەبو سوفیان)ی کردە فەرمانڕەوای مەدینە و (عەمری کوڕی سەعیدی کوڕی عاص)یش سەرداری مەککە و (نوعمانی کوڕی بەشیر) کرایە سەرداری کوفە و (عبداللەی کوڕی زیاد) فەرماندە و سەرداری بەصرە.

یەزید لە وەرگرتنی بەیعەتدا سەرنجی خستە سەر ئەو کەسانەی کە بەیعەتیان پێ نەدابوو لە کاتی هەبوونی باوکی لەژیاندا، گرنگترینیشیان لەلای ئەو (حوسەینی کوڕی

ئیمامی عەلی) بوو –ڕەزای خوای لێبێت– ، ئینجا نامەی نوسی بۆ (وەلیدی کوڕی عتبە)ی فەرماندەی و تیایدا هەواڵی مەرگی باوکی پێ ڕاگەیاندبوو، ووتبووی:بەناوی خودای گەورە و میهرەبان... لە ئەمیری بڕواداران(یەزید) ەوە بۆ (وەلیدی کوڕی عتبە)، لەپاشان، معاویە بەندەیەك بوو لە بەندەكانی خودا، خودا ڕێزی لێنا و كردی بەجێنشین و دەسەڵاتی دایە و بەهێزی كرد، بە قەدەرێك ژیا و بە ئەجەلێك مرد، بەڕەحمەت بێت، بە ڕێز و شكۆ و ناوبانگەوە ژیا و بەچاكی و لەخواترسی مرد و والسلام.

به تێڕوانین لە نەرمی نواندنی (وەلیدی کوڕی عتبە) بەرامبەر وەرگرتنی بەیعەت لە (حسین) و (ئیبن زوبێر) چونكە ڕێز و گەورەیی (حسین)ی دەزانی كە چ پیاوێكی نەرم و نیان و بەڕێز و بەشكۆیە وەك دیسان لە سزا و تۆڵەی خوداش دەترسا، هەربۆیە ڕێی گرت لە زیندانیكردنی حسین یان كوشتنی و گووتی: ((سوێند بەخوا پێم خۆش نیە خۆر لەسەر چەندە ماڵ و موڵكی دونیا هەڵاتووە و ئاوا بووە هەمووی هی من بێت و بەڵام حسین بكوژم ، پاكی وبێگەردی بۆ خودا! ئایا حسین بكوژم هەر لەبەر ئەوەی گوتوویەتی: بەیعەت نادەم؟ سوێند بەخودا من پێم وانیە مرۆڤێك لەتەرازودا هاوتای خوێنی حسین بێت لای خوای گەورە لە ڕۆژی دواییدا.

هەربۆیە مەروانی كوڕی حەكەم پێی ووت: ئەگەر ئەمە بۆچوونت بێت ئەوا پێكاوتە.

بەڵام سووربوونی (یەزید) و كۆڵنەدانی لەسەر داواكردنی بەیعەت لە حسەین و ئیبن زوبێر – ڕەزای خودا لە هەردوكیان بێت – یەكەمین پریشكی ئەو فیتنەیە بوو كە داكەوتە نێو موسوڵمانانەوە، هەربۆیە هەر یەك لەو دوو كەسە دەی زانی كە داواكراوە، بۆیە ئەگەریش بەیعەت نەدا ئەوا دەبێتە قوربانی هەڵەشەیی یەزید، داروودەستەكەی خەلیفەی نوێ شمشێریان تیژكردبوو بۆ هەردووكیان، ئینجا ئەوانیش پەنایان بردە بەر كەعبە (بيت الحرام) و خۆیان لە مەككەی پیرۆز شاردەوە، بە نیازی بێ وەی بوون و خۆپاراستنیان بە پارێزگاریی خودایی.

ووتیان: ئەمە بیدعەیەكی نوێیە، بیدعەكەش ئەوەیە خەلافەتی كردۆتە بۆماوەیی بۆ كوڕەكەی، لەكاتێكدا خەلافەت بە ڕاوێژ بوو و دیاریكرابوو بۆ جگە لە كەسی نزیك، جا

چۆن دەبێت خزمێکی نزیك و کوڕێکی ڕاستەوخۆ بکرێتە جێنشین، هەربۆیە ئەوان ئەو بنەمایەیان پەرچ کردەوە کەکارەکە بە بۆماوەیی بێت، ویستیان جێنشینایەتی وەك سەردەمی خەلیفەکانی ڕاشیدینی لێ بێتەوە.

ئیبن زوبێر بەیعەت نەدانی بە یەزید هەڵبژارد، ئینجا ڕۆی بۆ مەککە تا لەوێ بمێنێتەوە و (حسین)ی لەگەڵ بوو – خوا لەهەردوکیان ڕازی بێت – ، ئەگەرچی مەککە سەربە دەسەلاتی یەزیدی کوڕی معاویە بوو، کەچی هەندێك هۆکار یەکانگیر بوون بۆ ئەوەی مەککە بکەنە گونجاوترین شوێن کە ئیبن زوبێر بتوانێت ڕوی تێ بکات – بە تێڕوانینی خۆی – گرنگترینیان ئەمانە بوون:

تاکە شوێن بوو کە بتوانرێت لەو ماوەیەدا پەنای بۆ ببرێت ئەوەش چونکە هەرێم و ناوچەکانی تر گونجاو نەبوون، بۆ نمونە عێراق گرەنتی تیا نیە بۆ دڵسۆزی و وەلائی خەڵکەکەی بۆ هەر سەرکردەیەکی بەرهەڵستکار دژی ئەمەویەکان، ئەوەش لەگەڵ حسین کردیان باشترین بەڵگەیە، ئیبن زوبێریش تەواو ئاگای لەوە بوو کاتێك ئامۆژگاری (حسین)ی کرد بەوەی نەڕوات بۆ عێراق پێی گووت: بۆ کوێ دەڕۆی؟! بۆلای کەسانێك کە باوکتیان کوشت و هەوڵی کوشتنی براکەتیان دا؟!

بەلأم میصر و یەمەن دوور بوون لە شانۆی ڕوداوەکان، ئیبن زوبێر لەم دوو ناوچەیەدا پشتیوان و شوێنکەوتووانێکی نەبوو پشتیان پێ ببەستێت، ئەوە شام با بووەستێت کە مەڵبەندی ئەمەویەکان بوو.

مەبەستی ئیبن زوبێر و ئەواتەشی لەگەڵی بوون لە هەندێك لە هاوەڵان و شوێنکەوتووان وەك (مسەوەر کوڕی مخرمە) و (عبداللەی کوڕی صەفوان) و (موصعەبی کوڕی عبدالرحمن کوڕی عەوف ) و جگە لەوانیش بریتی بوو لە گۆڕینی پێشهاتەکە بە شمشێر، کاتێك بینیان خەلافەت گۆڕاوە بۆ بۆماوەیی و پاشاگەردانی و هەروەها هەندێك پڕو پاگەندە لەچواردەوری (یەزید) بلأوەیان کردبوو کە وێنەیەکی خراپی خەلیفەی ئەمەویەکانی لە دیمەشق پیشان دەدا.

لەپشت ئەم شۆڕشەوە هەوڵی دەدا ئوممەتی ئیسلامی بگەڕێنەوە بۆ ژیانی ڕاوێژ و نەتەوەی موسوڵمانیش باشترینی ناو خۆیان بکەنە فەرمانڕەوا، خەلافەت گۆڕا بۆ موڵکداری و پاشاگەردانی، ئیبن زوبێر وای دەبینی کە بەکارهێنانی شمشێر و گۆڕینی خراپە (منکر) بەهۆی هێزەوە نزیکی دەکاتەوە لە خودا و ڕێ دەگرێت لەوەی خەلافەت ببێتە پاشایەتی و بۆماوەیی، لەبەر ئەمە ڕێی بەخۆی نەدا هەتا (یەزیدی کوڕی معاویە) کۆچی دوایی کرد.

ئیبن زوبێر دەیفەرموو: خودایە من دیداری تۆم حەز لێیە، تۆش بینینی منت پێ خۆش بێت، خودایە من جەنگام و جیهادمکرد لەبەر تۆ و لەدژی دوژمنەکەت، تۆیش پاداشتی جیهادکارانم پێ ببەخشە[1].

کاتێك حسین چوو بۆ کوفە و ڕۆژی عاشورا لە ساڵی ٦١ك لە کەربەلا شەهید کرا، ئەوە ڕوداوێکی دڵتەزێن بوو بۆ ئیبن زوبێر، ئەوەی کە لێی دەترسا ئەمەویەکان تەنهای بکەن هاتە دی.

هەروەها ئەو پیاوەی کە لەسەنگەری بەرهەڵستکاراندا وەستابوو کوژرا، لەگەڵ ئەوەشدا هیچ جموجوڵێك لەلایەن خەڵکیەوە بەرپا نەبوو بەهۆی کوشتنی حسەینەوە — ڕەزای خودای لێبێت — دژی ئەمەویەکان.

ئیبن زوبێر هەستی بە ترسناکی هەڵویستەکەی کرد، بەڵام هەوڵی دا سود وەربگرێت لە پاڵنەرەکانی ڕق و تورەیی کە دەرونی خەڵکی پڕکردبوو دژی ئەمەویەکان لەبەر کوشتنی حسەین.

یەکەمین هێرشی ڕاستەوخۆ لە (ئیبن زوبێر)یشەوە بۆ سەر (یەزید) ئەو کاتە بوو کە (ئیبن زوبێر) هەواڵی کوژرانی (حسەین)ی بیست هەستایەوە بۆ وتار لە مەککە و ڕەحمەتی نارد بۆ حسەین و لۆمە و سەرزەنشتی بکوژانی کرد و فەرمووی:

---

[1]. سەیری (تأريخ دمشق)ی (ئیبن عەساکر) بکە.

سوێند بێ بەخوا کەسێکیان کوشتووە کە شەونوێژی درێژ و ڕۆژوی زۆر بوو، لەوان خاوەن حەق تر بوو بۆ ئەو شتەی کە هەیانە و ئەوەی کە هان لەناویدا(مەبەستی دەسەلآت و خەلافەتە)، ، لەپێشتر بوو لە دین و چاکەکاریشدا.

سوێند بێ بەخودا درێخی نەدەکرد لە خوێندنەوەی قورئان و لەبەر خودا گریان، بەڕۆژوبوونی نەدەگۆڕیەوە بە خواردنەوەی حەرام، کۆڕەکانی زیکر و یادی خودای وازلێنەدەهێنا لەبەر ڕاوشکاری، دواتریش ئەوانەی کوشتیان فڕێ دەدرێنە ناو (غی) کە شیوێکە لە دۆزەخ.

لەسەرەتادا (یەزید) هەوڵی ئەدا لای خۆیەوە کارێك بکات ناکۆکیەکەی لەگەڵ (ئیبن زوبێر)دا ئالۆزتر بکات، لەبەر ئەمە نامەیەکی بۆ نارد و تیایدا باسی چاکەکانی و شوێن دەستەکانی لەئیسلامدا کرد.

هەروەها هۆشداری دابوویە سەبارەت بە هەلگیرساندنی ئاژاوە و هەوڵدان بۆی، بەشێك لەو قسانەی بە نامە بۆی ناردبوو ئەوەبوو پێی وتبوو: ((خوات بەبیردێنمەوە، کە بەتەمەنەکانی قورەیش و پێشینە چاکەکان و ئەوانەی کە دەستپێشخەربوون لە کۆشش و پەرستشدا هەموو ڕۆیشتن. ئەو چاکەیەی کە پێشت خستووە زیاتری بکە و سفری مەکەرەوە، ئەوەی خەڵکی پێیان تێخستووە تۆش بچۆ ناوی، مەیانخەرە ناو گێژاوی فیتنەوە، ئەوەی خودا قەدەغەی کردووە تۆ حەلآڵی مەکە)).

بەلآم ئیبن زوبێر وەلآمی تکا ئاشتەواییەکەی یەزیدی نەدایەوە، ڕازی نەبوو کە بەیعەتی پێ بدات، ئینجا یەزید سوێندی خوارد کە بەیعەت وەرناگرێت لە ئیبن زوبێر مەگەر بە قۆڵبەستکراوی نەبێت.

معاویەی کوڕی یەزید هەوڵی دا باوکی پەشیمان بکاتەوە لەم سوێندەی، چونکە ئیبن زوبێری دەناسی و دەیزانی کە هەر ئەسڵەن هاتن بۆلای یەزید پەرچ دەکاتەوە و لە ڕق و توڕەییدایە، معاویەی کوڕی یەزید چاکەکار و لەخواترس و خۆپارێز بوو، لانی ئاشتەوایی دەگرت و لە خوێن ڕشتنی موسوڵمانان دەترسا، (عبداللەی کوڕی جەعفەر)یش پاڵپشتی ڕایەکەی (معاویە)ی کرد.

بەڵام یەزید سور بوو لەسەر ڕایەکەی خۆی، بۆ ئەوەیش کە قورسی و ناخۆشی ڕەوشەکە سوک بکات لەسەر دڵی ئیبن زوبێر دە کەسی لە پیاو ماقوڵانی خەڵکی شامی نارد بۆلای و بڕێك لە زیو و بەرگ و پۆشاکی کڵاوداری پێدا ناردن.

کاتێك ئەندامانی وەفدەکە گەیشتنە مەککە (ئیبن عوضاتی ئەشعەری) دەستی کرد بە قسە و ووتی: ئەی (ئەبا بەکر)، جێ دەستت لە کاروباری خەلیفەی ستەم لێکراودا — عوسمانی کوڕی عەففان — و پشتگیری و پشتیوانیت لێی لە (یوم الدار) دا لەبیر ناکرێت، ئێستا ئەمیری بڕواداران تورە بووە لەوەی کە پشتت تێکردووە، بۆ ئەو مەبەستەش کە (نوعمانی کوڕی بەشیر)ی نارد بۆ لات و سوێندی خوارد کە لە تەوقێکی ئاسنی سوکدا بێی بۆلای بۆئەوەی سوێندەکەی نەکەوێ، بەرگێکی بکە بەسەردا کە نەبینرێت، پاشان تۆ وەك بەڕێزێك دەبیت لای ئەمیری بڕواداران کە لە فەرمانڕەوایەتیەکەیدا پێچەوانەی ناجوڵێیتەوە.

ئیبن زوبێر ئیزنی خواست لە نێردراوەکان کە چەند ڕۆژێك بیربکاتەوە و پرس و ڕاوێژ بکات، هەر بۆیە ڕاوێژی بە دایکی کرد (ئەسمای کچی ئەبوبەکی صدیق) ڕەزای خوای لێبێت — ئەویش پێی گوت: کوڕەکەم بەسەربەرزی و شکۆوە بژی و بە ڕێز و شکۆوە بمرە، دڵنیا مەبە لە خۆتەوە متمانەت بە بەنی ئومەییە نەبێت، یاریت پێ بکەن، مردن باشترە لەو کارە.

مەروانی کوڕی حەکەم (عبدالعزیز)ی کوڕی نارد بۆلای ئیبن زوبێر و پێی گوت: بە ئیبن زوبێر بڵێ: باوکم ناردومی چاودێری کاروبارەکانت بکەم و حورمەت و شکۆت بپارێزم، هەر بەوبۆنەوەبەوە پێت دەڵێم سوێندەکەی ئەمیری بڕواداران پەسەند بکە، کۆتێك لە زیو یان ئاڵتون کە کڵاوێکی پێوە بێت و دەرنەکەوێت و تەنها دەنگەکەی ببیسترێت دەکاتە بەرت ، ئینجا ئیبن زوبێر نامەی بۆ مەروان نوسیەوە و سوپاسی کرد لەگەڵ کۆت و کەلەبچەکەش.

هەروەها وەڵامی نێردراوەکانی بە نەرێ دایەوە.

پاش ئەوەی ئیبن زوبێر وەلامی وەفدەکەی بە نەرێ دایەوە بە (ئیبن عوضات)ی ووت: من لەجێی کۆترێکم لە کۆترەکانی مەککە، ئایا تائێستا کوترێکت لە کۆترەکانی مەککە کوشتووە؟

ووتی : بەڵێ کۆترەکانی مەککە چ حورمەتێکیان هەیە؟ هۆی غولام تیر و کەوانەکەم بۆ بێنە.

تیر و کەوانەکەی بۆ هێنرا و تیرێکی هەلگرت و خستیە ناو کەوانەکە و پاشان نیشانەی گرت لە کۆترێك و گووتی: هۆی کۆتر، ئایا یەزید مەی دەخواتەوە؟ دە بڵێ بەڵێ، بەخوا گەر وا بڵێی تیرەکەت تێ دەگرم، هۆی کۆترەباریکە: ئایا پشت لە یەزیدی کوڕی معاویە دەکەیت و ئوممەتی موحەممەد پەرت دەکەیت و لە (کەعبە) نیشتەجێ دەبیت تاکو پەنات بدات؟ بەخوا گەر وا بکەی تیرەکەت تێ دەگرم.

ئینجا ئیبن زوبێر گووتی: بەلا لێت دا ئایا باڵندە قسە دەکات؟

گووتی: نا... بەلام ئیبن زوبێر خۆ تۆ قسە دەکەیت، سوێند بێ بەخوا بەیعەت دەدەیت بە خۆشی بێت یان ناخۆشی، یان ئالای ئەشعەریەکان دەبینیت لەم چەمەدا، ئەگەر بڕیاری شەڕکردنمان دا لەدژت دواتر بشچیتە کەعبەوە، وێرانی دەکەین یان دەیسوتێنین بەسەرتدا، - پەنا بەخوا- لە قسەکانی.

ئیبن زوبێریش فەرمووی: وێرانکردن و شەڕکردن لە کەعبەدا حەلاڵ دەکەیت؟

ووتی: کەسێك حەلاڵی دەکات کە حورمەتی شکاندووە.

پاشان ئیبن زوبێر گوتی: بەیعەتی یەزید لە ئەستۆی مندا نیە.

ئینجا (ئیبن عوضات) گووتی: ئەی گرۆی قورەیش بیستان چی ووت؟! بەیعەتتان دابوو و ئەویش فەرمانتان پێ دەکات لە بەیعەتەکتان پاشگەزبنەوە.

ئینجا ئیبن زوبێر دەستی کرد بە باسکردنی کەموکوڕیەکانی یەزید و گوتی: پێم گەیشتۆتەوە کە ئەو بە سەرخۆشی ڕۆژ دەکاتەوە و شەویش هەروا، پاشان گوتی: ئەی (ئیبن عوضات): بەخوا من نە خەڵکم ترساندووە و نە هیچ، من بەرچاوم ڕونە لەخواوە،

ئەگەر بشکوژرێم ئەوە باشترە بۆم، ئەگەر بەدەردی خوایی بمرم ئەوا خودا ویست و نەویستنم دەزانێت بەرامبەر ئەو کەسەی کە لە زەویەکەیدا سەرپێچی دەکات.

ئەوانی تریش بەهەمان وەڵام وەڵامیان دایەوە.

پاشان ئیبن زوبێر فەرمووی: خودایا من خۆم لە ماڵەکەی تۆدا پەنا داوە.

ئینجا نازناوی (عائذ بالله)ی لەخۆی نا، واتە پەناگر بەخوا، پێی دەوترا (عائذ).

یەزید بۆی دەرکەوت کە بێگومان دەبێت ئیدی کردەوەیەکی سەربازی ئەنجام بدات، ئامانج لێی دەستگیرکردن یان لەناوبردنی ئیبن زوبێر و تەوقی ئاسن کردنە گەردنی بێت، کاتێك (عەمری کوڕی سەعیدی کوڕی عاص) کە والی مەدینە بوو حەجی ماڵی خوای کرد لەو ساڵەدا (ئیبن زوبێر)یش لەگەڵی دا بوو، بەڵام نوێژی لەدوای (عەمر)ەوە نەکرد، لەگەڵ ئەو هیچ کام لە دروشمەکانی حەجی نەدەگوت، ئەم کارەی ئیبن زوبێر واتای خۆجیاکردنەوەیەکی ئاشکرای دەدا لە دەسەڵاتی ئەمەویەکان و دان پیان نەنانیان، بەتایبەت کە ئەنجامدانی حەج بە بەڵگەیەکی بەهێز دادەنرێت لەسەر شەریعەتی دەوڵەت و هێزی قەڵەمڕەویەکەی، کە هەروەك ئەنجامدانی جیهاد لەپێناوی خوادا وایە.

پاشان (ئیبن زوبێر) نەیهێشت (حارسی کوڕی خالیدی مەخزومی) بەرنوێژی بۆ خەڵکی مەککە بکات کە لەوکاتەدا (حارسی کوڕی خالید) بریکاری (عەمری کوڕی عاص) بوو لە مەککە.

ئیبن زوبێر وەك کەسایەتیەکی سەربەخۆ و جیاواز لە دەوڵەتەکە هەڵسوکەوتی دەکرد، هەروەها هیچ کارێکی بەبێ (مسور کوڕی مخرمە) و (موصعەبی کوڕی عبدالرحمن کوڕی عەوف) و (جوبەیر کوڕی شەیبە) و (عبداللەی کوڕی صەفوان کوڕی ئومەییە) نەدەکرد، نیشانی دەدان کاروبارەکان لەناو ئەواندا بە ڕاوێژە، هەروەها نوێژەوکان و نوێژی هەینی و حەجی بەتۆرە پێ دەکردن[1].

[1] (تأريخ دمشق- لإبن عساكر).

ئینجا (یەزید) نامەی نوسی بۆ (عەمری کوڕی سەعیدی کوڕی عاص)ی والی و فەرمانڕەوای خۆی لە مەدینە، کە هەندێك سەربازی بۆ بنێرێت.

(عەمری کوڕی عاص) بۆ سەرکردایەتی هەڵمەتەکە (عەمری کوڕی زوبێری کوڕی عەوام)ی برای (عبداللەی کوڕی زوبێر)ی دانا، عەمری کوڕی زوبێر سەرۆکی پۆلیسی مەدینە بوو – بەمانای ئەمڕۆ– کە لەلایەن (عەمری کوڕی سەعید)ەوە دانرابوو، زۆر دوژمنی براکەی بوو، هەر کەس سۆز و هاوخەمی و دڵسۆزی بۆ عبداللەی کوڕی زوبێر هەبووایە دارکاریی دەکرد، لەوانەی لێیان درا ( مونزیر[١]ی کوڕی زوبێر) و کوڕەکەشی ( محمدی کوڕی مونزیر) و ( عبدالرحمن کوڕی ئەسوەد کوڕی عەبد یەغوپ) و (عوسمانی کوڕی عبداللەی کوڕی حەکیمی کوڕی حیزام) و (خوبەیبی کوڕی عبداللەی کوڕی زوبێر)بوون، ئەوانەش کە هەڵاتن لەدەستی و ڕویان کردە مەککە و پەنایان هێنا بۆلای ئیبن زوبێر ( عبدالرحمن کوڕی عوسمان ) و (عبدالرحمن کوڕی عەمر کوڕی سوهەیل) و هەندێکی تر بوون.

دانانی (عەمری کوڕی زوبێر) بەسەرکردایەتی ئەو سوپایەی بۆ بەرەنگاربوونەوەی (عبداللەی کوڕی زوبێر) دەچوو لەسەر داخوازی (عەمر) خۆی بوو، ئەم سوپایەی (عەمری کوڕی زوبێر) کە ڕوی کردە مەککە هەزار پیابوو، لە بەرەتاکەیدا (ئەنیسی کوڕی عەمری ئەسلەمی) بە حەوت سەد سەربازەوە ڕۆیشتن و لە (ذي طوی) دابەزین و (عەمری کوڕی زوبێر)یش ڕۆی و لە (أبطح) بارگەی خست.

ئینجا (عەمری کوڕی زوبێر) نامەی نارد بۆ (عبداللەی کوڕی زوبێر)ی برای، داوای لێکرد خۆی ملبدات بۆ سوێندەکەی یەزیدی کوڕی معاویە، هۆشداریشی پێدا لەوەی کە لە شاری مەککەدا شەڕ بکات، (عەمری کوڕی زوبێر) لە سەربازگەکەی دەردەچوو و بەرنوێژی بۆ خەڵکەکە دەکرد لەمیانەی دانوستانەکانی لەگەڵ (عبدالله)ی برایدا.

---

[١] منذر.

(عبدالله)ش لەگەڵی دەڕۆیشت و نەرمونیان و ڕوخۆش بوو لەگەڵی و دەیگووت: من کەسێکم گوێدەگرم و گوێڕایەڵیشم، تۆش دەستوپێوەندی (یەزید)ی کەچی لە دوای تۆوە نوێژیش دەکەم و لاریەکم نیە، بەڵام تەوق بکەیتە گەردنم و ئینجا تێ تەقێنی بۆ شام، من لەوەم ڕوانیوە و بۆم دەرکەوتووە کە ڕەوا نیە بۆم بەخۆم ڕەوای بکەم، ئەمەی من گوتم بۆ گەورەکەتی بنوسە و پێداچوونەوەی بۆ بکە.

بەڵام (عەمری کوڕی زوبێر) پۆزشی هێنایەوە کە نامە نانوسێت بۆ یەزید، بەبیانوی ئەوەی ئەم بۆ کارێکی دیاریکراو هاتووە و دەبێت ئەنجامی بدات، (عبداللەی کوڕی زوبێر) (عبداللەی کوڕی صەفوان)ی بەهەندێك سەربازەوە ناردبوو خوارووی مەککەیان گرتبوو، چواردەوری (ئەنیسی کوڕی عەمری ئەسلەمی)یان دابوو، ( ئەنیس) هەستی پێ نەکردبوون تا چواردەوری گیرا، دواتر کوژرا و هاوەڵانیشی تێك شکان.

لەو کاتەی کە (ئەنیسی ئەسلەمی) کوژرابوو و سوپاکەشی تێکشکابوو، (موصعەبی کوڕی عەبدولڕەحمانی کوڕی عەوف) سەرکردایەتی کۆمەڵێك سەربازی تری دەکرد بەرەو (عەمری کوڕی زوبێر)، کە لە (أبطح) بارگەی خستبوو، ئینجا (عەمری کوڕی زوبێر) تێشکا و چوویە ماڵی پیاوێکەوە پێی دەوترا (عەلقەمە) (عوبەیدەی کوڕی زوبێر)ی برای هات بۆلای و داڵدەی دا و بردی بۆلای (عبداللەی کوڕی زوبێر)، بۆی باسکرد کە ئەو هانای بۆ بردووە، ئەویش گووتی بۆ حەق و مافی خۆم بەڵێ لێی خۆش دەبم، بەڵام بۆ حەق و مافی خەڵکی ئەوا تۆڵەی هەرکەسێکی کە لەمەدینە ئازاری دابێت لێ دەستێنمەوە.

(عبدالله) عەمری کوڕی زوبێری برای دانا تاکو تۆڵەی خەڵکی لێ بسەنێتەوە، جا هەرکەس سکاڵای هەبووایە لەسەر (عەمر) کە ئەمە و ئەوە و ئەوەی بەرامبەری کردبێت، (عبداللەی کوڕی زوبێر) پێی دەگووت: ئەوەی پێی کردیت پێی بکەرەوە، سەرچاوەکان باسی ئەوەیان کردووە کە (عەمری کوڕی زوبێر) ڕووبەڕوی سزادانێکی قورس بوویەوە لەو لەو دادگاییەدا و لەژێر ئەشکەنجە و لێداندا مرد.

بەرهەڵستکاریی ئیبن زوبێر هیچ سەرکەوتنێکی بەدی نەهێنا شیاوی باس بێت، چوون لە ماوەی دوو ساڵ یان زیاتردا لە بەرهەڵستیکردنی یەزید دا هیچ گۆڕانێك ڕوی نەدا لە

پێگەی هێز و دەسەلاتی دەوڵەتەکەی لە حیجاز دا سەرباری ناوچەکانی تر، بەلام ئیبن زوبێر ئامانجی وروژاندنی ئەمەویەکان بوو بۆ فرێدانی یەزید بۆ نێو کەندەلانی ڕوبەڕووبونەوەکە، یەزید هەڵەیەکی گەورەی کرد کە سوێندی خوارد دەبێت ئیبن زوبێر لەناو تەوق و کەلەبچەدا بێت بۆلای بۆ دیمەشق، جا چۆن دەبێت هاوەڵێکی بەڕێز و بەشکۆ کە تەمەنی لە شەست ساڵ تێپەڕی کردووە مل بدات بۆ داوایەکی لەو جۆرەی (یەزیدی کوڕی معاویە).

(ئیبن زوبێر) توانی (یەزید) لەبەردەم خەڵکی حیجازدا وا پیشان بدات کە کەسێکی خۆ سەپێنە و شیاوی فەرمانڕەوایەتی موسوڵمانان نیە، ئەم ڕوداوە لە ئیبن زوبێرەوە تێڕوانینی زۆرێك لەخەڵکی گۆڕی بەوەی کە ئیبن زوبێر حەق خوازە و ڕوبەڕوی خەلیفەیەك بۆتەوە ستەم دەکا لە فەرمانەکانیدا و لادەر و ستەمکارە لە بڕیارەکانیدا.

پاشان ئەو هەڵە گەورەیەی کە (عەمری کوڕی زوبێر) تێی کەوت، سەربوردە و چیرۆکەکان باسی دەکەن کە ئەویش زۆر خۆ بەگەورزان و بەفیز و لوتبەرز و ستەمکار بووە، لاپەڕەی ژیانی پڕە لە خراپە، هەر کەس لایەنگری و دڵسۆزی بۆ (عبداللە) هەبایە دەیگرت و بە قامچی لێی دەدا، لەبەر ئەمەش بوو کە عبداللەی برای سوربوو لەسەر ئەوەی خەڵکی تۆڵەی خۆیانی لێ بکەنەوە، هەروەها یەکێکی تر لەو شتانەی هەستی خەڵکی خرۆشاند ئەو والیەی مەدینە بوو کە یەزید دایناوو کاتێك یەکەم ڕۆژی فەرمانڕەوایەتیەکەی لە مەدینە چووە سەر بڵندگۆ لەبارەی (ئیبن زوبێر)ەوە دەیگوت: خۆی لە مەککە دەشارێتەوە، سوێندبێ بەخوا هەڵەکوتینە سەری و ئینجا بەخوا گەر بشچێتە کابە، کابەی بەسەردا دەسوتێنین هەرچی دەبێت با ببێت. (پەنا بەخوا لە قسەکەی).

کاتێکیش سوپاکەی ئامادەکرد بۆ بەرەنگاربوونەوەی ئیبن زوبێر لە مەککە هەندێك لە هاوەڵان ئامۆژگاریان کرد و هۆشداریان دایە و بیریان خستەوە کە حەرام شەڕ و ئاژاوە و کوشتن لە کابە ڕەوانیە و قەدەغەیە بە بەڵگەی فەرمودەی پێغەمبەری خودا، بەلام گوێی بە ئامۆژگاریەکەیان نەدا.

مەروانی کوڕی حەکەم – کە ئەمیرێکی ژیر و سیاسیەکی بە ئاگا بوو – عەمری وریا کردەوە کە هەڵنەکوتێتە سەر کابە و پێی گوت: پەلاماری مەککە مەدە و ڕێز و حورمەتی مەشکێنە، لە ئیبن زوبێر گەڕێن ئەو چووەتە تەمەنەوە و شەست و نەوەندە ساڵە، پیاوێکی کۆڵنەدەرە، بەخوا ئەگەر نەیشیکوژن خۆی دەمرێت، ئینجا (عەمر) پێی گووت: پەلاماری دەدەین و هێرشی دەکەینە سەر لەناو دڵی کابەشدا بێت، هەرکەس چی دەڵێت با بڵێت، مەروان گووتی: بەخوا ئەوەم پێ ناخۆشە و ناڕەحەتم دەکات.

عبداللەی کوڕی زوبێر نازناوێکی کاریگەری هەڵبژاردبوو کە بەخۆی دەگوت (عائذ باللە) – پەناگر بەخوا– ، ئیدی دەستدان لە مەککە بوویە شتێك کەلای هاوەڵان و شوێنکەوتوان پەسەند نەبوو، هەردەبووایە بەرگری لە مەککە بکرێت، لەبەرامبەر سوپایەکدا کە دەی ویست شکۆ و پیرۆزی مەککە بشێوێنێت، تەنانەت ئەوەی کە ناشتوانێت بەرگری لە مەککە بکات ئەوا هاوسۆز و هاوخەمی ئیبن زوبێر دەبێت چونکە بەرگری لە ماڵی خودا دەکات.

خەلکی لە دەورووبەری (تائیف)ەوە بە لێشاو ئەهاتن بەرەو ئیبن زوبێر تا هاوکاری بکەن و پارێزگاری لە مەککە بکەن.

ئابەم جۆرە یەزید سەلماندی کە سیاسەتی نیە و کەم عەقڵ و خۆبەگەورە زانە، پاش ئەوە سوپایەکی نارد بۆ داگیرکردنی مەدینەی پیرۆز و گەمارۆدانی کابە، بەڵام خودای گەورە لەناوی بردن و تیاچوون، پاش پەلاماردانی مەدینە کە لەسەر ڕێگەی دا بوو بەرەو ئیبن زوبێر سەرکردەی سوپاکەی تیاچوو، دوای ئەویش (حصین کوڕی نمیری سکونی) سەرکردایەتی سوپاکەی گرتە دەست ، چوار شەو پێش تەواوبوونی (مانگی موحەڕەم) گەیشتە مەککە [1].

---

[1] سەرکردەی ئەو سوپایەی کە یەزیدی کوڕی معاویە بۆ پەلاماردانی مەدینەی سەرووەرە و ناچارکردنی خەلکەکەی بۆ بەیعەتدان بە یەزید ڕەوانەی کردبوو (مسلم کوڕی عوقبە)بوو، خوا ئابڕووی بکات، چونکە لەسەر ڕاسپاردەی یەزید مەدینەی داگیر کرد، خەلکی ناویان لێنا (مسرف کوڕی عوقبە)، ئینجا خوای گەورە ئەم

(حصین کوڕی نمیر) لە کێوی (حجون[1]) لای (بیری مەیمون) بارگەی خست، بەوەش کاری کرد بۆ بڵاوە پێکردنی سوپاکەی لە مەودایەکی بەرفراواندا، ئەوەش کە هانی دا بۆ ئەو کارە سروشتی ئەو جەنگەبوو کە لەدەوری مەککە ئاڵابوو.

ئیبن زوبێریش دەستی کرد بە هاندان و خرۆشاندنی خەڵکی بۆ بەرەنگاربوونەوەی سوپاکەی خەڵکی شام، ئەوانەش کە لە شەڕی (الحرە)ی مەدینەی منەووەرە تێك شکابوون هاتنە ڕیزی ئیبن زوبێرەوە، (نەجدەی کوڕی عامری حەنەفی)ش بە خەڵکێکەوە لە دەرەوە هاتن بۆلای ئیبن زوبێر بۆ پاراستنی کابە لەدەست خەڵکی شام.

ئەو جەنگاوەرانەی لەگەڵ ئیبن زوبێر بوون ژمارەیان زۆر کەمتر بوو لەو جەنگاوەرانەی کە بەشداربوون لە شەڕەکەی (الحرە)دا، هێزەکان هاوشانی یەك نەبوون، کە ئەمەش وای کرد بارودۆخەکە لە بەرژەوەندی (حصین کوڕی نمیر) بێت، بەتایبت پاش ئەوەی ئیبن زوبێر توشی لەدەستدانی باشترین هاوەڵەکانی بوو، وەکو هەر دوو براکەی (مونزیر و ئەبی بەکر) و (موصعەبی کوڕی عبدالرحمن) و (حوزافەی کوڕی عبدالرحمن کوڕی عەوام) و (عەمری کوڕی عوروەی کوڕی زوبێر).

لە ڕەبیعی یەکەمی ٦٤کۆچیدا (حوصەین کوڕی نومەیر) هەستا بە دانانی مەنجەنیق لەسەر کێوی (ئەبی قەبیس) کە کێوێکی هاوتەریبە لەگەڵ (صەفا) و کێوی (قعیقعان)، شوێن و مۆڵگەکانی ئیبن زوبێر لەبەردەم (حصین کوڕی نمیر)دا دیار و لەبەرچاوبوون، ئیبن زوبێر هیچ پەناگەیەکی نەبوو بۆ خۆپاراستنی لە بەردە گەرمەکانی مەنجەنیق، هیچ شوێنێکی بەدەستەوە نەما بە تەنها (مسجد الحرام ) نەبێت، پاش ئەوەی مۆڵگە گرنگەکانی لەپێشەوە لەدەست دا لە ئەبتەخ (أبطخ) وە لەمیانەی شەڕەکانی نێوان (ئیبن زوبێر) و (حوصەین کوڕی نومەیر) دا مەککە سوتا.

---

سەرکردەیەی لەناوبرد و هەروەها یەزیدیش کە پاش ئەو ڕاستەوخۆ لەناوچوو، نەفرەت لە ستەمکاران ((ألا لعنة الله على الظالمين)).

[1] ١. ناوی کێوێکە لە مەککە.

بەڵام یەزیدی کوڕی معاویە لە نیوەی مانگی ڕەبیعی یەکەمدا مرد و کەسیش بە مردنەکەی نەزانی لەبەر دوری ماوەی نێوان مەککە و دیمەشق، هەواڵی مردنەکەشی لە سەرەتای مانگی ڕەبیعی دووەمی ساڵی ٦٤کۆچیدا گەیشتە مەککە.

خودی مەککە مەبەست نەبوو کە بسوتێنرێت، بەڵگەش لەسەر ئەوە ئەو ترس و بیمەیە لەخودا کە هەر دوو لا پاش سوتانی مەککە دایگرتن، یەکسەر پیاوێك لە خەڵکی شام پاش سوتانی کابە هاواری کرد و ووتی: خوا هەردوولا لەناو بەرێت، بەڵام هاوەڵانی زوبێر لەگەڵ تەرمی ئافرەتێکدا هاتنە دەرەوە.

لە بەرەبەیانی ئەو شەوەی کە ئاگرەکە بەربووە کابەوە لەترسی ئەوەی نەکا سزای خودا ببارێتە سەریان، ئیبن زوبێر سوژدەی دەبرد و دەیگوت: ((خودایە من ئەوەی ڕوویدا مەبەستم نەبوو، بەندەکانی خۆت بەهۆی تاوانەکەی منەوە لەناو مەبە، ئەمەش سەری کەچمە لەبەردەستی تۆدایە)).

کاتێك هەواڵی مردنی (یەزید) گەیشتە (حوصەین کوڕی نومەیر) ناردی بەشوێن ئیبن زوبێردا و ووتی: شەوەکەی ئەبتەخ شوێن و کاتی یەکتر بینینمان بێت، دەیویست لەگەڵی کۆببێتەوە و دانوستانی لەگەڵ بکات لەسەر خەلافەت، پاشان کۆبوونەوە و کاتێکی زۆر قسەیان لەگەڵ یەك کرد، مشتومڕ و قسە لەنێوانیاندا گەرم بوو، یەکێك لەو قسانەی کە حوصەین بە ئیبن زوبێری گوت ئەوەبوو کە بانگی دەکرد بۆ خەلافەت و دەیگوت: ئەگەر ئەم پیاوە لەناوچوو بێت ئەوا تۆ باشترینی کەسی بۆ ئەم کارە، خێراکە با بەیعەتت بدەینێ، ئینجا وەرە لەگەڵم بۆ شام، ئەو سەربازانەی لەگەڵمن شۆڕەسوار و گەورەکانی خەڵکی شامن سوێند بەخوا دوو کەس لەسەرتۆ ناکۆك نابن گەر خەڵکی پارێزراو بکەیت و ئەو خوێنانەش کە لەنێوانی من و تۆدا ڕژان، ئەوەش کە لەنێوان ئێمە و خەڵکی ئەم (حەرە)یەدا ڕژان وازیان لێبێنیت.

عبداللە گووتی: من ئەم خوێنانە واز لێبێنم؟ سوێند بەخوا خوێنی یەك پیاویان نادەم بە خوێنی دە پیاوی ئێوە.

حوصەین بە چپەوە قسەی لەگەڵ دەکرد و ئەویش بە ئاشکرا و دەنگی بەرز دەیگوت: نا بەخوا نایکەم.

ئیدی حوصەین پێی گووت: خوا ڕوی ئەوە ڕەش بکات کە لەمە بەدوا بە دانا و ژیرت دابنێت، من بۆچوونێکم بۆتۆ بەمێشکدا هات، مەگەر نامبینی بە چپەوە قسەت لەگەڵ دەکەم کەچی تۆ بە دەنگی بەرز وەڵام دەدەیتەوە، من بەڵێنی خەلافەتت پێ دەدەم تۆش بەڵێنی کوشتن و لەناوچوون.

پاش ئەوەی تەواو بوون لە دانوستان و یەکتریان جێهێشت (عبدالله) هەستی بە هەڵەکەی خۆی کرد لە هەڵوێستیدا بەرامبەر حوصەین کاتێک پێشنیاری خەلافەت و یاوەرێتی کرد بۆی بەرەو وڵاتی شام، ویستی ئەم هەڵوێستە چاك بکاتەوە لەو کاتەدا کە حوصەین خۆی ئامادە دەکرد بە سوپاکەیەوە بگەڕێتەوە بۆ شام ناردی بەشوێنیدا و پێی گوت: ئەوەی کە من بێم بۆ شام کارێکە نایکەم، هەروەها حەزم لێ نیە لە مەککە دەرچم، بەڵام ئەگەر لەوێوە بەیعەتیان پێدام، ئەوا من ئاسایش و دادگەریتان بۆ دەستەبەر دەکەم.

حوصەین بەم جۆرە وەڵامی دایەوە: بزانە ئەگەر تۆ خۆت نەهاتی و بینیت کەسانێکی زۆر لە خەڵکی ئەم ماڵە داوای خەلافەتیان کرد و خەڵکیش هاتن بەدەمیانەوە، ئەوا خەتای من نیە و من دەستم نیە تیایدا.

ڕەنگە ئەوەی کە ئیبن زوبێر پەرچی پێشنیارەکەی سەرکردەی سوپاکەی شامی دایەوە نەبوونی متمانەبوونێت پێی، بەتایبەت لەوەی کە ئەو بە چپەوە پێی دەگوت و بەڵێنەکەی پێ دەدا، سەرباری ئەوەی کە هاوەڵەکانی زوبێر ڕقیان لەم سەرکردەیە و سوپاکەی شام بوو، چونکە پەلاماردانی مەدینەیان بە ڕەوا دانابوو، ئەوەی ویستیان کردیان تیایدا لە کوشت و بڕی نەوەی خەڵکەکەی کە هاوەڵانی پێغەمبەری خودا – درودی خوای لێبێت – و نەوەکانی ئەوان بوون، پیرۆزییەکانی خودایان شکاند، جا ئیتر چۆن ئیبن زوبێر دڵنیا بێت و باوەڕیان پێ بکات تا لەگەڵیان بچێت بۆ شام؟!

***

# عبداللەی کوڕی زوبێر
# وەك خەلیفەی موسوڵمانان پاش ئەوەی بەیعەت وەرگیرا بۆی
# لە زۆربەی وڵاتانی موسوڵمانەوە

یەزیدی کوڕی معاویە بەرواری ڕەبیعی یەکەمیساڵی ٦٤ك کە تەمەنی ٣٨ ساڵ بوو مرد و مردنەکەشی لە گوندێك بوو لە گوندەکانی (حمص) پێی دەوترا (حوارین) لە خاکی شام، بە ووتەی هەندێك کەس ماوەی فەرمانڕەوایەتیەکەی سێ ساڵ و شەش مانگ بوو، هەندێکی تر دەڵێن هەشت مانگ بووە.

دوای ئەوە (معاویە)ی کوڕی کوڕی خەلافەتی گرتە دەست کە پیاوێکی لەخواترس و خۆپارێز و پشت لەدونیاکردوو بوو، بەپێی ووتەی مێژوو نوسان و ژیننامەزانان.

ساڵی ٤٤ك لەدایك بوو لە خانەوادەی خەلافەتدا و بەیعەتی بۆ وەرگیرا.

مێژوزانان ڕاجیان لەبارەی ماوەی فەرمانڕەوایەتی (معاویەی کوڕی یەزی)دەوە، ڕا جیاییەکەش لەنێوان بیست ڕۆژ بۆ سێ مانگدایە، هەندێك لە مێژوزانان چل ڕۆژ بە ڕاست دەزانن، بەدرێژایی ماوەی فەرمانڕەوایەتیەکەی نەخۆش بووە، لەبەر ئەمە هیچ کارێك لەماوەی فەرمانڕەوایەتیەکەیدا کاریگەری لێ نەکرد، تەنانەت نوێژەکەش (زەحاکی کوڕی قەیس) بە خەڵکی دەکرد، هەروەها کاروبارەکانی بەڕێ دەکرد، هەر (زەحاك) تا دوای مردنی معاویەش هەر خۆی بەرنوێژی بۆ خەڵکی دەکرد، تا ئەو کاتەی کە کاروبارەکان یەکلابوونەوە و جێگیر بوون بۆ (مەروان) لە شام.

کاتێك (معاویەی کوڕی یەزید) هەستی کرد مردن لێی نزیك بۆتەوە لەناو خەڵکیدا بانگی دا. (الصلاة جامعة)، وتارێکی بۆدان، بەشێك لەو قسانەی کە کردی ئەوەبوو فەرمووی: ئەی خەڵکینە من کاروباری ئێوەم گرتە دەست لەکاتێکدا لاوازبووم تیایدا، ئەگەر پێتان خۆش بوو جێی دێڵم بۆ پیاوێکی بەهێز، وەك چۆن ئەبوبەکری صدیق جێی هێشت بۆ عومەر، گەر ویستتان جێی دێڵم بۆ ڕاوێژ لە شەش کەسدا وەك چۆن عومەری کوڕی خەتاب جێی هێشت، ئەگەریش کەسێك نەبوو لەناوتاندا بۆ ئەو کارە باش بێت و کاروباریشتانم جێ هێشت ئەوا ڕادەستی ئەو کەسەی بکەن گونجاوە و خۆتان بەباشی دەزانن.

پاشان دابەزی و چووە خانوەکەیەوە نەهاتە دەر هەتا مرد.

لە گێڕانەوەیەکی تردا بۆ وتارەکە (ئیبن أثیر) دەیگێڕیتەوە فەرمویەتی: ((من لاوازبووم لە کاروباری ئێوەدا، حەزم کرد وەکو عومەری کوڕی خەتاب بکەم کاتێك ئەبوبەکر کردی بە جێنشینی خۆی، بەڵام کەسێکی وام نەبینی، پێم خۆش بوو شەش کەس بخەمە ڕاوێژەوە وەکو ئەو شەش کەسەی کە عومەری کوڕی خەتاب ڕاوێژ و هەڵبژاردنی بۆ کردن بەڵام شەش کەسی وام نەدۆزیەوە، کەواتە خۆتان لەپێشترن بۆ کاروباری خۆتان، هەڵی بژێرن ئەو کەسەی کە بەباشی دەزانن))، ئینجا چووە ماڵەکەی خۆیەوە و دیار نەما هەتا مرد.

ئەم هەڵوێستەی بە بەڵگەیەك دادەنرێت کە ئەو ڕازی نەبووە بە گۆڕینی خەلافەت لە ڕاوێژەوە بۆ بۆماوەیی، ڕازی نەبووە پەیمان بە کەسێك لە خانەوادەی خۆی بدات کاتێك پێیان گووت: یەکێك بکە بە جێنشینت لە خانەوادەی خۆت، فەرمووی: بەخوا شیرینی خەلافەتی ئێوەم نەچەشتووە ئیتر چۆن تاڵیەکەی لە ئەستۆ دەگرم، ئێوەش پەلەی شیرینیەکەی بکەن و منیش پەلەی تاڵیەکەی، خودایە من بێ نیاز و بێ بەریم لێی، دەستم لێ هەڵگرتووە[1].

---

[1] - سەیری (مروج الذهب)ی (مسعودي) بکە.

لە گێڕانەوەیەکی تردا هاتووە پێی گوتراوە: ئایا ڕاسپاردە و وەسیەت ناکەیت؟ فەرمووی: تاڵیەکەی زیاتر ناکەم، شیرینیەکەی جێدێڵم بۆ بەنی ئومەییە.

بەڵێ بەم جۆرە معاویەی کوڕی یەزید لەتاو لاویدا کە بیست و یەك ساڵ بوو یان دەڵێن بیست و سێ ساڵ بووە یان کەمتر لەو ماوەیە کۆچی دوایی کرد – بەڕەحمەت بێت – ، هیچ کەسی ڕانەسپارد لەدوای خۆی بۆ خەلافەت بەڵکو جێی هێشت بخرێتە ڕاوێژەوە لەنێوان موسوڵماناندا وەك چۆن بوو لە پێشتردا.

برایەکی بچوکی هەبوو بەناوی (خالیدی کوڕی یەزید)، دەستەیەك لە سەربازەکانی شام پێیان باش بوو بەیعەت بدەن بە ئیبن زوبێر بۆ خەلافەت لەوانیش (زەحاك کوڕی قەیس)ی ئەمیری شام، بەڵام زۆرینەی سەربازەکانی شام وەکو (حسان کوڕی مالیك) سەرکردەی هۆزەکانی یەمەن کە خاڵوانی یەزیدی کوڕی معاویە بوون پێیان باش بوو کاروباری خەلافەت لە دەستی بەنی ئەمەویەدا بمێنێتەوە ئەگەرچی لە باڵی مەروانیەکانیشدا بێت، لەبەر نەبوونی کەسێك کە گونجاو بێت لە باڵی سوفیانیەکانی بەنی ئومەییەدا، ئیدی ئەوە بوو کۆنگرەی (جابیە) بڕیاری لەسەر هەڵبژاردنی (مەروانی کوڕی حەکەم) دا وەك جێنشین وەك پێشتر باسمان پێکرد.

ئیبن زوبێریش لە حیجاز و عێراق و میصر و ئەوپەڕی وڵاتی مەغریب و هەندێك لە دەورووبەری شام بەیعەتی خەلافەتی پێدرابوو.

لە دیمەشق (زەحاك کوڕی قەیسی فەهری) و لە حیمص ( نوعمان کوڕی بەشیر) و لە قنسرین ( زەفەری کوڕی حارسی کیلابی) و لە فەلەستین (ناتل کوڕی قەیس) بەیعەتیان پێدا و (ڕوح کوڕی زنباعی جوزامی) بە خەلافەتەکەی ڕازی نەبوو و لێی دەرچوو.

بەیعەتەکەی وەك (ئیبن کثیر) باسی کردووە لە ساڵی ٦٤کۆچیدا بوو، خەلافەتەکەشی بەردەوام بوو هەتاکو لە ساڵی ٧٣کۆچیدا کوژرا، لە شامدا بەیعەتی خەلافەت نەدرابوو بە ئیبن زوبێر جگە لە دیمەشق و نوێنەرەکانی دیمەشق لە وڵاتی ئەردەن چونکە پاش ئەوە بەیعەتیان دابوو بە (مەروانی کوڕی حەکەم).

بەو بەیعەتانە لە شام و یەمەن و خوڕاسان و عێراق و میصر و حیجاز عبداللەی کوڕی زوبێر بوویە جێنشینی ڕەوا و شەرعی موسوڵمانان و زانایان و مێژونوسانیش دانیان بەمەدا ناوە.

(ئیبن کثیر) لە کتێبی (البدایة والنهایة) دەفەرموێت: ئیبن زوبێر پاش مردنی معاویەی کوڕی یەزید بێ هیچ گومانێك ژیرتر و فامیدەتر بوو لە مەروانی کوڕی حەکەم کە لەگەڵی بەشەڕهات و دژایەتی کرد پاش ئەوەی هەموو کۆدەنگ بوون لەسەری و لە ئاسۆ دورەکانیشەوە بەیعەتیان پێدا و کارەکەی بۆ جۆر بوو.

بەمەش مەروان و کوڕەکەی کە لەپاش خۆی هات بە ستەمکار و دەرچوو دادەنرێن لە خەلافەتە شەرعیەکەی ئیبن زوبێر هەتا کۆچی دوایی ئیبن زوبێر، هەروەها زانایان ئیبن زوبێر بە خەلیفەی موسوڵمانان دادەنێن لەپاش مردنی معاویەی کوڕی یەزید، مەروانی کوڕی حەکەم و کوڕەکەشی (عبدالملك) بە ستەمکار و یاخی دانراون چونکەی ڕای گشتیی و کۆدەنگیی هەموانیان بەدەستنەهێنا پاش کوژرانی ئیبن زوبێر نەبێت.

کەواتە (عبدالملك)یش بە جێنشین دانانرێت ئەوکات نەبێت کە توانی ئیبن زوبێر لەناو ببات و ولاتانی ئیسلام بخاتە ژێر ڕکێفی خۆی و کۆدەنگی هەمووان بەدەست بێنێت بۆ جێنشینیەکەی.

ئەگەرچی عبداللەی کوڕی زوبێر توانی پەیمان و بەیعەتی زۆرینەی ولاتانی ئیسلامی بەدەست بێنێت وەك پێشتر ئاماژەمان پێکرد کەچی نەیتوانی بەیعەت لە محمدی کوڕی حەنەفیە (کوڕی ئیمامی علی) و هەروەها ئیبن عومەر ڕەزای خوایان لێبێت وەربگرێت.

چون ئیبن عومەر بەیعەتی دابوو بە یەزیدی کوڕی معاویە بۆ جێنشینی و هەوڵیشی دا ئیبن زوبێر قایل بکات کە دەرنەچێ (خروج نەکات) لە خەلافەتی یەزید و ئاژاوە و فیتنە هەڵنەگیرسێنێت بەو کارەی.

پاش کۆچی دوایی معاویەی کوڕی یەزید ئیبن عومەر هەر بەیعەتی نەدایە عبداللەی کوڕی زوبێر ئەگەرچی ئیبن زوبێر داوای بەیعەتیشی لێ کردبوو، ئەم وتەیەی کردبووە پاساوی پەرچکردنەوەکەی: دەستم ناخەمە ناو دەستەیەکی ناکۆکەوە، دەستیشم

ناگێڕمەوە لە کۆمەڵەیەکی یەکڕیز.(واتە چوونە ناو کۆمەڵم پێ باشترە لە دەستەیەکی ناکۆکی خوان).

ئیبن زوبێریش زۆری لێ نەکرد و ناچاری نەکرد بۆ بەیعەت دان وەک چۆن جێنشینەکانی بەنی ئومەییە و بەنی عەباس ئەو کارەیان دەکرد، ئەگەرچی بەیعەت نەدانی ئیبن عومەر کاریگەرییەکی نەرێنی لەسەر جێنشینیەتی ئیبن زوبێر هەبوو لە وڵاتی حیجاز بەڵام نەبووە هۆی مەترسی بۆسەر خەلافەتەکە لەبەر ئەوەی ئەمای کورسی و دەسەڵاتی نەبوو.

هەروەها ئیبن عەباس – ڕەزای خوای لێبێت– و ئیبن حەنەفیە بەیعەتیان نەدایە ئیبن زوبێر و هەرکامیان دەیگوت ئەگەر ئەوی تر بەیعەتی دا، ساڵی ٦٤ک داوای بەیعەتی لێکردن بۆئەوەی گشت وڵاتان لەسەری کۆ دەنگ بن و خەڵکی پێک بێن لەسەری، ئەوانیش پێیان ڕاگەیاند کە هیچ لاریەک پیشان نادەن.

بەڵام پەرتوکەکانی مێژوو و ژیننامە باسی ئەوە دەکەن کە ئیبن عەباس – ڕەزای خوای لێبێت – هاریکار بووە لەگەڵ ئیبن زوبێردا لە فەرمانڕەوایەتی و جێنشینیەکەیدا بەجۆرێك وەک دادوەر لە مەککە کاری کردووە بەڵام دواتر پەیوەندیەکەیان ڕو لە گرژی دەکات و دەبێتە هۆی دەرچوونی ئیبن عەباس لە مەککەوە بەرەو (تائیف).

سەبارەت بە ئیبن حەنەفیەش، ئیبن زوبێر لەسەرەتادا هەوڵی نەدا ناچاری بکات لەسەر بەیعەت پێدان، هەروەها بەردەوامیش نەبوو لەسەر سیاسەتی نەرمونیانیانەی لەگەڵ ئیبن حەنەفیەدا، ئینجا پاش ئەوەی پێگە و پلەی بەرزبوویەوە و بەیعەتی لە هەموو شار و ناوەدانیەکەوە بۆهات و خەریکە ئوممەت لەسەری کۆدەنگ دەبن هەستی کرد کاتی هاتووە ئیبن حەنەفیەش بەیعەتی پێ بدات لەسەر بەڵێنەکەی خۆی، بۆیە جارێکی تر داوای بەیعەت پێدانی لێکرد ساڵی ٦٥ک، بەڵام ئیبن حەنەفیە ڕازی نەبوو بەیعەتی پێ بدات، ئیبن زوبێریش لە بەندی کرد. تەنانەت (موختاری سەقەفی) سوپایەکی نارد بۆ دەربازکردنی ساڵی ٦٦ک، بەڵام ئیبن حەنەفیە خۆی بێ نیازکرد لە موختار و نکوڵی کرد کە ناردبێتی بۆ عێراق بەدوایدا وەک چۆن موختار بانگەشەی ئەوەی دەکرد.

سەبارەت بە ئیبن زوبێریش هەستی کردبوو کە سەرچاوەی هێزی ئیبن حەنەفیـە خـۆی حەشارداوە لە پاڵپشتی مختاری کوڕی ئەبی عوبەیدەدا بۆی، لەبـەر ئـەوە بـیری کردەوە (موختار) لەناو ببات هەربۆیە (مصعەب)ی بـرای کـە والـی بەصـرە بـوو نـارد و فـەرمانی پێکرد بەرەنگاری موختار ببێتەوە. موصعەب توانی لە ڕەمەزانی سـاڵی ٦٧ك دا موختـار لەناو ببات.

کوشتنی موختار بوویە هۆی لەق بوونی پێگـەی ئـیبن حەنەفیـە لـە مەککـە و شـلۆق بوونی دۆخەکەی، ئیبن سەعد دەگێڕێتەوە کە: ئیبن زوبێر برایەکی خۆی کەناوی (عوروە) بوو نارد بۆلای ئیبن حەنەفیە تا داوای لێ بکات بەیعـەتی پـێ بـدات و هەڕەشـەی شـەڕی لێکرد ئەگەر سوربێت لەسەر پەرچکردنەوەی بەیعەت، لەم هەڕەشەیە و فشارەکانی ئیبن زوبێردا دەرفەتێك بۆ ئیبن حەنەفیە و دەربازگەیەکی بۆ هەلکەوت ئـەویش سـریتی بـوو لـە بانگێشتکردنی لەلایەن عبدالملکی کوڕی مەروانەوە بۆئەوەی بگاتە شام، دەستبەجێ ئەم دەرفەتەی قۆستەوە و ڕوی کردە شام بەخۆیی و شـوێنکەوتوانیەوە، هـەروەها ناوچـەی (بەئیلە)یان هەڵبژارد لەسەر کەناری دەریای (قلزم)، ئەم شارە ئەگەرچی لـە ولاّتـی شـام بوو ناوچەی هێز و دەسەلاّتی عبدالملکی کـوڕی مـەروان بـوو کەچـی ئـەو لـە چـوارلایەوە بەرەو حیجاز و بەنزیکی ناوچەیەکی دور بوو لە دەسەلاّتی هەردووکیانەوە.

بەلاّم عبدالملك کوڕی مەروان پێشنیازی بەیعەتدانی بۆکرد لەبەرامبـەر مـاڵ و سامان و هەندێك خـەلاّت و بەخشـیندا یـان دەرچـوون لـە ولاّتـی شـام، ئـیبن حەنەفیـەش بەیعـەت نەدانی هەڵبژارد و ویستی بگەڕێتەوە بۆ مەککە بەلاّم ئیبن زوبێر نەیهێشت بێتـەوە نـاوی، ئیدی ڕوی کردە (تائیف) و دەشڵێن ڕوی کردۆتە (مەدینە) و لەوێ مایەوە هەتا ئەو کاتی کە ئیبن زوبێر کوژرا لەلایەن حەجاجی کوڕی یوسفی سەقەفیەوە ساڵی ٧٣ك.

سەبارەت بە هەڵگەڕاوەکانیش بە دوو قۆناغدا تێپەڕین لە بەیعەت دان بە ئیبن زوبێـردا ، سەرەتا خەواریجەکان هاوپەیمانێتیان بەست لەگەڵ ئیبن زوبێردا لـە بـەرگری کـردن لـە مەککە تاکاتی مردنـی یەزیـد، ئینجا کاتێك مەترسی ئـەما سـەرکردەکەیان چـووە نـاو مەککەو کابەوە و ویستی بزانێت ئیبن زوبێر ڕای چیە سـەبارەت بـە (عوسمانی کوڕی

مەنفان) ئەویش وەڵامێکی دانەوە کە ئەوان بە دڵیان نەبوو، ئەوەی پێی وەصف دەکرا بۆی باسکردن لە باوەڕ و ڕاستگۆیی، دادوەری و چاکەکاری و گەڕانەوە بۆ ڕاستی، لەو کاتەدا پشتیان تێی کرد و لێی جیابوونەوە و چوون بەرەو وڵاتی عێراق و خۆراسان و بڵاوبوونەوە تیایدا.

بۆ بەرەنگاربوونەوەیان (ملهب کوڕی ئەبی صفرە) دانرابوو، ئیبن زوبێر نامەی بۆی نوسی کە بەرەنگاربوونەوەیان لە ئەستۆ بگرێ و ئەویش فەرمانەکەی بەجێ هێنا، سەرکردایەتی خەواریجەکانی ئەزاریقە (نافیعی کوڕی ئەزرەق) بوو، (مهلب کوڕی ئەبی صفرە) توانی تێکیان بشکێنێت و فەرماندەکەشیان (نافیعی کوڕی ئەزرەق) بکوژێت، ئینجا سوپا بەزیوەکەیان ڕایان کرد بەرەو وڵاتی فارس.

هەرچی (مەروانی کوڕی حەکەم)ە لەسەرەتادا دەسەڵاتی لە دیمەشقدا چڕبووبوویەوە کاتێك ئیبن زوبێر خۆی ڕاگەیاند وەك جێنشینی موسوڵمانان و زۆرینەی موسوڵمانان و کاربەدەست و فەرمانڕەوایان پەیمانیان پێدا (بەیعەتیان پێدا) وەك باسمان کرد، ئیبن سەعد دەگێڕێتەوە خودی (مەروان)یش خۆی بەکلاکردەوە کە بەیعەت بداتە ئیبن زوبێر کەچی (عوبەیدوڵای کوڕی زیاد) و (ئەمەویەکان)ی شام پێشنیاری بەیعەت نەدانیان بۆکرد، ئەویش داواکەیانی پەسەند کرد، بەتایبەت کە کۆنگرەی (جابیە)یان بەست و پاڵێورا بۆ پۆستی خەلافەت (جێنشینی) و لەڕوی تەمەنەوە گەورەترینی ناو بەنی ئومەییە بوو.

مەروان کوڕی حەکەم و ئەوانەشی لەگەڵی بوون، بوونە بەرهەڵستکارانی فەرمانڕەوایەتی ئیبن زوبێر، یەکەمین شت کە مەروان پێی هەستا هەوڵی یەکخستنەوەی هەرێم و ئەو ناوچانەی دا کە سەر بە دەوڵەتی بەنی ئومەییە بوون لە فەرمانڕەوایەتیدا، وەك ئەوەی دەوڵەتی ئیسلامی بووبێتە میرات بۆ ئەمەویەکان، بەمەش مەروان بەو کەسە دادەنرێت کە درز و دووبەرەکی خستە نێو موسوڵمان لەکاتێکدا کە یەکریز بوون لە گوێڕایەڵی و ملکەچبوونیان بۆ (ئیبن زوبێر)ی جێنشینی ڕەوای موسوڵمانان .

کۆنگرەی جابیە کێشەی جێنشینی لەنێوان خودی ئەمەویەکاندا چارە کرد، بەتایبەت پاش ئەوەی پۆستەکە بۆ مەروانی کوڕی حەکەم یەکلابوویەوە، کە ئەوەش هەنگاوێکی یەکلاییکەرەوە بوو، بەڵام هەرواش ئاسان نەبوو هێشتا چەندین ئاستەنگ و بەربەستی گەورە و کێشە و گرفت و شەڕ لەبەردەمیدا بوو لەلایەن بەرهەڵستکارانیەوە، وەك (ضحاك کوڕی قەیس) گەورەی (قیسیەکان) کە پشتیوانی ئیبن زوبێر بوو، پاش کۆنگرەکە چوو بۆ مێرگی (راهط) و (نوعمانی کوڕی بەشیری ئەنصاری) هاتە ریزەکانیەوە، دواتر چوو بۆ حیمص و (زەفەر کوڕی حارسی کیلابی) هاتە ریزیەوە کە ئەمیری (قنسرین)بوو، ڕوون بوو کە ئەوان خۆیان ئامادە دەکەن ڕووبەڕووی ئەمەویەکان ببنەوە، پێویست بوو لەسەر مەروانیش کە بیسەلمێنێت ئەو پیاوی بەرپرسیارێتیە و هەڵگری بار و بەرپرسیارێتی خەلافەتە و بەرگری لێدەکات و پشتیوانەکانیشی یەکەمین سەرکەوتنیان بەدەستهێنا بۆی بە دەستگرتن بەسەر دیمەشقدا و دەرکردنی پاشماوەی (ضحاك) لێی.

پاشان مەروان هەستا بە ئەیارکردنی پشتیوانەکانی لە هۆز و تیرەکانی (کەلب و غەسان و سەکاسك و سکون)ی یەمەنی لە شامدا، (عەمری کوڕی سەعید)ی کردە دەستە ڕاستی خۆی و (عوبەیدولا کوڕی زیاد)یشی کردە دەستە چەپی، پاشان ڕوی کردە مێرگی (راهط) و شەڕێکی گەرم ڕوویدا، ئەم شەڕە دۆخەکەی لە شام بۆ بەنی ئومەییە و بەتایبەتیش مەروان یەکلاکردەوە، بەجۆرێك (قیسیەکان) کە پشتیوانی ئیبن زوبێر بوون تێکشکان، هەروەها (زەحاکی کوڕی قەیس) و ژمارەیەکی زۆریش لە گەورەپیاوانی (قەیس) لە شام کوژران، شایانی باسە ئەم شەڕە لە کۆتایی ساڵی ٦٤کۆچیدا بوو گوتراویشە: ساڵی ٦٥ك بووو ماوەی نزیکەی بیست ڕۆژی خایاند.

ئەم شەڕە خاوەندارێتی و دەسەڵاتی گێڕایەوە بۆ بەنی ئومەییە پاش ئەوەی مەترسی ڕوخان و لەناوچونی لەسەربوو، هەروەها دەسەلات لە باڵی سوفیانیەوە چوویە دەست باڵی مەروانی.

ئیجا ئەمەویەکان ڕزگاریان بوو لە (زەحاکی کوڕی قەیس) کە بە ئۆپۆزسیۆنێکی بەهێز دادەنرا بەرامبەر ئەمەویەکان و شوێنکەوتوویەکی ئەڵقەلەگوێ و دڵسۆز بوو بۆ ئیبن زوبێر[١].

(قنسرین) کەوتە دەستی ئەمەویەکان و (زەفەری کوڕی حارس) کە فەرمانڕەوای ئەوێ بوو هەڵات بۆ (قەرقیسیا) کە (عیاضی حارسیی) فەرمانڕەوای بوو.

(فەلەستین) کەوتە دەستی ئەمەویەکان.

(حیمص) کەوتە دەستی ئەمەویەکان و (نوعمانی کوڕی بەشیر)ی فەرمانڕەوای ئەوێ کوژرا، کە یەکێك بوو لە کاریەدەستەکانی ئیبن زوبێر.

بیری هۆزپەرستی کەوتە نێو شانۆی سیاسەتی باڵای دەوڵەتەکەوە، ئەگەر ڕۆژی مێرگی (راهط) کەلبیەکان سەریش کەوتبێتن ئەوە سەرکەوتنێکی کاتی بووە، ململانێی نێوان هەردوو باڵی (قیسیەکان) و (یەمەنیەکان) یەکێك بوون لە هۆکارەکانی داڕمانی دەوڵەتی ئەمەوی.

کەوتنی ئەو وڵاتانەی پێشتر سەرەتای کۆتایی ئیبن زوبێر بوو.

لەکاتێکدا مەروان پشتی بە پیاواتی زیر و فێڵباز لە شەڕدا دەبەست وەك ( حوصەین کوڕی نومەیر) و (عەمری کوڕی سەعید)، ئیبن زوبێریش سیاسەتێکی تری هەبوو بە بەشداری پێ نەکردنی پێڕەوانێك لە شەڕدا، کە ئەمە بووە هۆی ئەوەی (ضحاك) شاری دیمەشق جێ بهێڵێت بەبێ ئەوەی هیچ هێزێکی لێبێت بتوانێت بیپارێزێت وێڕای گرنگیەکەی، ئەمەش ئاسانکاری کرد بۆ ئەمەویەکان دەستبگرن بەسەریدا و هەرچی لەناویدایە لە ماڵ و سامان دەستی بەسەردا بگرن.

دەگێڕنەوە (مەروانی کوڕی حەکەم) کاتێك سەری (زەحاك)یان بۆ هێنا پێی ناخۆش و گوتی: ئێستا کە تەمەنم گەورەبووە و ئێسکم ڕوکاوەتەوە و باریك بووە، تەمەنێکی

---

[١] . سەیری (الکامل في التأریخ)ی (ئیبن ئەسیر) بکە.

کورت و کەمم ماوە، ئایا پاش ئەوەی گەورەبووم و لاوازبووم وام لێهاتووە لەسەر پۆست و پایە بەشمشێر بکوژم و ببڕم.

لە گێڕانەوەیەکی تردا لە مالیکەوە وتی: ماوەی چل ساڵ قورئانم خوێندەوە ئینجا وام کرد کە کردم لە خوێن ڕشتن و ئەم شتانە.

پاش ئەم شەڕە مەروان توانی دەست بگرێت بەسەر میصردا کە سەر بە قەڵەمڕەویی ئیبن زوبێر بوو بەجۆرێك ساڵی ٦٥ك کەوتە دەستی و دوو مانگ تیایدا مایەوە و پاشان گەڕایەوە بۆ شام و (عبدالعزیز)ی کوڕی کردە فەرمانڕەوای ئەوێ، واتە گرنگترین ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی ئیبن زوبێر کەوتنە دەستی مەروانەوە.

هەروەها مەروان هەستا بە ئامادەکردنی دوو هەڵمەت دژی ئیبن زوبێر بۆ سەندنەوەی عێراق و حیجاز لە دەستی، بەڵام هیچ پەرەسەندنێکی بەدی نەهێنا لە گێڕانەوەی عێراق و حیجاز بۆ ژێر دەستی خۆی، چونکو مردن یەخەی پێگرت و کۆچی دوایی کرد، هەڵمەتەکەش لە ڕێگەی خۆیدا بوو و (زەفەری کوڕی حارس) لە (قەرقیسیا) گەمارۆدرابوو.

پاش مەروان پۆستی جێنشینی بۆ (عبدالملك)ی کوڕی بەجێما، کە باوکی پەیمانی پێدابوو دوای خۆی ئەو جێگرەوەی بێت، پاش ئەوەی مەروان بڕیارەکانی کۆنگرەی جابیەی هەڵوەشاندەوە کە دانرابوو (عەمری کوڕی سەعیدی ئەشدەق) و (خالیدی کوڕی یەزیدی کوڕی معاویە) بکرێنە جێنشینی، ئەوەش پاش سەرکەوتنی لە گێڕانەوەی میصر بۆ ژێر دەسەڵاتی ئەمەویەکان.

(عەبدولەمەلیکی کوڕی مەروان) توانی دوبارە دەوڵەتی ئەمەوی دابمەزرێنێتەوە بە چەندین شەڕ وەك باسمان کرد، پاش ناردنی هەڵمەتی کۆتایی بۆ سەندنەوەی مەککە و مەدینە لە ئیبن زوبێر کە ئەو هەڵمەتە هەڵمەتێکی بەناوبانگ بوو تیایدا ناوبانگی حەجاجی سەقەفی بڵاوبوویەوە و دەسەڵات و پێگەی بەرز بوویەوە.

(٤)

# حەجاجی کوڕی یوسفی سەقەفی و ئیبن زوبێری جێنشین

- سەرەتای دەرکەوتنی حەجاجی کوڕی یوسف. پێش پەلاماردانی ئیبن زوبێر لە مەککە.

- گەمارۆدانی ئیبن زوبێر لە مەککە. لەلایەن حەجاجەوە و بۆردومانکردنی کەعبە (بیت الحرام) بە مەنجەنیق.

- لەنێوان حەجاج و ئەسمای کچی ئەبوکردا - ڕەزای خودا لە خۆی و باوکی- . (هەڵوێستی ئیبن عومەر - ڕەزای خوای لێبێت - بەرامبەر ئاژاوەکە و حەجاج).

# سەرەتای دەرکەوتنی حەجاجی کوڕی یوسفی سەقەفی

حەجاجی کوڕی یوسفی سەقەفی لەهۆزی (سەقیف)ە و ساڵی ٤١کۆچی لە (تائیف) لەدایك بووە، ئەو ساڵەی کە موسوڵمانان کۆدەنگ بوون لەسەر پەیمان دان بە دانانی معاویەی کوڕی ئەبو سوفیان وەك جێنشین پاش ئاشتبوونەوە و ڕێککەوتنی لەگەڵ (حەسەنی کوڕی عەلی) – ڕەزای خودایان لێبێت–، ناوی کولەیب (کُلَیب[1]) بوو پاشان ناوی خۆی گۆڕی بە (حەجاج[2]) ناوی دەرکرد پێی.

دایکیشی بریتیە لە (فاریعە کچی هومامی عوروەی کوڕی مسعودی سەقەفی)، کە عوروە هاوەڵێکی ناسراوی پێغەمبەر بووە، پێشتر چیرۆکی موسوڵمان بوونی و کوژرانیشی بەدەستی هۆزەکەی کە بانگی کردن بۆ ئیسلام خرایە ڕوو.

زنجیرەی ڕەچەڵەك و درەختی خێزانەکەی وەك مێژوزانان باسیان کردووە: (حەجاج) کوڕی (یوسف)ی کوڕی (حەکەم)ی کوڕی (ئەبی عەقیل) کوڕی (مەسعود)ی کوڕی

---

[1] - کُلَیب: ناوی بچکۆلەکراوەی (کَلب)ە، بەنزیکی واتای (توتکە سەگ) دەدات، کە ئەم ناوانە لەسەردەمە کۆنەکاندا باوبوون و خەڵکی و بەتایبەت عەرەبەکان منداڵەکانی خۆیان بەناوی باڵندە و مار و مێرو ئاژەڵانی کێوی و زۆر شتی سەیرترەوە ناودەنا.

[2] - حجاج: واتا ئەو کەسەی کە زۆر حەج دەکات یان ئەو کەسەی کە هەمیشە بەلگەی بەهێزی پێ یە بۆ قسەکانی، یاخود مانایەکی تریشی هەیە واتە ئەو سەگەی کە ئێسقان زۆر دەشکێنێت (سەگی هار)...( تێبینی: ئەمەی کۆتاییان لە حەجاجەوە نزیکترە چونکە لەسەرەتای ئەم پەرتوکەدا ئاماژەیەکی وای تێدایا گوایا ناسوری حەجاجی وەرگرتووە لەبەر ئەوەی ئێسك و پروسکی زۆر مرۆڤی شکاند بە زۆر و ستەمەکانی ..) والله أعلم.

(عامر)ی کوڕی (متعب)ی کوڕی (مالیک)ی کوڕی (عەمر)ی کوڕی (سەعد)ی کوڕی (عەوف)ی کوڕی (سەقیف)ە[1].

شافیعی فەرموویەتی: بیستم کەسێك باسی دەکرد کە (موغەیرەی کوڕی شعبە) لە سەرەتای ڕۆژدا چووە لای ژنەکەی دانی دەئاژنی بۆ ئەوەی پاکی بکاتەوە.

وتی: بەخوا ئەگەر زووتر خواردنت خواردبێت کەواتە زۆرخۆرێکی ئەوسنی، ئەگەریش ئەوەی لە دانت پاکی دەکەیتەوە هی دوێنێ بێت کەواتە (پیس و پۆخڵ)یت..

پاشان تەلاقی دا.

ئەویش گوتی: بەخوا شتێك نەبوو لەوانەی تۆ باست کرد، وەك خەڵکی (حورە) چۆن بەیانیان زوو سیواك دەکەن منیش ئەوەم کرد، بەڵام تاڵێك لە نێوان ددانەکانمدا مابوویەوە هەوڵمدا دەری بکەم.

دوای ئەمە (موغەیرە) بە یوسفی باوکی حەجاجی گوت: بیخوازە، ئەو ئەو کەسەیە خوا دایناوە بۆ پیاوێك زاڵ بێ، ئیدی یوسفی باوکی حەجاج خوازبێنی کرد و هێنای.

شافیعی فەرمویەتی: بۆیان گێڕامەوە کاتێك باوکی حەجاج چووە لای و سەرجێیی لەگەڵ کرد و خەوت، لە خەودا پێی وترا: چەند خێرا سکت پڕ کرد بە (المبیر – خوێن ڕێژەکە)[2].

ئیبن خەلەکان فەرمویەتی: ناوی دایکی فاریعەی کچی هومامی عوورەی کوڕی مەسعودی سەقەفی بووە، مێردەکەشی حارسی کوڕی کلدەی سەقەفی پزیشکی عەرەب بووە، ئەویش هەمان بەسەرهاتی سیواکەکەی لێ گێڕاوەتەوە.

دانەری پەرتوکی (العقد) باسی کردووە کە حەجاج و باوکیشی لە (طائف) هەرزەکارەکانیان فێر شمشێر بازی و ئەسپ سواری دەکرد ، پاشان چوو بۆ دیمەشق بۆلای (ڕوحی کوڕی زنباع)ی وەزیری عبدالملك، لەوکاتەدا عبدالملك لای ڕوحی کوڕی

---

[1]. سەیری (البدایة والنهایة)ی (ئیبن کثیر) بکە و هەندێکیش دەڵێن کە ساڵی ٣٩ك و وتراویشە ٤٠ك لەدایك بووە.

[2]. البدایة والنهایة.

زنباع سکاڵای کە سوپاکە بەفەرمانی ئەو هەڵناسن و دانانیشن، ئینجا ڕوح پێی گووت: پیاوێکم لایە ئەو کارەی پێ بسپێرە، ئیدی عبدالملك کاروباری سوپاکەی دایە دەست حەجاج، پاش ئەمە کەسێك نەبوو دوابکەوێت لە هەڵسان و دانیشتن، تەنانەت تێپەڕی بەلای چادرەکەی (ڕوحی کوڕی زنباع)دا نانیان دەخوارد، لێی دان و بەدەوریاندا سوڕایەوە و چادرەکەی سوتاندن، ڕوح ئەمەی بردەوە بۆلای عبدالملك و سکاڵای کرد، ئینجا بە حەجاجی گووت: بۆچی ئەم کارەت کرد؟

ئەویش گوتی: من نەمکرد، بەڵکو تۆ کردت گەورەم، چونکە دەستی من هەر دەستی تۆیە و قامچی من قامچیەکەی تۆیە، هیچت لەکیس ناچێ ئەگەر لەجیاتی چادرێك دوو چادریش بدەیتەوە بە ڕوح، لەجیاتی خزمەتکارێك دوو نۆکەریشی بدەیتێ، لەسەر ئەو شتەی کە خۆت پێت سپاردووم مەمشکێنە.

هەربۆیە عبدالملك ئەو کارەی کرد کە حەجاج گووتی و حەجاجیش لەلای ئەو پلەی بەرزبوویەوە.

(ئیبن کثیر) لە (البداية والنهاية)دا لەبارەی کەسێتی باوکی حەجاج و خودی حەجاجەوە دەفەرموێت: جوامێریەکی گەورە و چاونەترسی تێدابووە، شمشێرەکەی پڕبووە لەتاوان، زۆر کەسی بە بچوکترین گومان کوشتووە لەکاتێکدا خودا خوێن ڕشتنی حەرام کردووە، وەك پادشاکان تووڕە دەبوو، وەك دەڵێن لە (زیادی کوڕی أبیە) چووە، (زیاد)یش وەك دەڵێن لە (عومەری کوڕی خەتاب) دەچوو.

(ئیبن عەساکر) لە ژیاننامەی (سولەیمی کوڕی عیتری تەجیبی) دادوەری میصردا باسی کردووە کە ئەم (سولەیم)ە یەکێك بووە لە گەورەکانی تابیعین (شوێنکەوتووان)، یەکێك بووە لەوانەی ئامادەی وتارەکەی عومەری کوڕی خەتاب بووە لە جابیەدا، یەکێك بووە لە زاهیدەکان (پشت لەدونیاکردووەکان) و خوداپەرستەکان بەڕادەیەکی زۆر گەورە، هەموو شەوێك سێ جار خەتمی قورئانی دەکرد لە نوێژدا و جگە لەنوێژیش، پرتەی مەبەست ئەوەیە کە حەجاج لەگەڵ باوکی لە میصر لە مزگەوتەکەی ئەم پیاوە دەبن، ئەم سولەیمی کوڕی عەتەرە بەلایاندا تێدەپەڕێت، باوکی حەجاج لەبەری

هەڵدەستێ و سڵاوی لێدەکات و پاشان دەڵێت: من دەڕۆم بۆلای ئەمیری بڕواداران، هیچ کار و پێویستیەکت نیە پێی ڕا بگەیەنم؟

ئەویش دەفەرموێت: بەڵێ هەمە، داوای لێ بکە با لە دادوەری لام ببات.

باوکی حەجاج دەڵێت: پاکی و بێگەردی بۆ خوا! بەخوا ئەمڕۆکە دادوەرێکم پێ شک نایە لە تۆ باشتر بێت.

پاشان گەڕایەوە بۆلای حەجاجی کوڕی، ئەویش پێی گوت: ئەی باوکی من ئایا لەبەرپیاوێك هەڵدەستی (تجیب)یە و خۆیشت (ثقفی)ت؟

باوکی گوتی: کوڕەکەم بەخوا من وا دەزانم خەڵکی ئەمە و هاوشێوەکانی دەکەنە تکاکار و پێیان دەپارێنەوە.

حەجاج گوتی: دە بەخوا کەسێك نیە هێندەی ئەم (سولەیم)ە و هاوشێوەکانی بەزیانت بۆر بن ئەمیری بڕواداران.

باوکی گوتی: بۆچی کوڕەکەم؟

ووتی: چونکە ئەمە و هاوشێوەکانی خەڵکی لەدەوریان کۆدەبنەوە و ئەوانیش باسی ژیاننامەی ئەبوبەکر و عومەریان بۆ دەکەن، ئیدی خەڵکی ڕقیان لە باسی ژیننامەی ئەمیری بڕوادارن دەبێتەوە و هیچ شتێك نابینن جگە لە ژیننامەی ئەوان، دواتر واز لەم دێنن و لەخەلافەتەکەی ئەم هەڵدەگەڕێنەوە و لەبەیعەتی دەردەچن، هەروەها ڕقیان لێی دەبێتەوە و گوێڕایەڵی ناکەن، بەخوا گەر کارم کەوتە دەست، لە ملی ئەمە و هاوشێوەکانی دەدەم.

ئینجا باوکی پێی ووت: کوڕەکەم بەخوا من پێم وانیە خوداوەند بە نەگبەت دروستی کردبێتی.

ئەمەش ئاماژەیە بۆوەی کە باوکی حەجاج خاوەن ڕێز و پایە بووە لای خەلیفە، هەروەها خاوەنی زانستی (فیراسەت[١]) و ڕوناسی و خوێندنەوەی دروست بووە، ئەو خوێندنەوەی بۆ کوڕەکەی کرد لەوەی کە دواتر دەبێتە چی بەهۆی ئەو شتانەی کە دەیکات.

ئیبن عەساکر دەفەرموێت: پاشان وەک گەنجێکی ژیر و کۆڵنەدەری زمان پاراوی ڕەوانبێژی حافیزقورئان گەورەبوو، هەندێک لە پێشینان وتویانە: حەجاج هەموو شەوێک قورئانی دەخوێندەوە.

ئەبو عەلا وتویەتی: کەسم نەبینیوە لەو و لە حەسەنی بەصری زمان پاراوتر بێت، حەسەنی بەصری لە حەجاج زمان پاراوتر بووە.

(دارقطنی) دەڵێت: سولەیمانی کوڕی ئەبو شێخ لە صالحی کوڕی سولەیمانەوە دەگێڕێتەوە دەڵێت: عەتەبەی کوڕی عەمر وتی: عەقڵ و ژیریی خەڵکی لەیەکتر نزیکن، عەقڵی حەجاج و (ئیاسی کوڕی معاویە) نەبێت کە عەقڵیان هەی بوو بەسەر عەقڵی خەڵکیەوە.

(أبو بكر بن خيثمة) دەگێڕێتەوە وتراوە: مانای چیە حەجاجی کوڕی یوسف جارێك لەتەنیشت (سەعیدی کوڕی موسەییب) نوێژی دەکرد – ئەوەش پێش ئەوەی ببێتە کاربەدەست – پێش ئەوەی پێشنوێژ (ئیمام) هەڵبستێتەوە ئەو هەڵدەسایە، هەروەها پێش ئەو دەچوویە سوژدە، کاتێك سەلامی دایەوە سەعید لێی چووە پێشەوە و پێی گوت: هۆی دز هۆی ناپاك ئاوا نوێژ دەکەیت؟ پێم خۆش بوو بەم نەعلە بدەم بە دەموچاوتدا.

حەجاج وەڵامی نەدایەوە، پاشان حەجاج چوو بۆ حەج کە گەڕایەوە بۆ شام وەك نوێنەر هات بۆ حیجاز، ئینجا کاتێك ئیبن زوبێر کوژرا دوبارە گەڕایەوە بۆ مەدینە وەك

---

[١]. (فراسە):تیژ بیری: زانستێکە لە زانستە سروشتیەکان کە ناخی مرۆڤەکان ئاڕاستەیەك هەڵدەداتەوە لەڕوی تەماشاکردنی باری ڕووکەش و ڕوکاریانەوە.

فەرمانڕەوای ئەویێ، کاتێک چوویە مزگەوتەوە کۆڕی سەعیدی کوڕی موسەییب بوو حەجاج ڕوی تێکرد و خەڵکی نێو کۆڕەکەی سەعید ترسان لێی، ئینجا ئەویش هات هەتا دانیشت لەبەردەمیدا، پێی گوت: تۆ ئەو کەسەبووی کە قسەکەت کرد؟! سەعیدیش دای بەسەر سنگیدا و ووتی: بەڵێ.

حەجاج وتی: خوا پاداشتی خێرت بداتەوە چ مامۆستا و پەروەردەکارێکیت، لەپاش تۆ هەر نوێژێکم کردبێت بیری قسەکەی تۆم کەوتۆتەوە، پاشان هەستا و ڕۆی.

لەدایکبوون و گەورەبوونی حەجاج لە (طائف) بوو، بەڵام بەرزبوونەوەی پلە و پایەی لە شام بوو، تائیف لەژێر فەرمانڕەوایەتی ئیبن زوبێردا بوو، ململانێ و ناکۆکیەکانیش لەوپەڕی گرژی و ئاڵۆزیدا بوو لەنێوان (ئیبن زوبێر) و (عەبدولمەلیکی کوڕی مەروان)دا، هەربۆیە حەجاج بڕیاری دا بڕوات بەرەو شام کە گەورەترین شار و پایتەختی خەلافەتی ئەمەویەکان بوو، چونکە عبدالملك هەوڵی دەدا دەسەڵات بۆ ئەمەویەکان بگێڕێتەوە کە زۆرێك لە ناوچەکانی کەوتبووە ژێر دەسەڵات و قەڵەمڕەویی ئیبن زوبێرەوە.

لەشام حەجاج چوویە ناو پۆلیس و قەڕەوڵی دەوڵەتەوە[1]، کە بەدەست کۆمەڵێك کێشە و ناڕێکی و شلۆقی و نەبوونی گوێڕایەڵی لەناو پۆلیس و سوپادا دەیناڵاند، حەجاج پەلەی کرد لە ئاگادارکردنەوەی بەرپرسان و کەسانی تایبەت بەوکارە لە مەترسیەکانی ئەو شێواوی و ناڕێکیەی کە هەیە لەنێو ڕیزەکانی سوپادا، ئینجا (ڕوحی کوڕی زنباع)ی وەزیر حەجاجی نزیك کردەوە لە عەبدولمەلیکی خەلیفەی ئەمەویەکان.

وەزیر بردی بۆلای خەلیفە عەبدولمەلیك، ئەویش کاروباری سەربازەکانی پێ سپارد، حەجاج هەستا بە ڕێکخستنەوەی کاروبارەکانی پاسەوانی شاهانە، بەجۆرێك عەبدولمەلیك زۆر پێی سەرسام بوو و لای خۆی پلەی بەرزکردەوە و کردیە یەکێك لە گەورە سەرکردەکانی سوپاکەی.

---

[1]. پۆلیس: بەمانای ئەمڕۆ....

ئیدی کارزانی و قسەڕۆیشتنی حەجاج لای خەلیفە گەیاندیە ئەوەی کە ئەو یاساو ڕێسایانەی پێی ئاسراوە جێبەجێی بکات تەنانەت بەسەر سەربازەکانی سوپاشدا نەک تەنها پاسەوانی شاهانە، پۆلیس (کە لەلایەن حەجاجەوە بەڕێوە دەبرا) هەڵدەستان بە جێبەجێکردنی فەرمانەکانی حەجاج دیسان بەسەر سەربازەکانی (ڕوحی کوڕی زنباع)ی وەزیریشدا کە بریتی بۆلای خەلیفە، دەڵێن حەجاج سەربازەکانی وەزیری بەندکردووە و چادرگاکانی بەسەردا سوتاندوون کاتێك سەرپێچی فەرمانەکانی ئەویان کردبوو، وەزیر سکاڵا دەکات لای خەلیفە، ئەویش بانگی حەجاج دەکات و پرسیاری لێدەکات کە بۆچی ئەو کارەی کردووە؟!، حەجاج دەڵێت: بەڵکو تۆی ئەو کارەت کردووە گەورەم ئەی ئەمیری برواداران، چونکە من هەم دەستی تۆ و هەم قامچیەکەی تۆم.

دواتر پێشنیار دەکات بۆ خەلیفە کە قەرەبووی زیانەکانی (روح کوڕی زنباع) بکاتەوە بە بێ شکاندنی فەرمانەکانی ئەم.

عبدالملك حەجاجی خستە نێو سوپاکەیەوە و کردیە یەکێك لە گەورە سەرکردەکان و بەشداری پێکرد لەگەڵ خۆی لەو جەنگانەی کە ناچاری بوو بوو بۆ سەندنەوەی عێراق لە دەستی ئیبن زوبێر، عبدالملك کردیە فەرماندەی بەشی باشور، ئەویش کاروبارییانی ڕێکخست و لە وڵاتی شام ڕایگەیاند کە هەر پیاوێك بتوانێت چەك بگرێت بەدەستیەوە و نەیەتە دەر لەگەڵی بۆ جەنگ دەیکوژێت و ماڵەکەی دەسوتێنێت، سێ ڕۆژ مۆڵەتی دان بۆ بیرکردنەوە، پاشان بەنێو ماڵەکاندا دەگەڕا بەدوای بەجێماوەکاندا، هەربۆیە سوپایەکی گەورە دروست بوو و هەمووان گوێڕایەڵی بوون بە ناچاری نەك بە ویست، هەموو ئەو کارانەش کەکردی پێش ئەوەبوو عبدالملك فەرمانی بۆ دەربکات بۆ سەرکردایەتیکردنی سوپا بۆ شەڕکردن لەگەڵ ئیبن زوبێردا لە مەککە ساڵی ٧٣کۆچی.

***

## حەجاج و گەمارۆدانی ئیبن زوبێر لە کەعبە

(عەبدولمەلیکی کوڕی مەروان) توانی ئەو هەرێم و ناوچانە بگێڕێتەوە ژێر ڕکێفی خۆی کە لە سنوری خەلافەت و قەڵەمڕەویی (عبداللەی کوڕی زوبێر)دا بوون، هیچ شوێنێك نەمابوویەوە بۆ ئیبن زوبێر جگە لە وڵاتی حیجاز و پشتیوان و شوێنکەوتووەکانی هەڵاتبوون و چووبون بۆ سەربازگەکەی عەبدولمەلیك.

وەك باسمان کرد پاش ئەوەی عێراق کەوتە دەستی عەبدولمەلیك و کوشتنی (موصعەبی کوڕی زوبێر)، عەبدولمەلیك سوپایەکی نارد بۆ حیجاز کە حەجاج لەبەرەتای سوپاکەدا بوو بۆ سەندنەوەی کۆتا پەناگە لە ئیبن زوبێر.

هەوڵەکانی عبدالملك بۆ ئەوەی حیجاز بخاتە ژێر ڕکێفی خۆی بە هەڵمەتێك دەستی پێکرد کە (عوروەی کوڕی ئەنیف) بەشەش هەزار سەربازەوە سەرکردایەتی دەکرد بەرەو مەدینەی منەووەرە و فەرمانی پێکردن کە لەدەرەوەی مەدینە بارگە بخەن لە (عرصە) کە زەویەکی فراوانە لە نێوان خانوەکاندا و ئەم زەویە فراوانە خانوی تێدا نیە لەدەوروبەری مەدینە لە (عەقیق).

عوروە ڕۆیشت و لە (عرصە) بارگەی خست، کاربەدەستێکی ئیبن زوبێر لێی هەڵات کە (حارثی کوڕی حاطب) بوو، (عوروەی کوڕی ئەنیف) مانگێك لەدەرەوەی مەدینە مایەوە، دەچووە مەدینە بۆ نوێژی هەینی و پاشان دەگەڕایەوە بۆ سەربازگەکەی، لەو ماوەیەدا هیچ ڕووبەڕووبوونەوەیەکی سەربازیی ڕوی نەدا پاشان ئەم سوپایە گەڕایەوە بۆ شام.

پاشان هەڵمەتی دووەم لای عەبدولمەلیکەوە دەستی پێکرد، (عەبدولمەلیکی کوڕی حارسی کوڕی حەکەم)ی نارد، هەڵمەتەکەش پێکهاتبوو لە چوار هەزار سەرباز بەرەو مەدینە، ئیشیان پاراستنی ئەو ناوچەیە بوو کەوتبووە نێوان شام و مەدینەوە، ئەو هێزە لە دۆڵی قورا (قرى) بارگەیان خست، عەبدولمەلیکی کوڕی حارس تیمێکی نارد کە لە پێنج سەد سەرباز پێکهاتبوون بۆلای کاربەدەستەکەی ئیبن زوبێر لە مەدینە کە (سولەیمانی کوڕی خالید) بوو و کوشتیان.

(ئیبن زوبێر)یش (جابری کوڕی ئەسوەد)ی کردە فەرمانڕەوای مەدینە بەجۆرێك توانیی ئەو هەڵمەتە بوەستێنێت و تێکی بشکێنێت.

ئینجا (عەبدولمەلیکی کوڕی مەروان) هەڵمەتی سێیەمی نارد بۆ زاڵبون بەسەر ئەو ناوچەیەی کەوتۆتە نێوان (ئایلە) و دۆڵی (قورا) بۆ وەستاندن و ڕوبەڕووبوونەوەی جموجوڵەکانی ئیبن زوبێر و یارمەتیدەرێکیش بێت بۆ هەرکەس کە پێویستیەکی هەبێت لە کاربەدەستەکانی عەبدولمەلیك، ئیبن زوبێر توانی ڕوبەڕوی ئەو هێزەش ببێتەوە بەتایبەت ئەوکاتی کە فەرمانڕەوای بەصرە هەزار پیاوی نارد بۆ پاسکردنی مەدینە بە سەرکردایەتی (ئیبن ڕەواس).

بەڵام پاش ئەوەی عێراق کەوتە دەستی مەروان و سنوری قەڵەمڕەوی و خەلافەتی ئیبن زوبێر بەرتەسك بوویەوە لە مەککە و مەدینەدا ئیدی عەبدولمەلیك هەڵمەتی کۆتایی نارد بۆ حیجاز بەسەرکردایەتی حەجاج وەك باسمان کرد بۆ لەناوبردنی ئیبن زوبێر و ئەوەی لەگەڵی مانەوە لە شوێنکەوتوانی کە ژمارەیەکی کەم بوون پاش ئەو شکست و بەزینانەی کە سوپاکەی ئیبن زوبێر توشی بوو بوون.

مێژوزانان کۆدەنگن لەسەر ئەوەی کە تێکشکانی (موصعەبی کوڕی زوبێر) لەبەردەم سوپاکەی شامدا بەسەرکردایەتی (عەبدولمەلیکی کوڕی مەروان) کۆتایی دەوڵەت و خەلافەتەکەی (عبداللەی کوڕی زوبێر) بووە و سەردەمی جێنشینی زوبێریەکان هەڵوەشایەوە، لەبەر ئەمە عبدالملك هێندەی بەس بوو سوپایەکی نارد بە سەرکردایەتی

حەجاج بۆ حیجاز و خۆی نەڕۆی، ئیدی ڕەوشەکە بارەو ئەویوو، چونکە دەیزانی کە ئیبن زوبێر ناتوانێت خۆی ڕابگرێت لەبەردەم سوپاکەیدا، لەبەر کەمی چەك و ژمارەی.

سوپای ئەمەویەکان ڕوی کردە حیجاز و لە (تائیف) جێگیر بوو، لە قەڵای سەقیفی هۆزی حەجاج.

ئیبن جەریر باسی کردووە کە هۆکاری ئەوەی عەبدولمەلیکی کوڕی مەروان حەجاجی سەقەفی هەڵبژارد نەك کەسی تر بۆ شەڕکردن لەگەڵ عبداللەی کوڕی زوبێر ئەوەبووە کە عەبدولمەلیك کاتێك ویستی بگەڕێتەوە بۆ شام پاش کوشتنی (موصعەب) و گرتنی عێراق نوێنەری نارد بۆلای خەڵکی بۆ شەڕکردن لەگەڵ (عبداللەی کوڕی زوبێر)دا لە مەککە بەڵام هیچ کەس نەهات بەپیر داواکەیەوە، ئینجا حەجاج هەستایەوە و گوتی: ئەی ئەمیری بڕواداران من دانێ بۆ ئەو کارە.

گوتی ئەمیری بڕواداران خەونێکم بینیوە: لەخەوەکەمدا گوایا عبداللەی کوڕی زوبێرم گرتبوو کەوڵم دەکرد، من بنێرە بۆی دەیکوژم.

بە سوپایەکی چڕوپڕەوە لە خەڵکی شام ناردی و نوسراوێکی پێدا بۆ خەڵکی مەککە کە بێ وەی دەبن گەر ملکەچی (عبدالملك) بوون.

ئینجا حەجاج لە جەمادی دووەمی ساڵی ٧٢ك دەرپەڕی و دوو هەزار ئەسپ سواری لە خەڵکی شام لەگەڵ بوو، ئینجا ڕێی عێراقی گرتە بەر بەرە و مەدینە و لە (طائف) بارگەی خست و نێردراوی دەنارد بۆ عەرەفە — ، ئیبن زوبێر ئەسپی دەنارد و بەیەك دەگەیشتن و ئەسپی ئیبن زوبێر دەبەزی و ئەسپی حەجاج دەیبردەوە.

پاشان حەجاج نامەی نوسی بۆ عەبدولمەلیك و ئیزنی خواست لێی کە بچێتە مەککە و گەمارۆی ئیبن زوبێر بدات و داواشی لێکرد هەندێك پیاوی بۆ بنێرێت.

عەبدولمەلیکیش نامەی نوسی بۆ (تاریقی کوڕی عەمر) فەرمانی پێکرد بەخۆی و یاوەرانیەوە بگاتە لای حەجاج.

ئابەم جۆرە حەجاج ئیزنی وەرگرت لە عەبدولمەلیك بۆ گەمارۆدانی مەککە و پەلاماردانی ئیبن زوبێر بە مەبەستی لەناوبردنی.

حەجاج ئابلۆقەیەکی ئابوری خستە سەر مەککە، ئاو و خۆراکی لێ بڕین، ئەو گەمارۆیە کاریگەریی لە خەڵکی مەککە کرد و زۆرێك لە هاوکارانی ئیبن زوبێری ناچارکرد بۆ هەڵاتن و چوونە ڕیزی حەجاجەوە.

ئیبن زوبێر و هاوەڵەکانی ناچاربوون پەنا بەنە بەر کابە و خۆ قایم کردن لەوێ، ئەوکات ئیبن زوبێر گەیشتبووە حەفتا و سێ ساڵی تەمەن کەچی هێشتا ئازا و بەهێز و جەنگاوەرێکی نەبەزیو بوو – ڕەزای خوای لێبێت – .

لەبەر ئەوەی حەجاجیش لەو کەسایەتیانە بوو هەموو سنورێکی دەبەزاند و دروشم و ڕێبازەکەی ئەوەبوو کە (مەبەست پاکانەیە بۆ میکانیزم – الغاية تبرر الوسيله) – واتە مەبەستت باش بی ئیتر هەر هۆکار و میکانیزمێك بەکاربێنیت ڕەوایە – ، هەربۆیە هەستا بە گەمارۆدانی مەککەی پیرۆز و پەلاماردانی بۆ لەناوبردنی ئیبن زوبێر و کە پێی خستبووە بۆنەی حەجەوە.

پێش ئەوەی پەلاماری مەککە و ماڵی خودا بدات حەجاج نامەی نارد بۆ (عبدالملك)ی گەورە و سەرداری، پرسی پێکرد بۆ ئەو کارە و ئەویش سەربەستی کرد و گووتی: ئەوەی بەباشی دەزانیت بیکە.

هەر بەکردەیی حەجاج بەهەموو سوپاکەیەوە ڕوی کردە مەککەی پیرۆز و مەنجەنیقی لەسەر کێوەکانی چەقاند، کە (مەنجەنیق) ئامێرێکی جەنگی بووە لەو سەردەمەدا وەك (تانك)ی ئەم سەردەمە، بەڵام ئەو بەردی گەرمبووی دەهاویشت.

ئینجا حەجاج دەستی کرد بە بۆردومانکردنی کەعبەی پیرۆز کە ئیبن زوبێر و هاوکارەکانی خۆیان لەوێ قایم کردبوو بە مەنجەنیق بەردەوام و بەبێ ناوبڕ.

حاجیانیش لە هەموو ولاتانی ئیسلامیەوە دەهاتن بەرەو مەککە، ئەو بۆردومانەش نەیدەهێشت بەدەوری کەعبەدا بسوڕێنەوە بەهۆی مەترسی ئاگربارانی مەنجەنیقەکەوە، کاتێك کە لەم کارەدا پایەیەك لەپایەکانی حەج پەکی کەوت ئیبن عومەر دەستی خستە ناو کاروبارەکەوە و نامەی نوسی بۆ حەجاج و ووتی: ((لەخوا بترسە تۆ لەمانگێکی حورمەتدار و شارێکی حورمەتداردای، وەفدی میوانەکانی خودا لە زۆرێك لە ولاتانی سەر

گۆی زەویەوە هاتوون بۆئەوەی یەکێك لە ئەرکەکانی خودا بەجێ بهێنن و خێری زیاتر بکەن)).

ئینجا حەجاج ناردی بۆلای (تاریقی کوڕی عەمر) فەرمانی کرد کە با ئیتر بەکارهێنانی مەنجەنیق بەس بێت، تاکو خەڵکی لە حەجکردن تەواو دەبن، پێی گوتن: بەخوا من حەزم بەوە نیە کە دەبیینن بەڵام ئیبن زوبێر لێرە لەماڵی خودا خۆی پەنا داوە.

دەستی هەڵگرت لە بەکارهێنانی مەنجەنیق تاکو حاجیەکان لە تەواف و سوڕانەوە بەدەوری کەعبەدا تەواوبوون و پاش ئەوەی وەرزی حەجکردن کۆتایی پێهات حەجاج بانگەوازی کرد بەناو خەڵکیدا کە ئیدی بچنەوە بۆ وڵاتی خۆیان و ئێرە جێ بهێڵن و شەڕ دەست پێدەکاتەوە دژی ئیبن زوبێر.

(بلاذري) گێڕاویەتیەوە کە ژمارەیەك لەوانەی لەگەڵ ئیبن زوبێر بوون هەوڵیان دا ڕازی بکەن بە پەسەندکردنی ئەوەی کە حەجاجی کوڕی یوسف گرەنتی بێ وەیی و پاراستنی پێدابوو، بەڵام ئیبن زوبێر وەڵامی هەوڵەکانیانی نەدایەوە و سووربوو لەسەر شەڕکردن، گێڕانەوەکانیش چەندین هەڵویستی خۆڕاگری و پاڵەوانێتی ناوازەی ئیبن زوبێریان تۆمارکردووە لە ڕووبەڕووبوونەوەی لەشکرەکانی حەجاجدا، هەروەها ئەوەی کە دەوروبەرەکەی وازیان لێدەهێنا و پشتیان تێدەکرد پەشیمانی نەدەکردەوە و نەیدەوەستان لە خۆڕاگری و بەرگریکردن لە بیروباوەڕەکانی تایبەت بەوەی کە جێنشینی بۆماوەیی نەبێت بۆ بەنی ئومەییە و هیچ کامی تر لە خانەوادە و بنەماڵەکان، بەڵکو بە ڕاوێژ بێت.

حەجاج جارێکی تر دەستی کردەوە بە بۆردومانکردنی کەعبە بە مەنجەنیق پاش وەرزی حەجکردن و خەڵکانێکی زۆری کوشت بەهۆی بۆردومانەکانی مەککە و کابەی پیرۆزەوە بە مەنجەنیق کە پێنج مەنجەنیقی پێ بوو و هەروەها ئاو و خۆراکی لە ئیبن زوبێر و پشتیوانانی زەوت کردبوو، تەنها ئاوی زەمزەمیان دەخواردەوە.

بەرد باران بوو بەسەر کەعبەدا و حەجاجیش سەربازەکانی کە لەخەڵکی شام بوون هاندەدا و دەیگوت:

ئەی خەڵکی شام الله الله لە گوێڕایەڵی..

ئائەمە ڕێبازی حەجاج بوو کە گەیاندیە بەرزترین پلەکانی دونیا گوێڕایەڵی کردنی وەلی ئەمر ئەگەریش پێچەوانەی خوا و پێغەمبەرەکەی بێت!!

ئیبن زوبێریش تابێت زیاتر لێیان توند دەبوو و بەرەنگاریان دەبوویەوە و بۆیان دەردەپەڕی کە پیرێکی بەساڵاچووبوو، بەڵام هەروەکو گەنجەکان بوو لە هێز و بڕشتدا و دەیفەرموو: من کوڕە حەواریم[1].

پێیان وت: ئایا ئاشتەواییان لەگەڵ ناکەیت؟!!

ئەویش فەرمووی: بەخوا گەر ئەوان لە هەناوی کابەشدا بتانگرن هەمووتان سەردەبڕن، کەواتە هەرگیز داوای ئاشتی و ئاگربەستیان لێناکەم.

زیاتر لەکەسێك و (ئیبن کثیر)یش لە (البدایة و النهایة)دا دەفەرموێت و کە ئەوان – واتە خەڵکی شام – کاتێك بە مەنجەنیق بەردبارانی کەعبەیان دەکرد هەورەگرمە و هەورەبروسکە دەیان گرمان و دەیانترپشکاند تەنانەت دەنگی ئەم بروسکە و هەورانە بەرزتربوو لە دەنگی مەنجەنیقەکان، ئینجا هەورەبروسکەیەك دای لە دوانزە پیاو لەپیاوانی شام، ئیدی دڵیان ترسا لەگەمارۆدان.

حەجاجیش هەر هانی دەدان و دەیگوت: من شارەزای ئەم شارەم ئەم بروسکە و تریشقانە وێڵن و گەڕۆکن چۆن لەئێوەی دا لەم گەلەش دەدات.

لەبەیانیدا هەورە بروسکەیەك هات و دای لە هاوەڵەکانی ئیبن زوبێر و کۆمەڵێکی تری لێ کوشتن، ئیدی حەجاج دەیگوت: ئایا پێم نەووتن ئەوانیش بە هەورەبروسکەکە دەمرن وەکو ئێوە؟! بەڵام ئێوە لەسەر گوێڕایەڵی و ئەوان لەسەر ناکۆکی و سەرپێچین.

---

[1] حەواری: هەرکەسێك هاوەڵ هەڵبژاردە و و پشتیوان و پشتگیری پێغەمبەران بێت پێی دەگوترێت (حەواری)، بۆیە بە (زوبێری کوڕی عەوام)یشیان گوتووە حەواری پێغەمبەر چونکە هاوەڵێکی هەڵبژاردە و بێ لەکە بووە.

حەجاج دەیویست کە لێدانی کابە بە مەنجەنیق لای سەربازەکانی ئاسایی بکاتەوە پاش ئەوەی کە نیشانە و تورەیی خودایان بینی لە هەورە گرمە و بروسکە بەسەر هەردوو لادا گەمارۆدەر و گەمارۆدراوەوە.

بەڵام ئەوەی وای کرد سەربازەکانی شام و حەجاج دەست هەڵبگرن لە ئاگرباران و بۆردومانکردن بە مەنجەنیق ئەوەبوو کە هەورە تریشقەیەک دای لە یەکێک لە مەنجەنیقەکان و ئاگری تێ بەردا و سوتاندی.

کەچی حەجاج بەوتارێك بەلاڕێیدا بردن و گوتی: بەلا لێتان دا، ئایا نەتان زانیوە کەئاگر دەباریە سەر ئەوانەی پێش ئێمە و قوربانیەکەیانی دەخوارد ئەگەر قوربانیەکەیان وەربگیرایە ؟ جا ئەگەر کارەکەی ئێوەش قەبوڵ و وەرگیراو نەبووایە ئاگر نەدەباری تا بیخوات.

ئیدی جارێکی تر دەستیان کردەوە بە گەمارۆدان و بۆردومان [1].

ئەم قسەیەی حەجاج یەکێك بوو لەو قسە و جوڵە پێکەنیناویانەی کە ئاماژە بۆ کەسێتی هەندێك لە سەرکردەکان دەکەن، کە چۆن حەق هەڵدەگێڕنەوە و خوێندنەوە و زانیاریان زۆرە و ئەم ئاستەیان لە زیرەکی و ڕۆشنبیری بەکاردێنن بۆ خزمەتی ئامانجەکانیان.

لە گەلەکانی پێشودا گەر کەسێك بیویستایە بزانێت خودا کارەکەی لێ وەرگرتووە قوربانیەکی دەکرد، ئەگەر ئاگرێك لەئاسمانەوە دابباریایە و بەتەواوی قورانیەکەی بخواردایە، ئەوا بەڵگەبوو لەسەر ڕازی بوونی خودا بەو کارە، بەڵام ئەو دوو کارە چەندە لەیەکەوە دورن قوربانی و ئەوەی ئاگر لە مەنجەنیق بەربێت کە ئامێرێکی جەنگیە.

جگە لەوەش حەجاج و ئەوەی لەگەڵی بوو قوربانیەکیان نەکردبوو و سەرباری ئەوەش ئەو دیاردەیە لەنێو گەلەکانی پێشودا باو بووە نەك سەردەمەکەی حەجاج.

---

[1] . البداية والنهاية.

لە قورئان دا باسی دوو قوربانی کراوە: ئاگر یەکیانی خواردووە وەک بەڵگەیەک بۆ وەرگیرانی ئەو قوربانیە لەلایەن خوداوە و ڕازی بوون لێی ئەم باسەش لە چیرۆکی دوو کوڕەکەی ئادەم دا (قابیل و هابیل) هاتووە لە سورە (المائدة) کە خواگیان دەفەرموێت:

﴿وَاتْلُ عَلَيْهِمْ نَبَأَ ابْنَيْ آدَمَ بِالْحَقِّ إِذْ قَرَّبَا قُرْبَاناً فَتُقُبِّلَ مِن أَحَدِهِمَا وَلَمْ يُتَقَبَّلْ مِنَ الآخَرِ قَالَ لأَقْتُلَنَّكَ قَالَ إِنَّمَا يَتَقَبَّلُ اللّهُ مِنَ الْمُتَّقِينَ﴾[1].

واتە:واتە بەسەرهات و هەواڵی دوو کوڕەکەی ئادەم بۆ ئەو خەڵکە بخوێنەرەوە کە بەڕاستی ڕوویداوە، ئەوەبوو کاتێک هەردوکیان قوربانیان کرد لە یەکێکیان وەرگیرا کە لەسەر حەق بوو، و لەوی تریان وەر نەگیرا چونکە ڕق ئەستور بوو، بەبراکەی وت هەر دەتکوژم، ئەویش لە وەڵامی هەڕەشەکەیدا وتی خوای گەورە تەنها لە پارێزگاران قوربانی و چاکە وەردەگرێت..........

بەڵام بەڵگەکەی حەجاج بۆ ئەوەی ئاگر مەنجەنیقەکەی خواردووە بەڵگەی بێ جێ بوو-بەڵگە بوو بۆ بەدەر لەجێی خۆی- ، کە ئەمەش ئاماژەیە بۆ ڕادەی زیرەکی و بیرتیژی ئەم زۆرداره ستەمکارە، زیرەکی لە شتی حراپ و شەڕئامێزدا

لەبەردەم ئەو گەمارۆ و ویرانکاریە بەزیانەی کە حەجاج سەپاندی بەسەر مەککە و کابەدا خەڵکی دەچونە دەر بۆلای داوای ئاسایش و دڵنیایی و پارێزراونیان لێ دەکرد، ئەو گرەنتی پاراستن و ئاسایشەی کە عبدالملك ناردبووی لەگەڵ حەجاج دا بۆ خەڵکی مەککە و ئیبن زوبێری پێشەوا و خەلیفەیان جێدەهێشت.

(ئیبن کثیر) باسی کردووە کە نزیکەی دە هەزار پیاوی خەڵکی ئەوێ لە مەککە دەرچوون و خۆیان دا بەدەست حەجاجەوە و داوای دڵنیایی و پەنادانیان لێکرد.

لەوانەش کە دەرچوون بۆلای حەجاج و داوای دڵنیایی و پەنادانیان لێکرد و وازیان هێنا لە ئیبن زوبێر (حەمزە و خوبەیب) هەردوو کوڕەکەی (عبداللەی کوڕی زوبێر)بوون، پەنادان و دڵنیاییان بۆخۆیان وەرگرت لای حەجاج، ئەو خۆبەدەستەوەدان و پشت

[1] المائدة: ٢٧ ـ ٣٠

هەڵکردنە لە باوکیان لەپێناوی پاراستنی گیانی خۆیان بەمانای کەلیمە ترازیدیا و مەرگ سات بوو، نەك هەر ئەوە بەڵکو هاوکار و هاوڕێ و خزمانی ئیبن زوبێر یەك یەك وازیان لێ دەهێنا، دواجار کەسی لەگەڵ نەمایەوە چەند دانەیەك نەبێت، کە نەیاندەتوانی یەك کاتژمێر خۆ رابگرن لەبەردەم سوپاکەی حەجاجدا، هەر ئەمەش بوو پاڵی نا بە ئیبن زوبێرەوە کە بڕوات بۆ لای دایکی (ئەسمای کچی ئەبوبەکر – ڕەزای خوا لەهەردووکیان بێت– ) دەردەڵ بکات لای لەوەی ڕوویداوە و پرس و ڕاوێژی پێ بکات ، مێژوزانانیش ئەم دیمەن و گفتوگۆیەی نێوان دایك و کوڕ هەردوکیان تۆمارکردووە کە هاوشێوەی نیە لە مێژوودا.

(ئەسما) – ڕەزای خوای لێبێت – ئەوکات نزیك یان تێپەڕی کردبوو لە سەد ساڵەی تەمەنی، هەروەها بینایی لەدەست دابوو.

هێشتاش مێژوو ئەو وشانەی لەبیرە، وەك چۆن قسەکانیشی لەبیرە لە ڕوبەڕووبوونەوەی حەجاجدا پاش کوژرانی ئیبن زوبێری کوڕی.

عبداللەی کوڕی زوبێر چوو بۆلای دایکی و پێی گوت: ئەی دایکی من خەڵکی هەموو جێیان هێشتم تەنانەت کوڕ و خزمەکانیشم، چەند کەسێکی کەمم لەگەڵ ماوەتەوە، کە تەنها کاتژمێرێك بەرگرییان پێ ناکرێت، ئەو خەڵکە – مەبەستی ئەمەویەکانە– چیم بووێت لەدونیا دەمدەنێ، تۆ ڕات چیە؟

دایکی فەرموی: کوڕی خۆم بەخوا تۆ خۆت باشتر دەزانی، ئەگەر دەزانی لەسەر ڕاستیت و بۆ ڕاستی تێدەکۆشی ئەوا تەواوی بکە و درێژەی پێ بدە، دەزانیت کە هاوەڵەکانت لەسەر ئەوە کوژران، مەهێڵە گەردنت بکەوێتە دەستی هەرزەکارانی بەنی ئومەییە، ئەگەریش دونیات دەوێ ئەوا بەدبەختترین کەسیت، تۆ خۆت و ئەوانەشی لەگەڵت کوژران بەهیلاکا برد ، ئەگەریش وتت: من لەسەر حەق بووم بەڵام کە هاوەڵانم کەمبوونەوە لاواز بووم، ئەوە کاری سەربەستان و دین ویستان نیە، پێت وایە چەندە لەدونیا دەمێنیتەوە، کوژران باشترە.

ئیبن زوبێر لێی نزیك بوویەوە و سەری ماچ کرد و گوتی: سوێند بەخوا ئەم قسانەی تۆ ڕای منیشە و ئەوەی پێی هەستام و گەیاندمیە ئەم ڕۆژە ئەوەیە پشتم بەدنیا نەبەستووە، حەزم بەژیان نەکردووە تیایدا، هیچ شتێك پاڵی پێوە نەنام بۆ دەرچوون بۆ بەرەنگاربوونەوە ئەوە نەبێت تووڕەبووم لەبەر خوا چونکە پیرۆزیەکانی شکێنرا، بەڵام ویستم ڕای تۆش بزانم و تۆش زیاتر بەرچاو ڕوونت کردم، ببینە دایەگیان من ئەمڕۆ دەکوژرێم با خەمباریت تاو نەسێنێت، بیسپێرە بەخوا، کوڕەکەت خراپەی نەدەویست و بەدکرداریی نەدەکرد، لە فەرمانی خودا لای نەدا و ناپاکی لە ئاشتی دا نەکردووە و مەبەستی ستەمکردنی نەبوو لە هیچ موسوڵمانێك، ئەم بیستووە کاربەدەستەکانم ستەمێکیان کردبێت و من پێی ڕازی بووبێتم، بەڵکو ڕقم لێی بووە و هیچ شتێکیش هێندەی ڕازی بوونی خودا لەلای من شوێن و بایەخی نەبووە.

خودایە من ئەمە نالێم بۆ خۆ پاکردنەوە و پاکانەکردن بۆخۆم، تۆ خۆت باشتر دەزانی، بەڵام دەیڵێم بۆ دڵنەوایی و بەهێزکردنی دایکم بۆئەوەی لەبیرم بکات.

ئینجا دایکی گوتی: من دەپاڕێمەوە کە دڵ و ماتەمم بۆتۆ باش بێت ئەگەر پێشم کەوتیت وەگەر منیش پێش تۆ کەوتم لەخۆم دەرچم تا تەماشا بکەم کە کاری تۆ بە چی دەگات.

فەرمووی: خوا پاداشتی خێرت بداتەوە دایەگیان لەپێش مردن و دوای مردنیش لە دوعا بێ بەشم مەکە.

دایکی فەرمووی: هەرگیز وازناهێنم لە پاڕانەوە بۆت.

پاشان فەرمووی: خودایە ڕەحمی پێ بکە هێندەی درێژیی شەونوێژەکانی لەشەوانی درووودرێژدا، هێندەی ئەو گریان وناڵاندن و تامەزرۆییانەی کە لەبەر تۆ دەپاڕایەوە لە قرچە گەرماکانی مەککە و مەدینە دا، هێندەی چاکەکردنی لەگەڵ باوکی و هەروەها منیشدا، ڕەحمی پێ بکە، خودایە وا من سپاردم بەتۆ و دامە دەست تۆ و ڕازی بووم بەوەی تۆ بڕیارت لەسەر داوە پاداشتی ئارامگران و سوپاسگوزارانم بدەرێ بۆ عبدالله.

دەستەکانی گرت تاکو ماچی بکات و ئینجا فەرمویئ ئەمە تەنها خواحافیزیەکە و لەیەکتر دورناکەوینەوە.

پاشان فەرموی: هاتمماڵئاوایی بکەم چونکە وای دەبینم ئەمە کۆتا ڕۆژمە لە دونیا.

دایکی فەرمووی: لێم نزیك بەرەوە تاکو ماڵئاوایت لیّ بکەم.

ئەویش لێی نزیك بوویەوە و لەباوەشی گرت و ماچی کرد، ئینجا دایکی دەستی کەوتە سەر زریّ پۆشەکە (درع) و فەرمووی: کورەکەم ئەمە پۆشاکی کەسێك نیە وەك تۆ شەهیدبوونی بووێت.

فەرمووی: ئەوەم تەنها بۆ ئەوە پۆشیوە تاکو وورەی تۆ بەرز بکەمەوەو دڵت ئاسودە بکەم.

دایکی فەرمووی: ئەوە دڵی من ئاسودە ناکات.

ئینجا ئەویش دایکەند و قەدی کرد (پێچایەوە)، خواروی کراسەکەی توندبەست و جبەیەکی لۆکە لەژێر کراسەکەی بوو، چمکەکەی خستە نێو پشتێنەکە و دایکی دەیفەرموو: جلەکانت بەگورجی لەبەر بکە، پاشان ئیبن زوبێر ڕۆیشت و دەیفەرموو:

**إني إذا أعرف يومي أصبر إذ بعضهم يعرف ثم ينكر**[1].

واتە: من کە ڕۆژی خۆم بزانم ئارامدەگرم* بەلاّم هەندیّ ڕۆژی خۆیان دەزانن و لەبیرخۆیانی دەبەنەوە...

ئینجا دایکی گوێی لیّ بوو و دەیگوت: بەخوا ان شا الله ئارام دەگرین باوکت ئەبوبەکر و زوبێر و دایکیشت صەفیەی کچی عەبدولموتەلیب[2].

ئەسما ڕەزای خوای لێبێت بەردەوام (زوبێر)ی باوکی و (ئەبوبەکری صدیق)ی باوەگەورەی و (صەفیەی کچی عبدالمطلب)ی داپیری و (عائیشەی خێزانی پێغەمبەر)ی

---

[1] . البداية والنهاية.

[2] . (التأريخ)ي طبري و (البداية والنهاية)ي ئيبن كثير..... صەفیە داپیری عبدالله بوو لەباوکیەوە و داپیریش لای عەرەب لە جێی دایکە.

پوری دەمێنایەوە بیری... داوای لێدەکرد گەر شەهید بوو بێت بۆلایان، پاشان لای دایکی دەرچوو و ئەوەش دواهەمین دیداری بوو لەگەڵی پەزای خوا لە هەردوکیان بێت.

ئیبن زوبێر بەدەم شەڕکردنەوە لە دەرگای مزگەوتەکە چوویە دەرەوە، لەناو پێنج سەد ئەسپ سوار و پیادە رۆدا لە ڕاست و چەپیەوە بڵاوبووبوونەوە، ئەوکات تەمەنی لە حەفتا و سێ ساڵ تێپەڕی کردبوو، بەدەوم وتنی ئەم هۆنراوەیەوە:

**إني إذا أعرف يومي أصبر**      **إذ بعضهم يعرف ثم ينكر.**

واتە: من کە ڕۆژی خۆم بزانم ئارامدەگرم* بەڵام هەندێ کەس ڕۆژی خۆیشیان دەزانن و لەبیرخۆیانی دەبەنەوە...

کرتا ڕۆژی ئیبن زوبێر کە تیایدا کوژراوە بەدرێژی شەوەکەی شەونوێژی بۆ خودای گەورە کردووە، کە شەوی سێ شەممەی حەفدەی مانگی جەمادی یەکەمی ساڵی ٧٣ك بوو، لە مزگەوتی حەرام بوو، خۆی لەوێ پەنا دابوو کە لەگەڵ پاشماوەی یاوەرەکانی، ئینجا بانگبێژ لەپاڵ (مەقام)دا بانگی بەیانی فەرموو، ئیبن زوبێر دەست نوێژێکی گرت و دوو ڕکات نوێژی سوننەتی بەیانی کرد و پاشان نوێژی بەیانی بۆ هاوەڵەکانی کرد بە خوێندنی سورەی (ن) و ئینجا سەلامی نوێژی دایەوە و وتارێکی دا بۆ هاوڕێکانی و فەرمووی:

ڕوخسارتان دەربخەن تاکو بتان بینم و تەماشاتان بکەم.

ئەوانیش ڕوخساری داپۆشراویان کە بە پارچەیەکی وەك پەچەی ئافرەت لەژێر تەپلە و کڵاوقوچەکانیانەوە دایان پۆشیبوو دەرخست، هانی دان و بزواندنی بۆ جەنگین و ئارامگری پاشان هەستایەوە و شەڕی لەگەڵ سوپای حەجاجدا کرد هەتا ناچاری کردن بکشێنەوە بۆ کێوی (حەجون)، ئینجا بەردێکی گەرمی سورەوەبوو دای بەسەریدا و

بریـنداری کـرد و هێنایـە لـەرزە و خـوێن بـە ڕوخسـاریدا هاتـە خـوارێ[1] و ئـەم شـیعرەی دەچڕی:

**فلسنا على الأعقاب تدمى كلومنا ولكن على أقدامنا تقطر الدّما[2]**

پاشان کەوتە سەر زەوی و سەربازەکانی حەجاج بە پرتا و پەلاماریان دا و کوشتیان، تەرمەکەیان هێنا بۆلای حەجاجی سەرکردەیان کە دڵخۆش بوو بە کوژرانی و سوژدەی بۆ خوا برد – خوا نابوتی بکات– .

(ئیبن جەریری تەبەری) لە (التأریخ)ەکەیدا و (ئیبن کەسیر)یش لە (البداية والنهايـة)دا هەڵوێستی حەجاج و یەکێك لە سەرکردەکانی عبدالملك باس دەکـەن کاتێـك لاشـەی ئـیبن زوبێریان هێنا بۆلایان:

(حەجاج) و (تاریقی کوڕی عەمر) ڕۆیشتن هەتا چوونە سـەر لاشـەکەی و ئینجـا تـاریق گـوتی: هیچ ئافرەتێك لەمە پیاوتری بەدنیا نەهێناوە.

حەجاج گوتی: ئایا کەسێك ستایش دەکەیت کە دژی ئەمیری بڕواداران بوو؟

وتی: بەڵێ ، ئێمە ماوەی حەوت مانگە گەمارۆمانداوە، ئەو بە بێ هیچ سەرباز و قەلا و بەربەستێك، بەلام لەئێمە بە هێزتر و تۆڵەسێنتر بوو بوو، هەی بوو بەسەر ئێمەدا.

قسەکەیان گەیشتەوە لای (عبـدالملك) و ڕاکـەی (تـاریق)ی بـە ڕاسـت دانـا، کـاتێکیش لاشەی ئیبن زوبێر هەڵواسرا بۆنی میسکی لێ پەیدابوو.

(زەهەبی) لە (سير أعلام نبلا )دا دەڵێت کە ئیبن زوبێر ڕۆژی کوژرانی دەیفەرموو:

وادەزانم کـە ئـەمڕۆ دەکـوژرێم، ئەمشـەو بینـیم وەك ئـەوەی ئاسمـان بکرێتـەوە بـۆم، چوومە ناویەوە، بەلام بەخوا وەڕس بووم لەم دونیا و ئەوەشی لەناویدایە.

---

[1] . وتراوە: کە هاوەڵەکانی ئیبن زوبێر بەردیان دەگرتە سەربازەکانی حەجاج یەکیان بەر سەری ئیبن زوبێر کەوت و بە سەختی برینداری کرد.

[2] . واتە: ئێمە لەدواوە خوێن لەبرینەکانمان ناچۆڕێ*بەڵکو سڵ ناکەینەوە خوێن لەبەردەممانەوە دەڕوا.

دیسان دەگێڕنەوە کاتێك (عبدالله) کوژرا دایکی چووە سەر لاشەکەی، حەجاج لەگەڵ هاوەڵەکانی هات بۆلای و ووتی: بینیت کە خوا چۆن حەقی سەرخست و پیشانی هەمووانی دا؟

ئەویش فەرمووی: ڕەنگە بۆ تاوێکیش ناڕاست (باطل) بەسەر ڕاستدا (حەق) سەرکەوێت.

حەجاج گوتی: کوڕەکەی تۆ لەم ماڵەدا سەرپێچی کرد، خوای گەورەش دەفەرموێت:﴿ وَمَنْ يُرِدْ فِيهِ بِإِلْحَادٍ بِظُلْمٍ نُذِقْهُ مِنْ عَذَابٍ أَلِيمٍ﴾[1].

هەربۆیە خوای گەورە ئەو سزا بەئێشەی پێ چەشت.

دایکی ئیبن زوبێری فەرمووی: درۆت کرد، ئەو یەکەمین لەدایکبووی ئیسلام بوو لە مەدینە، کە پێغەمبەر – درودی خوای لێبێت– پێی شادومان بوو، مەلاشوی بەدەستی خۆی بۆ شیرینکرد کرد، موسوڵمانانیش (الله أكبر)یان کرد هەتاکو خۆشی و شادی لە مەدینەدا دەنگی دایەوە ، کەچی تۆ و هاوڕێکانت ئەم ڕۆ بە کوژرانی دڵخۆشن، چاك بزانە ئەوانەی ئەو ڕۆژگارە دڵخۆش بوون زۆر باشترن لەتۆ و هاوڕێکانیشت، لەگەڵ ئەوەشدا باش بوو لەگەڵ دایك و باوکی و زۆر بەڕۆژو دەبوو و زۆر شەونوێژی دەکرد و قورئانی خودای بەگەورە دادەنا، حەزی نەدەکرد سەرپێچی خودا بکات، ئیدی حەجاج بەزی و ڕۆیشت، دواتر ئەم قسانە گەیشتنەوە لای عبدالملك، نامەی نوسی بۆ حەجاج و سەرزەنشتی کرد لەسەر ئەو جۆرە قسەکردنەی لەگەڵ ئەسما و ووتی: تۆ چیتە بەسەر کچی پیاوە باش و چاکەخوازەکەوە (مەبەستی ئەبوبەکری صدیق بوو ڕەزای خوای لێبێت).

عبداللەی کوڕی عومەر دای بەلای ئیبن زوبێردا بە هەڵواسراوی و فەرمووی: سڵاوت لێبێت ئەی باوکی خوبەیب، سڵاوت لێبێت ئەی باوکی خوبەیب، سڵاوت لێبێت ئەی باوکی خوبەیب، بەخوا پێم خۆش نەبوو ئەمەت بەسەر بێت، ئەوەندەی من بزانم تۆ زۆر

---

[1] . الحج : ٢٥

بەڕۆژەبوویت و زۆریشت شەونوێژ دەکرد و خزم دۆست بوویت، کەواتە بەخوا ئۆمەتێك تۆ خراپترینەکەی بیت ئەوە باشترینە، پاشان عبداللەی کوڕی عومەر جێی هێشت، وەستانی ئیبن عومەر لەسەر لاشەی ئیبن زوبێر و قسەکانی گەیشتەوە بە حەجاج، ئەویش ناردی لە دارەکەیان کردەوە[١].

پاش کوژران و شەهیدبوونی ئیبن زوبێر کەس نەمایەوە و هەموان بەیعەتیان دا بە عبدالملك تەنانەت ئیبن عومەریش ڕەزای خوای لێبێت کە نامەی نوسی بۆ عبدالملك:

...... ئەوا منیش بەیعەتم دا بە ئەمیری بڕواداران بە گوێڕایەڵیەوە لەسەر دەستوری خودا و پێغەمبەرەکەی لەوەی کە بتوانم.

لەگێڕانەوەیەکدا هاتووە کە ئیبن عومەر نامەی نوسیوە بۆ عەبدولمەلیکی کوڕی مەروان و بەناوی خۆی دەستی پێکردووە و ئینجا نوسیویەتی :﴿اللَّهُ لَا إِلَهَ إِلَّا هُوَ لَيَجْمَعَنَّكُمْ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ لَا رَيْبَ فِيهِ﴾[٢].واتە: (الله) خوایەکە بێجگە لەو هیچ خوایەکی تر نیە (شایستەی پەرستن بێت) سوێند بەخوا لە ڕۆژی قیامەتدا کۆتان دەکاتەوە و هیچ شك و گومانێکی تێدا نیە......

پێم گەیشتۆتەوە کە موسوڵمانان کۆدەنگن لەسەر بەیعەتدان بەتۆ، ئەوا منیش چومە ئەو ریزەی موسوڵمانان تێی چوون...... والسلام.

هەندێك لە دەستوپێوەندەکانی خەلیفە هەوڵ دەدەن خەلیفە لە ئیبن عومەر توڕە بکەن، چونکە ناوی خۆی پێش ناوی خەلیفە خستووە، ئینجا عبدالملك دەڵێت: ئەمە لە (ئەبو عبدالرحمن)ەوە زۆر ڕوی هەیە – واتە چەند مەبەستێکی هەیە و ئێوە نایزانن – .

یەکێك لەو نوسیناتەی کە عبدالملك نوسیی بۆ حەجاجی کوڕی یوسف ئەوەبوو کە سەرپێچی عبداللەی کوڕی عومەر نەکات لە حەجدا.

---

[١] . الطبقات – لإبن سعد

[٢] النساء: ٨٧.

ئیبن عەساکر گێڕاویەتیەوە لە ژیاننامەی حەجاجدا کە کاتێك ئیبن زوبێر کوژرا مەککە ماتە لەرزین و خرۆشا بەگریان بۆ عبداللەی کوڕی زوبێر، ئینجا حەجاج هەستایەوە بۆ وتاردان بۆ خەڵکی مەککە و وتی:

ئەی خەڵکینە عبداللەی کوڕی زوبێر لە بژاردە و باشەکانی ئەم ئوممەتە بوو تا کاتێك کە حەزی کەوتە سەر جێنشینی و ململانێی لەگەڵ ئەوانەدا کرد کە لەبەرتربوون بۆ خەلافەت، لە کەعبەدا سەرپێچی کرد، خوای گەورەش سزای بەئێشی خۆی پێ چەشت، هەروەك ئادەمیش لای خودا لە ئیبن زوبێر بەرێزتر بوو، ئەو لە بەهەشت بوو، کە بەهەشت لە مەککە پیرۆزترە، جاکاتێك ئەو ئادەمە سەرپێچی فەرمانی خوای کرد و لەو درەختەی خوارد کە خودا لێی قەدەغە کردبوو، ئیدی خودا دەری کرد لە بەهەشت، کەواتە هەستن بۆ نوێژەکانتان بەر ڕەحمەتی خودا بکەون.

دەڵێن ووتویەتی: ئەی خەڵکی مەککە پێم گەیشتوتەوە کە کوژرانی ئیبن زوبێرتان گەورە کردووە ، بەڵێ ئیبن زوبێر یەکێك بوو لە باشترینەکانی ئەم ئوممەتە تاکو حەزی دونیا کەوتە مێشکی و ململانێی جێنشینی کرد لەگەڵ ئەوانەی کە جێنشینی هی خۆیانە، ئیدی وازی لە گوێڕایەڵی خودا هێنا و حورمەتی کەعبەی شکاند، گەر مەککە شتێك بوایە رێی لە مردن بگرتایە ئەوا حورمەتی بەهەشت رێی نەدەدا ئادەم بمرێت کە خودا بەدەستی خۆی دروستی کرد، لەڕۆحی خۆی کردووە بە بەریدا و سوژدەی بە فریشتەکانی بردووە بۆی و فێری ناوی هەرچی شت هەیە کردوێتی، بەڵام کاتێك سەرپێچی فەرمانی خوای کرد دەری کرد لە بەهەشت و دایبەزاندە سەر زەوی، هەمووتان دەزانن کە ئادەم لای خوا لە ئیبن زوبێر بەرێزترە و ئیبن زوبێر هەر ئەو کەسە بوو کە قورئانەکەی خوای گۆڕی.

یەکسەر عبداللەی کوڕی عومەر پێی گوت: گەر ویستبێتت من پێت بڵێم درۆت کرد ئەوا وتم، سوێند بەخوا ئیبن زوبێر قورئانی خوای نەگۆڕی، بەڵکو ئەو کەسەبوو کە زۆر بەڕۆژو دەبوو و زۆر شەونوێژی دەکرد و بە حەق کاری دەکرد[1].

حەجاج سەری (ئیبن زوبێر)ی نارد بۆ (عبدالملکی کوڕی مەروان) لەشام و سەری هەریەك لە (صەفوان و عەمارەی کوڕی حەزەم)یشی نارد و فەرمانی بە سەربازەکانیشی کرد کە ئەگەر تێپەڕین بە مەدینەی مونەووەرەدا سەرەکان هەڵبواسن و پاشان ڕۆیشتنەکەیان بۆ شام درێژە پێ بدەن، ئەوانیش وایان کرد کە ئەو گوتی، ئینجا سەرە براوەکانی بەپیاوێکی (ئەزد[2])ی دا نارد، عبدالملك پێنج سەد دیناری خەڵات کرد و زۆریش دڵخۆش بوو بە کوژرانی ئیبن زوبێر و خۆشیەکەی دەربڕی بە بڕینی چواردەوری قژی منداڵەکانی و سەرچاك کردنیان.

پاشان عبدالملك فەرمانی کرد بە حەجاج بە هەڵواسینی لاشەی ئیبن زوبێر لای کێوی (جەحون) لە مەککە، ئەمەش یەکێکە لە قێزەونترین ئەو کارانەی کە مێژووی دەوڵەتی ئیسلام تۆماری کردووە و نەنگی و خەوشێکە لە سەربوردەکەی عبدالملك و حەجاجی دەستوپێوەندیدا، بەڵکو خەلیفە و ستەمکارەکانی هاوشێوەیشی ئەو مێژووەیان هەبووە.

هەر بەکردەیی حەجاج فەرمانی (عبدالملك)ی گەورە و سەرداری جێبەجێ کرد وەك پیشەی هەمیشەیی حەجاج لە گوێڕایەڵیکردنی وەلی ئەمرەکاندا، ئەگەرچی فەرمانەکانیشیان پێچەوانەی قورئان و دەستوری پێغەمبەرەکەی بێت – درودی خوای لەسەر – گوێڕایەڵیکردنی وەلی ئەمر و گەورەکان لای ئەو لەپێش هەموو شتێکەوە بوون.

(حەجاج) و (ئەسمای کچی ئەبوبەکر) چەندین ڕووبەڕووبوونەوەیان هەیە کە مێژو تۆماری کردووە گرنگترینیان پاش کوژرانی ئیبن زوبێرە، ئێمەش ئەوەیان باس دەکەین کە ئەحمەد لە (مسند)ەکەیدا گێڕاویەتیەوە:

---

[1] .البدایة والنهایة.

[2] . الأزد: هۆز و قەبیلەیەکی عەرەبی (قحطاني)یە و لەزۆربەشیان بەناوبانگترە، ڕیشەی ئەم تیرەیە دەگەڕێتەوە بۆ کەسێك بەناوی (مازن بن الأزد).

کاتێك ئیبن زوبێر مرد مەککە خرۆشا بەگریان، حەجاج فەرمانی کرد بەخەڵکی و کۆبوونەوە لە مزگەوت، ئینجا چووە سەر بڵندگۆ و گوتی:سوپاس و ستایش بۆخوا: ئەی خەڵکی مەککە پێم گەیشتۆتەوە کە کوژرانی ئیبن زوبێرتان گەورە کردووە، بەڵێ ئیبن زوبێر یەکێك بوو لە باشترینەکانی ئەم ئوممەتە تاکو حەزی دونیا کەوتە مێشکی و ململانێی جێنشینی کرد لەگەڵ ئەوانەی کە جێنشینی هی خۆیانە، ئیدی وازی لە گوێڕایەڵی خودا هێنا و حورمەتی کەعبەی شکاند، گەر مەککە شتێك بوایە ڕێی لە مردن بگرتایە ئەوا حورمەتی بەهەشت ڕێی نەدەدا ئادەم بمرێت کە خودا بەدەستی خۆی دروستی کرد، لەڕۆحی خۆی کردووە بە بەریدا و سوژدەی بە فریشتەکانی بردووە بۆی و فێری ناوی هەرچی شت هەیە کردویتی، بەلام کاتێك سەرپێچی فەرمانی خوای کرد دەری کرد لە بەهەشت و دابەزاندە سەر زەوی، هەمووتان دەزانن کە ئادەم لای خوا لە ئیبن زوبێر بەڕێزترە، یادی خودا بکەن تا یادتان بکات.

لە (ئەبی صدیقی ناجی)ەوە دەگێڕێتەوە کە حەجاج چووە لای (ئەسمای کچی ئەبوبەکر) پاش ئەوەی عبداللەی کوڕی کوژرا و وتی: کوڕەکەت لەم ماڵەدا -مەبەستی کەعبەیە- سەرپێچی کرد، بۆیە خوای گەورەش سزای بەئێشی خۆی پێ چەشت و ئەوەی پێکرد کە کردی.

ئەویش فەرمووی: درۆت کرد، ئەو باش بوو لەگەڵ دایك و باوکی، زۆر بەڕۆژوو دەبوو و شەونوێژی دەکرد، بەلام پێغەمبەری خودا -درودی خوای لێبێت- هەواڵی پێداوین کە لە (ثقیف) دوو درۆزن پەیدا دەبن، دووەمیان لە یەکەمیان خراپترە، لەگە درۆزنیەکەیدا خوێنڕێژیشە.

(ئەبو یەعلی) لە (قەیسی کوڕی ئەحنەف)ەوە ئەویش لە (ئەسمای کچی ئەبوبەکر)ەوە گێڕاویەتیەوە کە ووتی: گوێم لێ بوو لە پێغەمبەری خودا قەدەغەی شێواندنی لاشەی کوژراوی کرد، هەروەها بیستم دەیفەرموو: لە سەقیف دوو پیاو یەکیان درۆزن و ئەوی تریان خوێن ڕێژ دەردەچن، ئەسما فەرموی: بە حەجاجم گوت: درۆزنەکەمان بینی و خوێن ڕێژەکەش تۆی ئەی حەجاج.

دیسان (ئەبو یەعلی) لە (عەوامی کوڕی حەوشەب)ەوە دەگێڕێتەوە گوتی: یەکێك پێی گوتم کە بیستی لە ئەسمای کچی ئەبوبەکری صدیقەوە دەیفەرموو بە حەجاج کاتێك چوو بۆلای تاکو سەرەخۆشی لیّ بکات بەهۆی کوژرانی کوڕەکەیەوە: بیستم پێغەمبەر – درودی خوای لەسەر– دەیفەرموو: لە سەقیف دوو پیاو دەردەچن درۆزن و خوێنڕێژ، درۆزنەکە کوڕەکەی ئەبو عوبەید واتە (مختار)ە، بەڵام خوێنڕێژەکە تۆی.

لە صەحیحی موسلیم دا بە شێوەیەکی تر خراوەتە ڕوو.

شافیعی فەرمویەتی: (موسلیمی کوڕی خالید) هەواڵی داوە لە (ئیبن جورەیج)ەوە ئەویش لە (نافیع)ەوە: ئیبن عومەر شەوەکانی شەڕکردن لەگەڵ ئیبن زوبێر خۆی لە حەجاج دورەپەرێزدەگرت کە حەجاج لە مینا بوو، هەروەها نوێژی لەگەڵ حەجاج نەدەکرد.

(سوفیانی پوری) دەگێڕێتەوە: ئیبن عومەر چووە لای حەجاج و سڵاوی لیّ نەکرد و نوێژی نەکرد لە دوایەوە.

( ئیسحاقی کوڕی ڕاهەوەی) دەگێڕێتەوە: کە حەجاج وتاری دەدا و دەیگوت: ئیبن زوبێر دەسکاری قورئانی کردووە.

ئینجا ئیبن عومەر پێی دەڵێت: خوای گەورە دەسەڵاتی ئەوەی پیّ نەداوە، تۆش لەگەڵی نەبووی، گەر ویستبێتت من پێت بڵێم درۆت کرد، ئەوا وتم.

هەروەها دەگێڕنەوە کە حەجاج درێژەی دا بە وتارەکە و وای کرد ئیبن عومەر چەند جارێك بڵێت ( نوێژ نوێژ)، پاشان قامەتی نوێژ کرا و خەڵکیش هەستانەوە و حەجاج نوێژی بە خەڵکەکە کرد.

کاتێك تەواو بوو بە ئیبن عومەری گوت: چی هانی دای وا بکەی؟

ئەویش فەرموی: ئێمە بۆ نوێژ دێین تۆیش لەکاتی خۆیدا نوێژەکە بکە و دواتر چەند دەڵێی بڵیّ– واتە چەنەی خۆت بدە–.

موسلیم لە صەحیحەکەیدا دەگێڕێتەوە لە (ئیبن نەوفەل)ەوە فەرمووی: عبداللەی کوڕی عومەر دای بەلای ئیبن زوبێردا بە هەڵواسراوی و فەرمووی: سڵاوت لێبێت ئەی

باوکی خوبەیب، سڵاوت لێبێت ئەی باوکی خوبەیب، سڵاوت لێبێت ئەی باوکی خوبەیب، بەخوا پێم خۆش نەبوو ئەمەت بەسەر بێت، ئەوەندەی من بزانم تۆ زۆر بەڕۆژدەبوویت و زۆریشت شەونوێژ دەکرد و خزم دۆست بووی، کەواتە بەخوا ئۆمەتێك تۆ خراپترینەکەی بێت ئەوە باشترینە، پاشان عبداللەی کوڕی عومەر جێی هێشت.

وەستانی ئیبن عومەر لەسەر لاشەی ئیبن زوبێر و قسەکانی گەیشتەوە بە حەجاج، ئەویش ناردی لە دارەکەیان کردەوە و لە گۆڕستانی جولەکان ناشتیان [1].

پاشان حەجاج ناردی بەدوای (ئەسما) دا – ڕەزای خوای لێبێت– ئەویش نەهات و ڕازی نەبوو کە بێت بۆلای، ئینجا نێرراوەکەی ناردەوە بۆلای وتی یان دێی بۆ لام یان کەسێك دەنێرم پەلکێشت بکا بۆلام.

ئەسما فەرمووی: سوێند بەخوا نایەم تا ئەو کەسە دەنێری پەلکێشم دەکات.

ئینجا خۆی نەعلەکانی لەپێ کرد و بەپەلە بەرەو لای ئەسما ڕۆیشت، کاتێك گەیشتە لای پێی گوت: بینیت چۆنم بەسەر دوژمنەکەی خوا هێنا؟

ئەویش فەرمووی: بەڵێ، بینیم دنیات لێ تێکدا، بەڵام ئەویش دواڕۆژی لێ خراپ کردی، پێم گەیشتۆتەوە کە تۆ پێت وتووە: کوڕی (ذات النطاقین – واتە خاوەن دوو پشتوێن– کەنازناوی ئەسما بوو) بەڵێ من دوو پشتوێنم لەپشت بوو، یەکیان خۆراکی پێغەمبەری خودا و ئەبوبەکرم پێ هەڵدەگرت، ئەوی تریشیان پشتوێنی ئافرەتێکە کە ئاتاج بە هیچ نیە، بەڵام پێغەمبەری خوا پێی فەرمووین کە لە (سەقیف) درۆزنێك و خوێنڕێژێك پەیدا دەبن درۆزنەکەمان بینی، خوێنڕێژەکەش تەنها تۆ دەبینم.

ئیدی حەجاج هەستا و نەگەڕایەوە بۆلای.

(واقیدی) باسی کردووە کە (ئەسما ) داوای کرد لە عبدالملك تا کوڕەکەی لە گۆڕستانی (حەجون) ئەسپەردە بکات، عبدالملك ڕەزامەندی پیشان دا لەسەر داواکەی، باسیان کردووە کە لای قەبرەکەی ئەوەوە بۆنی میسك دەهات.

---

[1] . البدایة والنهایة.

پاش چەند ڕۆژێك لە کوژرانی عبداللەی کوڕی، ئەسمای دایکیشی مرد، دەڵێن دە ڕۆژ دوای ئەو بووە، یان پێنج ڕۆژ، یا سەد ڕۆژ کە ئەم ماوەیەیان زیاتر ڕای لەسەرە، گەیشتبووە سەد ساڵ و ددانێکی نەکەوتبوو، وتراوە کە لە کۆتا ڕۆژەکانیدا چاوی لەدەست داوە، هەندێکیش دەڵێن وانیە و چاوی هەر بینیویەتی[1].

(طبرانی) لە ئیسحاقی کوڕی ئەبی ئیسحاقەوە دەگێڕێتەوە: من لە مزگەوتی حەرام بووم کە ئیبن زوبێر کوژرا، ئەو ڕۆژەی کوژرا یەك یەك سوپاکان خۆیان دەکرد بە دەرگای مزگەوتەکەدا، هەر کۆمەڵێك لە دەرگاوە دەهاتنە ژورێ زۆر بەتوندی هێرشی دەکردە سەریان هەتا دەری دەکردن، بەو جۆرە بەردەوام بوو تاکو دەڵێن بەردێکی گەرمی مەنجەنیق بەر سەری کەوت یان دەڵێن تێرگێك لە بنمیچی مزگەوت بەربوویەوە بەهۆی بوردومانەکانی حەجاجەوە و بەر سەری کەوت و دای بەزەویدا و بەدەم گوتنی ئەم دێڕانەوە:

أسماء أسماء لاتبكين        لم يبق إلاّ حسبي وديني

وصارم لانت به يميني[2]

ئائەمەش لە هەمووی ڕاستر هیچ کەس لە سەربازەکانی سوپای حەجاج چاری نەکرد گەرچی پیرێکی بەساڵاچووش بوو کەچی هێزێکی گەورەی پێ بوو، وەك مێژوزانان و بگێڕەوەکانی مێژوو باسیان کردووە، ووتویانە هۆکاری ئەو هێزە ئەوە بووە کە پێغەمبەر -درودی خوای لەسەر- خوێنی کەڵەشاخی خۆی پێداوە تاکو ڕۆی بکات و بیڕێژێت،

---

[1] . هەروەك ئیبن کەسیر باسی کردووە کە وتراوە عبداللەی کوڕی زوبێر ئەسمای دایکی خۆی شۆری و کفنی کرد و نوێژی لەسەرکرد و بردی بۆ مەدینە و خاتو صەفیەی کچی حوبەی کوڕی ئەحتەب یەکێك لە خێزانەکانی پێغەمبەر درودی خوای لێبێت ئەسپەردەی خاکی کرد، ئەو لەپاڵ پێغەمبەر و ئەبوبەکر و عومەردا ئەسپەردە کراوە و چەند کەسێش ئەوەیان باسکردووە، خواگیان خۆیشی زاناتر و ئاگادارترە لە هەمووان ..

[2] .ئەسما ئەسما مەگریە.....هیچ نەماوە جگە لە خۆشەویستیم بۆتۆ و دینەکەم.

ئەویش خواردویەتیەوە، خوێنی کەڵەشاخیش ئەو خوێنەیە کە لە جەستەی مرۆڤ دەردەچێت پاش ئەوەی کەڵەشاخی بۆ دەکەن.

جا کاتێك گەڕایەوە پێغەمبەر درودی خوای لێبێت پێی فەرموو: چیت کرد لە خوێنەکە ئەی عبدالله؟

ئەویش فەرمووی: کردمە شوێنێکەوە وام گومان برد خەڵکی نایدۆزنەوە و دور لەچاوی خەڵکی.

پێغەمبەر فەرمووی: ڕەنگە خواردبێتتەوە؟

فەرمووی: بەڵێ.

فەرمووی: کێ فەرمانی پێ کردیت کە خوێن بخۆیتەوە؟ وەیل بۆتۆ لەخەڵکی و وەیل بۆ خەڵکی لەتۆ.

لەگێڕانەوەیەکدا ئیبن زوبێر فەرمویەتی: پێم خۆش بوو خوێنی پێغەمبەری خودا لە هەناومدابێت.

پێغەمبەریش پێی دەفەرموێت: وەیل بۆتۆ لەخەڵکی و وەیل بۆخەڵکی لەتۆ، ئاگرت بەر ناکەوێت.

لەوانەش کە لەگەڵ ئیبن زوبێر کوژران لە هاوەڵان: (عبداللەی کوڕی صەفوان کوڕی ئومەییە) و (عبداللەی کوڕی موتیع کوڕی ئەسوەد کوڕی حاریسەی عەدەوی) و (عەوق کوڕی مالیك) — ڕەزای خوایان لێبێت— .

ئەصمەعی دەفەرموێت: گوێم لێ بوو مامم دەیگوت: هەواڵم پێ گەیشت حەجاج کاتێك لە کوشتنی ئیبن زوبێر تەواو بوو چوو بۆ مەدینە و پیاوێکی پیری بینی لەدەرەوەی مەیدنە و پرسیاری لێکرد لەبارەی حاڵی خەڵکی مەدینەوە، ئەویش گوتی: خەڵك لەخراپترین حاڵدان کوڕی حەواریەکەی پێغەمبەری خودا کوژراوە — درودی خوای لێبێت —.

ئینجا حەجاج پێی گوت: جا کێ کوشتویەتی؟

ئەویش گوتی: ئەو تاوانبارە نەفرەتیە حەجاج، نەفرەتی خودای لێبێت خوا لەناوی بات.

حەجاج زۆر تورەبوو و پاشان گوتی: هۆی پیر ئایا حەجاج دەناسیت ئەگەر بینیت؟

گوتی: بەڵێ خوا خێر نەهێنێتە ڕێی و لەشەڕ و زیانیش نەیپارێزێت.

ئینجا حەجاج ڕوپۆشەکەی لابرد و گوتی: هۆی پیر هەر ئێستا دەزانی حەجاج کێ یە ئەگەر خوێن ڕژا!

جا کاتێك مامە پیرەکە بۆی ئاشکرا بوو گوتی: ئای چەند سەیرە ئەی حەجاج، گەر بتناسیبام ئەم قسەیەت نەدەکرد، من ئەو (عەباسی کوڕی ئەبو داود)ەم، کە هەموو ڕۆژێ پێنج جار فێی لێدێت .

ئینجا حەجاج گوتی: برۆ خوا شیفای (الابعدُ)[1] نەدات لە شێتیەکەی و چاکی نەکاتەوە.

بەڵام هەڵوێستی زانایان و زانست دۆستان لەبارەی جێنشینیی (عبداللەی کوڕی زوبێر)ەوە بۆ موسوڵمانان ئەوەیە: کۆك بوون لەسەری پاش (یەزیدی کوڕی موعاویە)، چونکە دەنگی زۆرینەی وڵاتانی ئیسلامی بەدەستهێنا وەك باسمان کرد، هەروەها (مەروانی کوڕی حەکەم) و کوڕەکەشی (عبدالملك) بە خەواریج و هەڵگەڕاوە لە خەلافەتەکەی دادەنێن، شەڕکردنی عبدالملك و حەجاج لە دژی بە دەستدرێژی دادەنێن بۆسەر ئیبن زوبێر و شەرع و یاسای خەلافەت، جگە لەوەی پێیان وایە ستەملێکراوانە کوژراوە –ڕەزای خوای لێبێت–.

***

---

[1] . الأبعدُ: وشەیەکە بۆ کەسێك بەکاردێت لەجیاتی ناوەکەی خۆی کە مەبەست لێی زەمکاری بێت.

## هەڵوێستی ئیبن عومەر ڕەزای خوای لێبێت لەبارەی ئاژاوەکە و حەجاجەوە

پاش کوژرانی ئیبن زوبێر عبدالملك حەجاجی سەقەفی سەرکردەی سوپاکەی خۆی کردە فەرمانڕەوای مەککە، عبداللەی کوڕی عومەریش بۆ حەج و عەمرە لە مەدینەوە دەهاتە مەککە کردەوەکانی حەجاجی دەبینی و چارەی نەدەهات لێی، هەربۆیە زۆر بە ئازایەتیەوە فەرمانی بەچاکە و ڕێگری لە خراپە لێدەکرد.

چەندین هەڵوێستی بەرامبەر حەجاج نواندووە، تەنانەت هەندێك لە مێژوزانان پێیان وایە کە ئیبن عومەر بە دەسکیسەیەکی حەجاج کوژرا.

ئیبن عومەر بەلایەوە گران بوو کە حەجاج ئاسایشکردبوویەوە چەك هەلگرتن لە مەککەدا بلاو ببێتەوە و لێ دەگەڕا پیاوانی سوپاکەی موسوڵمانانی پێ نیگەران بکەن و ژیانیان ڕوبەڕوی ئەو مەترسیە بکەنەوە، لە صەحیحدا هاتووە لە سەعیدی کوڕی جوبەیرەوە فەرموی: لەگەڵ ئیبن عومەر بووم کاتێك نوکی ڕم چوو بە بنی پێیدا، ئیدی پێی بە (ئاوزەنگ[1])ی زینی ئەسپەکەیدا دەلکا، برینەکەی کیمی دەکرد، ئەو ڕوداوەش لە مینا بوو، ئینجا حەجاج گەیشت و گەڕاندیەوە.

حەجاج گوتی: گەر دەمزانی کێ وای لێکردوی؟

ئیبن عومەر فەرموی: تۆ بریندارت کردم.

---

[1] چوارچێوەیەك یان ئەلقەیەکە و دەبەسترێت بە زینی ئەسپەوە بۆ ئەوەی سوارییەکە قاچی بکاتە ناوی لەکاتی ئاودان و ڕۆیشتندا و بە ئاسانیش سواری ببێت.

حەجاج گوتی: جا چۆن؟

فەرمووی: چەکت لە ڕۆژێکدا هەڵگرت کە قەدەغەبوو، هەروەها چەکت هێنایە کابەوە و چەکیش پێشتر نەدەهاتە کابە.

وە لەگێڕانەوەیەکدا کە ئیسحاقی کوڕی سەعید لەباوکیەوە دەگێڕێتەوە:

وتی: حەجاج چوویە لای ئیبن عومەر و منیشی لا بووم.

وتی: کێ بریندارى کردیت؟

فەرمووی: ئەو کەسە برینداری کردم کە فەرمانی بە هەڵگرتنی چەك کرد لە ڕۆژێکدا کە ڕەوا نیە تیایدا چەك هەڵبگیرێت.

- واتە حەجاج-.

کاتێك حەجاج دەرچوو ئیبن عومەر فەرمووی: داخم نەخواردووە بۆ هیچ شتێك لەم دونیایە جگە لە سێ شت نەبێ، یەکێ لەوانە کە باسی کرد ئەوەیە گوتی: بەرەنگاری ئەم دەستە ستەمکارە نەبوومەوە کە دەستدرێژیان کردە سەرمان.

پێشەوا زەهەبی دەگێڕێتەوە کە دەستە ستەمکارەکە عبدالملك و سوپاکەی بوون، هەروەها ئیبن عومەر بەهۆی ئەو برینداربوونەوە کۆچی دوایی کرد.

ئیبن عومەر دور نەبوو لە ڕوداوە سیاسیەکانی دەوروپشتیەوە، بەڵکو تێڕوانین و شیکردنەوەی خۆی هەبوو بۆ ئەو ڕوداوانە، ئیبن عومەر جیاوازبوو لە هەڵوێستەکانی دا دژی ئاژاوە و فیتنە جیاوازیەکی ئاشکرا، لەگەڵ چەندین ئاژاوەدا ژیاوە کە ئومەتی ئیسلام لەو کاتەدا گیرۆدەی بووە و بەرگەی گرتووە.

لەدیارترین ئەو شتانەی ئەهج و ڕێبازی ئیبن عومەر پێی جیاکراوەتەوە لە کاتی مامەڵەکردن لەگەڵ ئاژاوەکاندا:

دورکەوتنەوە لە شەڕ و شۆڕ و سوربوون لەسەر نەڕشتنی خوێنی موسوڵمانان، چەندین گێڕانەوە هەن کە هەڵوێستی ئیبن عومەر ڕون دەکەنەوە -ڕەزای خوای لێبێت- لەو شەڕەی کە هەڵگیرسا لە فیتنەی یەکەم و دووەم دا، لە قاسمی کوڕی عەبدولڕەحمانەوە وتی: وتیان بە ئیبن عومەر لە یەکەم ئاژاوەدا ئایا ناچیت بۆ شەڕ؟

فەرموی: کاتێك شەڕم دەکرد و بت و پەیکەرەکان لەنێوان ئەم پایە و دەرگاکەیدا بوون هەتا خوای گەورە سڕینیەوە لەسەر خاکی عەرەبی، بەڵام من ئێستا پێم خۆش نیە شەڕ بکەم لەگەڵ کەسێك دەڵێت: لااله الا الله.

وتیان: بەخوا ڕات وانەبوو، بەڵام ویستت هاوەڵانی پێغەمبەر -دروردی خوای لەسەر- یەکتری لەناو ببەن تا کاتێك جگە لەخۆت کەس نامێنێتەوە و دەڵێن بەیعەت بدەن بە (عبداللەی کوڕی عومەر) و بیکەنە ئەمیری بڕواداران، فەرمووی: سوێند بەخوا ئەوە نیە لە دڵمدا، بەڵام گەر وتتان (حيّ علی الفلاح) ئەوا دێم بەپیریتانەوە، ئەگەر ناکۆکی کەوتە نێوانتان لەگەڵتان نابم، ئەگەریش لەگەڵتان بووم لێتان جیا نابمەوە[1].

دوو پیاو هاتن بۆلای لە ئاژاوەکەی ئیبن زوبێردا و وتیان: دەبینی خەڵك چیان کرد، تۆش کوڕی عومەر و هاوەڵی پێغەمبەر خودایت، چی ڕێگریت لێ دەکات نەیەیت بۆ شەڕ؟

فەرموی: ئەوە ڕێگریم لێ دەکات کە خودا خوێنی برا موسوڵمانەکانمی لەسەرم حەرام کردووە ، وتیان: ئایا خودا نەیفەرمووە:﴿ وَقَاتِلُوهُمْ حَتَّى لَا تَكُونَ فِتْنَةٌ﴾[2].. واتە : خۆ ئەگەر کۆڵیان نەدا ئەوا بجەنگن لەگەڵیان تا ئاشوب و ئاژاوە نەمێنێت....

فەرمووی: جەنگاین تا ئاژاوە نەما و ئێستاش دین هی خودایە. ئاینی خودا حوکم دەکات).

کاتێك بۆیان دەرکەوت کە ئەو وەڵامەی دەیداتەوە لەگەڵ بۆچونی ئەمان ناگونجێت وتیان چی دەڵێی لەبارەی عەلی و عوسمانەوە؟

ئیبن عومەر فەرموی: چی دەڵێم لەبارەی عەلی و عوسمانەوە؟ (عوسمان) خودای گەورە لێی خۆش بوو و بەخشی ئێوەش پێتان ناخۆش بوو کە لێی خۆش بووبێت، هەرچی (عەلی)ە ئامۆزای پێغەمبەری خودا و زاواشی بوو.

بە دەستیشی ئاماژەی کرد، ئەوە ماڵەکەیەتی کە دەیبینن.

---

[1] سەیری (حلية الأولياء وطبقات الأصفياء ) ی (أبو نعيم الأصفهاني)بکە.

[2] البقرة:١٩٣

ئیبن عومەر هەر بەوە وازی نەهێنا کە تەنها خۆی دووربگرێت لە خوێنڕشتنی موسوڵمانان، بەڵکو هەندێك ڕێگای گرتە بەر کە دەبنە هۆی دوورخستنەوەی موسوڵمانانیش لە خوێنڕشتن لە ناو خۆیاندا، لەوانەش هەوڵی جدی خۆی بوو لەمیانەی ناکۆکیەکەی ئیبن زوبێر و عەبدولمەلیکی کوڕی مەرواندا، بۆ کۆتاییهێنان بە شەڕی نێوانیان و خوێن نەڕشتنی موسوڵمانان.

مەدائینی گێڕاویەتیەوە کە عبداللەی کوڕی عومەر نامەی نوسیوە بۆ عەبدولمەلیکی کوڕی مەروان و داوای لێکردووە لەخوا بترسێت و وازبهێنێت لەو بەزمە، عبدالملك بۆی دەنوسێتەوە کە خۆی لەو ئاژاوەیە دەردەکات خەلافەت دەکاتە ڕاوێژ، بەڵام کاتێك هەر بەو جۆرە نامە دەنوسێت بۆ ئیبن زوبێر ئاوڕی لێنادات[1].

ئابەم جۆرە بوو بەرنامە و ڕێبازی ئیبن عومەر – ڕەزای خوای لێبێت – لە ئاژاوەکاندا هەر لە سەرەتای سەرهەڵدانیانەوە لە سەردەمی عوسمان دا – ڕەزای خوای لێبێت – ، هەربۆیە ئیبن عومەر فەرمویەتی: لە خەلافەتەکەی عوسمانیدا پیاوێك هات بۆلام، داوای لێدەکردم کە عوسمان بکەم، جا کاتێك قسەکانی تەواو بوون پێم گوت: ئێمە کاتێك کە پێغەمبەری خودا زیند بوو دەمان گوت: باشترینی ناو ئوممەتی محمد لەدوای خۆی ئەبوبەکر و عومەرن و پاشان عوسمان، ئێمە ئەمان بیستووە و بینوە عوسمان کەسێك بە ناحەق بکوژێت، شتێك لە تاوانە گەورەکانی ئەنجام نەداوە، بەڵام ئەم ماڵە گەر پێیان دان ڕازی دەبن وەگەر دای بە نزیکێکی توڕە دەبن و ڕقتان لێی دەبێتەوە، بەڵام ئێوە دەتانەوێت وەك فارس و ڕۆم بن، واز لە ئەمیرێك ناهێنن هەتا دەیکوژن، ئینجا چاوەکانی چوار فرمێسکی لێ هات و پاشان فەرمووی: خوایە ئەو ئاژاوەیە دوبارە نەکەیتەوە[2].

ئیبن عومەر بەرهەڵستی ئەو قسەیەی کرد کە لەسەر زمانی هەلگەڕاوەکان – خەواریج– بوو بەسەر خەلافەتەکەی عوسمانی کوڕی عەففاندا – ڕەزای خوای لێبێت –

---

[1]. سەیری (أنساب الأشراف)ی (أحمد بن يحيى البلاذري) بکە.

[2].(طبراني) لە (المعجم الكبير)دا گێڕاویەتیەوە.

دەیانگوت لای دەبەین لە خەلیفایەتی تاکو نەبێتە دەستور، کاتێک خەلیفە عوسمان – خوا لێی ڕازی بێت – مەترسیەکی وەک ئەم لادانەی هەست پێکرد و هەروەها پەی بەوە برد کە موسوڵمانان و خودی خەلیفەش توشی چ خراپی و دووبەرەکی و ناکۆکیەک دەبن لەبەر ئەوە متمانەی تەوای خۆی بەخشیە ئیبن عومەر و پرس و ڕاوێژی پێ دەکرد کاتی دەردیسەری و ئەو میحنەتەی لەگەڵ ئەو هەراوهوریایەدا بەرۆکی گرتبوو، هەربۆیە کاتێک ئیبن عومەر چوو بۆ لای عوسمان پێی فەرموو: سەیرکە ئەوانە چی دەڵێن: دەڵێن خۆت وازبێنە یان دەتکوژین.

ئیبن عومەر پێی فەرموو: ئایا تۆ لەدونیا بۆ هەتایە دەژیت؟

فەرموی: نەخێر.

پێی گوت: ئایا لە کوشتنت زیاتر هیچی تر دەکەن؟

فەرمووی: نەخێر.

پێی گوت: ئایا بەهەشت و دۆزەخی تۆ لای ئەوانە؟

فەرمووی: نەخێر.

گوتی: کەواتە ئەو کراسەی خوا کردویەتیە بەرت دامەکەنە با نەبێتە دەستور، هەر گەلێک ڕقیان لە خەلیفەکەیان بوو یان لایان ببەن یان بیکوژن[1].

چەندین بەڵگە و ڕاستیی مێژوویی هەن دەیسەلمێنن کە ئیبن عومەر کاتێک ئەو کردەوانەی حەجاجی بینیوە وەک ستەمکردنی گەورە لە کەعبەی پیرۆزدا و خوێن ڕشتن و شکاندنی پیرۆزیەکەی، ڕای خۆی گۆڕی لە پەرژگرتن لە ئاژاوە، بەڵکو پەشیمان بوویەوە لەوەی کە نەجەنگا لە سوپاکەی عەلی کوڕی ئەبو تالیب دا دژی معاویە کە بە تێڕوانینی ئەو هەڵگەڕایەوە لە شەرعیەت بوونی عەلی و ستەمی لێکرد، هەربۆیە (حەبیبی کوڕی سابت[2]) دەگێڕێتەوە کە ئیبن عومەر کاتێک مەرگ بەخەی پێ گرت فەرموی: هیچ

---

[1] - العواصم من القواصم.... ابوبكر بن العربي.

[2] حبيب بن ثابت.

شتێکی خراپ لەخۆمدا شك نابەم ئەوە نەبێت کە لەگەڵ عەلی نەجەنگام دژی دەستە ستەمکارەکە – مەبەستی دژی دەستەی معاویە بوو–[1].

ئیبن عومەر ڕێگری کرد لە بەیعەتدان بە ئیبن زوبێر لەبەر بوونی ناکۆکی لەسەر جێنشینی لەنێوان ئیبن زوبێر و مەروان و پاشان کوڕەکەیدا (عبدالملك)، پێی وابوو کە هەمووان کۆ دەنگ نین لەسەر یەك پیاو، جا کاتێك ئیبن زوبێر کوژرا و هەمووان کۆدەنگ بوون لەسەر عبدالملك ئەمیش بەیعەتی پێدا.

ماوەتەوە بڵێین ئیبن عومەر –ڕەزای خوای لێبێت– ساڵی ٧٤ ك، کۆچی دوایی کرد و تەمەنی هەشتا و شەش ساڵ بوو.

***

[1] سەیری (سیر أعلام النبلاء)ی (ذهبي) بکە.



# حەجاج دەبێتە فەرمانڕەوا (والی)

- حەجاج دەبێتە فەرمانڕەوای مەککە و مەدینە و گائف و یەمەن و پاشان عێراق.

- یەکەمین ڕاپەڕین دژی حەجاج لە بەیرەوە سەرهەڵدەدات.

- چەندین قسە وهەڵوێست و بەسەرهاتی ڕۆژانەی حەجاج لەماوەی فەرمانڕەوایەتیەکەیدا کە ئاماژە بۆ کەسێتی حەجاج دەکەن.

# حەجاج دەبێتە فەرمانڕەوای مەککە و مەدینەی مونەووەرە

شتێکی سروشتی بوو کە حەجاج فەرمانڕەوایەتی مەککە بگرێتە دەست پاش سەرکەوتنی لە لەناوبردنی عبداللەی کوڕی زوبێری ئەمیری شەرعی موسوڵمانانادا وەك باسمان کرد، ئینجا حەجاج بەیعەتی وەرگرت لە خەڵکی مەککە بۆ عەبدولمەلیکی کوڕی مەروان پاش کوژرانی ئیبن زوبێر.

عەبدولمەلیکی کوڕی مەروان کە خۆی کردبوویە جێنشین بەزەبری هێز و چەك و ستەمی حەجاج، پاش ساڵێك دوای کوژرانی ئیبن زوبێری جێنشینی شەرعی بڕواداران ساڵی ٧٤ك (طاریقی کوڕی عومەر)ی فەرمانڕەوای مەدینەی لەسەر کار لابرد، یەکێك بوو لەو کاربەدەست و سەرکردانەی کە بەشداربوو لەگەڵ حەجاج لە شەڕەکەی ئیبن زوبێردا، بەڵام کاتێك سەری ئیبن زوبێریان هێنا بۆ حەجاج ئەو ستایشی ئیبن زوبێری کرد و گوتی:

ئافرەتان لەمە (مەردتریان) پیاوتریان بەدنیان نەهێناوە.

حەجاج گوتی: ئایا کەسێك ستایش دەکەیت کە دژی ئەمیری بڕواداران بوو؟

وتی: بەڵێ، ئێمە ماوەی حەوت مانگە گەمارۆمانداوە، ئەو بە بێ هیچ سەرباز و قەڵا و بەربەستێك، بەڵام لەئێمە بە هێزتر و تۆڵەسێنتر بوو بوو، هەی بوو بەسەر ئێمەدا.

قسەکەیان گەیشتەوە لای (عبدالملك) و ڕاکەی (تاریق)ی بە ڕاست دانا[1].

---

[1] - تأريخ الامم والملوك...ئيبن كەسيريش لەوەی بۆ نەقڵ کردووین لە (البدايه والنهايه)دا

تاریقی کوڕی عەمر ساڵی ٧٢ك بۆماوەی پێنج مانگ بە فەرمانی عبدالملك فەرمانڕەوایەتی مەدینەی پیرۆزی گرتە دەست کە هەر خۆیشی لای برد و مەدینەی خستە ژێر ڕکێفی فەرمانڕەوایەتی حەجاجەوە.

فەرمانڕەوایەتی حەجاج لە مەککە و مەدینە بە خراپترین و دژوارترین قۆناغ و سەردەمدا تێپەڕی کە خەڵکی بینیبێتیان، حەجاج هیچ ڕێز و شکۆی بۆ ئەو هاوەڵانەی پێغەمبەر -درودی خوای لەسەر بێت- دانەدەنا کە لەژیاندا مابوون، وەکو (عبداللەی کوڕی جابر) و (ئەنەسی کوڕی مالیك) و (سەهلی کوڕی سەعد) -ڕەزای خوا لە هەموویان-.

یەکێك لە سوکایەتیەکانی حەجاج بەرامبەر هاوەڵانی پێغەمبەر -درودی خوای لێبێت- ئەوەبوو کە مۆری دەدا لە مل و دەستیان، ئەو حاڵەتەش ئیبن جەریر لە (التأریخ)ەکەی و ئیبن کەسیر لە (البدایە والنهایە) دا باسیان کردووە، هۆکارەکەشی ئەوەبوو ئیبن کەسیر باسی کردووە کە حەجاج حنێوی دا بە جابر و سەهلی کوڕی سەعد و هەڕەشەی لێکردن گوایا پشتیوانی عوسمانی کوڕی عەففان نەبوو بوون، هەروەك بەشێوەیەکی زۆر زبر قسەی لەگەڵ کردن و مۆری دا لە گەردنیان بۆ سوك کردنیان، خوا ڕسوای بکات و سزای بەئێشی بدات.

(محمدی کوڕی عمران) باسی ئەو ڕوداوەی کردووە کە (جابری کوڕی عبدالله)ی بینیوە دەستی مۆر کراوە[1].

هەروەها ئەنەسی کوڕی مالیکی بینیوە گەردنی مۆر کراوە. حەجاج بەو کارەی دەیویست سوکی بکات، ئەوە سیاسەتی حەجاج بوو لەگەڵ هەر کەسێك کە پێی وابووایە ئەمەویەکانی خۆش ناوێت جا چی دەڵێیت گەر کەسێك بەرەنگاریان بووایەتەوە؟!

کاتێك حەجاج بوویە فەرمانڕەوای مەدینە هاتە ئەوێ و چەند مانگێك تیایدا نیشتەجێ بوو، بۆ عەمرە جێی هێشت و پاشان گەڕایەوە لە مانگی صەفەر دا و سێ مانگ تیایدا

---

[1]. (تأریخ طبري).

مایەوە و لە (بەنی سەلەمە)دا مزگەوتێکی دروست کرد ساڵی ٧٤ك. هەروەها لەو ساڵەدا حەجی بە خەڵکی کرد.

عبدالملك ناوچە و شارەکانی لەنێوان سەرکردەکانیدا دابەش کردبوو، هەربۆیە حەجاجی کردە فەرمانڕەوای حیجاز – کە مەککە و مەدینە و تائیفی لەخۆ دەگرت – (بیشری کوڕی مەروان)ی برای کوفە و بەصرەی پێ دابوو (ناسرابوون بە عێراقی عەرەب)، خۆراسان و (عێراقی فارس[1])یشی دابوویە دەست (ئومەییەی کوڕی عبداللەی کوڕی خالیدی کوڕی ئوسەید)[2].

---

[1] عێراقی عەرەب، لەکۆندا بە کوفە و بەصرەیان وتووە یاخود ئەم عێراقەی ئەمڕۆکە لە کۆندا پێی گوتراوە عێراقی عەرەب، بەلام عێراقی (فارس) یان عێراقی (عەجەم)یشیان پێووتووە، بەو ناوچە جوگرافیانە گوتراوە کە دەکەونە ڕۆژهەلاتی عێراقی عەرەبەوە کە ئەم شارانەی ئێستای ئێرانی تێدابووە وەك (ئەصفەهان و الری و قەزوین و کرماشان)، هەروەها ناسراویشە بە (ناوچە شاخاویەکان) کە ناوچە شاخاویەکانی کورد و فارس و ئازەری لەخۆ گرتووە، واتا بەناوچە دەشتاییەکانی سەر ڕوباری دیجلە و فورات گوتراوە عێراقی عەرەب و ناوچە شاخاویەکانی سنوری ڕۆژهەلاتی بە عێراقی عەجەم یان فارس ناوزەد کراوە، کە زنجیرە چیاکانی زاگرۆس ئەو دوو ناوچەیەی لەیەکتر جیاکردۆتەوە.. ...سەرچاوە: ویکیبیدیا: ar.wikipedia.org.

[2] . (تأریخ طبري)......بیشری کوڕی مەروان ساڵی ٧٤ك کۆچی دوایی کرد و عبدالملك ساڵی ٧٥ك حەجاجی کردە فەرمانڕەوای عێراق.

# حەجاج دەبێتە سالار و فەرمانڕەوای عێراق

لەساڵی ٧٥ك دا عبدالملك مەدینەی مونەووەرەی سپاردە (یەحیای کوڕی حەکەمی کوڕی عاص)ی مامی، عێراقیش بە (حەجاج) بەبێ خۆراسان و سەجستان، ئەوەش پاش کۆچی دوایی (بیشری کوڕی مەروان) برای (عەبدولمەلیکی کوڕی مەروان) کە فەرمانڕەوای عێراق بوو.

کاتێك عبدالملك نامەی نوسی بۆ حەجاج ڕای سپارد بۆ فەرمانڕەوایەتیکردنی عێراق، حەجاج چوو بۆ ئەوێ و دوانزە سواری لەگەڵ بوو وەك خزم و دەستوپێوەند، بەبێ ئاگای خەڵکەکەی چوویە کوفەی پایتەختی ئەوکاتی عێراق، پۆشاکەکەی خۆی -پۆشاکی فەرمانڕەوایەتی- کردە بەر و شمشێرەکەی کرد بە پشتوێنەکەیدا و گوڵنگەی مێزەرەکەی لەدواوە بەردایەوە لەنێوان هەردوو باهویدا و پاشان ڕۆی بۆ کۆشکی فەرمانڕەوا، ڕۆژی هەینی بوو و بانگبێژ بانگی نوێژی هەینی فەرموو.

شتێکی سروشتی بوو کە حەجاج بچێت بۆ مزگەوتی گەورە لە کوفە چونکە ئەو ئەمیری وڵات بوو، هەربۆیە چوویە مزگەوتەوە و ئەوانیش نەیان دەزانی، ئینجا چوویە سەر بڵندگۆ و لەسەری دانیشت، قسەی نەکرد و ماوەیەکی زۆر بێدەنگ مایەوە، نەریتی خەڵکی عێراق وابوو وردە بەرد یان چەویان دەگرتە فەرمانڕەواکانیان، لەگەڵ فەرمانڕەواکەی پێشوشیاندا هەمان کاریان کردبوو کە برای خەلیفە بوو.

کاتێک حەجاج بێدەنگ بوو زۆر سەیریان لێهات و هەریەکەیان لەسەر ئەژنۆ دانیشتبوو و بەردەکانیان بەدەستەوە گرتبوو ئامادەبوون بۆ ئەوەی تێی بگرن، بێدەنگیەکەی ئەو کاریگەریەکی کارای هەبوو لەسەر دەرونیان و پاشان کەوتە وتاردان وئەو قسانەی کرد بۆ خەڵکی عێراق کە مێژوو تۆماری کردووە:

یاأهل العراق یاأهل الشقاق والنفاق ومساوئ الاخلاق......

ئەی خەڵکی عێراق .. ئەی ئەهلی دوبەرەکی و دووڕویی و بەدخوویی، بەخوا پێش ئەوەی بێم بۆ لاتان کاروباری ئێوەم مەبەست بوو و بەلامەوە گرنگ بوو.

دەپاڕامەوە خوا تاقیتان بکاتەوە بە من و گیرۆدەی منتان بکات، دوێنێ ئەو قامچیەی کە ئێوەی پێ ژیر و تەمبێ دەکەم لێم کەوت و ئەمەم لەجێی دانا – ئاماژەی بۆ شمشێرەکەی کرد – پاشان گوتی:

بەخودا بە بچوکەکانتان گەورەکانتان دەبەستمەوە و سەربەستەکانتان بە کۆیلەکانانتان، پاشان لێدانێک ئەتان کوتم وەک لێدانی ئاسنگەر لە پارچە ئاسن و نانەوا لە هەویرکاتێک پانی دەکاتەوە[١].

جا کاتێک قسەکانیان بیست وردە بەردەکان لەدەستیان بەربوویەوە وەک ئەوەی باڵندە بەسەر سەریانەوە بێت.

(تەبەری) باسی کردوە کە حەجاج لەمەدینە چوویە دەر کاتێک نوسراوەکەی عەبدولمەلیکی بۆهات سەبارەت بە ڕاسپاردنی بۆ فەرمانڕەوایەتی عێراق پاش مردنی بیشری کوڕی مەروان، ئینجا کاتێک ڕۆژ بوویەوە لەناکاو چوویە کوفەوە، سەرەتا لەمزگەوتەوە دەستی پێکرد چووە ناوی و سەرکەوتە سەر بڵندگۆ و مێزەرێکی سوری پۆشی بوو ئینجا گوتی: لەسەرمە بە خەڵکی ڕابگەیەنم، ئینجا وایانزانی کە لە خەواریجە و ئەوانەیش کە لە گەڵیان هاوەڵینی هەریۆیە لێی چوونە بەرەوە، تا کاتێک لەدەوری کۆبوونەوە، ئینجا ڕوخساری خۆی دەرخست و گوتی:

---

[١] البدایة والنهایة.

أنَا ابنُ جَلَا وطَلَّاعُ الثَّنَايَا ........ متَى أضَعِ العِمامَةَ تَعرِفُونِي

هذَا أوَانُ الشَّدِّ فاشتَدِّي زِيَمْ ..... قَدْ لَفَّهَا اللَّيْلُ بِسوَّاقٍ حُطَمْ

ليس بِرَاعِي إِبلٍ ولا غَنَم .......... ولا بِجزَّارٍ على ظَهْرِ وَضَمْ

قَدْ لَفَّهَا اللَّيْلُ بِعَصْلَبِيٍّ ...............أروَعَ خَرَّاجٍ مِنَ الدَّوِيِّ

مُهَاجِرٍ لَيسَ بِأعْرَابِيٍّ

ليس أوان يكره الخلاط ... جاءت به والقلص الأعلاط

تهوي هوي سابق الغطاط.

واتە : ( من کوڕی بەرەبەیانم و گردۆلکەم هەلتۆقیوم، چ کاتێك مێزەرەکەم دانا دەمناسنەوە......

—ئەم دێڕە هۆنراوانە جۆرێکن لە هەجوو و هەڕەشە بۆ ترساندنی خەلك و دانیشتوانی ئەوکاتی کوفە و عێراق کە خەریکی یاخی بوون و هەلگەڕانەوە بوون لە ویلایەتی عبدالملك—.

پاشان وتی: ئەی خەلکی کوفە سوێند بەخوا من ڕوبەڕوی خراپ بەخراپ دەبمەوە، بە پێوانەی خۆی بەرەنگاری دەبمەوە و وەك خۆی جەزای دەدەمەوە، من چاوم، چاوە بەتەماع و ملە درێژەکان و سەرانێك نابینێت کە پێگەییون و وەختی لێکردنەوەیان هاتووە و من خاوەنیانم، من ئەو خوێنانە دەبینم لە نێوان مێزەر و ڕیشەکاندایە.

بەخوا ئەی خەلکی عێراق من وەك داری هەنجیر بەیەك ڕەشەبا و فشار ناچەمێمەوە و ناشکێم، وە بە هێرش و پەلاماردان نابەزێم و ناترسم، هەربۆیە لەبەر زیرەکی هەلبژێردرام و هاتوم بۆلای ئێوە بۆ مەبەستێکی ئەوپەڕی گرنگ.

ئەمیری بڕواداران (عبدالملك) دەمی تیردانەکەی[1] کردەوە پاشان تیرەکانی تاقیکردەوە و منی دیتەوە وەك ڕەقترین دار و شکێنەرترین نوکیان[1]، هەربۆیە ناردمی بۆلای ئێوە چونکە بەردەوام کەوتوونەتە ئاژاوەوە و ڕێگای نادروستان گرتۆتە بەر.

---

١ . تورەکەی تیر.

ئەمە و سوێند بەخوا وەك چیلکە دەتان تاشم، لێتان دەدەم وەك چۆن لەوشتر دەدرێت بۆ ئەوەی لە ناو دووریکەوێتەوە.

من بەڵێنم نەداوە بەجێم نەهێنابێت، شتێکم بڕیارنەداوە جێبەجێم نەکردبێت.

من ئەمێنم و ئەم کۆمەڵ کۆمەڵ و ووتی وتی و قسە وباس و چی دەڵێ و چی نالێ و چی دەکەی و ئەو شتانە؟

بەخوا یان دەچنە سەر ڕێی ڕاست یان هەر پیاوێك لەئێوە لەجەستەیدا شوێنەوارێك جێدەهێڵم.

دوای سێ ڕۆژ لە ناردنی (مهلب کوڕی ئەبی صفرە[2]) هەر کەس بگرم خوێنی دەڕژم و ماڵەکەی دەبەم بۆخۆم[3].

پاشان چووە ماڵەکەی خۆی و زیاتری نەگوت.

هەروەها (ئیبن جەریری تەبەری) باسی کردووە: کاتێك بێدەنگیەکەی حەجاج درێژەی کێشا (محمدی کوڕی عومەیر) وردە چەوی بەدەستەوە گرتبوو دەیویست بیگرێتە حەجاج ، دەیوت: خوا بیکوژێ چەند لەخوێن ڕێژ دەچێ.

جا کاتێك حەجاج دەستی بە قسان کرد بەردەکان بەردەبوونەوە لەدەستی و ئاگای لێی نەبوو، واتە نەیدەزانی کە دەکەونە خوارەوە بەهۆی ئەو ترسەی کە توشی بوو.

هەروەها حەجاج لە وتارەکەیدا گوتی:

---

١ .لێرەدا مەبەستی ئەوەیە عبدالملك هەموو پیاوەکانی خۆی کۆدەکاتەوە کامەیان لەهەموویان توندوتیژتر و بڕ بەرگەگر و ڕەقتر بوو لە مامەڵەکردندا ئەوەیانی هەڵبژارد بۆ فەرمانڕەوایەتیکردنی ئێوە چونکە ئێوە پێویستتان بەو جۆرە کەسانەیە بۆ ڕێککردنەوەتان.

٢ . موهلەبی کوڕی ئەبی صوفرە لەلایەن بیشری کوڕی مەروانەوە نێدرابوو بۆ بەرەنگاربوونەوەی هەلکەپلوەکانی (حەروریە).

٣ . ئەمە شێوازی مامەڵەی حەجاج بوو بۆ کۆکردنەوەی خەلکی و جەم کردنیان بۆ شەڕ لەناو سوپای خەلیفەدا بەتاچاری دژی نەیاری جێنشینەکانی بەنی ئومەییە.

ناشـیرین بـن ئـەو ڕوخسـارانە کـە خـوا دەفـەرموێت: ﴿وضـرب الله مـثلا قرية كانت آمنة....﴾[1].

واتـە : خـوا نمونـەی هێناوەتـەوە (بەدانیشتوانی)شـارێك كـە ژیانیـان بـە هـێمنی و ئاسودەیی دەبردە سەر، لە هەموو لایەکەوە ڕزق و ڕۆزی جۆراوجۆریان بۆ دەهات (بـەلام لەجیاتی سوپاسگوزاریی) ناشکور و قەدرنـەزانی نـاز و نیعمەتـەکانی خـودا بوون، ئینجا خوای گەورە پۆشاكی برسێتی و ترسی کردە کالآی بالآیان و تالآوی نەداری و ترسـی پێ چەشتن لەسەر ئەنجامی ئەو ئیش و کارە (ناپوخت و ناڕێکانەدا) کە کردبوویانـە پیشـەی خۆیان[2].

ئێوەش هـەر ئەوانـە و هاوشـێوەی ئەوانـەن، یـان بـاش دەبـن یـان بـە شمشێر کوتـە کوتەتان دەکەم.

من دەمێنم و ئەم کۆمەڵ کۆمەڵ و وتی وتیە، هەر پیاوێك لەئێوە نابێت بەڕێگادا بڕوات بە تەنها نەبێت.

ئایا گەر سەرپێچیکاران سەرپێچیەکەیان شیاو بووایە ئەوا بـاج نەدەسـەنرا و دوژمنێك نەدەکوژرا، ددانی کەس نەدەشکێندرا، گەر خەڵکی بە زۆر و ناچاری نەچوونایە بۆ شـەڕ ئـەوا بـە حـەز و ملکەچیشـەوە نەدەچـوون ، ئـەوەم پێگەیشتووە کـە نـەهاتون بـەدەم (مهلب)ەوە، پێشوازیتان لـە کۆمـەڵێك سەرپێچـیکار کـردوە بـۆ شـارەکەتان، من سوێند دەخۆم بەخوا بۆتان گەر کەسێك ببینم پاش سـێ ڕۆژ نەچوبێتە سـوپای (مهـلب)ەوە لـە گەردنی دەدەم.

پاشان عەریف نێو سەربازەکانی بانگ کردوو و گووتی: خەڵکی ببەن بۆلای (مهلب) و بەڵێن نامەکانیانم بۆ بێنن، شەو و ڕۆژ دەرگاکانی ئەم پردە دانـاخرێن هـەتا ئـەم ماوەیـە تەواو دەبێت.

---

١ النحل:١١٢

٢ . تەفسیری ئاسان.

ئابەم جۆرە حەجاج چارەسەری یەکەمین سەرپێچی و یاخی بوونی خەڵکی عێراقی کرد کاتێك ملیان نەدا بچنە نێو سوپاکەی (مهلب کوڕی ئەبی صفرە)ەوە بۆ شەڕکردن دژی خەواریجەکان و سێ ڕۆژی مۆڵەت پێدان بۆئەوەی بێنە ڕیزیەوە.

ئەم چاوسورکردنەوەیەی حەجاج کاتێك کاریگەری و بەرهەمەکەی دەرکەوت کە خەڵکی بە لێشاو دەچوونە سوپاکەی (مهلب)ەوە لەترسی زۆرداریی حەجاج.

ئیبن جەریر دەڵێت: کاتێك ڕۆژی سێیەم بوو گوێی لە تەکبیر (الله أكبر)ێك بوو لە بازاڕدا، هەربۆیە دەرچوو لە کۆشکەکەی و چووە سەر بڵندگۆ و ئینجا گوتی:

یاأهل العراق، وأهل الشقاق والنفاق، و مساوئ الاخلاق.......

ئەی خەڵکی عێراق، ئەی ئەهلی دووبەرەکی و دوو ڕوویی و بەدخوویی...من تەکبیرێکم گوێ لێ بوو ئەو تەکبیرە ئارەزومەندانەیە نەبوو کە خودا دەیەوێت، بەڵکو ئەو تەکبیرە لە ترسا بوو، بۆم دەرکەوت ئەوە چەڕەدوکەڵێکە و لە ژێریدا بۆگەن پەنگی خواردۆتەوە.

ئەی کوڕی ژنە گێژەکان، کۆیلە و بەندەی دار و کوتەك، تا هەر پیاوێك لە ئێوە چوار مشقی دانەنیشێت و خوێنی خۆی شیرین نەکات و لەبەر پێی خۆی ورد نەبێتەوە.

سوێند دەخۆم بەخوا کارێکتان بەسەر دێنم ببێتە پەند بۆ ئەوانی پێشو و تەمبێ و ئەدەبێکیش بۆ ئەوانەی پاش ئێوە.

ئینجا (عومەیری کوڕی جەنابی تەمیمی) هەستایەوە و گوتی: خوا چاك بۆ فەرماندە بکات، ئایا منیش دەبێت بڕۆم بۆ شەڕ لەکاتێکدا پیاوێکی پیری نەخۆشم، ئەمەش کوڕەکەمە و گەنجترە لەمن.

حەجاج پێی گوت: ئێجا تۆ کێی؟

وتی: (عومەیر کوڕی ضابیئی تەمیمی)م.

حەجاج گوتی: ئایا دوێنێ قسەکانی ئێمەت گوێ لێ بوو؟

وتی: بەڵێ.

وتی: ئایا تۆ نەبووی پالاماری ئەمیری بڕوادارانت دا؟!

وتی: بەڵێ.

وتی: چی هەڵینای بۆ ئەو کارە؟

وتی: باوکمی بەند کردبوو و باوکیشم پیاوێکی پیری بەتەمەن بوو.

حەجاج گوتی: ئەوە نیە شاعیر دەڵێت:

همت ولم أفعل وكدت وليتني تركت على عثمان تبكي حلائله[1].

من وای مەزەندە دەکەم کوشتنی تۆ چاکەی تیابێت بۆ میصریەکان، هەستە ئەی سەرباز بدە لە ملی.

ئینجا پیاوێك هەستایەوە و دای لەملی و ماڵەکەشی برد بۆخۆی.

دەڵێن: (عەنبەسەی کوڕی سەعید) بە حەجاجی گوت:

ئایا ئەمە دەناسیت؟

وتی: نەخێر.

وتی: ئەمە یەکێکە لە بکوژانی عوسمان (ئەمیری بڕواداران).

ئینجا حەجاج گوتی: ئەی دوژمنی خودا، ئایا لەجێی عوسمان کەست ناردووە بۆ ئەو دونیا.پاشان فەرمانی کرد بدرێت لە گەردنی.

هەروەها فەرمانی کرد جاڕدەرێك بانگی دەکرد لەناو خەڵکیدا: ئایا ئەوە نەبوو (عومەیر کوڕی ضابیء) پاش سێ ڕۆژەکە هات و بانگەوازەکەشی بیبستبوو، فەرمانمان کرد بە کوشتنی، خوا لەوانە دەبورێت کە لە سوپاکەی (مهلب)دا ئەمشەو بەسەر دەبەن.

ئیدی خەڵکی بە پاڵەپەستۆ بەرەو پردەکە دەڕۆیشتن و دەچونە نێو سەربازەکانی (مهلب کوڕی ئەبی صفره)ەوە کە لە (رامهرمز)بوو، ئینجا (مهلب) گوتی: ئێرە پیاوێك گەیشتۆتە چووەتە عێراق، ئیدی ئەمڕۆ دوژمن لەناوچوو.

ئەو کاتە چوار هەزار جەنگاوەر لە عێراقەوە چوونە سوپاکەی (مهلب)ەوە.

(ئیبن طبري) دیسان چیرۆکێکی تری باسکردووە سەبارەت بە کوشتنی (عومەیری کوڕی ضابیء) لەلایەن حەجاجەوە، لە عەمری کوڕی ئیبن سەعیدەوە فەرموی: کاتێك

---

[1] . واتە: ویستم و ئەم کرد، خەریك بوو و خۆزگا بمهێشتایە هاوسەر و مەحرەمەکانی لەسەر عوسمان بگریەن.

حەجاج گەیشتە کوفە وتاری بۆدان و وتی: ئەمڕۆکە ئێوە کەمتەرخەمیتان کردووە بەرامبەر سوپاکەی (مهلب)، هیچ کەس بۆی نیە ببێتە یەکێك لە سەربازەکانی ئەو لە پاش سێ ڕۆژی تر، کاتێك سێ ڕۆژەکە تەواو بوو پیاوێك هات خوێنی لێ دەهات، وتی: چیتە؟

وتی: فەرمانم بە (عومەیری کوڕی ضابیء) کرد بچێتە سوپاکەوە لێی دام و درۆی لەگەڵ کردم.

ئینجا حەجاج ناردی بەدوای عومەیردا و هێنایان پیاوێکی پیری بەتەمەن بوو، پێی گوت: کێ لەجێتە لە سەربازگەکەت؟

وتی: من پیاوێکی پیرم و جوڵەم نەماوە، کوڕەکەم لەجێی خۆم نارد ئەو لەمن بەهێزتر و گەنجترە، پرسیار بکە لەبارەی قسەکەمەوە ئەگەر ڕاستم نەکرد سزام بدە.

وتی: ئینجا عەنبەسەی کوڕی سەعید وتی: ئەمەبوو کە هات عوسمانی کوڕی عەففانی خەلیفە بکوژێت، زللەیەکی لێدا و ئینجا هەڵی کوتایە سەری و دوو پەراسوی شکاند.

ئینجا حەجاج فەرمانی کرد دایان لە گەردنی.

حەجاج لە ساڵی ٧٥ ك چووە کوفە، فەرمانڕەوایەتی حەجاج لە عێراق ماوەی نزیکەی بیست ساڵ بەردەوام بوو، مێژوو تۆماری کردووە کە ئەو تاکە کەس بووە ئەم وڵاتە جڵەو بکات لەسەردەمی ئەمەوی و عەباسیدا، صەدام حوسەینی سەرۆکی دیکتاتۆری پێشوی عێراقیش هاوشێوەی بووە لە سەردەمی نوێدا، چونکە خاکی عێراق چەندین ڕێباوەڕ و نەتەوە و دین و ئایدیای جۆراوجۆر و دژ بەیەکی تێدایە، تەنانەت ناوی خاکی ئاژاوەکانی (أرض الفتن)ی لێنراوە و شوێنی پشێوی و ئاڵۆزی و کوشتارە سیاسیەکانە.

حەجاج لەسەر کاروباری عێراق جێگیر بوو پاش ئەوەی کە خەلیفە عبدالملك لایبرد لە فەرمانڕەوایەتی مەککە و مەدینە و تائیف و یەمەن کە زۆر تیایاندا نەمایەوە چونکە خەڵکەکانیان سکاڵایان کرد لای عبدالملك لەدەست توندوتیژی و زۆردارییەکانی حەجاج، جگە لەوەش ناوچەیەکی وەك عێراق کە پڕە لە ئاژاوە و کێشە و ناکۆکی و ئاڵۆزیی

سیاسی و ململانێکان و هەڵگەڕانەوە لە دەسەڵاتی خەلیفە پێویستی بە کەسێکی وەك حەجاج هەیە.

جڵەوکردنی عێراق لەلایەن حەجاجەوە و زاڵبون بەسەریدا هەروەها ئاسان نەبوو، بەڵکو چەندین شۆڕشی ناوخۆیی (شەعبی) لە کۆمەڵانی خەڵك ڕووبەڕوی بوونەوە لە هەڵگەڕاوەکان و جگە لەوانیش، ئەویش بە زۆر و ستەم و هێزی دەسەڵات و کوشتن و سەربڕین و هەڵواسینیان پاڵی بە شۆڕشەکانەوە دەنا، کەچی هێشتا ئەم هەموو توندوتیژیەش ئەو شۆڕشانەی نەوەستاند، تا کۆتاییهاتنی حەجاج بۆ دواجار پاش ئەوەی (سەعیدی کوڕی جوبەیر)ی زانا کە یەکێك بوو لە تابیعینی پێغەمبەری کوشت، کە دواتر خوا بیەوێت ڕونی دەکەینەوە.

***

## یەکەم ڕاپەڕینی خەڵك دژی حەجاج
## لە بەصرە

پاش ئەوەی کاروبار لە کوفە بۆ حەجاج یەکلایی بوویەوە و (عومەیری کوڕی ضابیء)ی کوشت و خەڵکی ئەوێی ترساند، ڕوی کردە شاری بەصرە و وتارێکی تیا دا وەکو ئەو وتارەی کە لە مزگەوتەکەی کوفە دای، خەڵکەکەی چاو ترسێن کرد، ئینجا پیاوێکی هێنا لە (بەنی شوکر) و وتیان : ئەمە سەرپێچی کردووە، گوتی: من فـــتقم هەیە و (بیشری کوڕی مەروان) چاوی پێی کەوتووە و منی بەخشی، ئەمەش موچەکەمە گەڕێندراوەتەوە لە خەزێنەی موسوڵمانان.

بەڵام حەجاج پۆزشەکەی پەسەند نەکرد و کوشتی.

کوشتنی ئەم پیاوە خەڵکی بەصرەی ترساند، ئینجا وەك بەرهەڵستکار لە حەجاج ڕاپەڕین لە (رامهرمز) کۆبوونەوە.

حەجاجیان بۆ چوو تا لە (رستقبان) لە یەکی شەعبانی ٧٥ کۆچیدا بارگەی خست، خەڵکیش بە سەرکردایەتی (عبداللەی کوڕی جارود) لێی ڕاپەڕین ، بەڵام حەجاج ئەم شۆڕشەی بە ئاسانی دامرکاندەوە و (ئیبن جارود) و هاوەڵەکانیشی کوشت کە ژمارەیان هەژدە پیاو بوو و کەللە سەریشیانی هەڵواسی لە (رامهرمز) بۆ تۆقاندنی خەڵکی.

هۆکاری ڕاپەڕینی ئیبن جارود ئەو توندوتیژیە بوو کە حەجاج بەکاری هێنا بۆ ناچارکردنی خەڵکی تاکو لەگەڵ (مهلب کوڕی ئەبی صفرە) بچن بۆ شەڕ، سەرباری ئەوەش حەجاج کاتێك لە (رستقبان) بارگەی خست بە خەڵکی گووت: ئەو زیادە

موچەیە[1]ی کە ئیبن زوبێر پێی بەخشیون زیادەی تاوانبارێکی دوو ڕووە و من ڕێی پێ نادەم ؛ ئیدی (عبداللەی کوڕی جارود)ی بۆ هەستایەوە و گوتی:

ئەوە زیادەی تاوانبارێکی دووڕوو نیە بەڵکو زیادەی ئەمیری بڕواداران (عبدالملك)ە، خۆی بۆی جێگیر کردووین.

ئینجا حەجاج بەدرۆی خستەوە و ترساندی، کۆمەڵە خەڵکێك هاتنە ڕیزی ئیبن جارودەوە و لەگەڵ حەجاج شەڕیان کرد و بە بەزین و سەربڕینیان کارەکە کۆتایی پێهات وەك باسمان کرد و حەجاج چوو بۆ بەصرە و نامەی نوسی بۆ (مهلب کوڕی ئەبی صفرە) و (عبدالرحمن کوڕی مخنف) کە لە هێرشکردنە سەر هەڵگەڕاوەکان بەردەوام بن.

ئینجا لە دەوروبەری بەصرە (داودی کوڕی نوعمانی مازنی) ڕاپەڕی و حەجاجیش فەرماندەیەکی لە یەکەیەکی سوپاکەی نارد بۆ بەرەنگاربوونەوەی، شەڕی لەگەڵ کرد و کوشتی.

لەماوەی فەرمانڕەوایەتی حەجاجدا لە عێراق وحیجاز و یەمەن و بەدەر لەوانەش لە شار و وڵاتەکان ژمارەیەکی زۆر شەڕ و جەنگی بەرپاکرد دژی ئەوانەی لێی ڕادەپەڕین بە تاك و بەکۆمەڵ، حەجاج هەزارانی لێ کوشتن لە نەیارەکانی و پەرتوکەکانی مێژوو زۆرێك لەو چیرۆکانەیان تۆمارکردووە کە ستەم و زۆرداری و ملهوڕیی ئەم پیاوە و ڕادەی ستەم و زۆرداریەکەی و حەزکردنی بە خوێن ڕشتن لە پێناوی دەسەڵاتدا ڕوون دەکەنەوە.

ئیبن کثیر -بە ڕەحمەت بێت- لەبارەی فەرمانڕەوایەتی حەجاجەوە لە عێراق فەرمویەتی:

بە گشتی حەجاج نیقمەت بوو بۆ خەڵکی عێراق، بەو پێشینەیەی هەیان بوو لە تاوان و ڕاپەڕین دژی پێشەوایان و پشت تێکردن و سەرپێچیکردنیان و جیابوونەوە لێیان.

(یەعقوبی کوڕی سوفیان) دەگێڕێتەوە: پیاوێك هات بۆلای عومەری کوڕی خەتاب - ڕەزای خوای لێبێت - پێی ڕاگەیاند خەڵکی عێراق بەردبارانی فەرماندەکەیان کردووە

---

[1] . موچە بە زمانی ئەمڕۆکە .

ئەویش بە تووڕەیی هاتە دەر، نوێژی بۆ کردین و سەهوی تیاکرد هەتا گوتمان (سبحان الله سبحان الله) کاتێك سەلامی دایەوە، هات بەرەو لای خەڵکەکە و فەرمووی: کێ لێرەیە لە خەڵکی شام؟

پیاوێك هەستایەوە، پاشان یەکێکی تر هەستایەوە، پاشان منیش سێیەم کەس یان چوارەم کەس بووم هەستامەوە، فەرمووی: ئەی خەڵکی شام ئامادەبن بۆ خەڵکی عێراق چون شەیتان لەناویاندا هێلکەی کردووە و بێچوی خستۆتەوە، خودایە ئەوان سەریان لە پێشەواکانیان تێکدا تۆش سەریان لێ بشێوێنە، پەلە بکە بە ناردنی هەرزەکارە سەقەفیەکە (خزمەتکارە سەقەفیەکە) بۆیان بە یاسای سەردەمی نەفامی فەرمانڕەوایەتیان بکات، چاکەکانیان لێ قەبوڵ نەکات و لە خراپەکەشیان خۆش نەبێت.

عبدالرزاق دەڵێت: جەعفەری کوڕی سلیمان پێی ڕاگەیاندین، لە مالیکی کوڕی دینارەوە، ئەویش لە حەسەنەوە فەرمووی: عەلی کوڕی ئەبی تالیب فەرمووی: خودایە وەك چۆن من بوومە پێشەوا و ئاسایش پارێزیان و ئەوان ناپاکیان لێکردم، من ئامۆژگاریم کردن و ئەوانیش گزی وفێڵیان لێکردم ئەوا بەسەریاندا زاڵ بکە گەنجێکی سەقیفی لوتبەرز و زۆردار کە ماڵیان لە بن بێنێت و چەوریان بتاوێنێتەوە و کەوڵیان بکات و بیکاتە پۆشاکی خۆی، بە یاسای سەردەمی نەفامی لەگەڵیان بجوڵێتەوە.

بەیهەقی باسی کردووە: لە هیشامی کوڕی یەحیای غەسانیەوە وتی: عومەری کوڕی عەبدولعەزیز گوتی گەر هەموو نەتەوەکان پیسترینی ناو نەتەوەی خۆیانیان هێنا و ئێمەش حەجاجمان هێنا ئەوا ئێمە لێیان دەبەینەوە لە پیسیدا.

ئەبوبەکری کوڕی عەیاش لە عاصمی کوڕی ئەبی نەجودەوە دەگێڕێتەوە کە وتوویەتی: خوای گەورە هیچ حەرامکراوێکی نەبووە کە حەجاج ئەنجامی نەدابێت.

ئیبن کەسیر ڕەحمەتی خودای لێبێت فەرموویەتی:

پێشو فەرمودەکەی پێغەمبەر باسکرا: کە لە سەقیفدا درۆزنێك و خوێنڕێژێك هەن، باسیشمان کرد پێگە و پایەی موختاری کوڕی ئەبی عوبەید، کە ئەو درۆزنە ناوبراوەی ناو ئەم فەرمودەیە بوو، کە بەڕوکەش بێ باوەڕیی پەرچ دەکردەوە و لەناخەوەش بێ

باوەڕیەکی تەواوی هەبوو، بەڵام خوێنڕێژەکە ئەم حەجاجی کوڕی یوسفەیە، کە ڕقی لە عەلی و کۆمەڵەکەی بوو لەبەر خاتری خانەوادەی مەروانیەکانی بەنی ئومەییە، زۆردارێکی قیرسچمە بوو کە ئامادەبوو بە بچوکترین گومان خوێن بڕێژێت.

هەروەها چەندین دەستەواژەی ناشیرین و ترسناکی بەکارهێناوە کە دیارەکەیان (کوفر)بووە وەك پێشتر باسمان کرد.

ئەگەر تۆبەی لەسەر کردن یان وازی لێ هێنابێتن ئەگەرنا ئەوا لە ئەستۆیدا ماوەتەوە، بەڵام دەترسا لەوەی کە لێیان دەگێڕایەوە بە شتێك زیادەشەوە، هەندێك کەس زۆر ڕقیان لێی بوو لەبەر هەندێك ڕوو، ڕەنگیشە هەندێك لەقسەکانیان دەسکاری کردبێت و زیادەشیان خستبێتە سەر ئەوەی کەخۆی کردوتی لەقسەی ناشیرین و ناڕەوا.

گێڕامانەوە لێی، کە ئەو فەرمانی دەکرد واز لە خواردنەوە بێ هۆشکەرەکان بێنن، زۆر قورئانی دەخوێندەوە و لە قەدەغەکراوەکان دوردەکەوتەوە، هیچ شتێك لە دەستدرێژی کردنە سەر ئافرەت و بێ ئابڕوویی لێوە باس نەکراوە، ئەگەرچی زۆر بە هەڵپەش بووە بۆ خوێن ڕشتن، خودای گەورەش خۆی زاناترە بە ڕاستیەکان و هەموو کاروبارەکان و ئەوانەش کە لەناو دڵ و سنگی مرۆڤەکاندا شاراوەن.

ئەوەی ئیبن کەسیر هێناویەتی و مەبەستی بووە بیڵێت ئەوەیە کە: خودا حەجاجی سەپاندووە و زاڵ کردووە بەسەر خەڵکی عێراقدا لەبەر ستەمکردنیان، هەربەوجۆرە خودای گەورە بۆ زاڵمەکان زەواڵ دەنێرێت و ستەمکاران بەستەمکاران لەناو دەبات؛ هەروەك وتراویشە لەکردەوەکانی خۆتانە زاڵی کردووە بەسەرتاندا، خوای گەورە دەفەرموێت :﴿ ذَٰلِكَ بِمَا قَدَّمَتْ أَيْدِيكُمْ وَأَنَّ اللَّهَ لَيْسَ بِظَلَّامٍ لِّلْعَبِيدِ﴾[1].

﴿وَظَلَّلْنَا عَلَيْكُمُ الْغَمَامَ وَأَنزَلْنَا عَلَيْكُمُ الْمَنَّ وَالسَّلْوَىٰ كُلُوا مِن طَيِّبَاتِ مَا رَزَقْنَاكُمْ وَمَا ظَلَمُونَا وَلَٰكِن كَانُوا أَنفُسَهُمْ يَظْلِمُونَ﴾[2].

---

[1] . آل عمران: ١٨٢. بۆ ڕاڤەی ئایەتەکان سەیری تەفسیری ئاسان بکە

[2] . البقرة: ٥٧.

﴿وَعَلَى الَّذِينَ هَادُوا حَرَّمْنَا مَا قَصَصْنَا عَلَيْكَ مِنْ قَبْلُ وَمَا ظَلَمْنَاهُمْ وَلَكِنْ كَانُوا أَنْفُسَهُمْ يَظْلِمُونَ﴾[1].

﴿مَنْ عَمِلَ صَالِحًا فَلِنَفْسِهِ وَمَنْ أَسَاءَ فَعَلَيْهَا وَمَا رَبُّكَ بِظَلَّامٍ لِلْعَبِيدِ﴾[2].

﴿مَا يُبَدَّلُ الْقَوْلُ لَدَيَّ وَمَا أَنَا بِظَلَّامٍ لِلْعَبِيدِ﴾[3].

ئایەتەکان لەم بوار و مانایەدا زۆرن کە ئاماژە بە دەستورەکانی خودای گەورە دەکەن لە گەردووندا.



---

[1] . (النحل:١١٨)

[2] (فصلت:٤٦).

[3] . ق:٢٩.

## چەندین قسە و هەڵوێست و بەسەرهاتی حەجاج
## لە ماوەی ویلایەت و فەرمانڕەوایەتیەکەیدا

مرۆڤ هیچ نیە جگە لە چەند هەڵوێست و ڕووداوگەلێك لە پەرتوکی تەمەنی درێژ یان ماوە کورتیدا دەنوسرێتەوە و خوای گەورەش لەسەری هەژماردەکات و ڕۆژی دوایی لێپرسینەوەی لەگەڵ دەکات.

دەشێ کەسێتی و ڕواڵەتی حەجاج و هەر مرۆڤێکی تر دەستنیشان بکرێت لەمیانەی ئەوەی نوسراوە و باس کراوە لەبارەیەوە ماوەی ژیانی، چونکە کەسایەتی دیاری دەکرێت لەسەر پێوەری کرداری نەك تیۆری.

حەجاج چەندین هەڵوێست و چیرۆکی زۆری هەیە کە هەیانە دانسقە و هەیانە ناخۆش و خەمناکە یان دەرخەری توڕەییە، کە پەرتوکەکانی مێژوو نوسیویانەتەوە، ئێمەش هەندێکیان لێرەدا دەخەینە ڕوو، بەشکو کەسێتی ئەو پیاوە سەیرە ڕون بکاتەوە کە زۆر سیفەت و شتی دژ بەیەکی لە کەسایەتی خۆیدا کۆکردبوویەوە .

لەبارەی تێڕوانینی حەجاج و فەلسەفەی ژیانیەوە دەگێڕنەوە:

ئیبن ئەبی دونیا لە موسنەدەکەیدا ئەویش لە عبداللەی کوڕی محمدی تەمیمیەوە دەڵێ بیستم پیاوێك لە قورەیش کە نازناوی خێزانیەکەی ئەبو بەکری تەمیمی بوو گوتی: حەجاج – کە خاوەنی زمانێکی پاراو بوو– لە وتارێکیدا دەیگوت: خوای گەورە ئادەم و وەچەکانی دروست کرد لە زەویدا و ڕەتاندنی لەسەر پشتیدا، بەروبومەکانی زەویان خوارد و وە لە ئاوی ڕوبارەکانیان خواردەوە و شڕ و شپرەزەیان کرد بە گەشت و گەڕان

بەناویدا، پاشان خوای گەورە زەوی لێ سەندنەوە و هەمدیس گێڕاندنیەوە بۆ ناوی، ئیدی ئەویش گۆشتەکانیانی خوارد وەك چۆن ئەوان بەروبومەکەیان خوارد، خوێنیانی خواردەوە وەك چۆن ئاوی ڕوبارەکانیان خواردەوە، لەهەناویدا دایڕزاندن و لەت و کوتی کردن و جومگەکانی لێکترازاندن وەك چۆن ئەوانیش بە گەشت و گەڕان شڕ و شپرزەیان کرد.

یەکێ لەو وتارانەی کە زیاتر لە کەسێك لە حەجاجەوە گێڕاویانەتەوە ئەوەیە کە جارێك وتی: ئەی پیاو، کە هەمووتان ئەو پیاوەن، پیاوێك کە نەفسی خۆی بەزاند و جڵەوی کرد، ئینجا ئەو بەستنەوەیە بردی بەرەو گوێ ڕایەڵی خودا و لە سەرپێچیکردنی خودا لای دا.

خوا ڕەحمی بەو مرۆڤە بکات کە نەفسی خۆی دەگرێت، دەروونی خۆی سەرزەنشت دەکات، نەفسی خۆی وەك دوژمن سەیر دەکات، لێپرسینەوە لە خۆی دەکات پێش ئەوەی لێپرسینەوە لە خەڵکی بکات، کەسێك کە سەیری تای تەرازوی خۆی دەکات، سەیری حیساب و کیتابی خۆی دەکات، مرۆڤێك کە کردارەکانی خۆی کیشانە و پێوانە دەکات، مرۆڤێك کە بیری کردۆتەوە لەوەی کە سبەینێ چی ئەنجامداوە لە دونیا لە نامەی کردەوەکانیدا دەیخوێنێتەوە و لە تەرازوەکەیدا دەیبینێتەوە ، بۆ دڵی قەدەغەکارە و بەربەست دائەنێ و بۆ ویستەکانیشی فەرمانکارە، مرۆڤێك لغاوی کردەوەکەی دەکات وەك چۆن لغاوی وشترەکەی دەگرێت، ئەگەر بردی بەرەو لای گوێڕایەڵیکردنی خودا شوێنی دەکەوێت، ئەگەریش بردی بەرەو سەرپێچی خودا وازی لێدێنێت، کەسێك کە کاروبارەکەی لەخواوە تێدەگات، کەسێك کە گورج و گۆڵ بووە و هۆشی بەبەردا هاتۆتەوە و ڕقی لە سەرپێچیکردنی فەرمانەکانی خوا و دوورییە، بۆئەوەی لای خودایە بەشەوق و پەرۆشە.

هێشتا هەر دەیگوت (کەسێك.... کەسێك...) تا (مالیکی کوڕی دینار) دەستی بەگریان کرد، مالیك یەکێك بوو لەگەورە تابیعینە لەخواترسەکان، بەڵام کاریگەر بوو بە ئامۆژگاریەکانی حەجاج و قسەکانی، ئەوەش هیچ سەیر نیە چونکە قسەکردن جادوی

خۆی هەیە، وەك پێغەمبەر دروودی خوای لەسەر فەرمویەتی : (انّ من البیان لسحرا) لە ڕوون بێژیدا جادوو هەیە....

(مەدائینی) لە (عوانەی کوڕی حەکەم)ەوە دەڵێت: شەعەبی گوتویەتی: گوێم لێ بوو حەجاج قسەگەلێکی دەکرد کە کەس پێشتر شتی وای نەوتبوو، دەیگوت: پاش سوپاس و ستایشی خودا .. بەڕاستی خوای بەرز و پایەدار چارەنوسی دونیای بە بڕانەوە و تەواوبوون نوسیوە، چارەنوسی دوارۆژیش بە نەمری و هەتاهەتایی نوسیوە، کەواتە شتێك لەناو ناچێت و نابڕێتەوە کە بڕیاری مانەوە و هەتاهەتاییبوونی لەسەر درابێت، شتێکیش نامێنێتەوە و بەردەوام نابێت کە بڕیاری بڕانەوە و تەواوبوونی لەسەر درابێت، کەواتە با ئەوەی لەدونیا دەیبینن و هان لەناویدا گومڕاتان نەکا و هەڵتان نەخەڵەتێنێت و بێ ئاگاتان نەکا لە نەبینراو و نادیاری دوارۆژ، هیوای نەبڕاوە و دوورودرێژتان لەگەڵ تەمەنی کەم و کورت تاندا یەك بخەن.

مەدائینی دەڵێت لە ئەبی عبداللەی سەقەفیەوە ئەویش لە مامیەوە فەرموی: بیستم حەسەنی بەصری دەیفەرموو: قسەیەك ترساندمی کە لە حەجاجەوە بیستم لەسەر ئەم بڵندگۆیە دەیگوت: هەر مرۆڤێك کاتژمێرێك لەتەمەنی لە شتێکدا بەسەر بەرێت کە بۆ ئەو شتە دروست نەکراوە ئەوا ڕەنگە ڕۆژی قیامەت داخ و پەژارەی درێژە بکێشێت.

(شەریکی قازی) لە ‹عەبدولمەلیکی کوڕی عومەیر)ەوە دەڵێت: حەجاج ڕۆژێك ووتی: هەرکەس کارێکی قورسی بۆ ئەنجام دابێ بەئەندازەی خۆی پاداشت دەدەینەوە.

ئینجا پیاوێك هەستایەوە و گوتی: پاداشتەکەم بدەرێ، چونکە من حسەینم کوشت.

ئەویش گوتی: چۆن کوشتت؟

وتی: ڕمێکم لێدا، لێدانێکی بە زەبر و ئینجا بە شمشێر لەتم کرد چۆن لەتکردنێك و هیچ کەسیش بەشدار نەبوو لەگەڵم لە کوشتنەکەیدا.

حەجاج گوتی: بڕۆ سوێند بەخوا تۆ و ئەو لەیەك شوێنیشدا کۆنابن و یەکناگرنەوە، هیچ شتێکی پێ نەدا.

(هەیسەمی[1] کوڕی عودەی) وتی پیاوێك هات بۆلای حەجاج و گوتی: براکەم لەگەڵ (ئیبن ئەشعەس[2]) چوە بۆ شەر کەچی خەت هێنراوە بەسەر ناوی مندا لە دادگادا (نوسینگەی میریدا) و موچەکەی من بڕاوە و ماڵەکەم ڕوخێنراوە.

ئینجا حەجاج گوتی: ئایا ئەو شیعرەت بیستووە کە دەڵێت:

| | |
|---|---|
| جنانيك من يجني عليك | وقد تُعدي الصحاح مبـــارك الجُرب |
| ولرب مأخوذ بذنب قريبه | ونجا المقارف صــــــاحب الذنب[3] |

ئینجا پیاوەکە گوتی: من بیستومە خوای گەورە جیاواز لەمە دەفەرموێت، بێگومان قسەی خوداش ڕاسترە نەك ئەمە.

حەجاج وتی: خودا دەفەرموێ چی؟

وتی: خودا دەفەرموێت:﴿ قَالُوا يَا أَيُّهَا الْعَزِيزُ إِنَّ لَهُ أَبًا شَيْخًا كَبِيرًا فَخُذْ أَحَدَنَا مَكَانَهُ ۖ إِنَّا نَرَاكَ مِنَ الْمُحْسِنِينَ (٧٨) قَالَ مَعَاذَ اللَّهِ أَنْ نَأْخُذَ إِلَّا مَنْ وَجَدْنَا مَتَاعَنَا عِنْدَهُ إِنَّا إِذًا لَظَالِمُونَ﴾[4].

وتی: هۆی خزمەتکار ناوەکەی بنوسەوە و خانوەکەی بۆ دروست بکەوە و بەخششەکەشی بدەرەوە، هەروەها بڕۆ لەناو خەڵکی دا جاڕ بدە و بانگەواز بکە: خودا ڕاستی فەرموو و شاعیر درۆی کرد[5].

( هەیسەمی کوڕی عودەی) لە (ئیبن عەیاشەوە) دەگێڕێتەوە: عبدالملك نامەی نوسی بۆ حەجاج کە سەری (ئەسلەم کوڕی عبدالبکری)م بۆ بنێرە، کاتێك حەجاج هێنایان

---

[1]. هیثم.لەبەر ئەوەی لە زمانی کوردیدا پیتی (ث) مان نیە ئەوا دەکرێت بە (س).

[2]. ابن أشعث.

[3]. واتە : خاوەنی تاوانەکە خۆی تاوانەکە دەخاتە ئەستۆی تۆ .وەك چۆن وشتری گەڕ وشترەکانی چواردەور ودراوسێشی توشی گەڕی دەکات (یان چۆن وشتری ساغ توشی گەڕی دەبێت لە وشتری گەڕەوە. یان کەسێك بەتاوانی خزم و نزیکێکی بگیرێت و خاوەن تاوانیش بۆی دەربچێت...

[4]. یوسف: ٧٨ – ٧٩. بۆ ڕاڤەی ئایەتەکان سەیری تەفسیری ئاسان بکە

[5]. البداية والنهاية لابن كثير.

بۆلای حەجاج (ئەسلەم) گوتی: ئەی فەرماندە تۆ لێرەیت (شاهیدیت) و ئەمیری بڕوادارانیش لێرە نیە (غائیبە)، وە خوای گەورە دەفەرموێت:﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِنْ جَاءَكُمْ فَاسِقٌ بِنَبَإٍ فَتَبَيَّنُوا أَنْ تُصِيبُوا قَوْمًا بِجَهَالَةٍ فَتُصْبِحُوا عَلَى مَا فَعَلْتُمْ نَادِمِينَ﴾[1].

ئەوەی لەبارەی منەوە پێی ڕاگەیەندراوە درۆیە و پوچە، من بەخێوکەر و سەرپەرشتیاری بیست و چوار ئافرەتم هیچ کاسبێکیان نیە من نەبێت، هەموویان ئێستا لەبەر دەرگان، ئینجا حەجاج فەرمانی کرد بیانهێنن.

کاتێك هێنایانن یەکیان وتی: من پورییمی، ئەویان گوتی: من مامۆژیمی، یەکی تر: من خوشکیمی، ئەوی تر من کچیمی، یەکێکی دیکەیان : من ژنیمی....

ئینجا کچۆڵەیەکی هەشت نۆساڵان لێی هاتە پێشەوە و حەجاج پێی گوت: ئەی تۆ کێی؟

ئەویش گوتی: خوا چاکت بۆ بکات فەرماندە منیش کچیمی، پاشان چۆکی دادا و گوتی:

| | |
|---|---|
| أحجاج لم تشهد مقام بناته | وعماته يندبنه الليل أجمعا |
| أحجاج كم تقتل به إن قتلته | ثمانا وعشرا واثنتين وأربعا |
| أحجاج من هذا يقوم مقامه | علينا فمهلا إن تزدنا تضعضعا |
| أحجاج إما أن تجود بنعمة | علينا وإما أن تقتلنا معا[2] |

---

١ . الحجرات. ٦. بۆ ڕاڤەی ئایەتەکان سەیری تەفسیری ئاسان بکە

[2] . واتە: ئەی حەجاج مەگەر حاڵی کچەکانی نابینیت، هەروەها پورەکانی هەموویان بەگشتی ئەم شەو شینی بۆ دەکەن.

ئەی حەجاج چەند کەسی تر دەکوژیت ئەگەر ئەوت کوشت؟ هەشت و دە و دوو و چوار( مەبەستی ئەوەیە کە ئەگەر ئەو بکوژیت وەك ئەوە وایە هەر بیست و چوار ئافرەتەکەت کوشتبێت کە ئەو بەخێویان دەکات).

ئەی حەجاج کێ هەیە جێی ئەو بگرێتەوە بۆ ئێمە، بەزەییت هەبێ ئەگەی زیاتر بێ دەسەڵات و داماومان بکەیت.

ئەی حەجاج یان بەخشندە بە یان هەموومان پێکەوە بکوژە.

دەڵێن:حەجاج دەستی بەگریان کرد و وتی: بەخوا سەرتان لێ ناشێوێنم و زیاتر ئاتان خەمە ئەنگانەوە.

پاشان نامەی نوسیەوە بۆ عبدالملك و هەمان قسەی پیاوەکە و کچۆڵەکەشی بۆ باسکرد لە نامەکەیدا، ئینجا عبدالملك فەرمانی پێ کرد ئازادی بکات و پەیوەندی باش بێ لەگەڵیان، لەگەڵ ئەم کچۆڵەیەشدا چاکەکار بێت و هەموو کات بەسەریان بکاتەوە.

دەڵێن: حەجاج ڕۆژێك وتاری دەدا و دەیگوت: ئەی خەڵکینە، ئارامگرتن لەسەر قەدەغەکراوەکانی خودا ئاسانترە وەك لە ئارامگرتن لەسەر سزاکانی خودا.

ئینجا پیاوێك بۆی هەستایەوە و وتی: بەڵا لێت دا ئەی حەجاج، چەند ڕودار و کەم شەرمی، چی دەکەی دەیکەیت و ئەم جۆرە قسانەش دەکەیت؟ سەرت لێ تێکچووە.

ئینجا بە پاسەوانەکەی گوت: بیگرن...کاتێك لە وتارەکەی لێ بوویەوە بەپیاوەکەی گوت: چی وای لێکردی بوێریت ئەو قسەیە بکەیت؟

ووتی: بەڵا لێت دا ئەی حەجاج تۆ دەوێریت قسە بەخوا بڵێیت من چۆن نەوێرم بەرامبەر تۆ هیچ بڵێم! جا تۆ چیت تا نەتوانم بەرامبەرت دەم بکەمەوە لەکاتێکدا تۆ بەرامبەر خودای هەموو جیهان دەمت دەکەیتەوە؟!

ئینجا ووتی: لێگەڕێن بروات بەڕێی خۆیدا و بەری دا.

مەدائینی دەڵێت: دوو دیلیان لە هاوەڵانی ئیبن ئەشعەس[١] هێنا بۆلای حەجاج و ئەویش فەرمانی کرد بیانکوژن، ئینجا یەکیان هاتە قسە و وتی: من حەقێکم لای تۆیە..

حەجاج گوتی: ئەو حەقە چیە؟

وتی: ڕۆژێك ئیبن ئەشعەس باسی دایکتی دەکرد منیش وەڵامم دایەوە.

ئەویش گوتی: کێ دەڵێت ڕاست دەکەیت (شایەتت کێیە؟).

وتی: ئەم هاوڕێیەم (مەبەستی دیلی دووەم بوو).

---

[١] ابن أشعث: یەکێك بوو لە سەرکردەکانی بەنی ئومەییە پاشان لێیان هەڵگەڕایەوە و ڕاپەڕی و حەجاج بەرەنگاری بوویەوە و زاڵ بوو بەسەریدا وەك دواتر باسی دەکەین.

دووەم وتی: سوێند دەخۆم کە ڕاست دەکات.

حەجاج پێی وت: ئەی بۆچی تۆیش وەك هاوڕێکەت بەرپەرچی ئیبن ئەشعەست نەدایەوە.

دوووەم وتی:

چونکە من ڕقم لێتە.

حەجاج وتی: ئەمیان بەریدەن لەبەر ئەو کارەی کە کردی.... ئەمیشیان لەبەر ڕاستگۆییەکەی.

هەروەها واقیدی دەگێڕێتەوە کە حەجاج جاڕی دا: هەرکەس پاش نوێژی شێوان (عیشا) لەماڵ بچێتە دەر دەکوژرێت، ئینجا شەو پیاوێکیان گرت و هێنایان بۆلای، پێی گوت: بۆچی هاتیتە دەر بەم شەوە لەکاتێکدا بانگەوازەکەی ئێمەت بیستبوو؟

پیاوەکە گوتی: سوێند بەخوا من درۆ ناکەم فەرماندە، دایکم نەخۆش و پەککەوتەیە، من سێ ڕۆژە لای ئەوم ، ئەو کاتەی کە چاك بوویەوە، گوتی: کوڕەکەم من سوێندت دەدەم لەبەر ئەو مافەی هەمە بەسەرتەوە بڕۆیتەوە بۆلای خاو خێزانەکەت، ئێستا ئەوان خەفەت دەخۆم کە دواکەوتوویت لە گەڕانەوەت بۆلایان.

ئینجا کە لای دایکم دەرچووم پاسەوانەکان گرتیانم و هێنایانم بۆلای تۆ.

ئینجا حەجاج گوتی: ئێمە لێتان قەدەغە دەکەین و ئێوەش سەرپێچیمان دەکەن؛ فەرمانی کرد بدەن لە گەردنی.

پاشان یەکێکی تریان هێنا، حەجاج پێی گوت: چ شتێك بەم کاتەی شەو تۆی هێناوەتە دەری؟

ئەویش گوتی: بەخوا درۆت بۆ ناکەم، هەندێك پارە و درهەمی لابوو بەزۆر لەبەر دەرگای ماڵەکەیان دانیشاندم، گوتی: لێت جیا نابمەوە بە حەقی خۆم نەبێت (واتە ناهێڵم بڕۆی تا پارەکەم نەدەیتەوە)، کاتێك گەیشتینە ئەم کاتەی شەو چووە ماڵەوە و

دەرگاکەی داخست و لەبەردەرگاکەی منی جێهێشت، ئینجا پاسەوانەکانت منیان گرت و هێنامیان بۆلای تۆ.

حەجاج گوتی: بدەن لە ملی.

وتی: یەکێ تریان هێنا، پێی گوت: لەم ساتەی شەودا چی هێنایتیە دەر؟

ووتی: لەگەڵ کۆمەڵێك دەمخواردەوە، کاتێك سەرخۆش بووم لای ئەوان هاتمە دەر و ئیتر نازانم هێنامیان بۆلای تۆ.

ئینجا حەجاج پیاوێکی لە تەنیشت بوو پێی گوت: ڕاستگۆ دێتە بەرچاوم، پاشان گوتی: ڕێی بدەن بڕوا ئەویش ڕۆی بەڕێی خۆیەوە!!

(محمدی کوری زیادی کوری ئەعرابی) باسی کردووە کە پیاوێك لە بەنی حەنیفە پێی دەوترا: (جحدری کوری مالیك) پەلاماری خاکی یەمامەی دابوو، ئینجا حەجاج نامەی ناردی بۆ کاربەدەستەی ئەوێ، سەرزەنشتی کرد و پلاری تێ گرت لەسەر ئەوەی ئەو پیاوەی نەگرتووە، هەربۆیە بەردەوام ئەو کاربەدەستە بەدوای (جحدر)دا گەڕا تا گرتی و ناردی بۆ حەجاج.

حەجاج پێی گوت: چی وای لێکردی ئەوە بکەی کە کردت؟

ئەویش وەڵامی دایەوە: دڵ نەترسی خۆم، هەروەها بێ باکی و بەدەمەوەنەهاتنی فەرمانڕەوا (سوڵتان)، گەر فەرماندە تاقی بکردمایەتەوە، دەیبینی کە یەکێکم لە هاوکارە باشەکانی و شۆڕەسوارەکانی، بۆی دەردەکەوت کە یەکێکم لە ژێر دەستە و هاوڵاتیە ڕەسەنەکانی خۆی، هەرگیز سوارچاکێکم نەبینیوە لەخۆم بە باشتر و بەتواناتر.

حەجاج پێی گوت: ئێمە دەتخەینە ناو بێستانێکەوە کە شێرێکی قەپگر و کەڵبەتیژی تیابێت، ئەگەر کوشتیتی ئەوا مردنەکەتمان بەسە، ئەگەریش تۆ ئەوت کوشت وازت لێدێنین بڕۆی بەڕێی خۆتدا.

پاشان ڕەوانەی بەندیخانەی کرد بە دەست بەستراوی و دەستی ڕاستی لە ملیدا بوو، حەجاج نامەی نوسی بۆ نوێنەرەکەی خۆی لە (کسکر) کە شێرێکی گەورەی برسی بۆ

بنێرێت ، ئینجا ئەم (جەحدەر)ە لەم بەندیەدا چەند دێڕە هۆنراوەیەکی گوت کە خەمباری خۆی دەربڕی بۆ ژنەکەی کە ناوی (سولەیمای ئوم عەمر)بوو لە هەندێك لە دێڕەکانیدا دەیگوت:

ألیسَ اللهِ یَجْمَعُ أمَّ عَمْرٍو - و إیّانا فَذاكَ لنا تَدانِ

بلی و تری الهلالَ کما أراهُ - و یَعْلوها النهارُ کما علاني

إذا جاوزْتُما سَعَفاتِ (نخلات) هَجْرٍ - و أودیةَ الیمامة فانعیاني

و قُولا جَحْدَرٌ أمسی رهیناً - یُحاذر وقْعَ مصقولٍ یَماني

کاتێك شێرەکەیان گەیاندە لای حەجاج فەرمانی کرد سێ ڕۆژ برسیان کرد، پاشان برایە ناو بێستانەکەوە، فەرمان کرا دەستی جەحدەر بکەنەوە بەڵام دەستی ڕاستی وەك خۆی لە ملیدا مایەوە، شمشێرێکیان دایە دەستی چەپی، ئینجا لەگەڵ شێرەکە ڕوبەڕوی یەکتر کرانەوە، حەجاج و هاوەڵەکانیشی تەماشایان دەکردن، جەحدەر بەرەو لای شێرەکە ڕۆیشت و دەیگوت:

لَیثٌ ولَیْثٌ في مَجالٍ ضنكِ - کلاهما ذو أنَفٍ ومَحْكِ

وبَطشةٍ وصولةٍ وفَتْكِ - إن یَکْشِفِ اللهُ قِناعَ الشكِ

فهو أحَقُّ مَنْزِلٍ بتَرْكِ

کاتێك شێرەکە بینی نەڕەیەکی توندی کرد، خۆی کێشایەوە و بەرەو ڕوی هات، کە ئەندازەی ڕمێکی مابوو لێیەوە، شێرەکە بازێکی توندی دایە سەر جەحدەر ، ئینجا جەحدەر بە شمشێرەکە بەرەنگاری بوویەوە و لێدانێك لێی دا کە تا گێز و گوڵنگەی شمشێرەکەی تێکەڵ بە هەناوی شێرەکە کرد، ئینجا شێرەکە بەربوویەوە بۆ زەوی دەتگوت چادرە و ڕەشەبا دەیدات بە زەویدا، بەهۆی توندی لێدانەکەوە، جەحدەریش کەوتە سەر زەوی لەبەر ئەوەی شێرەکە زۆر توند بازی دابووە سەری، هەروەها لەبەر ئەوەی ئەو کۆت و زنجیرەشی لێی ئاڵێنرابوو زۆر توند بوو، ئیدی حەجاج تەکبیری کرد و هاوەڵەکانیشی بەدوایدا، پاشان جەحدەر ئەم هۆنراوەیەی بۆ هات:

یاجمل انك لو رأیت کریهتي ** في یوم هول مسدف وعجاج

وتقدمي لليث أرسف موثقا ** كيما أثاروه على الأحراج
شثن براثنه كأن نيوبه** زرق المعاول أو شباه زجاج
يسمو بناظرتين تحسب فيهما ** لهبا أحدهما شعاع سراج
وكأنما خيطت عليه عباءة ** برقاء أو خرق من الديباج
لعلمت أني ذو حفاظ ماجد ** من نسل أقوام ذوي أبراج.

پاشان ئاوڕی دایەوە بەلای حەجاجدا و گوتی:

علم النساء بأنني لا أنثني ** اذ لا يثقن بغيرة الأزواج
وعلمت أني ان كرهت نزاله ** أني من الحجاج لست بناج

لەبەر ئەوە حەجاج سەرپشکی کرد کە ئەگەر ویستی لای ئەو بمێنێتەوە، ئەگەریش حەزدەکات با بڕواتەوە بۆ شارەکەی خۆی، ئەویش مانەوەی لای حەجاج هەڵبژارد، ئینجا خەڵات و پاداشت و هەندێك پارەی باشی درایە.

حەجاج لەگەڵ زمان پاراوی و ڕەوانبێژیەکەیدا هەندێك ئایەتی قورئانی بە هەڵە دەخوێندەوە (ئاوازی مۆ دادەنا) کە (یەحیای کوڕی یعمر) بە ناڕەوای دەزانی، لەوانەش ئەمەبوو کە (إن)ی (ژێرە)داری دەگۆڕی بە (أن)ی (سەرە)دار و پێچەوانەی دەکردەوە، کە ئایەتی ﴿قُلْ إِنْ كَانَ آبَاؤُكُمْ وَأَبْنَاؤُكُمْ وَإِخْوَانُكُمْ وَأَزْوَاجُكُمْ وَعَشِيرَتُكُمْ وَأَمْوَالٌ اقْتَرَفْتُمُوهَا وَتِجَارَةٌ تَخْشَوْنَ كَسَادَهَا وَمَسَاكِنُ تَرْضَوْنَهَا أَحَبَّ إِلَيْكُمْ﴾ی تا ﴿أَحَبَّ إِلَيْكُمْ﴾دەخوێندەوە، وشەی (أَحَبَّ)ی ڕەفع دەکرد واتە دەیکردە (أَحَبُّ).

هەروەها ڕۆژێکیان نکوڵی کرد کە حسێن لە نەوەی پێغەمبەری خودا بێت – درودی خوای لێبێت– چونکە کوڕی کچەکەیەتی، ئینجا یەحیای کوڕی یعمر پێی گوت: درۆت کرد.

حەجاجیش گوتی: لەسەر ئەوەی گوتت بەڵگەیەکم بۆ دێنیت لە قورئان و پەرتوکەکەی خودا ئەگینا لە گەردنت دەدەم.

ئەویش گوتی: خوا دەفەرموێت:﴿.....وَمِنْ ذُرِّيَّتِهِ دَاوُدَ وَسُلَيْمَانَ وَأَيُّوبَ وَيُوسُفَ وَمُوسَى وَهَارُونَ وَكَذَلِكَ نَجْزِي الْمُحْسِنِينَ * وَزَكَرِيَّا وَيَحْيَى وَعِيسَى....﴾ بەپێی ئەم ئایەتە عیسا لە نەوەی ئیبراهیمە، کە ئەویش لە نەوەی مەریەمە، حسەینیش کوڕی کچی پێغەمبەری خوایە -درودی خوای لێبێت-.

حەجاج گوتی: ڕاستت کرد.

ئینجا دوری خستەوە بۆ خۆڕاسان.

ئەصمەعی دەگێڕێتەوە: کە عبدالملك نامەی نوسی بۆ حەجاج و پرسیاری لێکرد لەبارەی دوێنێ و ئەمڕۆ و سبەینێوە، بە نامەهێنەکەی گوت: ئایا (خوەیلیدی کوڕی یەزیدی کوڕی معاویە)ی لەلا بوو؟

ئەویش گوتی: بەڵێ.

ئینجا حەجاج نوسیەوە بۆ عبدالملك و گوتی: دوێنێ تەواو بوو و کۆتایی پێهاتووە و ئەمڕۆکەش کاتی کردەوەیە و بەیانیش کاتی هیوا و ئومێدە.

ئیبن دورەید دەڵێت: لە ئەبی حاتەمی سەجستانیەوە، ئەویش لە (أبی عبیده معمر بن المثنی)ەوە دەڵێت: کاتێك حەجاج ئیبن ئەشعەسی کوشت، بەشێوەیەکی زیاتر بەخشین و موچەی دەدا بە خەڵکی، هەربۆیە عبدالملك نامەی بۆ نوسی و گوتی پاش سوپاس و ستایشی خودا ... بە ئەمیری بڕواداران گەیشتۆتەوە کە تۆ لەیەك ڕۆژدا هێندە خەرج دەکەی کە ئەمیری بڕواداران لە هەفتەیەکدا خەرجی ناکات، لە هەفتەیەکیشدا ئەوەندە بە خەرج دەدەیت و دەبەخشی ئەمیری بڕوادارا لە مانگێکدا خەرجی ناکات، پاشان بەم هۆنراوەیە نامەکەی تەواو کرد:

علیك بتقوی الله في الأمر كله ... وكن لوعيد الله تخشى وتضرع

ووفر خراج المسلمين وفيئهم ... وكن لهم حصنا تجير وتمنع

ئینجا حەجاج بۆی نوسیەوە:

إذا كنت سوطا من عذاب عليهم ... ولم يك عندي في المنافع مطمع

أيرضى بذاك الناس أم يسخطونه ... أم أحمد فيهم أم ألام فأقذع

وكانت بلاد جئتها حيث جئتها ... بها كل نيران العداوة تلمع

فقاسيت منها ما علمت ولم أزل ... أضارع حتى كنت بالموت أضرع

فكم أرجفوا من رجفة قد سمعتها ... ولو كان غيري طار مما يروّع

وكنت إذا هموا بإحدى هناتهم ... حسرت لهم رأسي ولا أتقنع

فلو لم تزد عني صناديد منهم ... تقسّم أعضائي ذئاب وأضبع

وتی ئینجا عبدالملك بۆی نوسیەوە و پێی گوت خۆت چۆنت پێ باش بوو وا بکە.

لە (محمد بن المستورد الجمحی)ەوە ووتی: دزێکیان هێنا بۆلای حەجاج، پێی گوت: وا دیارە دەوڵەمەند بوویت بەو دزیە تا بڕیار بدەین ئەندامێکی جەستەت لە دەست بدەیت.

پیاوەکە گوتی: ئەگەر خاوەن دەست کەموکورتی کرد ئەوا دەروون سەرکێشی و تاوان دەکات.

ووتی: ڕاست دەکەیت، بەخوا گەر جوان پۆزش هێنانەوە سزای (حد) ی هەڵوەشاندایەتەوە، ئەوا تۆ دەبورایت، ئەوا من دەمکرد، هۆی خزمەتکار شمشێرێکی تیژ و پیاوێك بێنن دەستی ببڕێت.

ئینجا دەستیان بڕی.

هەروەها ئەبوبەکری کوڕی موجاهید لە محمدی کوڕی جەهمەوە ئەویش لە فەڕائەوە ووتی: ڕۆژێك حەجاج لەگەڵ وەلیدی کوڕی عبدالملك قاوەڵتی دەکرد، کاتێك قاوەڵتیەکەیان تەواو بوو وەلید بانگێشتی کرد بۆ خواردنەوەی مەی، ئەویش گوتی: ئەی ئەمیری بڕواداران، هەرچی تۆ حەلاڵت کردبێ حەلاڵە، بەڵام من قەدەغەم کردووە

کاریەدەستەکانم بیخۆنەوە، بۆیە حەزناکەم پێچەوانەی ئەو وتەیەی صالح پێغەمبەر بم کە خوا لەقورئان بۆمان دەگێڕێتەوە فەرموی:﴿ وَمَا أُرِيدُ أَنْ أُخَالِفَكُمْ إِلَىٰ مَا أَنْهَاكُمْ عَنْهُ﴾[1].

هەروەها دەگێڕنەوە: عبدالملك نامەی نوسی بۆ حەجاج و سەرزەنشتی کرد لەسەر دەست بڵاوی و زیادە خەرجیەکانی و بەفیڕۆدانی ماڵ و خوێن ڕشتنی زۆر و پێی وت: ماڵ و سامان هی خودایە و ئێمەش پارێزەری گەنجینەکەین بەڵام پێم گەیشتۆتەوە ئەو گەنجینەیە لەباشەدا دەگێڕیتەوە و لە خراپەشدا بەخەرج دەدرێت، لە خوارەوەی نامەکەدا نوسی:

إذا أنت لم تترك أمورا كرهتها........وتطلب رضائي في الذي أنا طالبه

وتخشى الذي يخشاه مثلك هاربا ........إلى الله منه ضيع الدار جالبه

فان تر مني غفلة قرشية ..........فيا ربما قد غص بالماء شاربه

وإن تر مني وثبة أموية.................فهذا وهذا كله أنا صاحبه

فلا تعد ما يأتيك مني فإن تعد ......تقم فاعلمن يوما عليك نوادبه.

کاتێك حەجاج نامەکەی خوێندەوە بۆی نوسیەوە: نامەکەی ئەمیری بڕواداران پێ گەیشت تیایدا باسی ئەوەی کردووە من زیادەخەرجی دەکەم و سامان و خوێن بە هەدەر دەدەم، دە سوێند بەخوا زیادەڕۆییم نەکردووە لە سزادانی سەرپێچیکاران و ماڵی گوێڕایەڵانیشم بەتەواوی نەداوە، جا ئەگەر ئەوە بەفیڕۆدان بێت با ئەمیری بڕواداران سنورێکم بۆ دابنێت کۆتایی پێ بێنم و لێی لا نەدەم، ئینجا لە خوارەوەی نامەکەدا نوسی:

إِذا أنا لم أطْلُبْ رِضَاكَ وأتَّقِي * * أذاكَ فَيَوْمِي لا تُوارَى كَوَاكِبُهُ

أُسالِمُ مَن سالَمْتَ مِن ذِي قَرابَةٍ * * وإنْ لَمْ تُسالِمْهُ فإنِّي مُحارِبُهُ

إِذا قارَفَ الحَجَّاج فِيكَ خَطِيَّةً * * فقامَتْ عليه في الصَّباحِ نَوادِبُهُ

إذا أنا لَمْ أُدْنِ الشَّفِيقَ لِنُصْحِهِ * * وأُقْصِ الذي تَسْرِي إِليَّ عَقارِبُهُ

---

[1]. هود: ٨٨، بۆ ڕاڤەی ئایەتەکان سەیری تەفسیری ئاسان بکە.

وأُعْطِي المَواسِي في البَلاءِ عَطِيَّةً * * * تَرُدُّ الذي ضاقَتْ عليه مَذاهِبُهُ
فمَنْ يَتَّقِي يَوْمِي، ويَرْعَى مَوَدَّتِي، * * * ويَخْشَى غَدِي، والدَّهْرُ جَمٌّ عَجائِبُه .

لەو وتارانەی حەجاج کە ئاماژەیە بۆ جورئەتکردنی و ئەوەی کە زمانی پێش عەقڵی کەوتووە و کەچۆن وێراویەتی بەرامبەر خودا قسە بکات:

دەگێڕنەوە حەجاج لەسەر بڵندگۆ دەیگوت: لەخوا بترسن چەندی پێتان دەکرێت و گوێڕایەڵی ئەمیری بڕواداران بن (عبدالملک) سوێند بەخوا گەر فەرمان بکەم خەڵکی لەم دەرگایەی مزگەوتەکەوە بچنە دەرەوە ئەوان لە دەرگایەکی ترەوە بچنە دەرەوە ئەوا خوێن وماڵیان حەلاڵ دەبێت بۆم.

عەلی کوڕی عبداللەی کوڕی موبەششیر لە عەباسی دوریەوە ئەویش لە موسلیمی کوڕی ئیبراهیمەوە دەگێڕێتەوە کە صەلتی کوڕی دینار وتی: گوێم لێ بوو حەجاج لەسەر بڵندگۆی (واسیت[1]) دەیگوت: عبداللەی کوڕی مەسعود سەرۆکی دووڕووەکانە، گەر دەستم پێی گەیشتبا زەویم تێراو دەکرد بەخوێنی ئەو.

وتی: هەروەها بیستم لەسەر بڵندگۆی واسیت ئەم ئایەتەی دەخوێندەوە :﴿ وَهَبْ لِي مُلْكًا لَا يَنْبَغِي لِأَحَدٍ مِنْ بَعْدِي﴾[2].

دوای خوێندنەوەی ئایەتەکە گوتی: بەخوا سولەیمانیش حەسود بووە (نستغفرالله).

ئیبن کثیر فەرمویەتی: ئەمەش بوێری و ڕوو قایمیەکی گەورەیە بەرامبەر خودا کە بەرەو بێ باوەڕی دەبیات، خوا ڕوی ڕەش و شەرمەزار و ڕسوای بکات و دوری بخاتەوە لەڕەحمی خۆی.

---

[1] - واسط.

[2] - ص:٣٥. بۆ ڕاڤەی ئایەتەکان سەیری تەفسیری ئاسان بکە.

ئیبن کپیر ڕەحمەتی خوای لێبێت فەرمویەتی: یەکێکی تر لە بەلا و کارەساتەکان دیسان ئەوەیە کە ئەبوداود گێڕاویەتیەوە لە ئیسحاقی کوڕی ئیسماعیلی تاقانیەوە[١] ئەویش لە جەریرەوە، زوهەیری کوڕی حەرب لە موغەیرەوە ئەویش لە بەزیغی کوڕی خالیدەوە بۆی باسکردین: گوێم لێ بوو حەجاج وتاری دەدا و لەوتارەکەیدا دەیگوت: لای هەرکامتان پێغەمبەرێك بەڕێزە کە پێداویستی خۆی پڕبکاتەوە یان جێنشینەکەی کە پێداویستی خەڵکەکەی پڕ بکاتەوە؟

لە دڵی خۆمدا وتم: لەبەرخوا با هەرگیز نوێژ لەدواتەوە نەکەم ، ئەگەر خەڵکانێکیشم بینی ڕویەڕوی تۆ بوونەوە و جیهادیان کرد ئەوا منیش لەگەڵیان بەرەنگارت دەبمەوە.

ئیسحاق لە فەرموودەیەکدا زیاتر دەڵێت: ئەگەر ئەمە ڕاست بێت ئەوا دیارەکەی کوفر و بێ باوەڕیە، ئەگەر ویستبێتی پلەو پایەی جێنشینی بەرزتربکاتەوە لە پلە وپایەی پێغەمبەرێتی، یان ئەگەر مەبەستی ئەوە بووبێت کە خەلیفەی بەنی ئومەییە باشترە لە پێغەمبەر.

ئەصمەعی فەرمویەتی: ئەبو عاصم ئەبیل لە ئەبو حەفصی سەقەفیەوە بۆی باسکردین: حەجاج ڕۆژێك وتاری دەدا بەرەو لای ڕاست ڕوی وەرچەرخاند و گوتی: ئایا حەجاج بێ بڕوایە (کافرە)، پاشان بێدەنگ بوو و ئینجا گوتی: بەڕاستی حەجاج بێ بڕوایە، پاشان بێدەنگ بوو و بەرەو لای چەپ ڕوی وەرچەرخاند و ووتی: بۆچی نا حەجاج بێ بڕوایە! ئەوکارەی چەند جارێك دوبارە کردەوە و پاشان گوتی: بێ بڕوایە ئەی خەڵکی عێراق بە لات و عوززا (اللات والعزى)[٢].

---

[١] .طاقاني.

[٢] . اللات والعزى: ئەو بتانە بوون کە عەرەب و بەتایبەت بێ باوەڕەکانی مەککە لەسەردەمی پێش ئیسلامدا دەیانپەرستن.

ئەسمەعی فەرمویەتی: عبدالملک رۆژێك بە حەجاجی گوت: هیچ کەس نیە ئەنگی و عەیبی خۆی نەزانێت تۆیش عەیبی خۆتمان بۆ باس بکە:

ووتی: ئەی ئەمیری بڕواداران بمبەخشە... ئەمیریش وازی نەهێنا.

ئینجا حەجاج گوتی: من ورکن و قین لە دڵ و چاوچنۆك(حەسود)م.

عبدالملک گوتی: جاخۆ شەیتانیش لەو سیفەتانە خراپتری نیە.

لە گێڕانەوەیەکی تردا دەڵێن پێی گوتووە: کەواتە لەنێوان تۆ و ئیبلیسدا خزمایەتی هەیە.

ئیبن کەسیر فەرمویەتی: بەگشتی حەجاج نیقمەت (پێ نواندن) ی خوایی بوو بە خەڵکی عێراق لەسەر ئەو کارو کردەوە و تاوانانەی کە پێشتر ئەنجامیان داوە و لە پێشەوا پاشەکان ڕاپەڕیون و هەڵگەڕاونەتەوە لێیان و پشتیان تێکردون و سەرپێچی و دژایەتیان کردوون.

ئابەم جۆرە کەسێتی حەجاج لە ناواخنیدا چەندین سیفەتی دژبەیەکی هەڵگرتبوو تاکو یەك مۆرك و شێوە بدات بەدەستەوە، کە وەك وەلی ئەمرە ستەمکار و پادشا زمان لوسەکان دەچوو، زمانی لوس و ڕەوانبێژیان کردبوویە شەیتانی خۆیان خەڵکیان پێ گومڕا دەکرد، تاکو خەڵکی وا گومانیان دەبرد کە ئەوانە ژیرترین و دادپەروەرترین کەسن.

حەجاج خۆی لەخودا نزیك دەکردەوە بە خوێندنەوەی قورئان و نەخواردنەوەی مەی و بادە و خەڵکیشی دەکوشت بە گومانێك لەبەر خاتری خەلیفە، هەرکەس لە خەلیفە ڕاپەڕیایە و لێی هەڵگەڕایەتەوە و لە فەرمانی خەلیفە لای بدایە لای ئەو بێ باوەڕ بوو و دەبوایە دەست بەجێ بکوژرێت.

جنێوی بە هاوەڵانی پێغەمبەر دەدا و ئازاری دەدان بە مردوو و زیندویانەوە، پەرتوکەکانی مێژوو بۆیان گێڕاوینەتەوە کە ئازاری عبداللەی کوڕی جابر و ئەنەسی کوڕی

مالیك و سەهلی کوڕی سەعدی داوە –ڕەزای خوا لە هەموویان– و هەروەها ئەو قسەیەشی کە لەبارەی ئیبن مەسعودەوە کردی و دڵ ڕەشبوونی بەرامبەری چونکە دەرچووبوو لە ڕای عوسمانی کوڕی عەففان لە خوێندنەوەی قورئاندا[1].

ئەوەش حەجاجی کوڕی یوسفی سەقەفی.....

***

---

[1] . عەلی کوڕی عبداللەی کوڕی موبەششیر لە عەباسی دووریەوە ئەویش لە موسلیمی کوڕی ئیبراهیمەوە دەگێڕێتەوە کە صەلتی کوڕی دینار وتی: گوێم لێ بوو حەجاج لەسەر بڵندگۆی (واسیت) دەیگوت: عبداللەی کوڕی مەسعود سەرۆکی دووڕووەکانە، گەر دەستم پێی گەیشتبا زەویم تێرلو دەکرد بەخوێنی ئەو.

(٦)

# خزمەتکارەکەی پێغەمبەری خودا و حەجاجی سەقەفی

- حەجاج ئازاری (ئەنەسی کوڕی مالیک)ی هاوەڵ و خزمەتکاری بەڕێزی پێغەمبەر – درودی خوای لێبێت – دەدات.

- ئەنەس -ڕەزای خوای لێبێت- لای "عبدالملك" سکاڵا دەکات لەبەر ئازاردانی و هەڕەشە لێکردنی لەلایەن حەجاجەوە.

# هەڕەشە كردنی حەجاج لە هاوەڵی بەڕێزی پێغەمبەر ئەنەسی كوڕی مالیك و ئازاردانی

ئەنەسی كوڕی مالیكی كوڕی نەزری[1] خەزرەجی ئەنصاری هاوەڵێكی بەڕێز بوو، لە شاری مەدینە لەدایك بوو، هەر بە منداڵی موسوڵمان بوو و پێغەمبەر -درودی خوای لێبێت- نازناوی (ئەبو حەمزە)ی لێنا.

١٠ ساڵ لەماڵی پێغەمبەردا بوو خزمەتی پێغەمبەری خوای دەكرد -درودی خوای لێبێت-.

پێغەمبەر بەم جۆرە بۆی پاڕایەوە: ((اللّهم أكثر ماله و ولده و بارك له وأدخله الجنة)) واتە خوایەگیان ماڵ و منداڵی زۆری بدەیتێ، بەرەكەت بخەیتە تەمەنیەوە، بیخەیتە بەهەشتەوە.... هەربۆیە تەمەنێكی درێژ ژیا، خوای گەورە نەوە و منداڵ و كوڕی زۆری پێ بەخشی. زۆرێك لە فەرمودەكانی پێغەمبەری گێڕاوەتەوە و لە خودی پێغەمبەرەوە گوێی لێ بووە -دروی خوای لێبێت- .

دایكیشی (أم سُلیم الغمیصا ) كچی (ملحان)ی (ئەنصاری) بوو ڕەزای خوای لێ بێت. دەوترێت.

دەوترێت سەهلەی كچی ملحانی كوڕی خالیدی كوڕی زەیدی كوڕی حەرامی كوڕی جندبی كوڕی عامری كوڕی غەنەمی كوڕی عدی كوڕی نەجاڕی ئەنصاری خەزرەجیە.

---

[1] النضر: لەبەر ئەوەی پیتی (ض) لەزمانی كوردیدا نیە بۆیە لەجیاتی (ض) (ز)مان داناوە

مالیکی کوڕی نەزری مێردی مرد، پاشان شوی کرد بە ئەبو تەڵحە[1]، زەیدی کوڕی سەهلی ئەنصاری و ئەبو عومەیری لێ بوو.

ئوم سولەیم یەکێك بوو لە باشترین کەڵە ئافرەتەکان کە چواردە فەرموودەی گێڕاوەتەوە و بوخاری و موسلیم لە دوو فەرمودەدا هاوڕابوون لەسەری و بوخاریش بە فەرمودەیەك و موسلیم بە دوو فەرموودە.

پێغەمبەر درودی خوای لێ بێت مژدەی بەهەشتی پێدەدات و فەرمووی: (( چومە بەهەشتەوە و گوێم لە جموجوڵێك بوو لەبەردەممدا، دیتم (غمیصائی کچی ملحان)ە[2].

ئوم سولەیم ئافرەتێکی بڕودارای تێکۆشەر بوو بەشداری دەکرد لە جیهادی موسوڵماناندا لە بەرزکردنەوەی بەیداخی جیهاد و ڕاستیدا، لە شەڕی ئوحوددا لەگەڵ دایکی بڕواداران (عائیشە) دا بوو –ڕەزای خوای لێ بێت–، ئاویان دەدا بە تینوان، لە شەڕی حونەین دا ئەبو تەڵحە هات پێغەمبەری هێنایە پێکەنین بە ئوم سولەیم و وتی: ئەی پێغەمبەری خودا ئەمە ئوم سولەیمە، خەنجەری پێیە؟ ئوم سولەیم فەرمووی: گەر بێ باوەڕێك (مشرك) لێم نزیك بێتەوە سکی پێ هەڵدەدڕم[3].

ئەنەس دەفەرموێت: دایکم دەستی گرتم و بردمی بۆلای پێغەمبەری خودا و فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خودا هیچ پیاو یان ئافرەتێکی ئەنصار نەماوە دیاریەکی پێشکەش نەکردبێت، من ناتوانم هیچ دیاریەکت پێ ببەخشم بێجگە لەم کوڕەم، فەرموو بیبە بۆخۆت با خزمەتت بکات.

ئیدی پاش ئەوە دە ساڵ خزمەتکاری پێغەمبەری خودا بووم، نە لێی دام و نەجنێوێکی پێدام، نە تورەبوو لێم، بۆ تەنها جارێکیش ڕوی گرژ نەکرد بە ڕومدا.

ئەبوبەکر و پاشان عومەری کوڕی خەتابیش کردیانە کاربەدەستی دەریاییەکان و سوپاسیان کرد لەسەر ئەو کارەش، لەپاش پێغەمبەر باری کرد و لە بەصرە نیشتەجێ

---

١. طلحة. لەبەر ئەوەی پیتی (ط) لەزمانی کوردیدا نیە بۆیە لەجیاتی (ط) (ت)مان دلناوە
٢. متفق علیه.
٣. الطبقات . ئیبن سعد.

بوو، ئازار و لێدانی لەلایەن حەجاج و داروودەستەکەیەوە پێگەیشت، لە ئاژاوەکەی ئیبن ئەشعەسدا حەجاج گومانی لێکرد و پێی وابوو ئەویش دەستی هەیە لەکارەکەدا و ئەو فەتوای داوە، هەربۆیە حەجاج مۆری دا لە گەردنی، کە ناسرابوو بە ناوی مۆرەکە حەجاج، ئەوەش قەشمەریاتێکی گەورە و گەمژەیی و بەدئاکاریی حەجاجی دەرەخست، هەربۆیە ئەنەسی کوڕی مالیك سکاڵای کرد لای عبدالملکی کوڕی مەروان، ئەویش نامەی نوسی بۆ حەجاج و سەرزەنشتی کرد و لێی توڕەبوو، حەجاجیش لەو توڕەبوونەی خەلیفە زۆر ترسا و ئەنەسی ئاشت کردەوە.

ئەنەس لەگەڵ پێغەمبەر چوو بۆ شەڕی بەدر وەك بەردەستێك خزمەتی پێغەمبەری دەکرد، ئیسحاقی کوڕی عوسمان پرسیاری لە موسای کوڕی ئەنەس کرد: پێغەمبەری خودا چەند غەزای کرد؟

وتی: بیست و حەوت غەزا، هەشت غەزایان بۆ چەند مانگ دیار نەدەما، نۆزدە غەزاشیان بۆ چەند ڕۆژ دیارنەدەما.

ئینجا گوتی: ئەی ئەنەسی کوڕی مالیك چەند غەزای کرد؟

وتی: هەشت غەزا.

ئەنەسی کوڕی مالیك یەکێك بوو لە تیرهاوێژ و نیشانەچیە دەست ڕاستەکان، فەرمانی دەکرد بە کوڕەکانی کە لەبەردەمیدا نیشانە بنێنەوە، لەگەڵیان نیشانەی دەنایەوە و لێی دەبردنەوە، لەهەموویا زیاتر نیشانەکەی دەپێکا.

یەکێك بوو لە شارەزا و زاناکان، هەربۆیە کاتێك ئەنەس مرد، (مۆرق العجلی) گوتی: نیوەی زانست مرد.

پێی ووترا: ئەمە واتای چیە ئەی باوکی (مغیرة)؟

ئەویش وەڵامی دایەوە: کەسێك گەر لەخۆیەوە قسەی کردبا و لەفەرمودەیەکدا بەپێی هەواو هەوەس لەگەڵمان ناکۆك بووایە پێمان دەگوت: وەرە با بڕۆین بۆلای ئەو کەسەی کە بەگوێی خۆی لە پێغەمبەری خوای بیستووە. (واتە ئەنەسی کوڕی مالیك).

ئەنەسی کوڕی مالیك بە کوڕەکەی فەرموو: کوڕم زانست بە نوسینەوە هەڵبگرن (واتە بینوسنەوە بۆوەی لەناو نەچێت).

سابتی[1] بەنانی چووبە لای ئەنەسی کوڕی مالیك ڕەزای خوای لێبێت و گووتی: چاوەکانت پێغەمبەری خودایان دیتووە؟

فەرمووی: بەڵێ.

ئەویش ماچی کردن و پاشان گووتی: ئایا پێیەکانت بۆ پێداویستیەکانی پێغەمبەری خودا ڕۆیشتوون؟

فەرمووی: بەڵێ.

ئینجا ماچی کردن و پاشان فەرمووی: بە دەستەکانت ئاوت داوە بە پێغەمبەر؟!

فەرمووی: بەڵێ.

ئینجا ماچی دەستەکانیشی کرد و پاشان ئەنەس پێی فەرموو: ئەی سابت بەدەستی خۆم ئاوم داوە بە دەستی پێغەمبەرەو بۆ دەستنوێژەکەی و پێی فەرمووم: ئەی لاو دەستنوێژت بەجوانی بگرە تەمەنت درێژ دەکات، سڵاو لەخەڵکی بکە کردەوە چاکەکانت زۆر دەبن، قورئان زۆر بخوێنەرەوە، ئینجا ڕۆژی دوایی لەگەڵ من وەك ئەم دووانە دەبیت: – پەنجەی ناوەڕاست و شایەتومانی جوڵاند–.

ئەنەسی کوڕی مالیك لە سەردەمی معاویە و وەلیدی کوڕی عەبدولمەلیکدا هەستا چوو بۆ دیمەشق ساڵی هەشتا و شەشی کۆچی، ڕۆژێکیان لە دیمەشق کە بە تەنها بوو (زهری) چووە لای، دەگریا، پێی گووت: بۆچی دەگریت؟.

فەرمووی: هیچ شتێك نازانم لەوەی پێمان گەیشت بێجگە لەم نوێژە.

ڕاجیایی هەیە لەبارەی ساڵی مردنیەوە، وتراوە: ساڵی نەوەدی کۆچی کۆچی دوایی کرد، یان نەوەد و دووی کۆچی یاخود نەوەد و سێی کۆچی.

---

[1] .ثابت البناني: لەبەر ئەوەی پیتی (ث) لەزمانی کوردیدا نیە بۆیە لەجیاتی (ث) (س)مان داناوە.

ئەو کۆتاهەمین هاوەڵ بوو کە لە بەصرە کۆچی دوایی کرد، مردنەکەشی لە ماڵەکەی خۆیدا بوو لە (الطف)، هەر لەوێش ئەسپەردە کرا لەدوری دوو فەرسەخەوە[1] لە بەصرە، (قطن کوڕی مودریکی کیلابی) نوێژی لەسەر کرد.

ئەنەس ڕۆژەکانی حەجاج و ڕاپەڕینی ئیبن جارود و خەڵکی بەصرەشی بینی لەدژی حەجاج وەك چۆن دواتر باسی ئەوە دەکەین و کوڕەکەشی بەناوی (عبداللەی کوڕی ئەنەس) لەو ڕاپەڕینەدا بەشداربوو و تیایدا کوژرا، حەجاج ئەنەسی بە یەکێك لە پشتیوانەکانی ئیبن جارود دادەنا لەبەر ئەوەش بوو کە قسەی زبری پێدەگوت و کرداری ڕەقی بەرامبەری دەنواند و دەستی بەسەر سامانەکەیدا گرت و هەڕەشەی کوشتنی لێکرد، لە پەڕەکانی دواتردا پشت بەخودا باسی لێوە دەکەین.



---

[1] فرسخ: یەکەی پێوانەی دورییە..کە فەرسەخێك دەکاتە نزیکەی (۳ میل)، هەر (میل)ێکیش (۱٦۰۰) مەترە، کەواتە یەك (فرسخ) دەکاتە (۵۰۰۰) مەتر بەنزیکەیی...

# ئەنەس سکاڵا دەکات لای عبدالملك لەبەر ئازاردانی و هەڕەشەلێکردنی لەلایەن حەجاجەوە

ئیبن کثیر لە عەوانەی کوڕی حەکەمی کەلبیەوە باسی کردووە کە ئەنەسی کوڕی مالیك چوویە لای حەجاجی کوڕی یوسف، کاتێك چوویە بەردەمی ڕاوەستا و سڵاوی لێکرد حەجاج پێی گوت: ئێ ئێ ئەی ئونەیس[1] ڕۆژێك لەگەڵ عەلی بوویت و ڕۆژێك لەگەڵ ئیبن زوبێر و ڕۆژێکیش لەگەڵ ئیبن ئەشعەس، دە بەخوا ڕیشەکێشت دەکەم وەك ڕیشەکێشکردنی ڕەگی داروبرەخت.

ئینجا ئەنەس فەرمووی: فەرماندە هەر مەبەستی منە خوا چاکی بۆ بکات؟

ووتی: بەڵێ هەرتۆ، کەڕیی یاخوا.

ئەنەس فەرمووی: انا لله وانا الیه راجعون...دە بەخوا گەر لەبەر منداڵە بچوکەکان نەبووایە گوێم نەدەدا چۆن دەکوژرێم و بەچ مردنێم دەمرم..

پاشان لای حەجاج ڕۆیشت و نامەی نوسی بۆ عبدالملك کوڕی مەروان و ئەوەی حەجاج پێی ووتبوو پێی ڕاگەیاند، جا کاتێك عبدالملك نوسراوەکەی ئەنەسی خوێندەوە، تەواو توڕەبوو، چاوی چووە پشتە سەری، ئەوەشی بە لەخۆبایبوون زانی لە حەجاجەوە[2].

---

١ . أُنَيس... ناوی بچوککراوەی (أنس)ە و لەسەر وەزنی (فُعَيْل)ە کە ناوی بچوککراوە هەندێك جار بۆ سوککردن و کەمکردنەوەی بەرامبەر بەکاردەهێنرێت.

٢ . وەك باسمان کرد هۆکاری توڕەبوونی حەجاج لە ئەنەسی کوڕی مالیك -ڕەزای خوای لێ بێت- ئەوەبوو کە کوڕەکەی ئەنەس لەگەڵ ئیبن جارود بەشداری کردبوو لە شۆڕشەکەیدا دژی ستەمکاریەکانی حەجاج

ئەنەس بەم جۆرە نامەکەی بۆ عبدالملك نوسی بوو:

بەناوی خوای بەخشندە و میهرەبان..بۆ عەبدولمەلیکی کوڕی مەروان (ئەمیری بڕواداران).. لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە.. پاش سوپاس و ستایشی خودا .. بەڕاستی حەجاج قسەی ناشیرینی پێ ووتم و وڕێنەی دا بەگوێمدا، کە من ئەهلی ئەو شتانە نیم و شیاوی ئەو سوکایەتیە نیم)، تۆش ڕزگارم کە لەدەستی، من ماوەیەکی دوورودرێژ لەخزمەتی پێغەمبەری خوادا بووم و هاوەڵی بووم..... والسلام علیك ورحمة الله وبركاته...

هەربۆیە عبدالملك ناردی بەدوای ئیسماعیلی کوڕی عوبەیدوڵای کوڕی ئەبو موهاجیر دا – کە هاوڕێی حەجاج بوو – دوو نامەی دایە دەستی و پێی گووت: ئەم دوو نامەیەی من بگرە و بە پۆستە بیان بە بۆ عێراق، یەکەمیان بدە بە ئەنەسی کوڕی مالیکی هاوەڵی پێغەمبەری خودا – درودی خوای لەسەربێت – و سلاوی منی پێ بگەیەنە و پێی بڵێ: ئەی باوکی حەمزە، بەڕاستی نامەیەکم بۆ حەجاجی نەفرەتی نوسیوە، هەر کە خوێندیەوە گوێڕایەڵتر دەبێت بۆت لە خزمەتکار و بەردەکەت.

نامەکەی عبدالملك بۆ ئەنەسی کوڕی مالیك ئەمە بوو:

بەناوی خودای بەخشندەی میهرەبان، لە عەبدولمەلیکی کوڕی مەروانەوە بۆ ئەنەسی کوڕی مالیك خزمەتکاری پێغەمبەری خودا – درودی خوای لەسەر – لەپاش سوپاس و ستایشی خودا...نوسراوەکەتم خوێندەوە تێگەیشتم لەو سکاڵایەی کە لەحەجاج هەت بوو، من نەمناردۆتە سەرت و فەرمانیشم پێ نەکردووە خراپەت بەرامبەر بکات، گەر کاری وای دووبارە کردەوە نامەم بۆ بنوسەرەوە سزای خۆم دەبارێنم بەسەریدا و هاریکاری و پشتیوانیم بەچاکی دەگەیەنم پێت.. والسلام.

کاتێك ئەنەس نامەکەی خوێندەوە و پەیامەکەی پێ ڕاگەیشت فەرمووی: خودا پاداشتی ئەمیری بڕواداران بداتەوە کە ئەو هەواڵەی پێدام، خوا بیپارێزێت و بەهەشتی پێ ببەخشێت، هەر بەم جۆرەش بوو بیرکردنەوە و ئومێدی من سەبارەت بەو.

ئینجا ئیسماعیلی کوڕی عوبەیدولاّ بە ئەنەسی گووت: ئەی باوکی حەمزە بەڕاستی حەجاج کاربەدەستی ئەمیری بڕوادارانە و لەبەر تۆ و خانەوادەکەشت واز لە حەجاج ناهێنێت، گەر کردیە تەوق و کۆتێکەوە و هێنای بۆتۆ هەر دەتوانێ زیان و سود بگەیەنێ، کەواتە لێی نزیك بەرەوە، بەخێر و ئاشتی و بێ وەی دەژیت لەگەڵی.

ئینجا ئەنەس فەرمووی: دەیکەم گەر خوا بیەوێت.

پاشان ئیسماعیل لای ئەنەس ڕۆیشت و چوویە لای حەجاج کاتێك حەجاج چاوی پێی کەوت گووتی: بەخێر هات ئەو پیاوەی کە خۆشمەوێ و حەزم دەکرد بیبینم.

ئینجا ئیسماعیل گووتی: منیش بەخوا حەزم دەکرد چاوم پێت بکەوێت، بەلاّم نەك بۆ ئەو پەیامەی بۆم هێناویت، ئینجا ڕەنگی حەجاج گۆڕا و گووتی: چیت هێناوە بۆم؟

گووتی: کە ئەمیری بڕوادارانم جێهێشت لەهەموو خەڵکی زیاتر لێت تووڕە و دوور بوو، ئینجا حەجاج بەترسێکەوە کە دانیشتبوو خۆی قنج کردەوە ، پاشان ئیسماعیل تۆمارەکەی بۆ فڕێدا (نامە پێچراوەکەی بۆ فڕێدا)، وای کرد کە حەجاج سەیری بکات جارێك و عارەق بکاتەوە، جارێکی تر سەیری ئیسماعیل بکاتەوە، کاتێك کردیەوە، ووتی: بمانبە بۆلای باوکی حەمزە (ئەنەسی کوڕی مالیك) داوای لێبووردنی لێ بکەین و ئاشتی بکەینەوە.

ئیسماعیل پێی گووت: پەلە مەکە.

حەجاج گووتی: چۆن پەلە نەکەم لەکاتێکدا تۆ ئەم بەلاّیەت بۆ هێناوم؟!.

وە نامەکەی عبدالملك بۆ حەجاج بەم جۆرە بوو:

بەناوی خوای گەورە و میهرەبان.. لە عەبدولمەلیکی کوڕی مەروان ئەمیری بڕوادارانەوە بۆ حەجاجی کوڕی یوسف: ...تۆ بەندەیەکی بەزرکراینەوە کەچی لەڕێی خۆت لاتدا و لە سنوری خۆت تێپەڕیت، بەدوای وەیدا دەگەڕێی، کەواتە دەتەوێ بمشکێنی و لەناوم بەیت، گەر ڕێت پێ بەم پێت ڕادەکێشی و ئەگەریش ڕێم پێ نەدایت دەگەڕێیتەوە دواوە، خوا نەفرەتت لێدەکات لەبەر ئەو بەندە چاوکزبووە پیرە.

ئەی کوڕی فلان، دە بەخوا وەك شێر پەلاماری ڕێوی بدات و باز پەلاماری کەروێشك بدات دێم بۆت ، تۆ هەڵت کوتاوەتە سەر پیاوێك لە هاوەڵانی پێغەمبەر دروودی خوای لەسەربێ بەدیارچاوی ئێمەوە، چاکەکانی وەرناگری و لەخراپەکانیشی چاوپۆشی ناکەیت، ئەوە نەترسی تۆیە لە خوای گەورە، هەروەها سوکایەتی کردنە بە پەیمان و خەلافەت.

بەخوا جولەکە و گاور گەر پیاوێکیان بدیایە خزمەتی عوزەیری کوڕی عەزرا و عیسای کوڕی مەریەمی کردبایە ڕێزیان لێدەنا و و بەگەورە تەماشایان دەکرد، چۆن تۆ ئەمە لەگەڵ ئەنەسی کوڕی مالیك دەکەی کە خزمەتکاری پێغەمبەری خوابووە و هەشتا ساڵ تەمەنیەتی ، پێغەمبەر –دروودی خوای لێبێت– نهێنیەکانی پێ دەگوت و لەکاروبارەکانیدا ڕاوێژی پێ دەکرد ئەو لەگەڵ ئەوەشدا یەکێکە لەو هاوەڵانەی کە ماونەتەوە تا ئەم کاتە.

کە ئەم نوسراوەی من دەخوێنیتەوە لە گوێرەوی و نەعلەکەی کەچ تر بە بۆی، ئەگەرنا لەمنەوە تیرێکی تیژی تەمبێکەرت بۆ دێت و بەمردن تەمبێت دەکات، ﴿لِكُلِّ نَبَإٍ مُسْتَقَرٌّ وَسَوْفَ تَعْلَمُونَ﴾[1].

ئیمام ئەحمەد گێڕاویەتیەوە لە (ئیبن عدی)ەوە فەرمووی: سکاڵامان بردە لای ئەنەسی کوڕی مالیك سەبارەت بەوە ڕەفتار و کردارانەی لە حەجاج بەدی دەکەین، فەرمووی: ئارامگرن ساڵ لەدوای ساڵ و ڕۆژ لەدوای ڕۆژ ئەوەی بەدوایدا دێت خراپتر دەبێت لەوەی پێشو، هەتا دەگەڕێنەوە بۆ لای خوا... من ئەوەم لە پێغەمبەرەکەتان بیستووە – دروودی خوای لێبێت – .

---

[1]. الأنعام: ٦٧. بۆ ڕاڤەی ئایەتەکان سەیری تەفسیری ئاسان بکە

سوفیانی سەوری[1] لە ئیسماعیلی کوڕی ئەبو خالیدەوە ئەویش لە شەعەبیەوە فەرمووی: ڕۆژێك دێت خەڵکی درود و ڕەحمەت بۆ حەجاج بنێرن ، شەعەبی فەرمووی: دە بەخوا گەر کەوتنە ئەو ڕۆژە ئاوات بە حەجاج دەخوازنەوە.

ئەصمەعی دەفەرموێت: بە حەسەنی بەصرییان گووت: تۆ دەڵێیت ئەوەی دواتر دێ خراپترە لەوەی پێش خۆی، ئێ مەگەر ئەمە عومەری کوڕی عەبدولعەزیز نیە لەپاش حەجاج.

حەسەن فەرمووی: بێگومان دەبێ خەڵکیش هەناسەیەك بدەن.

(مەیمونی کوڕی مهراب) ووتی حەجاج ناردی بەدوای حەسەنی بەصریدا ئەویش چوو بەدەمیەوە و کاتێك چووە بەردەمی و ڕاوەستا فەرمووی: ئەی حەجاج لەنێوان تۆ و ئادەمدا چەند پشت هەیە؟

وتی: زۆر.

فەرمووی: دەی لەکوێن؟

ووتی: مردن.

ئیدی حەجاج سەری داخست و حەسەنیش ڕۆیشتە دەرەوە.

ئەیوبی سەختیانی فەرمویەتی کە حەجاج چەند جارێك ویستویەتی حەسەنی بەصری بکوژێت بەڵام خوا پاراستویەتی لەدەستی.

چەندین گفتوگۆی لێ دەگێڕنەوە کە حەسەن لەو کەسانە نەبووە کە دەرچون و لادان لە خەلافەتەکەی حەجاج بە باش بزانێت، بگرە هاوەڵەکانی ئیبن ئەشعەسی قەدەغە دەکرد لەو کارە، بەڵام کاتێك چووە ناویشیان بەنابەدڵ دەچوو، دەیفەرموو ئەو حەجاجە

---

١ سفیان الثوري: لەبەر ئەوەی پیتی (ث) لەزمانی کوردیدا نیە بۆیە لەجیاتی (ث) (س)مان داناوە.

نیقمەتە ( پێ نواندنی خواییە)، کەواتە بە شمشێر ڕووبەڕووی نیقمەتی خودا مەبنەوە بەڵکو ئارام بگرن و بپاڕێنەوە.

لە ئیبن عائیشەوە فەرمووی: پیاوێك لە هەڵگەڕاوەکان هێنرا بۆلای وەلیدی کوڕی عبدالملك و پێیان وت: چی دەڵێی لەبارەی ئەبوبەکر و عومەرەوە؟

ئەویش ستایشی کردن و بە باشە باسی کردن.

ئینجا گوتی: ئەی عوسمان..دیسان بە باشە باسی کرد... هەتا پێی گوترا: ئەی عەبدولمەلیکی کوڕی مەروان؟ فەرمووی: ئێستا کاتی هاتووە بڵێم حەجاج یەکێکە لە هەڵەکانی[1].

ئەصمەعی دەگێڕێتەوە: ئافرەتێکی خەواریجیان هێنا بۆلای حەجاج و حەجاج هەر قسەی لەگەڵ دەکرد و ئەویش نە سەیری دەکرد و نە وەڵامی دەدایەوە، هەندێك لە پاسەوانەکانی حەجاج وتیان فەرماندە قسە لەگەڵ تۆ دەکات و تۆش ڕوی تێناکەیت.

فەرمووی: من شەرم دەکەم لەخوا کە سەیری کەسێك بکەم خودا سەیری ناکات.

ئینجا فەرمانی کرد کوشتیان.

هەروەها دەگێڕنەوە: بە سەعیدی کوڕی جوبەیریان گووت: ئایا لەفەرمانڕەوایەتی حەجاج لاتدا و هەڵگەڕایتەوە؟

فەرمووی: لاریم نەبوو لە فەرمانڕەوایەتیەکەی هەتا بوویە بێ باوەڕ.

دەڵێن: حەجاج لەدوای ئەو تەنها یەك پیاوی کوشت ناوی (ماهان) بوو، هەندێکیش دەڵێن کەسی نەکوشت، بەڵام پێش ئەوە خەڵکانێکی زۆری کوشت، زۆرترینیان لەوانە بوون کە لەگەڵ ئیبن ئەشعەسدا لایان دا لە فەرمانڕەوایەتی حەجاج.

هیشامی کوڕی حەسان فەرموویەتی: بە لەسەرخۆیی ئەو کەسانەی حەجاج کوشتونی بژمێرن ژمارەیان گەیشتۆتە سەد و بیست هەزار کەس.

---

[1] البدایة والنهایة. سەرچاوەی پێشو

ئەصمەعی دەڵێت: گێڕایانەوە کە سولەیمانی کوڕی عبدالملك لە یەك بەیانیدا هەشتا و یەك هەزار دیلی بەردا، لەدوای مردنی حەجاج بەندیخانەکانیان کردەوە بینیان سی و سێ هەزار بەندیی تیایە، یەکێك لەوانەی کە بەندکرابوو دەشتەکیەك بوو، بینیبوویان لەبنی گەوڕێکی شاری واسیت دا میزدەکات، یەکێك بوو لەوانەی ئازادکرا و ئەم هۆنراوەیەی گوت:

**اذا نحن جاوزنا مدينة واسط　　　　خرينا وصلينا بغير حساب**



٧

# شەڕکردنی حەجاج لەگەڵ خەواریجەکاندا

- خەواریجەکان... سەرهەڵدان و گێرەشێوێنیەکانیان بەدرێژایی سەردەمەکان

- شەڕکردنی (مهلب کوڕی ئەبو یوفرە) لەگەڵ خەواریجەکانی ئەزاریقە

- شەڕکردنی حەجاج لەگەڵ خەواریجەکانی یوفریە.

- شۆڕشەکەی (شەبیبي کوڕی یەزیدی شەیبانی)...کە سەرەڕای کەمی ژمارەشیان ترسناکترین بزوتنەوەکانی خەواریج بوون.

# خەواریجەکان.... سەرهەڵدان و گێرەشێوێنیەکانیان بەدرێژایی سەردەمەکان

خەواریجەکان کۆمەڵەیەکی ئیسلامی بوون لەسەردەمی خەلیفەی ڕاشیدین عەلی کوڕی ئەبو تالیبدا سەریان هەڵدا، لەسەرەنجامی ململانێی لەگەڵ موعاویەی کوڕی ئەبو سوفیاندا پاش سەرکەوتنی ئیمامی عەلی – ڕەزای خوای لێبێت - لەشەڕی (صەفین)دا، کە ئەوانیش لە پشتیوانانی ئیمام بوون، پاشان دەرچون و هەڵگەڕانەوە لە خەلافەتەکەی بەهۆی ئەوەی کە ڕازی بوو بە (تحكیم) ناوبژیکردن، ئەگەرچی خۆیان لە پشت وەستانی شەڕەکەشەوە بوون.

ئەم کۆمەڵەیە کە دواتر زۆر بەشی تریان لێ بوویەوە، بەوە ناوزەد دەکرێن کە پابەند بوون بە بیروباوەڕی خۆیانەوە و لەوانەش بوون کە قورئانیان لەبەر دەکرد، هەروەها بەیعەتیان دا بە ئیمامی عەلی ڕەزای خودای لێبێت.

پاش بەزین و شکانی معاویە لە جەنگی صەفین دا سەربازەکانی شام و معاویە بەپەلە ڕێگایەکیان گرتە بەر بۆ چارەسەری دۆخەکە و قورئانەکانیان بە نوکی ڕم و شمشێرەکانیان بەرزکردەوە و داوای ( تحكیم[1] –ناوبژی)یان دەکرد، هەربۆیە ئیمامی

---

[1] - تحكیم : (ناوبژی) : بەوە دەگوترێت کە لەنێوان دوو لایەنی بەشەڕهاتوودا کەسێك یان چەند کەسێك بڕیاربدەن و بکەونە بەینیانەوە بە مەبەستی چارەسەری دۆخەکەیان .. . ئەوەی کە لە مەسەلەی ناوبژیکردنی عەلی و معاویەدا باس دەکرێت ئەوەیە کە هەردوولا کاتێك بەشەڕهاتن لەجەنگی صەفین دا خوێنێکی زۆر ڕژا و زۆر کەس بوونە قوربانی هەربۆیە موسوڵمانان زۆر بەم دۆخە نامۆڕەتاح بوون و ئارام نەبوون بەبینینی ڕەوشەکە و ترسان لەوەی بەتەواوی موسوڵمانان لەناوبچن و یان لاوازبن و ئیدی دوژمنان بەسەریاندا زاڵ بن، بۆیە چەند

عەلی – خوا لێی ڕازی بێت – داواکەی پەسەند کردن و ڕازی بوو کە قورئانی پیرۆز ناوبژییان بکات.

هەندێك لە شوێنکەوتوانی ئیمامی عەلی دەرچوون لە فەرمانەکەی و دروشمی (أنَ الحکم الاّ باللّه)یان بەرزکردەوە، واتە حوکم تەنها هی خودایە...ئیمامی عەلی بەم ووتەیە وەڵامی دانەوە: ئەوە قسەیەکی ڕاستە و مەبەست لێی شتێکی ناڕاستە ((انّها کلمة حق یراد بها باطل))، ئەوانیش سەرەنجامی (ناوبژی)ەکەیان پەسەند نەکرد، داوایان کرد شەڕ بەردەوام بێت، بەڵام ئیمامی عەلی داواکەیانی پەسەند نەکرد و پێی فەرموون: بەڵا لێتان دا ئایا پاش ڕازی بوون و گفت و پەیمان پەشیمان ببمەوە! ئایا پاش ئەوەی بەڵێن نامەیەکمان نوسی ئێستا هەڵی بوەشێنینەوە، ئائەمە کارێکی ناڕەوایە.

هەربۆیە ناوی (خەواریجەکانیان لێنرا، فەرمانده‌یەکیان بۆخۆیان هەڵبژارد، کە یەکێك بوو لە هاوەڵان ئەویش عبداللەی کوڕی وەهەبی ڕاسبی بوو لە ئێزد[1]

ناوی خۆیان نا بڕوداران – کۆمەڵەی بڕواداران یان کۆمەڵە بڕوادارەکە، ئەیارە سیاسی و فیکریەکانیشیان ناوی (خەواریجەکان)یان لێنان کە بە کوردی دەتوانین بڵێین

---

ژیر و زانایەکیان پێشنیاری (تحکیم) ناوبژیان کرد بەتایبەت پاش ئەوەی سوپاکەی شام بەن با ملێن معاویە خەریك بوو بەتەواری شکست بێنن.. ئەوەبوو لە دەستەی معاویەدا (عەمری کوڕی عاص) و لە دەستەی عەلی ئەمیری بڕوادارانیش دا (ئەبو موسای ئەشعەری) دانران بۆ گفتوگۆ و دانوستان و نوسینی چەند بڕیار و مەرج و حوکمێك وەك دوو ناوبژیوانی متمانە پێکراو کە دەبێت هەردوولا پابەند بن پێیەوە و بەسەرەنجامی ناوبژیەکە ڕازی بن. شیاوی ناسە هەردوو ناوبژیوانەکە لەخواترس و زانا و دانپەروەر بوون بەڵام چەند کەسێك لە کۆمەڵەکەی پێشەوا عەلی – خوا لێی ڕازی بێت به ناوبژییەکە قایل نەبوون و وتیان چۆن تا خودا وەستابێت پیاوەکان بۆیان هەیە ناوبژی بکەن و حوکم بکەن. . هیچ بڕیار و فەرمانێك بێجگە لەهی خوا ڕاست نیە – گەرچی پێشەوا عەلی ناوبژیکردنی بە قورئان و سوننەت مەبەست بوو نەك ئەوەی کە خەواریجەکان لێی تێگەیشتبوون– ئەوان پێیان وابوو کە ئیمامی عەلی لەسەر حەقە و معاویەش – خوا لێی ڕازی بێت– دەبێت شەڕی لەگەڵ بکرێت تا کۆتایی...هەربۆیە لە فەرمانی پێشەوا عەلی دەرچوون و ناوی (خەواریج)یان بەسەردا برا.

[1] .أزد.

(هەڵگەڕاوەکان یان دەرچووەکان)، لەبەر دەرچونیان لە ڕای پێشەوایانی ڕاست و دادگەر و شۆڕشە زۆرەکانیان، کاتێك ئەم ناوە بڵاوبوویەوە، پەسەندیان کرد، بەڵام بەو جۆرە لێکیان دایەوە کە گوایا دەرچونەکەیان دەرچوونە لە ڕای پێشەوایانی ستەمکار و تاوانبار و لاواز، کارەکەشیان وەك جیهاد لەپێناوی خوادا لەقەڵەم دا.

هەروەها پێشیان دەوترا: (حەروری) یان (حەروریەکان)، کە ئەم ناوە لەناوی ئەو شوێن و مۆڵگانەوە وەرگیرابوو کە مەشقیان تیا دەکرد و لێی کۆدەبوونەوە و شۆڕشەکانیان درێژە پێ دەدا، هەروەها ناوی خۆیان نابوو (کڕیاران)، بەو پێودانگەی کە گیانی خۆیان دەفرۆشن لەدونیادا و بەهەشتی پێ دەکڕن لە دواڕۆژدا.

ئەوان مەرجیان ئەوەبوو جێنشینی و خەلافەت دەبێت کەسی چاکەخواز و چاکەکار بیگرێتە دەست بە چاوپۆشین لەوەی کە ئایا ڕەگ و ڕەچەڵەکی کێ یە و چیە، ڕەنگی چۆنە لە قورەیشە یان نا.

خەواریجەکان –هەڵگەڕاوەکان[1]– کۆدەنگ بوون لەسەر واجب بوونی ڕاپەڕین لەدژی پێشەوایانی ستەمکار و تاوانبار و لاواز، دەیانگوت پێویستە لە ڕایان دەربچیت ئەگەر ژمارەی دژە ڕاکانیان گەیشتە چل پیاو، بەمەشیان دەوت (سنوری کڕیاران) واتە ئەوانەی کە بەهەشتیان بەگیانیان کڕی، ڕەوا نیە ڕاپەڕیوان دابنیشن مەگەر ژمارەکە لە سێ پیاو کەمتری کرد، جا گەر لە سیان کەمتر بوون، ئەوا دەتوانن دابنیشن و باوەڕەکەیان بشارنەوە.

هەڵگەڕاوەکان بە خەلافەتی ئەبوبەکری صدیق و عومەری کوڕی خەتاب ڕازین، هەروەها خەلافەتی عوسمانی کوڕی عەففانیش تاکو پێش شەش ساڵی کۆتایی، لەو شەش ساڵەی ناڕازین و پشتیان تێکردووە، (پێیان وایە خزمایەتی دەکرد و کاری پێ سپاردن و

---

[1]. ئەگەرچی وشەی (هەڵگەڕاوەکان) لە پەرتوکە کوردیەکاندا بۆ ئەو کەسانە بەکارهێنراوە کە موسوڵمان دەبن و دواتر لەدینی ئیسلام پاشگەز دەبنەوە.. بەڵام دەتوانین بۆ (خەواریجەکان)یش هەمان زاراوە بەکوردی بەکاربێنین چونکە ئەوانیش سەرەتا بەشێك یان خەلافەتی کەسێك ڕازی دەبوون و دواتر لێی هەڵدەگەڕانەوە.

ماڵی زۆریشی بەسەردا ڕژاندن لە بیت المال)، هەروەها باوەڕیان بە ئیمامی عەلیش نەما و بەکافریان دانا پاش ڕوداوی ناوبژییەکە.

ڕاجیابوون لە جۆری ئەم بەکافرکردنەیدا، هەندێکیان کافریان کرد (بەکوفری هاوبەشی پەیداکردن) لە دیندا، هەندێکی تر کافریان کرد (بە کوفری نیعمەت و بەخششەکان) بە تەنها، واتە پێنەزانی و سپڵەیی بەرامبەر نیعمەت و بەخششە خواییەکان لە ئەرکەکانی جێنشینیدا، هەریەوجۆرە بەیەکسانی خۆیان بێ بەری دەکرد لە نەیارەکانیان لە هاوەڵانی ڕوداوی (جەمەل) (زوبێر و تەڵحە و عائیشە) و هاوەڵانی جەنگی (صەفین) معاویە و یاوەرانی.

خەواریجەکان بیرۆکەی (هەڵبژاردن و بەیعەت دان)یان کردۆتە بنەما؛ بەریەرچی ئەوانە دەدەنەوە کە دەڵێن پێشەوایەتی کارێکە لە کاروبارەکانی ئاسمان یان پلە و پایەیەکی ئاسمانیە، پێشەوایەتی لای ئەوان لە بەشەکاندایە (فەرع) نەک پایەیەک بێت لە پایەکانی دین (أصول الدین).

هەڵگەڕاوەکان ئەوانەی کە تاوانی گەورەیان ئەنجامداوە و پێش ئەوەی تۆبە بکەن دەمرن، بەکافریان لە قەڵەم دەدەن و دەڵێن تا هەتایە لە ئاگردا دەمێننەوە، ئائەمەش ناکۆکیی سەرەکیان بوو لەگەڵ ئەهلی سوننەتدا، سەرباری شەڕکردن لەدژی عەلی، ئەو بیرۆکردنەوەیەش لە ململانێی فیکری و چەکداریشیاندا ڕەنگی دابوویەوە دژی بەنو ئومەییە، کاتێک پرسی ئەو فەرمانڕەوایانە سەری هەڵدا کە گوناه و ستەمی گەورەیان کردبوو.

هەڵگەڕاوەکان یەک دەنگ بوون لەسەر ئەوەی خودا ستەم ناکات، بەمانای ئەوەی هێزی نەگۆڕ و توانستی کاریگەر و پاشانیش بڕیاری ئازادی و هەڵبژاردنیشی بەمرۆڤ داوە.

هەڵگەڕاوەکان دیسان کۆک بوون لەسەر ئەوەی زاتی خودا دوربخەنەوە لەهەر لێکچواندنێکی بە داهێنراو و دروستکراوەکان، لەوەشەوە چوون بەرەو ئەوەی گوتیان قورئان مەخلوقی خودایە.

هەروەها هەڵگەڕاوەکان گوتیان خودا مژدەی خۆی دەباتە سەر لەگەڵ گوێڕایەڵان و بەڵێنی سزاشی لەگەڵ سەرپێچیکاراندا بەجێ دێنێت، بەبێ ئەوەی پەیمان و بەڵێنەکانی دوابخات یان بگۆڕێت بەهەر هۆیەک لە هۆیەکان.

هەڵگەڕاوەکان بۆ بنچینەی فەرمان بەچاکە و ڕێگری لە خراپە پەیوەندیەکی پتەویان دروست کرد لەگەڵ گۆڕینی زۆر و ستەمدا و شۆڕش بەسەر فەرمانڕەوای گەندەڵ دا.

هەڵگەڕاوەکان بەناوبانگ بوون بە توانا جەنگیەکانیان و ماڵ و سامان نەویستییان و حەزنەکردنیان بە کۆکردنەوەی ماڵ و سامان، وەک چۆن بەوە بەناوبانگ بوون کە زۆر پەرستشی خودایان دەکرد و سیفەتی ئازایەتیان تێدابوو، کەوای کردبوو تەنانەت نەیارەکانیان لە پەرتوکەکانیاندا ئەم سیفاتانەیان تۆمار بکەن.

هەڵگەڕاوەکان لەبەرەی دادگەری و بەرەنگاربوونەوەی زۆر و ستەم و پارێزگاری کردن لە لاوازەکاندا دەوەستان، هەر لەو بوارەشدا ڕاپەڕینیان دژی ئەمەوی و کاربەدەستەکانیان ئەنجام دا و چوونە ریزی ژێردەستەکانەوە لە فارس و ئەمازیغی و خەڵکی باکوری ئەفریقا، هەڵگەڕاوەکان ئازایەتی و لەخواترسانیان کردبوویە مەرج لەسەر سەرکردەکانیان و گفت و بەیعەتیان پێدەدان لەسەر مردن، هەروەها نازناوی ئەمیری برواداریان لێدەنان، شەڕیان دژی نەیارەکانیان یەکێک بوو لەو شەوق و پەرۆشیانەی کە سەرنجی ڕادەکێشان بۆ قوربانی و بەرخۆدانی زیاتر، ئەوان خۆیان بە موسوڵمانانی ڕاستەقینە دەزانی نەک خەڵکی تر، ئەوانەش کە دژایەتیان دەکردن بێ باوەڕ بوون لای ئەمان و کوشتنیان بە کارێکی ڕەوا دەزانین.

لەدیارترین سەرکردەکانی خەواریج بەدرێژایی مێژوو:

- عبدالله کوڕی وەهەبی ڕاسبی، لە (أزد) ئەزد.
- (حوثرة) کوڕی (وداع) کوڕی (مسعود)، لە (أسد).
- (المستورد) کوڕی (علقه) کوڕی زەید کوڕی (مناه) لە (تیم الرباب).
- زحاف (طائي) لە (طيء).

- (قريب) کوڕی (مُرّة)، لە (أزد).
- (حبان) کوڕی (ظبيان السلمي).
- ئەبو بلال مرداس کوڕی (أدية المريعي الحنظلي)، لە (تميم).
- (زوبێر)ی کوڕی (علی السليطي) لە (بكر بن وائل).
- (ثابت التمار) لە (العوالي).
- ئەبو فديك، (عبدالله بن ثور بن قيس بن ثعلبة بن تغلب).
- (ابو الضحاك شبيب بن يزيد بن نعيم بن قيس الشيباني).
- (أبو نعامة قطري بن الفجاءة الكناني المازني) لە (تميم).
- (عبد ربه)ی بچووك، یەكێك لە ژێردەستەكانی (قيس بن ثعلبة).
- (أبو سماك)، (عمران بن حطان الشيباني الوائلي).
- عبداللەی کوڕی یەحیا کوڕی عومەری کوڕی ئەسوەد، لە (كندە).

کە ئەمانە ڕاپەڕین و شۆڕشی بەردەوامیان هەبوو دژی ئەمەویەکان و پێش ئەوانیش عەلی – خوای لێ ڕازی بێت – .

**جەنگەکانیان دژی ئیمامی عەلی – خوای لێ ڕازی بێت – ئەمانە بوو:**

١– شەڕی (نهروان): ڕەمەزانی ساڵی ٣٧ك، بەسەرکردایەتی یەکەمین فەرماندەیان: عبداللەی کوڕی وەهەبی ڕاسبی، کە تیایدا تێکشکان.

٢– دسکەرە لە (خۆراسان) : ڕەبیعی دووەمی ساڵی ٣٨ك، بە سەرکردایەتی : (أشرس بن عرف الشيباني)، تیایدا شکان.

٣–(ماسبذان) لە (فارس): جەمادی یەکەمی ٣٨ك، بەسەرکردایەتی: هەلال کوڕی (علفه)، تیایدا شکان.

٤– جرجرایا لەسەر ڕووباری دیجلە: ٣٨ك، بەسەرکردایەتی: (الأشهب بن بشر البجلي).

٥-لەسەر دەروازەکانی کوفە: ڕەمەزانی ساڵی ٣٨ك، بەسەرکردایەتی: (أبو مريم)، لە (بنی سعد تميم)، تيايدا شکان.

هەروەها هەستان بە ڕێکخستنی پیلانێك بۆ کوشتنی ناڕەوای ئیمامی عەلی و عەمری کوڕی عاص و معاویەی کوڕی ئەبو سوفیان، لەم پیلانە عەمر و ئەبو سوفیان ڕزگاریان بوو و ئیمامی عەلی شەهید کرا بەدەستی (عبدالرحمن بن ملجم).

پاش شەهیدکردنی عەلی و سازشکردن و وازهێنانی (حەسەن)ی کوڕی لە خەلافەت و دەستبەرداربوونی بۆ معاویە جەنگی هەڵگەڕاوەکان دەستی پێکرد لە خەڵکی شام، لە یەکەم ڕووبەڕووبوونەوەدا خەریك بوو سوپای معاویە تێك بشکێنن گەر پشتگیری خەڵکی کوفە نەبووایە.

هەروەها چەندین شۆڕشی بەردەوامیان دژی فەرمانڕەوایەتی بەنو ئومەییە ئەنجام دا و هەر ئەوانیش هۆکاری سەرەکی بوون لە ڕوخانی دەسەڵاتی ئەمەویەکاندا.

دیاترین ئەو شۆڕشانەی کە دژی بنەماڵەی ئەمەویەکان کردیان ئەمانە بوون:

١- یاخی بوونێکی ناوخۆیی دژی بنەماڵەی ئەمەویەکان ساڵی ٤١ك دەستی پێکرد بە سەرکردایەتی (سهم بن غالب التميمی) و (خطيم الباهلی) تاکو ساڵی ٤٦ك، کە (زياد بن أبيه) ئەم یاخی بوونەوەی دامرکاندەوە و کۆتایی پێهێنان.

٢- لە سەرەتای شەعبانی ٤٣ك، هەڵگەڕاوەکان بەسەرکردایەتی (المستورد بن علفه) کە فەرماندەیان بوو چون بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی سوپاکەی معاویە.

٣- لە ساڵی ٥٠ك، لە بەصرە کۆمەڵەیەك بەسەرکردایەتی (قريبی الأزدي) ڕاپەڕین

٤- لە ساڵی ٥٨ك، خەواریجەکان لە (بنوعبدالقيس) ڕاپەڕین و شۆڕشەکەیان بەردەوام بوو تا ئەوکاتەی سوپاکەی عبداللەی کوڕی زیاد لەناوی بردن.

٥-لەساڵی ٥٩ك، بە سەرکردایەتی (حبان بن ظبيان السلمی) شۆڕشیان بەرپاکرد و شەڕیان کرد هەتا هەموویان کوژران لە (بانقيا)ی نزیك مەککە.

٦-لەساڵی ٦١ك، ئەو شەڕە ڕویدا کە تیایدا (أبو بلال مرداس بن أديه) کوژرا، کوژرانیشی بوویە هۆی زیادکرنی پشتیوانەکانی خەواریج.

٧-پاشان لە بەصرە بەسەرکردایەتی (عروه بن أديه) دەستیان بە یاخی بوون و ڕاپەڕین کردەوە.

٨-هەر لە بەصرە بە سەرکردایەتی (عبيده بن هلال) ڕاپەڕین.

٩-لەکۆتاییەکانی شەوالی ساڵی ٦٤ك، شۆڕشە گەورەکەی خەواریجەکانی ئەزاریقە دەستی پێکرد بەسەرکردایەتی (نافع بن الأزرق)، ئەو شۆڕش و ڕاپەڕینەش بە شکاندنی دەرگاکانی بەندیخانەکانی بەصرە دەستی پێکرد بەرەو ئەهواز.

١٠- لە ساڵی ٦٥ك لە (یەمامە) بەسەرکردایەتی (أبی طالوت) ڕاپەڕین.

١١- لە شەوالی ساڵی ٦٦ك ڕوبەڕوی سوپاکەی (مهلب کوڕی ئەبو صفره) بوونەوە لە ڕۆژهەلاتی ڕوباری (دجیل) دوجەیل دا.

١٢- لە ساڵی ٦٧ك بەسەرکردایەتی (نجده بن عامر) شۆڕشیان بەرپاکرد و دەستیان گرت بەسەر چەند بەشێکی یەمەن و (حضرموت) و بەحرەین دا.

١٣- لە سەرەتاکانی ساڵی ٦٨ك خەواریجەکانی ئەزاریقە شەڕیان بەرپاکرد و پەلاماری کوفەیان دا.

١٤- لە ساڵی ٦٩ك دەستیان گرت بەسەر چەند ناوچەیەکی دەروبەری ئەصفەهان دا و ئاماوەیەکی دوورودرێژ لەژێر ڕکێفی خۆیاندا مایەوە.

١٥- لە ساڵی ٦٩ك لە ئەهواز شەڕیان بەرپاکرد بە سەرکردایەتی (قطری بن الفجاءة).

١٦- لە کۆتایی شەعبانی ساڵی ٧٥ك دژی (مهلب کوڕی ئەبو صفره) جەنگیان بەرپاکرد و کاتێك تێکی شکاندن کشانەوە بەرەو فارس.

١٧- لە مانگی صەفەری ٧٦ك لە (داریا) شۆڕشیان بەرپاکرد بە سەرکردایەتی (صالح کوڕی مسرح) و لە خاکی (المدبج) دا لە (موصل) شەڕیان کرد.

١٨- هەروەها لە ساڵی ٧٦ك و ٧٧ك توانیان بە سەرکردایەتی (شبیب کوڕی یەزید کوڕی نعیم) چەند شکستێك بەسەر سوپاکەی حەجاجی کوڕی یوسفی سەقەفی دا بهێنن.

١٩- پاشان شۆڕشەکەیان دووبارە بوویەوە بە سەرکردایەتی (شوذب) و لە کوفە ڕژایەتی فەرمانڕەوایەتی یەزیدی دووەمیان کرد.

٢٠- وە لە سەردەمی (هشام بن عبدالملك) دا تێهەڵچوونەوە و لە موصلٌ بە سەرکردایەتی (بهلول کوڕی بسر) ڕاپەڕین، پاشان بەسەرکردایەتی (الصحاری بن شبیب) بەجۆرێك چوون بەگژ نەیارەکانیاندا لە (مناذر) لە دەورووبەری (خوراسان).

٢١- هەروەها لەڕەجەبی ساڵی ١٢٧ك دا خەواریجەکان لە کوفە بە سەرکردایەتی (ضحاك کوڕی قیسی شەیبانی) ڕووبەڕوی ئەمەویەکان بوونەوە و بەسەریاندا سەرکەوتن، ، ژمارەشیان سەد و بیست هەزار جەنگاوەر بوو، لەم سوپایەدا ئافرەتانێکی زۆر بەشداربوون و شەڕیان دەکرد، ، لە (واسط)یش شەعبانی ساڵی ١٢٧ك هەمان حاڵەت ڕوویدا.

٢٢- لە ساڵی ١٢٩ك لە یەمەن شۆڕشیان بەرپاکرد بە سەرکردایەتی (عبدالله یەحیا کەندی)؛ دەستیان گرت بەسەر (حضرموت) و (یەمەن) و (صەنعا)دا و سوپایەکیشیان نارد بە سەرکردایەتی (أبی حمزه الشاری) چووە مەککە و لە مەدینەش سەرکەوتن تائەو کاتی سوپای ئەمەویەکان تێکیان شکاندن کە لە شامەوە بۆیان هاتن لە جەمادی یەکەمی ١٣٠ك دا.

خەواریجەکان یاخود هەلگەڕاوەکان لە هەندێك پرس و لق دا (المسائل و الفروع) بەش بەش بوون و لە بنچینە فیکریەکانیشیاندا بەکۆدەنگی مانەوە، دابەشبوون بەسەر:

١- (الأزارقة): ئەوان شوێنکەوتووانی (نافیع کوڕی ئەزرەق) بوون، بڕیاریان دا کە دیار رەهەواری نەیارەکان دیار و هەواری بێ باوەڕیە، هەرکەس تیایدا نیشتەجێ بێت ئەوە (بێ باوەڕە)، دەیانگووت: منداڵی بێ باوەڕان لە ئاگردا بە نەمری دەمێننەوە، هەروەها نکوڵیان دەکرد لەوەی زیناکار (داوێن پیس) ڕەجم بکرێت، (حەد)یشیان بۆ ئەو کەسە دانابوو کە تۆمەتی زینا دەداتە پاڵ ئافرەتی داوێن پاك بەبێ ئەو کەسەی کە پیاوی

داوێن پاك تۆمەتبار دەكات بەزینا. هەروەها دەستی دزیان دەبڕی بە بێ ئەوەی جیاوازی بکەن لەنێوان ئەوەی شتە دزراوەکە کەم بێت یان زۆر.

٢- (النجدات) ئەوانیش شوێنکەوتوانی (نجده بن عامر الحنفی) بوون دەیانگووت دین دوو شتە:

أ - ناسینی خوا و پێغەمبەرەکەی و قەدەغەکردنی خوێن وماڵی موسوڵمانان.

ب- دان نان بەوەی لای خوداوە هاتووە بە گشتی.

جگە لەوانە لە حەلاڵ و حەرام و شەریعەتەکان هەرکەس بەسەزانی بیانکات ئەوا بەخشراوە چونکە لە دیندا نیە، دەیانگووت ئەوەی بەردەوامە لەسەر تاوان و سەرپێچی جا تاوانەکەی گەورەبێت یان بچوك کافرە.

٣- (الإباضیة) ئەوانیش شوێنکەوتووانی (عبدالله بن إباض) بوون، کەمترین زیادەڕۆیی و توندڕەوییان هەبوو لەچاو هەڵگەڕاوەکانی تردا، زۆرترین میانەڕەوی و هاوسەنگیشیان هەبوو، لای ئەوان کوفری ئەو کەسەی کە تاوانە گەورەکان دەکات (کوفری نیعمەت)بوو نەك (کوفری شیرك)، هەروەها پێیان وانەبوو منداڵی بێ باوەڕان لە دۆزەخدا بمێننەوە.

٤- (الصفریه) : ئەوانیش شوێنکەوتوانی (زیاد الأصفر) یان (نعمان بن الأصفر) یان (عبدالله بن صفار) بوون،وەکو (ئەزارقەکان) وابوون، تەنها لەوەدا پێچەوانەی ئەوان بوون کە لای ئەوان قەدەغەبوو ئەو منداڵانە بکوژن کە لە بیروباوەڕدا نەیار و ناکۆکیانن.[1]

گروپ و کۆمەڵەی هەڵگەڕاوەکان زۆر زۆرن کە پەرتوك و نوسراوەکان باسیان لێوە کردووە و هێشتاش ئەوانە هەر بەردەوامن لە هەڵگەڕانەوە و دەرچوون بە شێواز و گروپی جۆراوجۆری نوێوە دژایەتی حکومەتەکان دەکەن و ئاشتی و ئاسایشی وڵاتانی ئیسلامی دەشێوێنن هەتاکو ئێستا.

خەواریجەکان چەندین شۆڕشیان بەرپاکرد لە سەردەمی جێنشینایەتی ئەمەویەکاندا، هەرکە ئاگری شۆڕشێك دەکوژایەوە، یەکی تر بەدوایدا بڵێسەی دەسەند، تەنها

[1] سەیری پەرتوکی (تیارات الفکر الإسلامي) د.محمد عمارة..بکە.

لەناوچەکانی ڕۆژهەڵاتیشدا پەنگی نەخواردبوویەوە، بەڵکو کشابوو بەرەو ئەفریقا و ئەندەلوس، هەر هەموشیان کۆتاییان پێدەهات بە سەرکوتکردن و کوژرانی سەرکردەکانیان، دیارترینیشیان لەسەردەمی جێنشینایەتی ئەمەویەکان و سەردەمی ئیبن زوبێردا بوو.

١-لە سەردەمی معاویەی کوڕی ئەبو سوفیان دا ساڵی ٤٣ك خەواریجەکان لە کوفە ڕاپەڕین ، بە سەرکردایەتی (المستورد بن علقە) پاشان هەرلەوێ ساڵی ٥٢ك بەسەرکردایەتی (خراش العجلی) شۆڕش یان یاخی بوونیان دەست پێکردەوە، هەروەها ساڵی ٥٨ك بە سەرکردایەتی (عروە بن أدیە) شۆڕشیان بەرپاکرد.

لە بەصرەش ساڵی ٤٥ك بەسەرکردایەتی (مالك الباهلی) ناسراو بە(الخطیم الباهلی) و (سهم بن خالد الهجیمی) ڕاپەڕین.

لە (ئەهواز)یش ساڵی ٥٩ك بەسەرکردایەتی (مرداس بن حدیر) ڕوبەڕوی نەیارەکانیان بوونەوە.

٢-لەسەردەمی (عبداللەی کوڕی زوبێر)دا هەڵگەڕاوەکان چوونە ڕیزی (عبداللە)وە و دژی بنەماڵەی ئەمەویەکان شەڕیان کرد، بەڵام دواتر لە ئیبن زوبێر جیابوونەوە و ڕوبەڕوی بوونەوە کاتێك بۆیان دەرکەوت کە لەگەڵ ڕاوبۆچوونی ئەمان دا ناکۆکە لە بارەی (عوسمان و عەلی)ەوە – خوا لێیان ڕازی بێت- ، لە ئەهواز کۆبوونەوە و شەڕیان لە دژی ڕاگەیاند بەسەرکردایەتی (نافع بن الأزرق)، ئینجا موصعەبی کوڕی زوبێر کە فەرمانڕەوای عێراق بوو، سوپایەکی نارد بەسەرکردایەتی (مهلب کوڕی ئەبو صفرە) دەستەویەخە بوو لەگەڵیان لە شەڕێکدا کە لەسەر ڕوباری (دجیل) (سیروان) ڕویدا ساڵی ٦٥ك.

لەو شەڕەدا سەرکردەکەیان (نافع بن الأزرق) کوژراو سەرکردایەتی خەواریجەکان دوای ئەو بۆ (زوبێر کوڕی ماحوز) بەجێ ما، ئەویش شەڕی ڕاگەیاند لە (الري) ساڵی ٦٨ك و گەمارۆی (أصبهان)ی دا و فەرماندەی ئەوێ کە ناوی (عتاب بن ورقا )بوو ڕوبەڕووی

بوویەوە لە شەڕێکدا کە تیایدا ئیبن ماحوز کوژراو و دواتریش سەرکردایەتی خەواریجەکان بەجێما بۆ (قطري بن الفجاءة).

٣-لە سەردەمی عەبدولمەلیکی کوڕی مەروان دا خەواریجەکان لەگەڵ سەرەتای گرتنە دەستی فەرمانڕەوایەتی عێراق لەلایەن حەجاجەوە هەروەها پێشتر لەویش شۆڕشیان بەرپا کرد، (مهلب کوڕی ئەبو صفره) بۆ ڕووبەڕووبوونەوەیان نێردرا و دواتریش کوڕەکانی کە دواتر باسی دەکەین.

لە (بەحرەین)یش بە سەرکردایەتی (عبدالله بن قیس) ناسراو بە (أبو فدیك) لەساڵی ٧٣ك یاخی بوون، (مغیره بن مهلب بن أبی صفره) لەوێ وەدەری نان، پاش شەڕێك کە تیایدا (أبو فدیك) کوژرا.

لە (جەزیرە)ش بەسەرکردایەتی (صالح بن مسرح) کە (شبیب بن یزید الشیبانی) و (مصاد)ی برای لەگەڵ بوو ساڵی ٧٦ك یاخی بوون ، (محمدی کوڕی مەروان)ی فەرماندەی جەزیرە سوپایەکی ڕووبەڕوویان کردەوە تۆشەڕکردن لەگەڵیان کە تیایدا صالح کوژرا و دوای ئەو بەیعەت درا بە (شبیب) بۆ سەرکردایەتی خەواریجەکان.

دوابەدوای ئەوە شەبیب شۆڕش بەرپادەکاتەوە و دەچێتە کوفە و ئەو سوپایە تێك دەشکێنێت کە حەجاج ناردبووی بەسەرکردایەتی (عبدالرحمن بن محمد بن الأشعث)، پاشان (شبیب) ڕوو دەکاتە ئەهواز، حەجاج سوپایەکی بۆ دەنێرێت بەسەرکردایەتی (سفیان بن الأبرد)، کاتێك (شبیب) بەسەر پردێکدا دەپەڕێتەوە لەسەر ڕووباری دوجەیل ئەسپەکەی خۆی ڕادەتەکێنێت و شەبیب دەکەوێتە ناو ڕووبارەکەوە و دەخنکێت، ساڵی ٧٧ك.

هەروەها لە (طبرستان) ساڵی ٧٧ك بەسەرکردایەتی (قطری بن الفجاءة) ڕاپەڕین ، ئینجا حەجاج سوپایەکی بەسەرکردایەتی (سفیان بن الأبرد) بۆ نارد و شەڕی لەگەڵ کرد، هاوەڵەکانی لێی جیابوونەوە، کەوتە شیوێکەوە و پیاوێك لە خەڵکی (طبرستان) کوشتی و کەللەسەرەکەی نارد حەجاج.

٤- لەسەردەمی وەلیدی کوڕی عبدالملك و هەروەها براکەشیدا (سلیمان) بەشێوەیەکی ڕێژەیی مەترسی خەواریجەکان کەم بوویەوە، کاتێك جێنشینایەتی درایە عومەری کوڕی عبدالعزیز لە (جوخی) لەنێوان خانەقین و ئەهوازدا خەواریجێك سەری هەڵدا و پێی دەوترا (بسطام الیشکری) و نازناوەکەی (شوذب) بوو، هەشتا شۆڕەسواری عەرەبی ڕەبیعە لەدەوری خڕبوونەوە، هەربۆیە عومەر داوای لە فەرماندەی عێراق کرد لەخۆیان دوو پیاو بنێرێت بۆلای تاکو دانوستانی لەگەڵ بکەن، (بسطام)یش دوو پیاوی ژیر و بەباوەڕی لە پیاوەکانی خۆی هەڵبژارد و ناردنی بۆلای عومەری کوڕی عبدالعزیز، لە وتوێژەکەدا بەڵگەکەی عومەر پەسەند بوو و سەری گرت، دوو پیاوەکەی خەواریج داوایان لێکرد کە بگەڕێنەوە بۆلای (شوذب) و ئاکامی وتوێژەکەی پێ ڕا بگەیەنن، بەڵام عومەر پاش ماوەیەك لە جێنشینیەکی پاك و کورت زۆر نەمایەوە لەژیاندا.

٥- لە سەردەمی یەزیدی کوڕی عبدالملك دا پاش مردنی (عومەری کوڕی عبدالعزیز) فەرماندەی کوفە سوپایەکی نارد بۆ شەڕی (شوذب) و هاوەڵەکانی ئەوانیش بەرەنگاری بوونەوە، کاتێك (مسلمە بن عبدالملك) فەرماندەیی عێراقی گرتە دەست ساڵی ١٠١ك سوپایەکی نارد بە سەرکردایەتی (سعید الحرشی) (شوذب) هەستی کرد خۆی و هاوەڵەکانی بەرگەی سوپاکەی ناگرن، هەربۆیە بە هاوەڵەکانی گوت: هەرکەس شەهید بوونی دەوێت ئەوا ئەو پلەیە هاتۆتە بەردەستی، هەرکەسیش دونیای دەوێت ئەوە ئیتر لەدەستی چووە، کێلانی شمشێرەکانیان شکاند و بەریان بە سوپاکەی سەعید گرت و لە شەڕەکەدا هەموویان کوژران.

لە بەحرەین خەواریجەکان بەسەرکردایەتی (مسعود بن أبی زینب العبدی) ڕاپەڕین ساڵی ١٠٥ك و فەرماندەکەشیان لەوێ وەردەنا کەناوی (الأشعث بن عبدالله بن الجارود) بوو، پاشان ڕوی کردە یەمامە و فەرماندەکەی (سفیان کوڕی عمرو العقیلی) ڕوبەڕوویان بوویەوە، لەو شەڕەی لەنێوانیاندا ڕویدا مسعود کوژراو و (هلال بن مدلج)یش کوژرا کە دوای مسعود سەرکردایەتی خەواریجەکانی گرتە دەست.

وتراوە (مسعود) ماوەی نۆزدە ساڵ دەستی گرت بەسەر بەحرەین و یەمامە دا تاکو (سفیان بن عمرو العقیلی) کوشتی.

بەڵام لە موصڵ خەواریجەکان بەسەرکردایەتی (مصعب بن محمد الوالبی) راپەڕین، (خالد القسری) فەرماندەی عێراق سوپایەکی بۆ ناردن ساڵی ١٠٥ك، هەربۆیە لەشەڕێکدا ڕووبەڕوویان بوویەوە و تیایدا موسعەب و زۆرێك لە هاوەڵانی کوژران.

٦-لە سەردەمی (هیشامی کوڕی عبدالملك) دا ساڵی ١١٩ك خەواریجەکان لە ئەهواز بەسەرکردایەتی (صحاری بن شبیب بن یزید الشیبانی) راپەڕین ، لە شەڕێکدا کە ڕوویدا لەنێوان ئەو و سوپاکەی (خالد القسری) فەرماندەی عێراق دا (ئیبن شەبیب) کوژرا.

لە (جەزیرە)ش ساڵی ١١٩ك شۆڕشی خەواریجەکان بەسەرکردایەتی (بهلول بن بشر الشیبانی) کە نازناوی (کثارة) بوو هەڵگیرسا، بە کوژرانی خۆی کۆتایی بەشۆڕشەکەش هات.

لە مەغریب دا خەواریجەکان ساڵی ١١٦ و ١٢٢ك راپەڕین لە (عبیدالله بن الحبحاب)ی فەرماندەی ئەفریقیا، بەهۆی ستەمی کاربەدەستەکانیەوە.

لە ئەندەلس بە هەمان شێوە شۆڕشیان بەرپاکردەوە دژی (عبدالملك بن قگن)، فەرماندەی ئەندەلس (بلج بن بشر القشیری) شۆڕشەکەیانی دامرکانەوە.

٧-لەدوای هیشامی کوڕی عبدالملك سێ جێنشین هاتنە سەر تەخت یەك بەدوای یەك ئەوانیش (وەلیدی کوڕی یەزیدی کوڕی عبدالملك) و (یەزیدی کوڕی وەلیدی کوڕی عبدالملك) و (ابراهیم)ی برای، ماوەی جێنشینێتیان لە شەش ساڵ تێپەڕی نەکرد، لەدوای ئەوانیش (مەروانی کوڕی محمدی کوڕی مەروانی کوڕی حەکەم) بوویە جێنشین و لەسەردەمی ئەودا شۆڕشەکانی خەواریج گەلێك زۆر بوون.

هەروەها لە جەزیرەدا ساڵی ١٢٧ك خەواریجەکان سەریان هەڵدایەوە بە سەرکردایەتی (سعید بن بهدل الشیبانی)، کە (ضحاك بن قیس الشیبانی) لەگەڵ بوو، (مەروانی کوڕی محمد) شۆڕشەکەیانی دامرکاندەوە.

لە (یەمەن) دیسانەوە بەسەرکردایەتی (یحیی الکندی) کە نازناوی (طالب الحق – خوازیاری حەق)ی لێنرابوو سەریان هەڵدایەوە، کە (أبو حمزه المختار بن عوف الأزدي) لەگەڵ بوو، دەستیان گرت بەسەر مەدینەدا، ئینجا (مەروانی کوڕی محمد) سوپایەکی ئامادەکرد بەسەرکردایەتی (عبدالملك بن عطية السعدي) و شۆڕشەکەیانی دامرکاندەوە.

لە ئەفریقیا شۆڕشەکەیان ساڵی ١٣١ ك دەستی پێکردەوە بەسەرکردایەتی (عبدالجبار المرادي) و پاشانیش شۆڕشێکی تر بەسەرکردایەتی (اسماعیل بن زیاد النفوسی).

لەپاڵ ئەم شۆڕشانەدا کە خەواریجەکان بەرپایان کرد لە سەردەمی (مەروانی کوڕی محمد) دا، (سلیمان کوڕی هشام کوڕی عبدالملك)یش لێی راپەڕی و هەڵگەڕایەوە، هەروەها خەڵکی (حمص) لەژێر رکێفی دەرچوون و کەلبیەکانیان لەگەڵ بوو بەسەرکردایەتی (ثابت بن نعیم الجذامي)، خەڵکی (غوطة) و (فلسطین)یش لێی راپەڕین و مەروان شۆڕشەکەی ئەوانیشی دامرکاندەوە.

بەڵام ئەو شۆڕشانە هێز و هەیمەنەی مەروانی کەم کردەوە، بوویە هۆی ئەوەی لەبەردەم سوپای عەباسیەکاندا ڕوخا و هەرەسی هێنا کە (عبدالله بن علی العباسي) رابەرایەتی دەکرد و کارەکەش کۆتایی پێهات بە شکان و بەزینی (مەروان) لە ڕوداوەکەی (الزاب) دا ساڵی ١٣٢ك و تیایدا کۆتایی بە فەرمانڕەوایەتی ئەمەویەکان هات و فەرمانڕەوایەتیەکی نوێ دەستی پێکرد بۆ عەباسیەکان، کە لەم قۆناغەشدا خەواریجەکان چەندین شۆڕشی زۆریان بەرپاکرد و تائێستاش کۆتایی پێ نەهاتووە، بەهەرجۆرێك بوبێت لەئێستا و لەکۆندا شۆڕشی سیاسی – دینی هەڵگەڕاوەکان دژی فەرمانڕەواکان سەری هەڵداوە.

***

# شەڕکردنی حەجاج لەگەڵ ئەو کۆمەڵە خەواریجانەی کە لە سەردەمی ئەودا سەریان هەڵدا

کاتێك حەجاج چوو بۆ عێراق و بوویە فەرمانڕەوای ئەوێ، ووتارە بەناوبانگەکەی خۆی لە کوفە و پاشان لە بەصرە بەگوێی خەڵکی عێراقدا دا، لەوێ خەڵکی ترساند و داوای لێکردن بچنە ڕیزی سوپاکەی (مهلب بن أبي صفرة)وە، ئەو (مهلب)ەی کە ڕابەرایەتی سوپای ئەمەویەکانی دەکرد لەپێش ئەویشدا سوپای خەلافەتی زوبێریەکان، بۆ بەرەنگاربوونەوەی ئەو خەواریجانەی کە شۆڕشیان بەرپاکردبوو و یاخی ببوون دژی خەلیفە عبداللەی کوڕی زوبێر پاش ئەوەی هاوپەیمانیان لەگەڵ بەستبوو و پاشان دوای کوژرانی ئیبن زوبێر و گرتنە دەستی جێنشینی لەلایەن عەبدولمەلیکەوە، (مهلب) بەردەوام بوو لە پیشەکەی و لەپۆستەکەی خۆیدا مایەوە لە ڕووبەڕووبوونەوەی خەواریجەکاندا.

یەکەمین کاری حەجاج ئەوەبوو سەربازی لە عێراقیەکان کۆکردەوە بۆ چوونە ڕیزی سوپاکەی (مهلب)ەوە بۆ شەڕکردن لەگەڵ خەواریجەکانی ئەزاریقە.

کەواتە ئەوەی سەرکردایەتی شەڕی دژ بە خەواریجەکانی گرتبووە دەست لە سەردەمی حەجاج دا (مهلب بن أبي صفرة)بوو، کە یەکێك بوو لە پیاوماقوڵ و گەورەکانی بەصرە لە خێڵی (أزد)، ناوبانگی بەخشندەیی و میوان دۆستیی هەبوو، ساڵی ئازادکردنی مەککە لەدایك ببوو، ئەتەوە و خێڵەکەشی لەنێوان عوممان و بەحرەین دا نیشتەجێ ببوون، هۆزەکەی لەسەردەمی ئەبوبەکری صدیق دا لە ئاینی ئیسلام هەڵدەگەڕێنەوە و (عەکرەمەی کوڕی ئەبو جەهل) بەشەڕ ڕووبەڕوویان دەبێتەوە و

بەسەریاندا سەردەکەوێت، هەندێکیشیان دەنێرێت بۆلای ئەبوبەکری صدیق، (ئەبو صفرە) و کوڕەکەشی (مهلب) کەلاوێك بوو هێشتا نەگەیشتبووە تەمەنی پێگەیشتن لەناویاندا بوون.

(مهلب) لە سەردەمی جێنشینی عبداللەی کوڕی زوبێردا ساڵی ٦٨ك بوویە فەرمانڕەوای خاکی جەزیرە لە عێراق، پاشان شەڕی خەواریجەکانی گرتە دەست لەسەرەتای فەرمانڕەوایەتی حەجاج دا کە هەرلە سەردەمی (بیشری کوڕی مەروان)ەوە (مهلب) و (کوڕەکانی) شەڕی خەواریجەکانیان گرتبوویە دەست.

پاش ئەوەی خەواریجەکان لەگەڵ سوپاکەی ئیبن زوبێر دا بوون بۆ بەرەنگاربوونەوەی سوپای یەزیدی کوڕی معاویە کە گەمارۆی ئیبن زوبێری دابوو بەسەرکردایەتی (حصین کوڕی نمیر)، هەروەها پاش کشانەوەی سوپاکە خەواریجەکان لەگەڵ ئیبن زوبێردا لە چەند پرسێکی فیقهیدا تێك چوون و دژایەتیان کرد، ئیدی خەواریجەکان بەرەو عێراق ڕۆیشتن کە مەڵبەندی هەبوون و ڕیشەیان بوو، کۆمەڵێك گەڕانەوە بۆ عێراق و (نافع بن الأزرق) و (نجدە بن عامر ) و (عبداللە بن صفار) و (عبداللە بن اباض بن بهیس) سەرکردایەتیان دەکردن، کۆمەڵێکیشیان ڕۆیشتن بۆ یەمامە، پاشان (نجدە بن عامر) چوو بۆ یەمامە بەهۆی ناکۆکییەوە لەگەڵ (نافع بن الأزرق) دا و هەر لەوێ کۆمەڵەی (نجدات)ی دامەزراند، ئەم دوبەرەکی و لێکهەڵوەشانەوەیەش خو و ئاکاری خەواریجەکان بووە بە بەردەوامی.

ئیبن ئەزرەق لە ئەهواز دایکوتا و نیشتەجێ بوو، پاش ئەوەی بەصرەی بە شوێن و ماڵی کوفر و بێ باوەڕی ناساند و پێی وابوو کە مانەوە تیایدا ڕێ پێدراوو جائیز نیە و سێ سەد لە هاوەڵەکانیشی شوێنی کەوتن.

ئەوەی مایەوە هەریەك لە (عبداللەی کوڕی صفار) کە کۆمەڵەی خەواریجی صوفریەی دامەزراند و (عبدالله بن اباض) کە کۆمەڵەی خەواریجی (اباضي) دامەزراند.

هەر کۆمەڵەیەکی خەواریجیش وەك دەبینین بە کوژرانی دامەزرێنەری کۆمەڵەکە و سەرکردەکەیان کۆتاییان پێدەهات.

ئەو کۆمەڵانەی کە ڕابەرایەتی شۆڕشەکانیان کرد دژی فەرمانڕەوایەتی بنەماڵەی ئەمەویەکان تاکو سەردەمی حەجاج و ڕووبەڕووبوونەوەیان، ئەزاریقە و صوفریە و (اباضیة) بوون.

## شۆڕشی خەواریجەکانی ئەزاریقە و شەڕکردنی حەجاج لەگەڵیان:

شەڕ و بەرەنگاربوونەوەی خەواریجەکانی ئەزاریقە کە لە ئەهواز نیشتەجێ بوون دەستی پێکرد پاش ئەوەی کاریان بووبە جێی مەترسی و گەیشتنە سەر ڕووباری فورات، لەساڵی ٧٣ك دا خەلیفە (عەبدولمەلیکی کوڕی مەروان) فەرمانی بە (بیشر کوڕی مەروان)ی برای کە فەرمانڕەوای عێراق بوو کرد ڕووبەڕووی خەواریجەکان ببێتەوە و (مهلب[1] کوڕی ئەبو صفرە) ڕاسپێرێت بۆ ئەو کارە.

(طبري) لە (تأريخ)ەکەیدا باسی دەکات کە خەلیفە عبدالملك نامەی نوسی بۆ (بیشری کوڕی مەروان): پاش سوپاس و ستایشی خودا (مهلب) لەگەڵ خەڵکی وڵات و شارەکەی خۆی بنێرە بۆ (ئەزاریقەکان)، با لەخۆیان سوارچاك و سەرگەورە و بە ئەزمونەکانیان هەڵبژێرێت، ئەو زیاتر ئاشنایە پێیان، با بەڕای خۆی بکات لە شەڕەکەدا، من متمانەم بە ئەزمون و ئامۆژگاریەکانی هەیە بۆ موسوڵمانان، هەروەها لە خەڵکی کوفە پیاوێکی ناسراوی خانەدانی بەهێزی بەزەبر بنێرە سەریان، باس و خواس و ئەزمونی شەڕ بزانێت، پاشان خەڵکی هەردوو شارەکەیان لێ ڕاپەڕێنە بکەونە شوێن خەواریجەکان، تاکو خوا لەناویان دەبات و ڕیشەکێشیان دەکات.. والسلام علیکم..

(بیشری کوڕی مەروان) (عبدالرحمن بن مخنف)ی هەڵبژارد تاکو سەرۆکایەتی سوپای کوفیەکان بکات و فەرمانی پێکرد کە فریاگوزار و بەئەزمونەکانیان هەڵبژێرێت، وەك چۆن فەرمانی بە (مهلب) کرد خۆی کێی ویست هەڵی بژێرێت.

---

[1]. مهلب وەك جەنگاوەرێك لە (مرو الروذ) کە تەمەنی حەفتا و شەش ساڵ بوو و دە کوڕی هەبوو ساڵی (٨٣ك) کۆچی دوایی کرد، لەدوای خۆی یەزیدی کوڕی جێی گرتەوە.

(ابن جریر الطبري) ئاماژەی پێدەکات کە (بیشری کوڕی مەروان) حەزی نەدەکرد (مهلب) ببێتە سەرکردەی سوپاکە، بەلاّم تەنها لەبەر ویستی (خەلیفە عبدالملك)ی برای ئەو ئەرکەی پێ سپاردووە کە لە قسەکەی (عبدالرحمن کوڕی مخنف)دا دەردەکەوێت کاتێك پێی ووت:

بیشری کوڕی مەروان بانگی کردم و پێی گووتم: تۆ ڕەنگە پێگە و پلە و پایەی خۆت لای من بزانیت، وە من بەباشم زانی کە ئەم سوپایە بسپێرمە تۆ، لەڕوانگەی ئەوەی کە بۆم دەرکەوتووە لە شکۆ و ئازایەتیت، کەواتە لەئاستی باشترین گومانی مندا بە بەرامبەرت، سەیری ئەوە بکە ئاوا – مەبەستی مهلب بوو –لە کاروباردا کەللەڕەقی لەگەڵ بکە و هیچ ڕاوێژ و ڕایەکیشی پەسەند مەکە و گوێی پێ مەدە..

(ئیبن مخنف) گووتی: وازی هێنا لەوەی کە بمسپێرێت بەسوپاکە و شەڕی دوژمن و سەیرکردنی خەڵکی موسوڵمان، دەستی کرد بە هاندانم لە کوڕە پورەکەم – مهلب – (پورزا لە باوکەوە) وەك ئەوەی من لە گەمژە و ساویلکەکان بم، یان ئەوەی کە هەرزەیم بە نەزانی ڕەفتاریکەم.

(مهلب) هەستا بە دەرکردنی ئەزاریقەکان لە ئەهواز و تێکی شکاندن و دوری خستنەوە بۆ وڵاتی فارس، خۆی لە (رامهرمز) مایەوە، دە ڕۆژ یان دە مانگ تیایدا مایەوە و پاشان هەواڵ هات کە (بیشری کوڕی مەروان) مردووە، ئیدی حاڵی سەربازەکان تێك چوو و لەبازاڕی ئەهواز کۆبوونەوە تەنانەت خەڵکی بەصرە ویستیان لە سوپاکەی (مهلب) بکشێنەوە ئەویش وتاری بۆدان و گووتی: خۆ ئێوە بەرگری لە شارەکەی خۆتان و زێد و سێبەری خۆتان دەکەن..[1]

ئەوە یەکێك بوو لەو ئاکارانە خەڵکی عێراق لە ڕابردوودا (ئاکاری هەڵگەڕانەوە و دڵگۆڕین)، هەر بەکردەیی کۆمەڵێك لە سەربازەکان هەڵاتن و گەڕانەوە بۆ بەصرە، لەبەر ئەمە (مهلب) لە نامەکەیدا کە بۆ حەجاجی نوسی ئاماژەی پێکرد کاتی شۆڕشەکەی (ابن

---

[1] سەیری (التاريخ الطبري) و (الكامل في التأريخ) بکە.

ئەشعث) و بەیعەت دانی خەڵکی بەصرە و کوفە پێی بەوەی بەردەوام نابن لەگەڵی بۆ شەڕکردن و دواتر لێی هەڵدەگەڕێنەوە و دەردەچن لە فەرمانی[1].

بەڵام کاتێك حەجاج گەیشتە سەر کورسی دەسەڵات لە عێراق دۆخەکە گۆڕا، وتارە بەناوبانگەکەی ئاڕاستەی ئەو کەسانەکرد کە ناچن بۆ شەڕ و چوونە ڕیزی سوپاکەی (مهلب)ەوە، ترساندنی بە بردنی ماڵ و موڵك و تێکدانی خانە و لانەیان، ئیدی خەڵکی بەصرە و کوفە بە کۆمەڵ و لێشاو دەهاتن بچنە سوپاکەی (مهلب)ەوە لەترسی زۆرداری و توندڕەوییەکەی حەجاج، تەنانەت (مهلب) کاتێك ئەو هەموو کۆمەڵە هاتنە ناو سوپاکەیەوە ووتی:

ئەمڕۆکە ئیتر مەردە پیاوێك هاتۆتە عێراق، ئەمڕۆکە ئیتر دوژمن کوژرا.[2]

لەگێڕانەوەیەکی تردا گووتوویەتی:

کێیە ئەو کەسەی کە خەڵکی عێراقی خستە جموجوڵ و کار؟ کێیە ئەو کەسەی کە پیاوەکانی کردە نێرە پیاو؟ کەواتە وەیل بۆ دوژمن ئەگەر خوا بیەوێت.

حەجاج خۆی چوو بۆ (رستقباز[3]) تاکو بۆخۆی سەرپەرشتی سوپاکەی (مهلب) بکات و (عبدالرحمن بن مخنف)ی نارد بۆلای و نامەیەکیشی پێدا، کە هانی دەدا بۆ شەڕی خەواریجەکان و تیایدا نوسیبووی:

" گەر ئەم نامەیەمتان پێگەیشت ئەوا دەست بەجێ لە خەواریجەکان ڕاپەڕن.. والسلام.."[4].

مهلب هەستا بە شەڕی ئەزاریقەکان لە (رامهرمز) ناچاریکردن بەبێ شەڕێکی قورس بکشێنەوە و چۆڵی بکەن و لەسابور لە خاکێك بارگەیان خست و دابەزین پێی دەوترا (کازرون)، (مهلب) چوو بۆیان و (ابن مخنف)یش لە ڕەمەزاندا بۆیان چوو، مهلب فەرمانی

---

١. دواتر باسی قسە و لێدوانەکەی تایبەت بە شۆڕشەکەی (ابن أشعث) دەکەین لەم پەرتوکەدا.

٢. سەیری (البدایە والنهایة ) و(الکامل في التأریخ) و (مروج الذهب– للمسعودي) بکە

٣ رستقاباد.

٤ .تأریخ الطبري.

کرد بە هەڵکەندنی (خەندەق) چاڵێك بە دەوری سەربازگەکەیدا بۆ پارێزگاری کردن لە خۆی و سەربازەکانی، بەڵام (عبدالرحمن بن مخنف) فەرمانی بە سەربازەکانی خۆی نەکرد تا خەندەق هەڵکەنن وەکو (مهلب) چونکە خەواریجەکانی بەکەم دەزانی و بەرەنگاربوونەوەیانی پێ ئاسان بوو.

خەڵکی بەصرە باسیان کرد کە (مهلب) ووتی بە (عبدالرحمن بن مخنف)، گەر پێت باش بوو خەندەق بەسەردا لێبدەیت پێویستە وا بکەیت.

هاوەڵەکانی عبدالرحمن بەگوێیان نەکرد و گووتیان: خەندەقی ئێمە شمشێرەکانمانە.

سەرەنجامی ئەو بەئاسان تەماشاکردن و بەکەم زانینەی دوژمن ئەوەبوو هەڵگەڕاوەکان بەشەو هێرشیان کردە سەر سەربازگەکەیان و پەلاماریان دان و تێکیان شکاندن و زۆریان لێ کوشتن، تەنانەت خودی (ابن مخنف) کوژرا.

شاعیرێکیش لەم ڕوداوەدا دەڵێت:

| لمن العسکر المکلل بالصّرعی | فهم بین میت وقتـــــــیل |
|---|---|
| فتراهم تَسفي الریاح عـهم | حاصب الرمل بعد جر الذیول |

پاش کوژرانی (ابن مخنف)، شەڕی (مهلب) دژ بە خەواریجەکان نزیکەی ساڵێك لە سابور بەردەوام بوو.

بەڵام خەڵکی کوفە گێڕانەوەیەکی تریان هێناوە جیاوازە لە گێڕانەوەکەی پێشو کە خەڵکی بەصرە باسیان لێوە کردووە، ووتویانە: خەواریجەکان هێرشیان کردە سەر (مهلب) و ناچاریان کرد پەنا بۆ سەربازگەکەی ببات و ناردی بەدوای (ابن أحنف)دا کە یارمەتی بدات و پێی ووت:

دوژمنمان یەکێکە و دەبینیت چی بەسەر موسوڵماناندا هاتووە، کەواتە یارمەتی براکانت بدە خوا ڕەحمەت پێ بکات.

ئینجا (ابن مخنف) بەدەم داواکەی (مهلب)ەوە چوو و هەرچی سەربازی هەبوو ناردی بۆی، لەسەروی هەموویانەوە کوڕەکە خۆی کەناوی (جعفر)بوو.

سەرەنجامی ئەوە خەواریجەکان خۆیان گەیاندە سەربازگەکەی (ابن مخنف) و دەورەیان دا کە سەبازی زۆری لێ نەمابوو، ئینجا (ابن مخنف) ئاشکرابوو و هاتە دەست لێیان و تا توانای بوو شەڕی کرد هەتا کوژرا.

سەرەنجامیش بەهۆی پشتیوانیەکەیەوە بۆ (مهلب) (ابن مخنف) دەشکێت و خودی خۆی دەکوژرێت، هەندێکیش وای بۆدەچن لەم گێڕانەوەیەوە ڕون دەبێتەوە کە سوپای بەصرە کە (مهلب) سەرکردایەتی دەکرد ژمارەی کەمتر بوو لە سوپاکەی کوفە کە (ابن مخنف) سەرکردایەتی دەکرد.

کاتێك حەجاج بە کوژرانی (عبدالرحمن کوڕی مخنف)ی زانی (عتاب بن ورقاء)ی نارد وەك سەرکردەی تازەی سوپاکەی کوفە و بەو مەرجەی لە (مهلب) فەرمان وەربگرێ و گوێ لەمست بێ.

بەڵام لەنێوان (عتاب کوڕی ورقاء) و (مهلب) دا ناکۆکیەك ڕویدا، کار گەیشتە ئەوەی کە (عتاب) نامەی نارد بۆلای حەجاج و ڕوداوەکەی تێگەیاند، کەچۆن (مهلب) هەندێك لە ساویلکەکانی سوپای کوفەی هانداوە لە (عتاب)ی سەرکردەیان، لەو ناوبەینەشدا شۆڕشەکەی (عبداللەی کوڕی جارود) هاتە پێش، ئینجا حەجاج ناردی بەدوای (عتاب)دا تاکو هاوکاریی بکات لە دامرکاندنەوەی شۆڕشەکەی (ئیبن جارود)دا، شەڕی خەواریجەکانی واز لێهێنا بۆ (مهلب).

پاش تەواوبوونی حەجاج لە کۆتایی هێنان بە شۆڕشەکەی (ئیبن جارود) و کوژرانی ئیبن جارود سەری سەرکردەکانی شۆڕشەکە و لەسەرو هەموویانەوە سەری ئیبن جارودی نارد بۆ (مهلب) تاکو هانی بدات بۆ شەڕی خەواریجەکان و گیانی مەعنەوی و ورەی سەربازەکانی بەرزبکاتەوە، هەروەها ترس بخاتە دڵی خەواریجەکانیشەوە.

هەربۆیە (مهلب) پاش شەڕێکی بەردەوام و قورس لەگەڵ خەواریجەکان کە نزیکەی ساڵێك درێژەی کێشا توانی وایان لێ بکات بکشێنەوە بۆ دەرەوەی خاکی فارس، کە کەوتبووە ژێر ڕکێفی خۆیەوە، ئینجا فەرمانی خەلیفە عبدالملك دەرچوو بە وازهێناتی

راهات و دەسکەوت و باجی فارس بۆئەو، هەروەها سەرپشکی کرد لە دامەزراندنی کاریەدەستەکان بەدەستی خۆی و لای خۆیەوە بۆ ناوچەی فارس.

وێڕای ئەو شەڕە دوورودرێژەی کە مهلب هاتە ژێر باری لەگەڵ خەواریجەکان کەچی حەجاج نامەیەکی نارد بۆ مهلب و تیایدا تۆمەتباری کرد بە ترسنۆکی و داوای لێکرد بەخێرایی کۆتایی بەدوژمن بهێنێت.

مهلب وای دەبینی کە درێژەکێشانی جەنگەکە لە بەرژەوەندی و قازانجی خۆیەتی، بۆیە بە حەجاجی ووت: من چاوەڕێ دەکەم یەکێك لەم سیانەیان بۆ بێتە پێش، مردنێکی گورج و بەتاو، یان برسێتیەکی بەزیان، یاخود ناکۆکیەك لەنێوانیان خۆیاندا.

بەڵێ، ئەوەی مهلب خوازیاری بوو هاتە دی و ناکۆکی و دوبەرەکی کەوتە ناو ڕیزەکانی ئەزاریقەوە و لەناوی بردن!! چۆن ئەوە ڕوویدا؟

پەرتوکەکانی مێژوی ئیسلامی باسی ئەوە دەکەن (مهلب کوڕی ئەبو صوفرە) کاتێك کە شکستی هێنا لە لەناوبردنی شۆڕشی ئەزاریقەکاندا لەڕوی سەربازیەوە، هەوڵی دا ئابلۆقەیان بدات و تەنگیان پێ هەڵبچنێت تاکو وای لێکردن پەنایان بردە بەر (کرمان) و لە (فارس) دەری کردن، دیار و هەواریانی لێ دور بکەوێتەوە، شەڕی دژبەیەکی هەردولا بەردەوام بوو و کۆتایی پێ نەدەهات، هەربۆیە مهلب چاوەڕێی کرد دوبەرەکی بکەوێتە نێوانیانەوە، ئینجا هەندێکیان سەرپێچی (قطریا)یان کرد کە سەرکردەی ئەزاریقە بوو و لێی هەڵگەڕانەوە و بەیعەتیان دا بە (عبد ڕەبە)ی گەورە و ئەو دوبەرەکیەش بووە هۆی لەناوبردنیان.

ئیبن جەریر پوختەی ئەوەی ڕوویدا لەنێوان مهلب و ئەزاریقەدا لەمیانەی ساڵێك شەڕی فورس دا باس دەکات و دەڵێت:

هشام لە (أبو مخنف)ەوە باس دەکات، ئەویش لە یوسف کوڕی یەزیدەوە کە (مهلب) بارگەی خست لە (سابور) ڕوبەڕوی (قطریا) و هاوەڵەکانی لە خەواریجی ئەزاریقە بوویەوە، پاش ئەوەی کە حەجاج نزیکەی ساڵێك دەبوو (عتابی کوڕی وەرقا)ی لە سەربازگەکەی دورخستبووەوە.

پاشان (ڕۆژی بوستان) هێرشی بۆ بردن و شەڕێکی قورسی لەگەڵ کردن و (کرمان) لەدەستی خەواریجەکاندا بوو و (فارس) لەدەستی (مهلب) دا بوو، ئینجا گەمارۆی خستە سەریان و تەنگی پێ هەڵچنین و لە فارسەوە هیچ شمەك و پێداویستیەکیان بۆ نەدەهات، لە دیار و دەواریان دوری خستنەوە، هاتنە کرمان و مهلب بەشوێنیانەوە بوو هەتا لە (جیرفت ) کە شارێکی کرمانە (شارێکی کرمانیە) دابەزی، لەوێ زیاتر لە ساڵێك شەڕی قورسی لەگەڵ کردن و لە هەموو فارس دوری خستنەوە.

ئینجا کاتێك هەموو فارس کەوتە دەستی (مهلب)ەوە، حەجاج کاربەدەستەکانی خۆی ناردە سەری گەرچی (مهلب) ئەو شوێنەی گرتبوو، ئەو هەواڵە گەیشتەوە بە خەلیفە عبدالملك و ئەویش نامەی نوسی بۆ حەجاج و گوتی:

پاش سوپاس و ستایشی خودا..بهێڵە باج و سەرانەی فارس بەدەستی ( مهلب)ەوە بێت، بێگومان ئەوە دەبێتە هێزێك بۆ سوپاکە و هاریکارێك بۆ خاوەنی سوپاکەش، شاری (فساودرابجرد) و شاری (اصطخر) بهێڵە بۆ ئەو بێت.

ئەویش وازی لێهێنا مهلب، ئینجا مهلب کاربەدەستەکانی خۆی ناردە ئەوێ، ئیدی ئەمە بووە هێزێك بەسەر دوژمنەکەیدا و ئەوەشی لەگەڵ ئاشت دەبوویەوە[١].

کاتێك سەرکەوتن هێواش و لەسەرخۆ بوو، حەجاج یەکێك لە پیاوەکانی خۆی نارد بۆلای مهلب بەناوی (بەرائی کوڕی قەبیصە) نامەیەکی پێدابوو تیایدا نوسیبووی:... بەخوا وەك من وای دەبینم گەر تۆش بتەوێت ئەوا ڕوبەڕووی ئەو یاخیە گومڕایانە دەبوویتەوە، بەڵام تۆ حەزدەکەیت مانەوەیان درێژە بکێشێت تاکو خاکەکەی دەورووبەرت بخۆیت.

هەربۆیە (بەرائی کوڕی قەبیصە) نێردراوە بۆلات تاکو ڕاتپەڕێنێت لێیان، کەواتە ئەگەر گەیشتە لات بە هەموو موسوڵمانانەوە لێیان ڕاپەڕە ، پاشان بە توندترین شێواز

---

[١]. سەیری (تأريخ الطبري) بکە.

بەرەنگاریان ببەوە، ئەكەی هەرگیز بێزار و وەڕس بێت و ئەوشتە پڕوپوچانە.. یان ئەو شتانەی كە لای من شیاو و ڕێپێدراو نین.. والسلام..

ئیدی (مهلب) و هەموو ئەوەی موسوڵمانان چوون بەرەو شەڕی خەواریجەكان و دەستەویەخەبوونێكی گەرم ڕویدا تەنانەت (بەڕائی كوڕی قەبیصە) هات بۆلای (مهلب) و پێی گوت: نە بەخوا... هەرگیز سوارچاكی وەك كوڕەكانی تۆم نەبینیوە ، هەروەها هیچ كات سوارچاكی وەك سوارچاكەكانی تۆم لەناو عەرەبدا نەبینیوە، هەرگیز هیچ كۆمەڵ و نەتەوەیەكیشم نەبینیوە وەك ئەوانەی شەڕ لەگەڵ تۆ دەكەن، ئارام بگرە هیچ قەیدی نیە... بەخوا تۆ بیانوت هەیە.

مهلب بەردەوام بوو لەشەڕكردن و ڕوبەڕووبوونەوەی ئەزاریقەكان بەتوندی، بە (بەڕا )ی گوت: چیت بینی و بۆ دەركەوت ؟

ووتی: بەخوا كەسانێكم بینی هیچ سەرت ناخا بەسەریاندا خوا نەبێت، ئیدی مهلب چاكەی لەگەڵ(بەڕا ) كرد و یارمەتی دا و پۆشتەی كرد و فەرمانی دا دەهەزار درهەمی پێ بدەن، پاشان بەڕا تێی تەقاند و گەڕایەوە بۆلای حەججاج و ئەوەی بینیبووی پێی ڕاگەیاند و هەروەها نامەیەكی نوسراوی (مهلب)ی هێنابوو بۆ حەججاج كە تیایدا نوسرابوو:

لە پاشان...نوسراوەكەی فەرماندەم پێگەیشت خوا چاكی بۆ بكات، پەنجە ڕاكێشانی بۆ من و تۆمەتباركردنم سەبارەت بەم یاخی و سەرلێشێواوانە، فەرماندە فەرمانی پێكردم كە لێیان ڕاپەڕم، بەدیارچاوی نێردەكەیەوە، منیش ئەوەم كرد، لێی بپرسە بزانە چی بینیوە، بەڵام بەخوا من گەر بمتوانیایە بنچ و بنەوانیان دەربێنم و لەشوێنی خۆیان بیانسڕمەوە و پاشان وازم لەو كارە هێنابێت و گزیم لە موسوڵمانان كردبێت و بێ ئەمەك بوویم بەرامبەر ئەمیری بڕواداران و ئامۆژگاریەكانی فەرماندە ئەوا پەنا بەخوا گەر ئەوە ڕای من بووبێت ....والسلام.

پاشان (مهلب) بۆماوەی هەژدە مانگ وازی لە ڕووبەڕووبوونەوەیان نەهێنا، كەچی هێشتا نەیتوانی دەریان بكات و ڕیشەكێشیان بكات، هەتا ناكۆكی كەوتە نێوانیانەوە، كە

ئیبن جەریری تەبەری سەرەتای ئەم ناکۆکیە و چۆنیەتی سەرهەڵدانی و ڕۆڵی مهلب لە خۆشکردنی ئاژاوەکەدا باس دەکات و دەڵێت:

پاشان پیاوێك لەخۆیان کە کاریەدەستی ناوچەیەکی کرمان بوو و دەستوپێوەندی (قطري) سەرکردەی ئەزاریقە بوو، بە یەکەیەکی سەربازیەوە بەوان کە پێی دەوترا (المقعطر) لە (بني خبته) بۆی دەرچوو، ئینجا پیاوێکی کوشت کە خاوەن پلەو هێز و دەسەڵات بوو لەناو خەواریجەکاندا، لەناو ئەواندا ویلایەتێکی وەرگرتبوو، کاتێك (مقعطر) ئەوی کوشت ئیدی خەواریجەکان هەڵیان کوتایە سەر (قطري) ، ئەوەیان بۆ باس کرد و گوتیان: ڕێما بدە ئەو بکوژە لەبری هاوەڵەکەمان بکوژینەوە.

ئەویش پێی گوتن: بەباشی نازانم وابکەم، گریمان پیاوێك لێکدانەوەیەکی کرد و هەڵەی کرد لە لێکدانەوەکیدا، بەباشی نازانم بیکوژنەوە، ئەو لە چاکەکان و لەپێشینەکانی ناو ئێوەیە.

ووتیان: بەڵێ هەر دەیکوژینەوە.

پێی وتن: نا.. مەیکوژن..

ئیدی ناکۆکی کەوتە نێوانیانەوە، (عەبد ڕەبە)ی گەورەیان کردە سەرگەورە و وازیان لە (قطريا) هێنا، (قطريا) بەیعەتی لە کۆمەڵێکیان وەرگرتبوو کە نزیك بوو لە (چوار یەك) یان (پێنج یەك)ی ژمارەیان، ئینجا نزیکەی مانگێك بەیانی و ئێوارە شەڕی لەگەڵ کردن.

هەربۆیە (مهلب) دڵخۆش بوو بەم ناکۆکیە و ئەو شەڕە چاوەڕوانکراوەی کەوتبووە نێوان خەواریجەکان خۆیانەوە، پاش ئەوەی نەیتوانی بە سەرکەوتنی سەربازی یان گەمارۆدانیان سەرکەوتن بەدی بهێنێت بەسەریاندا، نامەی نارد بۆ حەجاج و ڕەوشەکەی تێگەیاند و نوسی:

لەپاشان... بەڕاستی خودا خەواریجی بەخۆیانەوە سەرقاڵ کردووە و زۆربەیان وازیان لە (قطريا) هێناوە و بەیعەتیان داوە بە (عەبد ڕەبیە)ی گەورە، کۆمەڵێکیان لەگەڵ (قطريا) ماونەتەوە، ئەوان بەیانی و ئێوارە لەگەڵ یەك شەڕ دەکەن، منیش پێشتر

خوازیاری ئەوە بووم كە ئەو ناكۆكیەیان تێ بكەوێت و ببێتە هۆی لە ناوچوونیان گەر خوا بیەوێت....والسلام.

دوای ئەوە حەجاج بە نامەیەك وەڵامی دایەوە تیایدا هاتبوو:

لەپاشان...نامەكەتم پێگەیشت كەتیایدا باسی ناكۆكی خەواریجەكانت كردووە لەنێو خۆیاندا، جا ئەگەر ئەم نامەیەی منت پێگەیشت، لێیان بێرە دەست تا لەو حاڵی ناكۆكی و دووبەرەكیەی خۆیاندا پێش ئەوەی یەكبگرنەوە و قورساییان لەسەرت قورستر بێت... والسلام.

ئینجا مهلب بە نامەیەكی تر وەڵامی حەجاجی دایەوە و ووتی:

لەپاشان... نامەی فەرماندەم پێگەیشت، هەرچی تێدابوو لێی تێگەیشتم، من پێم باش نەبوو هێرشیان بۆ بكەم چونكو خۆیان لەناویەكدا بەشەڕ هاتوون، ژمارەی یەكتری كەم دەكەنەوە، جا ئەگەر لەسەر ئەوە بەردەوام بوون ئەوەیە كە ئێمە دەمانەوێت و ڕۆژ بەڕۆژ كەم دەكەن و لەناو دەچن، ئەگەریش یەكیان گرتەوە ئەوا یەكتریان تەنك و لاواز كردووە، ئێمەش لێیان دێینە دەست لەسەر ئەو حاڵەشەوە، ئەوان لاوازتر و بێ هێزترن لەوەی كە هەبوون، گەر خوا بیەوێت... والسلام.

ئەوەی (مهلب) بە باشی دەزانی ئەوە ڕاستەكە بوو.. چونكو گەر گوێی بگرتایە بۆ قسەكانی حەجاج و هەڵی كوتایەتە سەر خەواریجەكان لەوكاتی كە ناكۆكی و دووبەرەكی لەنێوانیاندابوو و شەڕیان لەگەڵ یەكتر دەكرد، ئەوە دەبوویە هۆی یەكگرتنەوەیان دژی (مهلب)، دەیویست هەریەوجۆرە لە شەڕەكەیان ڕامێنێت و بە بەردەوامی یەكتری بكوژن و ببڕن تاكو تیادەچن.

ئەگەریش ناكۆكی و شەڕ لەنێوانیاندا كۆتایی پێهات، شەڕ دەست پێدەكاتەوە لەگەڵیان لەوكاتەی كە لە دۆخێكی مەعنەوی و كوشتوبڕی دژواردان، ئیدی دەتوانێت سەربكەوێت بەسەریاندا ئاسانتر لەوەی كە لە دۆخی هێز و یەكریزییاندا بوون، كە لە ڕابردوودا نەیتوانی.

لەکۆتاییدا هەر ئەمە هاتە دی بۆ مهلب، (مهلب) لێگەڕا خەواریجەکان نزیکەی مانگێك لەگەڵ یەکتر شەڕبکەن، تاکو سەرکردەکەیان (قطریا) لەگەڵ ئەوانەی لەگەڵی بوو بەرەو (گبرستان) ڕۆیی، ئەوانەی تریش لەگەڵ سەرکردە نوێیەکەیان مانەوە (عبد ربە الکبیر)، ئینجا مهلب لێیان ڕاپەڕی و شەڕێکی قورسی لەگەڵ بەرپاکردن، لەناوی بردن و چەند کەسێکی کەم نەبێت ڕزگاریان نەبوو لەدەستیەوە سەرکەوتنی بەدەست هێنا و (عبد ربە)ی سەرکردەی نوێیانی کوشت و سەرکردە کۆنەکە (قطریا) هەڵات.

حەجاج بەوەوە نەوەستا بەڵکو سوپایەکی بە سەرکردایەتی (سفیان کوڕی الابرد) نارد کە گشت سوپاکە لە خەڵکی شام بوون و پاڵپشتی کرد بە سوپایەك لە کوفەوە بە سەرکردایەتی (محمد بن الأشعث) لە (طبرستان) بۆ ئەوەی سەرکردەی هەڵاتووی خەواریجەکان (قطریا) وەدەرنێن، هەتا پێی گەیشتنەوە لە شیوێك لە شیوەکانی (طبرستان) و شەڕیان لەگەڵ کرد و هاوەڵەکانی لێی جیابوونەوە و خۆی لەسەر ئاژەڵەکەی بەربوویەوە بۆ دامێنی شیوەکە، ئینجا یەکێك لە ڕۆڵەکانی شارەکە هاتە لای و نەیدەناسی، ئینجا (قطري) پێی گوت ئاوم بدەرێ تینومە. تینوێتی زۆری بۆ هێنابوو، پیاوەکە پێی گوت: شتێکم بدەرێ تاکو ئاوت بدەمێ و تینویەتیت بشکێنم.

قطری گوتی: بەڵا لێت دا هیچم پێ نیە ئەو چەکە نەبێت کە دەیبینیت، من پێتی دەدەم گەر ئاوت بۆ هێنام.

ووتی: نا بەڵکو ئێستا بمدەرێ.

قطری گووتی: نا بەڵکو لەپێشدا ئاوم بۆ بێنە.

لەو کاتەدا پیاوەکە بەردێکی گەورەی دا بە (قطری) دا یەکێك لە سمتەکانی شکاند، ئەویش ناڵاندی و هاواری کرد، پیاوەکەش خەڵکی بانگ کرد و هاتن بەرەوپیری و سوپای کوفە کوشتیان و سەریان بڕی و ناردیان بۆ حەجاج.

لە خەواریجەکانی ئەزاریقە چەند کەسێك مانەوە کە بەیعەتیان دا بە (عبیدە بن هلال) و خۆیان لە کۆشکێك حەشاردا لە (قومس)، ئیدی (سوفیانی کوڕی ئەبرەد) گەمارۆی

دان، ئینجا جاردەرێك بانگی دا لەناویاندا، هەر پیاوێك هاوڕێکەی بکوژێت و پاشان بێتە دەر بۆلای ئێمە ئەوا بێ وەی و پارێزراوە لای ئێمە.

یەکسەر (عبیدە بن هلال) ئەم هۆنراوەیەی ووت:

لَعَمري لَقَد قامَ الأَصَمُّ بِخُطبَةٍ لَها في صُدورِ المُسلِمينَ غَليلُ

لَعَمري لَئِن أَعطيتُ سُفيانَ بيعَتي وَفارَقتُ ديني إِنَّني لَجَهولُ

إِلى اللَهِ أَشكو ما تَرى بِجِيادِنا تَساوَكَ هَزلى مُخُّهُنَّ قَليلُ

تَعاوَرَها القُذّافُ مِن كُلِّ جانِبٍ بِقومَسَ حَتّى صَعبُهُنَّ ذَلولُ

فَإِن يَكُ أَفناها الحِصارُ فَرُبَّما تَشَحَّطَ فيما بَينَهُنَّ قَتيلُ

وَقَد كُنَّ مِمّا أَن يُقَدنَ مِنَ الوَجى لَهُنَّ بِأَبوابِ القِبابِ صَهيلُ

ئینجا (سوفیان) گەمارۆی چڕی خستنە سەر تاکو شەکەت بوون و هەموو ئاژەڵ و ماڵیاتەکانیان خوارد پاشان هاتنە دەر لە کۆشکەکە و شەڕیان لەدژی سوفیان کرد تاکو هەموویان کوژران و ئەویش کەللە سەری هەموویانی نارد بۆ حەجاج، ئەو ڕوداوە ساڵی ٧٧ك ڕوویدا، ئینجا سوفیان چووە (دنباوەند) و (طبرستان) وەك فەرمانڕەوا لەوێ مایەوە هەتا حەجاج لای برد و دوری خستەوە پێش ڕوداوی (دیر الجماجم) کە دواتر باسەکەی دێتە بەردەستت لەگەڵ باسی شۆڕشەکەی ئیبن ئەشعەس دژی حەجاج و خەلیفە..

بە کوژرانی (عوبەیدەی کوڕی هلال) و ئەوانەی لەگەڵی بوون لە پاشماوەی ئەزاریقە.. شۆڕشەکەیان کۆتایی پێهات و حەجاج ڕزگاری بوو لەدەستیان پاش شەڕێکی تاڵ و قورس و درێژخایەن، هیچ شەڕێك لەوە درێژتر نەبوو بێجگە لە شەڕەکەی (عبدالرحمن کوڕی ئەشعەس) کە شۆڕشی بەرپاکرد لەدژی حەجاج، وەك دواتر لەکاتی خۆیدا بە پشتیوانی خودا باسی دەکەین.

***

## شەڕی حەجاج لەگەڵ خەواریجەکانی صوفریە

خەواریجەکانی صوفریە شوێنکەوتووانی (زیاد بن الاصفر) و ووتراویشە (عبدالله بن صفار) هەروەها گووتراوە (عبیدالله بن قبیصە) بوون، کە یەکێك بوو لە کۆمەڵە سەرەکیەکانی خەواریج، هەروەك گووتراوە هۆکاری ناوەکەیان دەگەڕێتەوە بۆ زۆری پەرستش و نوێژیان بەجۆرێك ناوچاوان و پەلەکانیان زەردبووبوو[1]، یان هۆکاری ئەو ناوەیان دەگەڕێتەوە بۆ نازناوی دامەزرێنەری ئەو کۆمەڵەیە وەك پیشەی هەمیشەیی خەواریجەکان.

لە خەواریجەکانی صفریە گروپێکی تر دەرچوون و جیابوونەوە پێیان دەووترا خەواریجی صاڵحی (الخوارج الصالحیە) کە سەر بە (صالح بن المسرح التمیمی) بوون، یەکێك بوو لە زانایانی خەواریج، لە (دارا) دەژیا، لە نێوان (ماردین) و خاکی موصڵ و جەزیرە، هاوەڵانێکی هەبوو فێری قورئان خوێندنەوەی دەکردن و لەدیندا شارەزای دەکردن، چیرۆکی دەگێڕایەوە و پەلەی نەکرد لە هەڵگەڕانەوە لە خەلیفە.

ابو مخنف دەڵێت: (عبداللەی کوڕی عەلقەمە) بۆی باس کردم ووتی: کاتێك هاوڕێکانی صاڵح لەدەوری بڵاو بووبوونەوە ڕۆژێك پێی ووتن: نازانم چارەڕێی چی دەکەن، تاکەی دادەنیشن، زۆر و ستەم تەشەنەی کردووە، دادپەروەریش لەناوچووە، ئەم فەرمانڕەوایانەش هیچیان پێ نیە بۆ خەڵکی دەرد و خەم و زیادەڕۆیی و زۆرداری و دورکەوتنەوە لەڕاستی و بوێری بەرامبەر خوا نەبێت...

---

[1] . صفر یان أصفر: واتە ڕەنگی زەرد.

کەواتە ئامادەبن بۆ یارمەتی ئەو برایانەتان کە دەیانەوێت بەرپەچی پوچ و ناڕەوا بدەنەوە و بانگەشە بۆ ڕاستی دەکەن وەك ئەوەی ئێوە دەتانەوێت، ئێن بۆلاتان و پێك دەگەین، دەبینین چی دەکەین، چ کاتێك بمانەوێ دەردەچین و ڕادەپەڕین[1].

ئەوەش ساڵی ٧٦ك بوو.

هاوەڵەکانی نامەیان لەگەڵ یەکتر گۆڕیەوە و بانگی یەکتریان کرد و قسەیان لەگەڵ یەکتر کرد و گردبوونەوە بەو جۆرە، ئەو کات (ابن واشل الیشکری) نامەیەکی لە (شبیب)[2]ەوە هێنا بۆ (صالح کوڕی مسرح) و تیایدا نوسرابوو:

لە پاشان......زانیم کە تۆ پێویستت بە کەسانێك بووە، منیشت بۆ ئەوە بانگ کردووە، هەربۆیە هاتم بەدەمتەوە، ئەگەر ئەمە ئەو ڕۆژە بوو بێت ئەوا تۆ گەورەی موسوڵمانانیت، هیچ کەس لەئێمە لەڕێگەی تۆ لانادات، ئەگەریش ویستت ئەو ڕۆژە دوا بخەیت ئاگادارم دەکەیتەوە.

خوا تۆ و ئێمەش بکات بەوانەی کە کاروباریان بۆ خوایە و لەبەر ڕازی بوونی خودایە و بەنیازی بینینی ڕوی پاکی پەروەردگار و هاوڕێیەتی پیاوچاکانن لە بەهەشت دا..والسلام.

وەڵامی صالح بە ئەرێ و ڕازی بوون هاتەوە بەم جۆرە:

لە پاشان.... نامە و هەواڵەکەت درەنگ گەیشتەوە پێم و هەتا ئەوە بێ تاقەتی کردم، پاشان دواتر یەکێك لە موسوڵمانان ڕایگەیاند پێم کە هاتویتە دەر و هاتوی، کەواتە سوپاسی خودا دەکەین لەسەر ئەو قەزایەی بۆی داناوین.

نامەهێنەکەت نامەکەتی بۆ هێنام، هەرچی تیابوو لێی گەیشتم، وا ئێمەش ئامادە و سازین بۆ ڕاپەڕین، هیچ شتێك نەیوەستاندوم لە دەرچوون چاوەڕوانیی تۆ نەبێت، کەواتە بگەرە لامان، پاشان هەرکات ویستت دەرچۆ لەگەڵمان، چون تۆ لەو کەسانەی کە

---

[1] تاريخ الطبري.

[2] . ئەو: (شبيب بن يزيد بن نعيم بن قيس بن عمرو بن الصلت بن شرحبيل بن صبرة بن ذهل بن شيبان الشيباني)ە.

ڕاوبۆچـونت ژیرانەیـە و پشتگوێ ناخرێـت، لـەو کەسـانەی کاروبارەکـان بـەبێ تـۆ ڕایـی نابن...والسلام علیك.

هەر بەوجۆرە، ڕای (شبیب) و (صالح) لەسەر ئەوە بوو کە هەڵبگەڕێنەوە لە حەجاج و خەلیفـەی ئەمەویـەکان، (شـبیب) چـوو بـۆلای صـالح و کاتێك پێـی گەیشـت گـووتی: بـا ڕاپەڕین...خوا ڕەحمەت پـێ بکـات، سـوێند بـەخوا ئـەم کۆمەڵەیـە تـەنها وانـەی تـر زیـاد دەکەن و فێر دەبن، تاوانکارانیش هیچ زیاد ناکەن زۆرداری و ستەم نەبێت.

صالح شوێنکەوتوانی خۆی ئاگادار کرد کە ئەو ڕادەپەڕێت لە سەرەتای مانگی صـەفەر شەوی چوارشەممەی ٧٦ك، کەواتە ئامادەبن بۆ ئەو ڕاپەڕینە و چەك و کەرەسـتەی شـەڕ ئامادەبکەن.

ئەبو مخنف دەڵێـت: (فروه بن لقیط الأزدي) قسەی بۆ کردم و ووتی: بەخوا من لەگەڵ (شبیب)بووم لە (مەدائن) باسی چۆنیەتی ڕاپەڕینەکەیانمان دەکرد ووتی: کاتێك ویستمان دەربچین شەوی دەرچوونەکە لای صالحی کوڕی مسرح کۆبووینەوە ، ڕای مـن ئـەوە بـوو خەڵکی کۆبکەینەوە کاتێك کردەوەی ناپەسەند و دوژمنایەتی و وێرانکاری و خراپەم بینی لەسەر زەوی، هەستام چووم بۆلای و ووتم: ئەی ئـەمیری بـڕواداران — مەبەسـتی صـالحی کوڕی مسرحە — چۆن لە ژیاننامەی پێغەمبەرەوە دەڕوانیتە ئەو خەڵکە ستەمکارانە؟

ئایا بیانکوژین پێش ئەوەی بانگەوازیان بکەین؟ یان بانگەوازیان بکـەین بـۆلای ڕێگـەی ڕاست و دواتر شەڕیان لەگەڵ بکەین؟

من ڕای خۆمت پێ ڕادەگەیەنم سەبارەت بەوان، پێش ئەوەی تۆ ڕای خۆت بڵێیت بەمن سەبارەت بەوان، من وای دەبینم هەر کەسێك ڕای ئێمە بە باش نازانێت نزیك بێت یان دوور بیکوژین، چونکە ئێمە دەردەچین لە فەرمانی کەسانێکی ستەمکاری گومڕای زۆردار کە فەرمانی خوایان واز لێهێناوە و شەیتان دەستی گرتووە بەسەر دڵ و دەروونیاندا.

ئینجا ووتی: نا..بەڵکو بانگەوازیان دەکەین، سـوێند بـێ کەسـیان نایـەن بـە دەمتـەوە ئەوانە نەبێت کە ڕاکەت بە باش دەزانن، ئەوانەشیان کە گاڵتەیان بە ڕاکـەت بێـت شـەڕت لەگەڵ دەکەن ، بانگ کردنیان بیانویان دەبڕێت، باشترین بەڵگەش دەبێت بەسەریانەوە.

ووتـی: پـێم ووت: ڕات چـۆنە سـەبارەت بەوانـەی کـە شـەڕمان لەگـەڵ دەکـەن و سەردەکەوین بەسەریاندا؟

چی دەڵێیت لەبارەی خوێن و ماڵیانەوە؟

صالح گوتی: ئەگەر کوشتمان و دەستکەوتمان هەبوو ئەوە هی خۆمانە، ئەگەریش لێ بوردە و لێ خۆش بوو بووین ئەوە فراوانترمان دەکات.

ووتی: ڕاسترین و باشترین قسە بوو، خوا ڕەحم بەئێمە و ئەویش بکات.

هەروەها صالحی کوڕی مسرح ئەو شەوەی ڕاپەڕی بە هاوەڵەکانی ووت:

لەخوا بترسن ئەی بەندەکانی خودا، پەلە مەکەن لـە شەڕکردن لەگـەڵ هـیچ کەسێکدا مەگەر کەسانێك کە ئێوەیان دەوێت و پەلامارتان دەدەن و داو و فێڵێکیـان سـازکردبێت، چونکە بەڕاستی ئێوە لەبەر تورەبوونی خودا ڕاپەڕیون بـەجۆرێك پیرۆزیـەکانی شکێنرا و لەسەر زەوی سەرپێچی کرا، خوێن بە ناحەق ڕژا و ماڵ وسامانیش بەتاڵان و ناڕەوا بـران، کاری هـیچ کۆمـەڵێك بـە ناشـیرین و عەیبـدار مـەزانن کـە خۆیشتان هـەمان کـار دوبـارە بکەنەوە، چونکە هەرچی کردارێك پێی هەڵدەستن لێی بەرپرسن.....

ژمارەیان لەو شەوەدا سەد و دە یان سەد و بیست پیاو بوو، صـالح ئامۆژگـاری کـردن شەڕ نەکەن مەگەر ناچار بن، چەندین ئـاژەڵ و ئەسـپی (محمـدی کـوڕی مـەروان)ی بـرای خەلیفە (عبدالملك)یان گرتبوو کە نوێنەری براکەی بـوو لـە جـەزیرە ، پێـی دابـوون تـاکو سواری بن، لە خاکی (دارا) سیازدە شەو مانەوە، خـەڵکی دارا و (نەصـیبین) و (سـنجار) پەنایان دان.

کاتێـك جێگـری خەلیفـە (محمـدی کـوڕی مـەروان) پێـی زانـین، هـەزار سوارچـاکی بەسەرکردایەتی (عدی بن عدی بـن عمـیرە) نـارد بـۆ پـەلاماردانیان، بـە چەشـنێك بۆیـان ڕۆیشتن هەروەکو بڵێی بەرەو مەرگ دەچـن لەترسـی شـەڕکرن لەگەڵیان و لەبـەر ئـەوەی دەیانزانی خەواریجەکان چـەند شازا و نەترسـن لەشـەڕدا و چـەند توندوتیژن، جـا کاتێـك گەیشتن بەیەك لەگەڵ خەواریجەکاندا، خەواریجەکان توانیان سەرەڕای کەمی ژمارەشیان

سەربازەکانی جێگری خەلیفە تێك بشکێنن شکانێکی ترسناك و لەڕادە بەدەر، هەرچیان هەبوو بوویە دەستکەوتی خەواریجەکان.

(محمدی کوڕی مەروان) دووبارە سوپایەکی نارده سەریان کە لە هەزار و پێنج سەد سوارچاك پێکهاتبوو بەسەرکردایەتی (حارس کوڕی جعونە) و لەشکرێکی تری هەزار و پێنج سەد کەسی بەسەرکردایەتی (خالد کوڕی حر) نارد و پێی گووتن: هەرکامتان پێشتر سەرکەوتنی بەدەست هێنا ئەوە دەبێتە فەرماندە و ئەمیری خەڵکەکە.

ئینجا چوون بۆیان بە سێ هەزار جەنگاوەرەوە، خەواریجەکانیش وەك باس کرا ژمارەیان سەد و دە یان سەدو بیست جەنگاوەر بوون.

هەردوو لا ڕووبەڕووی یەکتر بوونەوە لە (ئامەد)، شەڕەکە تاوی سەند، نزیکەی حەفتا لە خەواریجەکان کوژرا، لە سوپاکەی (مەروان)یش نزیکەی سی سەرباز کوژرا، هەربۆیە خەواریجەکان لە شەودا هەڵاتن و لەناوچەی جەزیرە چوونە دەرەوە، پەڕینەوە بۆ موصڵ و ڕۆیشتن تاکو (دسکەرە)یان بڕی، ئینجا حەجاج سێ هەزار سەربازی نارده سەریان بەسەرکردایەتی (حارس[1] کوڕی عومەیرە) بۆ بەرەنگاربوونەوەیان، لە خاکی موصڵ پێیان گەیشتەوە و (صالح) تەنها نەوەد پیاوی لەگەڵ بوو.

سەرەڕای کەمی ژمارەی خەواریجەکان کەچی ئارامگری و بەرگەگرتنێکی زۆریان هەبوو لە شەڕەکەدا.

دواجار لەم شەڕەدا سەرکردەی خەواریجەکان (صالح کوڕی مسرح) کوژرا و (شبیب) بریندار بوو، هاوڕێکانی هەڵیان گرت و بردیانە پەنایەکەوە و شاردیانەوە لەوێ، لەم کاتەدا حەفتا پیاویان لەگەڵ مابوویەوە، ئینجا (حارس کوڕی عومەیرە) دەروی دان و فەرمانی بە سەربازەکانی کرد کە دەرگای ئەو شوێنە ئاگرتێبەردەن کە خەواریجەکان خۆیان لێ پەنا دابوو، ئەوانیش ئەو کارەیان کرد و گەڕانەوە بۆ سەربازگەکەیان، دڵنیابوون لەوەی کە خەواریجەکان دواتر خۆیان دەدەن بەدەستەوە.

---

[1] .حارث.

بەڵام خەواریجەکان لەو شوێنە چوونە دەرەوە کە خۆیان لێ حەشاردابوو، ئینجا هێرشیان کردە سەر سوپاکەی (حارس) و کوشتارێکی گەورەیان لەناویاندا ئەنجامدا و خەواریجەکان بەسەرکردایەتی (شبیب) هەرچی لە سەربازگەکەی ئەواندا هەبوو گرتیانە دەست بۆخۆیان، پاشماوەی سەربازەکانی ئەمەوی هەڵاتن بەرەو مەدائن، ئەمەش یەکەم سەرکەوتن بوو (شبیب) بەدەستی هێنا پاش گرتنە دەستی سەرکردایەتی خەواریجەکان، وەك ئیبن کەسیر باسی کردووە، لە ڕۆژی سێ شەممە کە سیازدە شەو مابوو لە مانگی جەمادی دووەمی ساڵی ٧٦ك.

خەواریجەکان کۆدەنگ لەسەر (شبیب) و بەیعەتیان پێدا، (بەغدادی) باسی دەکات کە پەیماندان بە (شبیب) دوای ئەو وەسیەت و ڕاسپاردەیە هات کە (صاڵح کوڕی مسرح) کردی پاش ئەوەی لە شەڕەکەدا بریندارکرا و کەوتە سەرەمەرگ، ئەو بە هاوەڵەکانی ووت: من (شبیب)م کرد بە جێنشینی خۆم بۆ سەرکردایەتی ئێوە، چونکە پیاوێکی نەبەرد و ئازا و شکۆدارە بەرامبەر دوژمنەکەتان، ئەو کەسەش دەبێتە جێنشین و جێگرەی ئەو کەسێکە کە لە فیقە و زانستەکەی ئەودا فەقیهـ و شارەزایە، پاشان مرد و ئەوانیش بەیعەتیان دا بە شبیب[1].

بەدەر لەو دەگێڕنەوە کە پەیماندانی خەواریجەکان بە شبیب دوای کوژرانی سەرکردەکەیان (صاڵح) و چوونەوە ناوەوەیان بۆ حەشارگەکەدا هات کە سوپاکەی حەجاج دەوری دان و ویستی ناچاریان بکات خۆیان بدەن بە دەستەوە بە سوتاندنی دەرگای حەشارگەکەیان، ئینجا شبیب بە هاوەڵەکانی ووت: چارەڕێی چی دەکەن، دە سوێند بەخوا ئەوانە گەر بکەونە بەیانی هەر هەمووتان لەناو دەبەن.

ئەوانیش ووتیان: فەرمانی خۆتمان پێ بڵێ.

ووتی: بەڕاستی شەو شاراوەترە بۆ هاوارلێهەستانیان، پەیمان و بەیعەت بدەن بەمن یان هەرکەس خۆتان دەتانەوێت، پاشان لێرە دەردەچین و دەڕۆین بۆیان بەتوندی

---

[1] سەیری (تأریخ بغداد) ی (الخطیب البغدادي) بکە.

ڕووبەڕوویان دەبینەوە لە سەربازگەکەیاندا، چونکە ئێستا ئەوان لەئێوە بێ ترسن، دەخوازم خوا سەرتان بخات بەسەریاندا.

پێیان ووت: دەستت بێنە با بەیعەتت پێ بدەین.

ئینجا بەیعەتیان پێدا و نزیکەی حەفتا یان هەشتا پیاو دەبوون[١].

خەواریجەکان لباویان هێنا و بەئاو تەڕیان کرد بۆ کوژاندنەوەی ئەو ئاگرەی کە نرابوو بە دەرگای حەشارگەکەیانەوە، توانیان بیکوژێننەوە و چوونە دەر بەرەو سەربازگەی سوپاکەی (حارس) و هێرشی کوتوپڕیان کردە سەریان و ژمارەیەکی زۆریان لێ کوشتن، خودی حارس خۆی بریندار بوو، هاوەڵەکانی هەڵیان گرت و پاشماوەی سوپاکەش شکان و هەڵاتن، خەواریجەکان هەرچی لە سەربازگەکەدا مابوو وەک دەستکەوتی شەڕ بردیان بۆ خۆیان و چوون بۆ مەدائن.

هەربەوجۆرە سەرکردەی نوێ (شبیب) پلەوپایە و پێگەیەکی بۆخۆی دروست کرد، بەجۆرێك لەیەکەم شەڕیدا سەرکەوتنی بەدەست هێنا سەرباری کەمی ژمارەی شوێنکەوتوانیشی، ئەو (شبیب)ە کێ یە؟

(شبیب بن یزید بن نعیم الشیبانی) زانا و شارەزای دین نەبوو بەڵکو جەنگاوەرێکی ئازا و بوێر بوو کە حەجاج و سەربازەکانی نەیان توانی بیبەزێنن، خێڵەکەشی نیشتەجێی (کەناری دەستە ڕاستی ڕوباری فورات بوون) لە بیابانی کوفە، لەسەرەتادا چوو بۆلای ئەو وەزیرەی نزیك بوو لە (خەلیفە عبدالملك)ەوە ئەویش (روح بن زنباع) بوو، داوای لێکرد کە داوا لە خەلیفە بکات بیبەخشێت وەك بەخشینی ئەهلی شەرەف، هەربەوجۆرە وەزیرەکەش پەیامەکەی گەیاندە خەلیفە و داواکەی گەیاند، ئینجا وەڵامی عبدالملك بەم جۆرە بوو: پیاوێکە نایناسم.

روح کوڕی زنباع ئەو وەڵامەی گەیاندەوە بە شبیب، ئینجا شبیب پێی گوت: بەم نزیکانە دەمناسێت.

---

١ سەیری (تأریخ الطبري) و (الكامل في التأريخ) بکە.

لەساڵی ٧٥ك کاتێك خەلیفە (عبدالملك) چوو بۆ حەج (شبیب) و (صالح)ی مامۆستای لە مەککە حەجیان دەکرد، (شبیب) ویستی خەلیفە بکوژێت، عبدالملك بەو هەوڵەی زانی، هەربۆیە فەرمانی بە حەجاج کرد بۆ دەستگیرکردنی شبیب و صالح، ئەمەبوو وای کرد شبیب پەلە لە صالحی مامۆستای بکات کە زوو دەربچن بۆ شەڕی ئەمەویەکان.

هەربۆیە ئەو دووانە یەکیان گرت دژی ئەمەویەکان، یەکیان خاوەنی زانست و فیقە بوو کە (صالح کوڕی مسرح) بوو، دووەمیش خاوەن هێز و هونەری شەڕ و جەنگەکان بوو کە (شبیب کوڕی یەزیدی شەیبانی) بوو.

پاش ئەوەی شبیب سەرکردایەتی خەواریجەکانی گرتە دەست پاش کوژرانی صالح، رەبر و هێزیان زیاتری کرد و بوونە هێزێکی چارنەکراو لە شەڕدا.

شەبیب و پشتیوانەکانی پاش یەکەم سەرکەوتن ڕۆیشتن بۆ خاکی (موصل) و (جوخی) و پاشان (ئازەربایجان)، تاکو پشتیوانی تر لەدەوری خۆیان خڕ بکەنەوە، خێزانەکەی کە ناوی (غەزالە)بوو و هەروەها دایکی هاتنە ریزیەوە، ئەم سیانە بەچەندین شەڕی زۆر، چەندین تاڵی تێکشکانیان بە حەجاج چەشت، تەنانەت غەزالەی خێزانی شبیب داوای شمشێربازی لەگەڵ حەجاج کرد لەیەکێك لە شەڕەکاندا، بەڵام حەجاج ترسا لەڕووبەڕووبوونەوەی، هەربۆیە شاعیر (عمران کوڕی قەحتان[1]) ووتە بەناوبانگەکەی خۆی ووت لە دوو توێی هۆنراوەیەك بەسەر حەجاج دا:

أسَدٌ عَلَيّ وَفِي الحُروبِ نَعامَــةٌ رَبْداءُ تجفلُ (فتخاء تنفر) مِن صَفيرِ الصافرِ

هَلَّا بَرَزتَ إلى غَزالَة في الوَغى بَل كانَ قَلبُكَ في جَناحَـــــــــي طائِرِ

---

[1] قحطان

غەزالە شارەزا لەدین و وتاربێژ بوو، مێردەکەی خۆشدەویست، لەتەنیشت ئەودا بە نەترسی و ئازایەتیەوە وەك پاڵەوانەکان دەجەنگا ، تەنانەت ڕۆژێك بە (شبیب)ی گووت: ئەی شبیب ...من ئامێکم کردووە (نزر)، داوات لێدەکەم کە یارمەتیم بدەیت بە ئەمەك بم بەرامبەر ئامەکەم، ئەویش ئەوەیە لە مزگەوتی گەورەی کوفە دوو ڕکات نوێژ بکەم، لە ڕکاتی یەکەمدا سورەی (بقرە) بخوێنم و لەڕکاتی دووەمیشدا سورەی (آل عمران)!!.

ئەو کاتە کوفە لەژێر دەستی حەجاجی سەقەفیدا بوو، بەلام شبیب خاوەن هێز و بوێری و نەترسی بوو داخوازی هاوسەرەکەی بەجێ گەیاند، هەربۆیە بەسوپاکەیەوە بەرەو کوفە کشا، شەڕی لەگەڵ سەربازەکانی حەجاج دا کرد و کوشتنی، چوویە کوفەوە و حەجاج و سەربازەکانی لێبوون، ئینجا ئەویش لە شەقامەکانی کوفەدا و بەتەنیشت خێزانەکەیەوە (غەزالە) دەڕۆیشت تاکو چوویە مزگەوتەکە و نوێژەکەی بکات و وەفا بکات بەرامبەر ئامەکەی، سەربازەکانی خەواریج وەستابوون بۆ پاسەوانێتی ئەو ژنە لەلای دەرگای مزگەوتەکەدا تاکو لەنوێژەکەی بوویەوە.

غەزالە لەدەوری خۆی یەکەیەکی سەربازیی لە ئافرەتانی خەواریجی کۆکردبوویەوە کە لەپیاوەکان ئازا و بەهێزتر بوون، بەو ئافرەتانە هێرشی دەبردە سەر شارەکان تەنانەت (خزیمە بن فاتك الاسدی) لەبارەی ئەو ژنەوە بەهۆنراوەیەك دەڵێت:

| | |
|---|---|
| أقامت غزالة سوق الضرار | لأهل العراقين حولا قميطا |
| سمت للعراقين في جيشها | فلاقي العراقان منها أطيطا |

غەزالە ئەو هێز و ئازایەتیەی لە مێردەکەیەوە وەردەگرت کە سەرمەشقی بوو، تاکو ئەوکاتەی کە کوژرا لە شەڕەکانی کۆتاییدا بۆ مێردەکەی لەگەڵ حەجاج ، ترسی حەجاج لێی بەردەوام بوو لەڕوانگەی ئەو دێرە هۆنراوەیەی شاعیرەوە کە مێژ و خەڵکی تا ئێستاش باسی دەکەن:

أسد عليّ وفي الحروب نعامة.........(واتە لە ئاشتیدا شێر و لەشەڕدا نەعامەیە[١])..

دەگەڕێینەوە بۆ ئەو شەڕانەی کە شبیب دژی حەجاج و ئەمەویەکان بەرپای کرد و چۆن ڕەوشەکە کۆتایی پێهات.

شبیب پاش ئەوەی سەرکردەکەیان (صالح) کوژرا و هاوەڵەکانی پەیمانیان پێدا بردنی وکۆچی پێکردن بەرەو خاکی موصل، تاکو شوێنکەوتووەکانی کۆبکاتەوە، ئینجا (سلامە بن سیّار بن المضماء التميمی) بینی، داوای لێکرد لەگەڵیان ڕاپەڕێت.

(سەلامە) مەرجی ئەوەی بۆدانا (سی) سوارچاکی بۆ هەڵبژێرێت لە خەواریجەکان بۆماوەی سێ ڕۆژ بیداتێ بیبان بات بۆلای (عەنزە) تاکو تۆڵەی خوێنی براکەی (فضالة) بسەنێتەوە.

ئەوەش چونکە براکەی (فضالة) دەرچوو و هەژدە پیاوی لەگەڵ بوو لە لای ئاوێک دابەزین پێی دەوترا (الشجرة)، دەیانەویست دەربچن لە ژێر بەیعەتی ئەمەویەکان، هەربۆیە (عەنزە) کوشتنی و سەری بڕین و ناردنی بۆلای خەلیفە عبدالملك سابەشکو بەخششێکی بداتێ، دەرچونی (فضالة) پێش دەرچوونی (صالح کوری مسرح) و (شبیب) بوو.

هەربەوجۆرە (شبیب) ڕازی بوو بە مەرجەکەی (سەلامە) و یەکەیەکی لەگەڵ نارد کە (سی) پیاو بوو لە پشتیوانەکانی، بۆ شەڕکردن لەگەڵ عەنزە یەك بەدوای یەك دەیکوشتن تەنانەت منداڵە شیرەخۆرەکانیشیان دەکوشت، تەنانەت سەلامە کوڕە پورەکەی خۆیشی کوشت کە منداڵێکی شیرەخۆرە بوو.

پاش ئەم ڕوداوە خەڵکی ترسان لە زۆر و ستەمی شبیب و شوێنکەوتوانی هەربۆیە لێیان هەڵدەهاتن، بەڵام جەنگاوەرەکانی ئەو شوێنەش نەیاندەتوانی شەڕی لەگەڵ بکەن، شبیب بە هاوەڵەکانیەوە بەرەو (ڕاذان) کەوتە ڕێ، ئینجا کۆمەڵێك لە (بەنی تمیم بن

---

١. نعامة: وشترمورغ = وشتر مەل.

شـیبان) دەرچـوون و خەڵکانێکیشـیان لەگـەڵ بـوو لـە غـەیری خۆیـان هـەڵاتن لەڕوبەڕووبوونەوەی شبیب ئەوان سێ هەزار کەس بوون کەچی شبیب و ئەوانەی لەگەڵی بوون نزیکەی حەفتا پیاو دەبوون.

شبیب بە دوانزە سوارەوە لە هاوڕێکانی چوو بۆلای دایکی لە قـەدپاڵی (سـاتیدما) و هێنایە لای خۆی و تاکو کوژرانی لەگەڵی مایەوە.

چەندین شوێنکەوتووی تر هاتنە پاڵ شبیب، (ابراهیم بن حجر المحلمي أبو الصقير) لەگەڵی ڕاپەڕی کە لەگەڵ (بەنی تمیم بن شیبان)بوو، شبیب لەخواروی خاکی (موصـل) و سنورەکانی خاکی (جوخی)ەوە پەڕیەوە و پاشان بەزۆر کەوتەوە بەرەو ئازەربایجان.

حەجاج نامەیەکی نارد بۆ (سفیان بن أبي العالیة الخثعمي) سـەرکردەی بەشێك لە سوپاکەی، کە ناردبووی بۆ شەڕی فەرمانڕەواکەی (طبرستان) بە لەشکرێکی پێکهاتوو لە هـەزار سوارچـاکەوە، فـەرمانی پێکـرد بگەڕێتـەوە و لەگـەڵ سـەرۆکی (طبرسـتان)دا ئاشتببێتەوە و بڕوات بەرەو شەڕی خەواریجەکان و بۆی نوسی:

...بڕۆ تـا لـە دسـکەرە دادەبـەزیت لەگـەڵ ئەوانـەی لەگەڵتن، پاشـان بمێنـەوە تـاکو سوپاکەی (حارث بن عمیرة الهمداني بن ذي المشعار) دەگاتـە لات، (ئـەو کەسـە بـوو کـە صالح بـن مسـرحی کوشـت، وتراویشـە – المنـاظر– )، پاشـان بـڕۆ بـۆ شـبیب بۆئـەوەی بەرەنگاری ببیتەوە.

بەکردەیی حارس و سوپاکەی ڕویان کردە دسکەرەوە وسوارەکانی (منـاظر) لەگـەڵی بوون کە پێنج سەد کەس دەبوون و بەسەرکردایەتی (سوره بن أبجر التمیمي) لـە (أبان بن دارم).

سوفیان بەپەلە شەڕی خەواریجەکانی دەست پێکرد و دەرچوو بۆیـان و لـە خانـەقین پێیان گەیشتەوە لە قەدپاڵی چیایەکدا، شبیب بـە فێـڵ و پلانێـك ڕوبـەڕوویان بوویـەوە، لێیان دورکەوتەوە و سەرکەوت بەڕوی چیاکەدا وەك ئەوەی نەیەوێت ڕوبەڕوویان ببێتـەوە بەڵام ئەو بەرەو کەمینێك ڕایدەکێشان کە بۆی ئامادەکردبوون بەیارمەتی (مصاد)ی برای و پەنجا سوارچاکی لەگەڵ بوو.

جا کاتێك سفیان و سەربازەکانی بینیان شبیب لەبەردەمیان هەڵدێت ووتیان: دوژمنەکەی خودا هەڵات شوێنی بکەون.

هەندێك ووتیان کە یەکێك لەوانە (عدی بن عمیرە الشیبانی)بوو: هۆ خەڵکینە پەلە مەکەن بەدوایاندا، تا دەدەین لە خاکەکە و پیایدا دەڕۆین، جا ئەگەر کەمینیان دانابێت ئەوا خۆمان پاراستووە، وەگەرنا ئەوانمان لەدەست ناچێ.

بەڵام ئەو کەسانەی لەگەڵ سوفیان بوون گوێیان نەگرت بۆ ئەم ئامۆژگاریە و پەلەیان کرد بۆ گەیشتنەوە بە شبیب و هاوەڵەکانی، کاتێك شبیب بینی ئەوان لە کەمینەکە تێپەڕیون، هێرشی بردە سەریان و لەپێشیانەوە بەری لێگرتن و بانگی کرد لە کەمینەکەی پشتیانەوە ئیدی شکانێکی ئێجگار قورس بوو بۆ سوپاکەی سوفیان.

دوای ئەو شکانە (سفیان بن ئەبی العالیە) نامەیەکی نارد بۆ حەجاج و شکانەکەی پێ ڕاگەیاند کە لە نامەکەدا هاتبوو:

لەپاشان... بە فەرماندە ڕادەگەیەنم . من کەوتمە شوێن ئەم بەرەڵا و سەرلێشێواوانە تاکو لە خانەقین پێیان گەیشتمەوە، شەڕم لەگەڵ کردن و خوا دای لە پۆزتیان و سەرکەوتین بەسەریاندا، جا کاتێك ئێمە بەو جۆرە بووین کەسانێك هاتن بۆیان لێیانەوە دیارنەبوون، پەلاماری خەڵکەکەیان دا و تێکیان شکاندن، ئینجا من چوومە ناو پیاوانێکەوە لە خەڵکی دین و خۆڕاگریی، هەربۆیە شەڕم لەدژیان کرد تاکو لەنێوان کوژراوەکاندا کەوتمە زەوی و هاوەڵەکانم هەڵیانگرتم وەك مردوو، هێنرام بۆ (بابل مهروذ)، ئا ئەوە من و ئەو سەربازانەیە کە فەرماندە بۆی ناردم وەفایان هەبوو بێجگە لە (سورە بن أبجر) کە ئەو نەهات بۆلام و لەگەڵم نەبوو تاکو ئەوکاتەی کە دابەزیم لە (بابل مهروذ) ئینجا هات و شتێکی ووت من نازانم، پۆزشێك دێنێتەوە کە پۆزش نیە...والسلام.

سەرەڕای شکانی سوفیان کەچی بە ئازایەتی و نەترسیەوە شەڕی کرد تاکو لە گلەپانی شەڕەکەدا بە برینداری کەوتە سەر زەوی ، هەربۆیە حەجاج بە بوێریەکەی سەرسام بوو و ووتی: کێ وەك ئەمەی کردووە؟ کێ وەك ئەمە بەرامبەرەکەی شڕ و وڕ کردووە؟

نامەی بۆ ناردەوەو ووتی:

لەپاشان...تۆ باشترین ڕوبەڕووبوونەوەت لەگەڵ دوژمن ئەنجام دا، ئەوەی لەسەرت بوو بەجێت گەیاند، هەرکات ئێش و ئازارت ئەما و برینەکەت ساڕێژ بوویەوە بەپەلە و دەست بەجێ وەرە بۆلام تاکو پاداشتەکەت بیەیتەوە بۆ کەس و کار و خانەوادەکەت..والسلام.

پاشانیش نامەی نوسی بۆ (سورە بن أبجر) سەرزەنشتی کرد لەسەر ئەوەی کە پەلەی نەکردووە بۆ خۆگەیاندن بە سوپاکەی سوفیان:

لەپاشان...ئەی کوڕی (ئوم سورە)، تۆ نەدەبوایە بوێری پەیمانی من وازلێبێنیت و لە سەربازەکانم جیاببیتەوە، جا کە نامەکەمت پێگەیشت پیاوێکی توندوتیژ لەوانەی لەگەڵتە بنێرە بۆ ئەو ئەسپ سوارانەی هان لە مەدائن، با لەناویاندا پێنج سەد پیاو هەڵبژێرێت و پاشان بیاندات بەر بۆلای تۆ، پاشان بیان بە تاکو ئەم یاخی و سەرلێشێواوانە دەبینیت، ئینجا خۆت کۆکەرەوە بۆ ڕوبەڕبوونەوەی دوژمنەکەت، باش بزانە باشترین شەڕ ئەوەیە پلان و فێڵی باشی تێدابێت.. والسلام.

هەر بەکردەیی (سورە) فەرمانەکەی حەجاجی بەجێ گەیاند و (عدی بن عمیرە)ی نارد بۆ مەدائن، لەوێ هەزار سوارچاکی لێبوو، لەناویاندا پێنج سەدیانی هەڵبژارد و پاشان گەڕایەوە بۆلای (سورە بن أبجر) لە (بابل مهروذ)، پاشان کەوتە شوێن شبیب و بەدوایدا گەڕا.

شبیب هات بۆ مەدائن خەڵکەکەی خۆیان لێ دەشاردەوە، ئەویش ئاژەڵی زۆری دەستخست بۆ ئەسپ سوارەکانی، هەرکەسی بدیایە لە شەقامەکانیدا دەیکوشت، کاتێک زانی کە (سورەت کوڕی ئەبجەر) دێت بۆی، لەگەڵ هاوەڵەکانی چوو بۆ نەهرەوان، ئالەوێدا بیری براکانیان کەوتەوە ئەو خەواریجانەی کە ئیمامی عەلی کوڕی ئەبو تالیب — ڕەزای خوای لێبێت— لەناوی بردن، هەربۆیە داوای لێخۆشبوونیان کرد بۆیان و لە ئیمامی عەلی و هاوەڵەکانیشی خۆیان بەری کرد، پاشان دەریای نەهرەوانیان بڕی و لەلای ڕۆژهەڵاتی ڕوبارەکەدا دابەزین.

(سورەت) هات و لە (بقطراثا) دابەزی و سیخوڕ و شەویارەکانی هەواڵیان پێدا کە شبیب و یاوەرەکانی لە نەهرەوانن، ئینجا بە هاوەڵەکانی گوت: بەڕاستی ئەوان بەدەگمەن دەدرێن بەزەویدا ، دەتان بەزێن و زاڵ دەبن بەسەرتاندا، بۆم باسکراوە کەم جار ئەوان لە سەد پیاو زیاتر بن ، بۆیە بەباشم زانی کە هەڵتان بژێرم و بە سێ سەد پیاو لەێوەوە لە ئازا و بەهێزەکانتان بڕۆم بۆیان لەکاتێکدا ئەوان دڵنیان لێتان و وادەزانن لە شوێنی مانەوەتانن، من تکام وایە خوای گەورە لەناویان بەرێ وەك ئەو برایانەیان کە پێشتر لە نەهرەوان لەناو چوون.

پێیان ووت: چیت پێ خۆشە وا بکە.

(سورەت) دەیویست لای نەهرەوان ڕوبەڕویان ببێتەوە، گەشبین بوو و دڵخۆش بوو بە شوێنەکە بەجۆرێك پێشەوا علی کوڕی ئەبو تالیبیش- خوای لێ ڕازی بێت - هەر لەپاڵ ئەو ڕوبارەدا ڕوبەڕوی خەواریجە یەکەمینەکان بوویەوە و زاڵ بوو بەسەریاندا و کوشتنی، ئەگەرچی دەیزانی ژمارەشیان کەمە، کەچی لە پیاوە ئازا و بەهێزەکانی سێ سەد پیاوی هەڵبژارد و پەلاماری شبیب و هاوەڵەکانی پێدان، کەچی هەر سورەت و سەربازەکانی شکان و شبیب بەسەریاندا سەرکەوت و (سورە) و ئەوانەی لەگەڵی مابوونەوە و نەکوژرابوون هەڵاتن بۆ سەربازگەکەیان، شبیب شوێنی کەوت و دەیویست لەناو سەربازگەکەیدا تێکی بشکێنێت، وە شبیب چوویە مەدائینەوە و خەڵکی تیربارانیان کردن ولەسەربانی خانوەکانەوە بەردبارانیان کردن.

هەربۆیە لە مەدائن چوویە دەرەوە و تا تێپەڕی بە (کلواذا)دا لەوێ ئاژەڵێکی زۆری حەجاجی دەستکەوت، پاشان لەوێش دەرچوو بەرەو خاکی (جوخی) پاشان پەڕیەوە بەرەو تکریت و سەربازەکانی حەجاج لەبەردەمی هەڵاتن هەتاکو لە کوفە پێی گەیشتنەوە.

کاتێك حەجاج بەوەی زانی کە (سورەت) چی کردووە ووتی: خوا (سورەت) نابوت بکات، سەربازگە و سەربازەکانیشی لەدەست دا ، چۆڵی کرد تا بوویە شوێنی مانەوەی خەواریجەکان، دە سوێند بەخوا خراپی پێدەکەم[١].

هەربەم جۆرە شبیب بەو ژمارە کەمەی سوارچاك و جەنگاوەرەکانیانەوە کە ژمارەی لە سەد و شەست سوارچاك تێپەڕی نەدەکرد توانی ترس و بیم بخاتە دڵی خەڵك و ئەو سەربازانەی حەجاجەوە کە ناردبوونی بۆی و ژمارەیان سێ هەزار سوارچاکی تێپەڕاندبوو، ئەمەش یەکێك بوو لە شتە سەیرەکانی خەواریج، کەچی هێشتا حەجاج هەر سور بوو و کۆڵی نەدا بۆ لەناوبردنیان و چوون بۆ ڕوبەڕووبوونەوەیان.

ئبین کپیر سەرسام بووە لەوەی چەندە ژمارەی خەواریجەکان کەم بووە کەچی سوپاکانی حەجاج نەیانتوانیوە بیان بەزێنن، کە ژمارەیان سەد و شەست سوارچاك بوو و سوپاکانی حەجاجیش هەزاران کەس دەبوون.

بەڵام ئەوەی تەماشای هەنگاو و پلانە سەربازیەکانی شبیب بکات بۆی دەردەکەوێت کە هونەری شەڕکردنی بەکاردەهێنا وەك فێڵ و ڕاکردن و نەمانەوە و خۆ نەگرتن لەشوێنێکدا، هەروەها بەکارهێنانی ئەو فێڵ و تاکتیکە سەربازیانەی کە مەغۆلەکانی پێ ناسرابوون لە شەڕەکانیاندا.

حەجاج دوای ئەوە بانگی (جزل) ی کرد کە (سعید کوڕی عوسمان)بوو و داوای لێکرد سوپایەك ئامادەبکات بۆ ڕوبەڕووبوونەوە و لەناوبردنی شبیب و خەواریجەکان و فەرمانیشی پێکرد کە پەلە نەکات .

پاشان جەزەل داوای لێکرد کە هیچ کام لەو سەربازانە نەخاتە ڕیزەکانیەوە کە لەبەردەم خەواریجەکان تێشکان، هەربۆیە حەجاج داواکەی پەسەند کرد و سوپایەکی بۆ پێکهێنا کە نزیکەی چوار هەزار سەرباز دەبوون.

---

[١] . سەیری (البدایە والنهایە) بکە... .حەجاج فەرمانی کرد (سورة) بەند بکەن و دواتر لێی خۆش بوو.

ئینجا سوپاکەی (جەزەل) دەرچوون بۆ ڕاوەدونان و دەرکردنی شبیب و سەد و شەست سوارچاکەکەی، نەخشەی شبیب وەك پیشەی هەموو جارەی هەڵاتن و ڕاکردن بوو لەسەرەتادا و دەرکەوتن بە دەموچاوی ترسناك و ترسێنەرەوە و جێگیرنەبوون لە شوێنێکدا.

بەڵام جەزەل لاسایی کردەوە هونەری سەربازیی (مهلب کوڕی ئەبو صفرە)ی کردەوە و پیادەیکرد لە شەڕەکەدا، بەڕۆژ بەدوایان دەکەوت و بە شەو خۆی لێ دەشاردنەوە.

شبیب هاوەڵەکانی خڕکردەوە و کردنی بە چوار کۆمەڵەوە، لە هەر کۆمەڵێك پیاوێك لە هاوەڵەکانی خۆی کردە سەرکردەیان، فەرمانی کرد هەر سەرکردەیەك لەلای خۆیەوە هێرش بکاتە سەر جەزەل، بەڵام هیچیان نەیان توانی هیچ شتێك بکەن.

لەگەڵ درێژەکێشانی کات و ڕونەدانی شەڕێکی یەکلاکەرەوە، حەجاج نامەیەکی نارد بۆ جەزەل و تیایدا ووتی:

لەپاشان...بەڕاستی من تۆم لەگەڵ سوارچاکانی خەڵکی شارەکە و گەورەکانیان نارد، فەرمانم پێکردیت شوێنی ئەم یاخی و بەرەڵا و سەرلێشێواوانە بکەویت هەتا دەیانگەیتێ، وازیان لێ نەهێنی تاکو دەیانکوژیت و لەناویان دەبەیت، کەچی تۆ شایی گێڕان لە ئاوەدانییەکان و خێمە هەڵدان لە خەندەقەکاندا بەلاتەوە ئاسانتر و خۆشترە لەوەی فەرمانەکەی من بەجێ بێنێت، لە دەرپەڕاندن و لەناوبردنیان..والسلام.

پاشان حەجاج پاش ئەو نامەیە جەزەلی دورخستەوە و لای برد لەسەر کارەکەی و لەبری ئەو (سعید بن المجالد الحمدانی) نارد و داوای لێکرد خەواریجەکان لەناوبەرێ بەبێ چاوەڕوانی و خاوەخاو وەك چۆن جەزەل وای دەکرد، لەو شوێنەیان کە کۆتاجار تیایدا جێگیربوون لە (نەهرەوان).

ئینجا سەعید هات و چوویە سەربازگەکەی خەڵکی کوفەوە و ووتارێکی بۆدان و هانی دان بۆ دەرچوون بۆ شەڕی ڕوبەڕوبوونەوەی خەواریجەکان، ئینجا جەزەل پێی گووت: تۆ لەناو کۆمەڵێك خەڵکی لە پیاو و شۆڕەسوارەکانیان دا بمێنەرەوە و خۆتیان بۆ دەربخە، چونکە بەخوا دێنە سەرت، هاوەڵەکانت پەرت و بڵاو مەکەوە.

بەڵام ڕاکەی ئەوی بەلاوە گرنگ نەبوو و سوپاکەی کوفە پەرتەوازە بوون، لەکاتێکدا شبیب لەڕێگادا بوو بەرەو (رامهرمز) ئەویش خۆی و هاوەڵەکانی نانیان دەخوارد، یەکێك هەواڵێکی ناخۆشی هێنا و ووتی کە دوژمن لە هەموو لایەکەوە دەورەی داون، خواردنەکەی تەواو کرد و پاشان دەرچوو و خەڵکی هانداو سەعیدیش بە هێواشی بە ئاژەڵەکانەوە دەهاتن بەرەو ڕوی، شبیب لەناو هاوەڵەکانیدا هاواری کرد: بەریان پێ بگرن و ڕوبەڕوویان ببنەوە، چون سوێند بەخوا یان فەرماندەکەیان دەکوژم یان دەمکوژێت.

شبیب هێرشی کردە سەریان بەو پیاوانەی لەگەڵی بوو، تێکی شکاندن و ئینجا هەڵی کوتایە سەر سەرکردەکەیان و بە شمشێر لێیدا و کوشتی، جەزەل بە گوڕوتین و ئازایەتیەوە شەڕی کرد هەتا بریندارکرا و بردیان بۆ مەدائن.

جەزەل نامەی نوسی بۆ حەجاج و زانیاری دایە و هەواڵی پێدا دەربارەی ئەوەی ڕویدا، ئینجا حەجاج نامەی بۆ نوسیەوە و ستایشی کرد و ڕای بوونی خۆی لەو و سەعیدی کوڕی مجالد ڕاگەیاند کە لە شەڕەکەدا کوژرا.

ئیبن کپیر سەرنجێك لەسەر ئەو کارە دەنوسێت کە شبیب کردی و دەفەرموێت: "حەجاج کۆڵی نەدا و بەردەوام بەدوایەوە بوو، لەشکر و سوپاکانی بۆ ئامادە دەکرد و یارمەتی وەردەگرت، کەچی شبیب گوێی بە کەس نەدەدا و تەنها سەد و شەست سوارچاکی لەگەڵ بوو..کە ئەمەش لە سەیرترینی شتە سەیرەکان بوو".[1]

ئینجا شبیب و هاوڕێکانی ڕویان کردە کوفە بۆئەوەی گەمارۆی بدەن، دەستە بەجێ هەموو سوپای حەجاج هاتن بۆ (سبخة) بۆ ڕوبەڕووبوونەوەی، شبیب گوێی پێ نەدەدان، بەڵکو بەڕاستی خەڵکی کوفە لێی وەڕس بووبوون و دەترسان تاکو داوای سوپای حەجاجیان کرد بێتە کوفەوە و خۆیانی پێ بپارێزن.

---

[1] . (البداية والنهاية) وە لە (تأريخ الطبري) دا وەك وردەکاریەك بۆ ئەو شەڕانەی شبیب ئەنجامی دا و تیایاندا سەرکەوت بەسەر سەربازەکانی حەجاج دا.. بەڕاستی ئەو و شوێنکەوتوەکانی دوانجار نەگەیشتنە نزیکەی هەشت سەد سوارچاك.

شبیب لە مەدائن لە یەکێك لە (کڵێسا)کان دابەزی و گوێی نەدەدا بە نەخشەی سوپاکەی حەجاج کە ناردبووی بۆ ئەوەی شوێنی بکەون، بەڵکو فەرمانی کرد خواردن و گۆشتی برژاوی بۆ ئامادە بکەن، پێیان ووت: سەربازەکان هاتون بۆت ئاگات لەخۆت بێت.

گوێی نەدا بەوە و بەو پیاوەی وت کە خواردنەکەی ئامادە دەکرد: باشی دروست بکە، پێی بگەیەنە و پەلەی لێ مەکە.

کاتێك خواردنەکە ئامادەبوو، خواردی و پاشان دەستنوێژی گرت و نوێژێکی تەواو و لەسەرخۆ و ئارامی بە هاوڕێکانی کرد، پاشان قەڵغانەکەی کردە بەر و دوو شمشێری کرد بە لاتەنیشتیدا و ستونێکی ئاسنی هەلگرت و ووتی: هێسترەکەم بۆ زین بکەن.

ئینجا سوار هێسترەکەی بوو بە (مصاد)ی برای گووت: سوار ئەسپێك بە.

ووتی: نا، پاسەوانی هەر کەسێك ئەجەل و مردنی خۆیەتی.

خۆی سوار بوو و پاشان دەرگای کڵێساکەی کردەوە کە خۆی تیا حەشاردابوو و دەیگوت:

من شەیدا و دێوانەم ...بێجگە لە حوکمی خودا هیچ حوکمێکی تر بوونی نیە.

ئینجا چووە پێش بەرەو فەرماندەی سوپاکەی حەجاج (سعید بن المجالد) و ستونە ئاسنەکەشی لە دەست بوو، پێیدا کێشا و کوشتی.

پاشان پەلاماری سوپاکەی تری دا و فەرماندەکەی ترسا و خەڵکەکە هەڵاتن لە دەستی و پەنایان برد بۆ کوفە تا خۆیانی تێدا بشارنەوە، شبیب شوێنی کەوت بۆ کوفە لە خوارەوەی ڕوباری فورات، کۆمەڵێکی لەوێ کوشت تەنانەت حەجاج بۆخۆیشی لە کوفە هەڵات بەرەو بەصرە و لەجێی خۆی (عروه بن المغیره بن شعبه)ی دانا لەوێ.

هەربەوجۆرە ڕەوشەکە و شەڕەکانی شبیب وا ئاڵۆز بووبوو تەنانەت حەجاج خۆیشی هەڵات لە ڕوبەڕووبوونەوەی ، گەرچی ژمارەی هاوەڵەکانی کەم بوو وەك پێشتر باسمان کرد، ژنەکەی شبیب کە ناوی غەزالە بوو و دایکیشی ئامادە بوون چووبوونە سوپاکەوە و

شان بەشانی ئەو شەڕیان دەکرد، هەروەها ئافرەتانی خەواریج هاتبوونە ڕیزەوە و غەزالە سەرکردایەتی دەکردن.

شبیب ویستی بچێتە کوفەوە، بۆیە بەڕێ کەوت، یەکسەر (عروة بن المغیرة) پەیامی نارد بۆ حەجاج و هەواڵەکەی پێ ڕاگەیاند، حەجاج بە پەلە لە بەصرەوە گەڕایەوە بۆ کوفە، کاتی نوێژی عەسر گەیشتە ئەوێ و چووە ناویەوە ، (شبیب)یش گەیشتە ناوچەی (المرید)ی دەوروبەری کوفە لە ڕۆژئاوایەوە.

کاتێك کۆتایی شەو داهات شبیب چووە ناو کوفەوە و بەرەو کۆشکی فەرمانڕەوا ڕۆیشت و بە ستونە ئاسنەکە کە هەڵی گرتبوو دای لە دەرگاکەی هەتا لێدانەکە شوێنەواری جێهێشت لەسەر دەرگاکە، کە دواتر ناسرابوو بە لێدانەکەی شبیب.

پاشان لە ڕێگەوبانی شارەکەدا دەڕۆیشت و چەند پیاوێکی لە گەورە پیاوانی کوفە و ناودارەکانیان کوشت وەکو : (أبي سليم) و (دليث بن أبي سليم) و (عدي بن عمرو) و (زاهر بن عبدالله العامري).

لەگەڵ شبیب دا غەزالەی هاوسەری هاتبووە کوفەوە و نەزر (ئامی) کردبوو وەك پێشتر باسمان کرد کە لە مزگەوتی گەورەی کوفە دوو ڕکات نوێژ بکات و سورەی (البقرە) و (آل عمران)یان تیا بخوێنێت هەر بەکردەیی شبیب ئەوەی بۆ بەجێ گەیاند و لەسەر بڵندگۆی مزگەوتەکە دانیشت و دەستی کرد بە سەرزەنشتکردن و ئانوت دان لە بەنی مەروان.

ئینجا حەجاج شەوێك چووە سەر کۆشکەکە و بانگی لە خەڵکی کوفە کرد: ئەی سوارچاکەکانی خودا سواری ئەسپەکانتان بن...

بەو بانگەوازە شەش هەزار جەنگاوەر هاتن بۆلای بۆ شەڕکردن دژی شبیب و هاوەڵەکانی، حەجاج بۆیان چوو، (شبیب)یش خۆی بۆ دەرخست و پەلاماری دەدا و ڕای دەکرد و لە سوپاکەی حەجاجی دەکوشت کە زۆربەیان فەرماندە و سەربازەکان بوون، لە فەرماندەکان (زائدة بن قدامة)ی بە دەستی خۆی کوشت، هەروەها دیسان لە

فەرماندەکان (عثمان بن قطن الحارثي) و (عقيل بن شراو السلولي) و (خالد بن نهيك الكندي) و (الأسود بن ربيعه) ی کوشت و سەدانی لە سەربازەکانیش کوشت.

ئیبن کثیر فەرموویەتی: شبیب وای لێهات بوویە دێوەزمە و (عبدالملك کوڕی مەروان) و (حەجاج) و گشت فەرماندەکانی هێنایە لەرزە، عبدالملك زۆر لێی ترسا، ترس و بیمێکی زۆر چوویە دڵی خەڵکەوە، شەڕی زۆر ڕوویدا لەگەڵیان هێشتا نەیان توانی ڕێیان پێ بگرن هەتا ساڵی نوێ دەستی پێکرد.

لە ساڵی ٧٧ك حەجاج سوپایەکی ئامادەکرد لە خەڵکی کوفە، چل هەزار جەنگاوەر بوون، دەهەزاری تری خستە سەریان، کەواتە کۆی سوپاکە بوویە پەنجا هەزار و (عتاب بن ورقا )ی کردە سەرکردەیان و فەرمانی پێکرد شبیب بکاتە ئامانج و شەڕی لەگەڵ بکات.

لەم میانەیەدا چەندین پشتیوان وهاریکار هاتنە ڕیزی سوپاکەی (شبیب)ەوە و هەزار جەنگاوەری بۆ پێکهات، سەرباری ئافرەتانی خەواریج کە غەزالە سەرکردایەتی دەکردن.

وەك نەریت و پیشەی ئاسایی شبیب هەموو جارێك کە هەواڵی ئەوەی پێدەگەیشت حەجاج سوپای بۆ ئامادەکردووە گوێی پێ نەدەدا، بەڵکو لەناو هاوەڵەکانیدا هەستایەوە بۆ وتار و ئامۆژگاری کردن و باسی خودای بۆکردن و هانی دان کە ئارام بگرن کاتێك بە دوژمن دەگەن، پاشان بەسوپاکەیەوە چوو بەرەو سوپاکەی حەجاج.

هەردوو سوپا بەیەك گەیشتن، سوپاکەی حەجاج بە سەرکردایەتی (ورقاو بن عثمان) و ژمارەیان پەنجا هەزار دەبوو، سوپاکەی شبیب ژمارەیان هەزار جەنگاوەر بوو! !

بەیەکگەیشتنەکە کاتی خۆرئاوابوون بوو، هەربۆیە شبیب فەرمانی کرد بە بانگ بێژەکە تاکو بانگی نوێژی ئێوارە (مغرب) بدات، ئینجا بانگ بێژەکە (سلام بن يسار الشيباني) بانگی فەرموو، دواتر شبیب و هاوەڵەکانی نوێژێکی تەواو و دوورودرێژیان کرد بە هێمنی و ئارامی و لەسەرخۆیی.

بەڵام (عتاب بن ورقا ) بەچواردەوری سەربازگەکەیدا خەندەقی لێدابوو، شەبیب چاوەڕوانی کرد تاکو مانگ هەڵات و ڕۆشن بوو، لە ڕاست و چەپی خۆی ڕوانی و پاشان پەلاماری ئاڵا هەڵگرەکانی عتابی دا، بەدەم وتنی:

من شەبیبی شەیدا و دێوانەم........ هیچ حوکمێك بوونی نیە جگە لە حوکمی خودا..

ئینجا تێکی شکاندن و فەرماندەکەیانی بەناوی (قبیصه بن والق) و هەروەها کۆمەڵێك لە فەرماندە سەربازیەکانی کە لەگەڵی بون کوشت، پاشان پەلاماری ڕاست و چەپی داو و پەرتەوازەی کردن.

ئینجا چووە پێش بەرەو ناو سوپاکە هەتا فەرماندەی سوپاکەی کوشت (عتاب بن ورقا ) و (زهره بن جونه)ش، پاشماوەی سوپاکە وێڵ بوون و هەڵاتن لە گۆڕەپانی شەڕەکەدا و لەکاتی هەڵاتنەکەیاندا جەستە و تەرمی (عتاب بن ورقا)یان پێشێل کرد و بەسەریدا ڕۆیشتن.

پاشان شبیب بانگی هاوەڵەکانی کرد: شوێن بەزیو مەکەون.

شتێکی سەرسوڕهێن بوو سوپایەك ژمارەکەی هەزار پیاو بێت سوپایەکی ڕێکخراو و دەوڵەتی تێك بشکێنێت کە ژمارەکەی پەنجا هەزار جەنگاوەر بێت، هەروەها فەرماندەکەیان بکوژرێت و بە بەزیوی هەڵبێن!!

شبیب دەستی گرت بەسەر هەموو ئەو شتانەی لە ماڵ و دەستکەوت و سامان لە ناو سەربازگەی سوپاکەی حەجاجدا بەجێما بوو، ئینجا ناردی بە شوێن (مصاد)ی برایدا لە مەدائن و بە هاوەڵەکانیەوە چوون بەرەو کوفە.

بەڵام حەجاج شێت و هار بوو و تەواو توڕەبوو لەو خەڵکەی کوفە کە هەڵاتبوون لە شەڕی شبیب و تێك شکابوون.

لەلایەکی ترەوە شبیب شوێنکەوتووانی تازەی هاتبوونە ڕیزەوە لەوانەی کە بەدیل گیرابوون لە سوپاکەی حەجاج، بەجۆرێك پەیمانیان پێدابوو بۆ فەرمانڕەوایەتی.

شاندێك لە (سفیان بن الابرد الكلبي) و (حبیب بن عبدالرحمن الحكمي) لە (مذحج)ەوە هاتبوون بۆلای حەجاج بە شەش هەزار سوارچاکەوە، کۆمەڵێك سەربازیشیان لەگەڵ بوو لە خەڵکی شام، بۆئەوەی بەرەنگاری شبیب ببنەوە لەبری خەڵکی کوفە.

ئینجا حەجاج هەستایەوە لەناو خەڵکی کوفەدا و وتارێکی بۆدان بەم جۆرە:

ئەی خەڵکی کوفە، خوا ئەوە سەربەرز نەکات کە سەربەرزی لە ئێوە دەوێت، خوا ئەوە سەرنەخات کە سەرکەوتنی بەهۆی ئێوەوە دەوێت، لای ئێمە دەرچن و لەگەڵمان مەبن بۆ شەڕی دوژمنەکەمان، بگەنە (حیرة) و لەگەڵ جولەکە و گاور دابەزن، کەس لەگەڵمان نەیەت بۆ شەڕ کاربەدەستەکانمان نەبێت، یان ئەوانەی کە ئامادەی شەڕەکەی (عتاب) نەبوون.

ئەم جارەیان حەجاج بۆخۆیشی ئامادەی بەرەنگاربوونەوەی شبیب بوو، تووڕەییەکەی گەیشتبووە ئەوپەڕی، سەرکردەکانی سوپاکەی لە خەڵکی شام و بەدەر لەوانیش هەڵبژاردبوو و ووتی:

ئەی خەڵکی شام، ئێوە گوێڕایەڵ و ئەهلی ئارامگری و باوەڕن، با پوچی ئەو پیسانە زاڵ نەبێ بەسەر ڕاستی ئێوەدا، چاوەکان دابخەن و ببنە مەیت بەسەر سوارەکانتانەوە، بە نوکی ڕمەکانتان ڕوبەڕووببنەوە.

سەربازەکان فەرمانەکەی حەجاجیان بەجێ هێنا، شەبیب گەیشت و سوپاکەی کردبوویە سێ کۆمەڵەوە، یەکیان لەگەڵ خۆی بوون، یەکێکی تر لەگەڵ (سوید بن یلیم) و یەکێکی تریش لەگەڵ (المجلل بن وائل)، فەرمانی کرد بە (سوید کوڕی سلیم) پەلاماری سوپاکەی حەجاج بدات، ئەوانیش بەرەو سوپاکەی حەجاج ڕۆیشتن و لەدەستی حەجاج تێك شکان، حەجاج بانگی کرد:

ئەی ئەهلی ملکەچی و گوێڕایەڵی ئاوها بکەن (کە کردتان..!

پاشان شبیب فەرمانی بە سەرکردەکەی تر (المجلل بن وائل) کرد هێرش ببات، هێرشیان برد و ئەوانیش خۆیان جێگیرکردبوو بۆی، نەخشەکەی حەجاج سەرکەوتنی بەدەست هێنا بەدانانی ڕمەکان لە ڕوبەڕووبوونەوەی پیاوەکانی شبیب دا، ئەوان بازیان

دەدایە سەری و ئەمانیش کاتێکی دوورودرێژ شەڕیان لەگەڵ کردن هەتا ناچاریان کرد بکشێتەوە.

کاتێك شبیب خۆڕاگریی و پتەوی خەڵکی شامی بینی فەرمانی بە (سوید بن سلیم) کردەوە کە جارێکی تر هێرش بکاتەوە، لەپشتەوە بێن بۆ حەجاج و شبیب و ئەوانەشی لەگەڵێنی لەپێشیەوە هێرش بەرن.

حەجاجیش (عروه بن المغیرە)ی بە سێ سەد جەنگاوەرەوە دانابوو بۆ پاسەوانی کردنیان لە ئەگەری هێرشکردنی سوپاکەی شبیب لەدواوە دا، شبیب فەرمانی کرد لە پشتەوە هێرش بکەنە سەر حەجاج ، ئینجا حەجاج هاواری کرد لەوانەی لەگەڵی بوون لە خەڵکی شام:

ئەی ئەهلی ملکەچی و گوێڕایەڵی، ئارامبگرن بۆ تەنها ئەم بەرگریە، پاشان سوێند بەخوای ئاسمان و زەوی پاکیان دەکەینەوە.

ئینجا سواری ئەسپەکانیان بوون و شەبیب بەو سوپایەی هەیبوو لەگەڵ هاوەڵەکانی هێرشی کردە سەریان، بەردەوام بەرەنگار دەبوونەوە تاکو توانیان هێرش و پەلامارەکانی شبیب بۆسەریان و بۆ سەر حەجاجیش ڕاوەستێنن، ئینجا شبیب هاواری کرد لە هاوەڵەکانی: ئەی پارێزەرانی دینی خوا و پشتیوانەکانی ، زەویەکە ، زەویەکە.

حەجاجیش بانگی کردە ئەوانەی لەگەڵی بوو:

ئەی خەڵکی شام، ئەی ئەهلی ملکەچی و گوێڕایەڵی، سوێند بەوەی گیانی منی بەدەستە ئەمە یەکەم سەرکەوتنە.

ئەو ڕۆژە بەدرێژایی ڕۆژەکە خەڵك شەڕێکی قورسیان کرد.

پاشانیش (خالد بن عتاب) کە یەکێك بوو لە سەرکردەکانی سوپاکەی حەجاج هێرشی بردە سەر سەربازگەی خەواریجەکان و چوار هەزار سەربازی لەگەڵ بوو، چوویە سەربازگەکەوە و پەلاماری دان، (مصاد)ی برای (شبیب)ی کوشت، هەروەها غەزالەی ژنی (شبیب) کوژرا، پیاوێك کوشتی پێی دەوترا (فورة بن دقاق الکلبی)، شبیب و ئەو

پاشماوە سەربازەشی لەگەڵی مابوونەوە هەڵاتن، سەربازەکانی حەجاج کەوتنە شوێنی بەڵام نەیانگرتنەوە.

هەربۆیە حەجاج زۆر بەم سەرکەوتنە دڵخۆش بوو، (الله أکبر)ی کرد و هاوەڵەکانیشی بەدوایدا.

پاشان حەجاج چوویە کوفەوە قسەی بۆ خەڵکەکە کرد و ووتی: بەڕاستی شبیب پێشتر نەبەزی بوو.

دوای ئەوە شبیب بەرەو کوفە ڕۆیشت، یەکەیەک لە سوپاکەی حەجاج ڕوبەڕووی بوونەوە و لە ڕۆژی چوار شەممەوە تاکو هەینی لەگەڵی شەڕیان کرد.

بەڵام شبیب پەلاماری ئەم یەکەیەی دا و شکاندی، (حارث بن معاویە الثقفي) سەرکردایەتی دەکرد و پێک هاتبوون لە هەزار سوارچاک، بەڵام لەبەردەم شبیب و هاوەڵەکانی هەڵاتن و لە کوفە خۆیان حەشاردا.

پاشان (أبو الورد)ی ژێردەستی حەجاج و کۆمەڵێک لە سوپاکەی چوون بۆ شبیب، بەڵام (أبو الورد) کوژرا و هاوەڵەکانی هەڵاتن و چوونە کوفەوە، پاشان زۆر کەسی تر بۆی چوون وەلێ نەیان توانی بەرگەی خەواریج بگرن.

پاشان شبیب بە هاوڕێکانیەوە ڕۆیشتن بەرەو (سواد) دایان بەلای کاربەدەستەکەی حەجاج لەم شارە و کوشتیان، پاشان شبیب وتارێکی لەناو هاوەڵەکانی پێشکەش کرد و وتی: سەرقاڵبوون بەدونیاوە و وازتان لە دواڕۆژ هێناوە.

پاشان ماڵەکەی کردە ڕوباری فوراتەوە، دواتر بردنی تاکو چووە چەند شارێکی تردەوە و کەس نەیدەتوانی ڕوبەڕوی ببێتەوە و پێشی پێ بگرێت، تەنانەت زۆر خەڵک و فەرماندە و سەربازی کوشت، هەروەها حەجاج ماڵ و پارەیەکی زۆری بەخشی لەپێناوی وەدەستخستن و گرتنی شبیب و هاوەڵەکانی بەڵام چاریان نەکرد.

حەجاج نامەی نوسی بۆ نوێنەرەکەی لەشاری بەصرە کە (حکم بن أيوب بن الحکم بن عقيل) بوو مێردی کچەکەی حەجاج بوو، فەرمانی پێکرد بۆ ئامادەکردنی سوپایەکی چوار

هەزاری تاکو بکەونە شوێن شبیب و هاوەڵەکانی و ئەو سوپایەش بە سەرکردایەتی (سفیان بن الابرد) بێت.

سوفیان هەندێك لە سەربازەکانی شامی لەگەڵ بوو، سەربازەکانی بەصرەش هاتنە ناویان و بوونە یەك سوپا، پاشان سوفیان بردنی بۆ شەڕی شبیب و هاوەڵەکانی.

هەردوو لا ڕووبەڕووی یەکتر وەستان و شەڕێکی قورسیان کرد، سوپای خەواریجەکان وەك هەمیشە ژمارەیان کەم بوو، سەربازەکانی حەجاج هەڵمەتێکی پێشوەختەیان بردە سەریان، دەست بەجێ خەواریجەکان لەبەردەستیان هەڵاتن و ناچاربوون چونە سەر پردێك لەوێدا، شبیب بە سەد کەس لە هاوەڵەکانیەوە لەوێ ڕاوەستا و سوفیان نەیتوانی پاش شەڕێکی دوورودرێژ بە درێژایی ڕۆژەکە تێکی بشکێنێت.

پاشان سوفیان فەرمانی بە هاوەڵەکانی کرد و هەموو پێکەوە تیربارانیان کردن، ئینجا خەواریج هەڵاتن و پاشان بۆجاری دووەم گەڕانەوە بۆ تیرهاوێژەکان و نزیکەی سی پیاویان لە هاوەڵەکانی سوفیان کوشت و شەڕەکەش کۆتایی پێهات بەبێ سەرکەوتنی هیچ لایەك، دواتر شەو داهات و هەردوو لا وازیان هێنا لە شەڕ و چاوەڕێیان کرد تاکو بەرە بەیان.

کاتێك ڕۆژ بوویەوە، شبیب و هاوڕێکانی بە پردەکەدا گوزەریان دەکرد، لەو کاتەی کە شبیب لەسەر پردەکە بوو و بەسواری ئەسپەکەی ..مێیەکەشی لەبەردەمیەوە دەڕۆیشت..ئەوکاتە هەڵی کوتایە سەر مێیەکەی بەردەمی و شبیب لەسەر پشتی کەوتە خوارەوە و کەوتە ڕووبارەکە، ئینجا ووتی: ﴿لِيَقْضِيَ اللَّهُ أَمْرًا كَانَ مَفْعُولًا﴾[١].

پاشان نوقم بوو لەئاوەکە و درعەکەشی پێوە بوو دەیگووت: ﴿ذَٰلِكَ تَقْدِيرُ الْعَزِيزِ الْعَلِيمِ﴾[٢].

---

١ . الانفال: ٤٢. بۆ ڕاڤەی ئایەتەکان سەیری تەفسیری ئاسان بکە

٢ . الأنعام: ٩٦. بۆ ڕاڤەی ئایەتەکان سەیری تەفسیری ئاسان بکە

هەربەم جۆرە شبیب لەو ئاوەکەدا نوقم بوو و خنکا، کاتێك خەواریجەکان زانیان مردووە و (الله أکبر)یان کرد و بە پەرتەوازەیی لە شارەکەدا بڵاوبوونەوە.

ئینجا فەرماندەی سوپاکەی حەجاج (سوفیان) هات و لاشەکەی لە ناو ئاوەکە دەرهێنا و قەڵغانەکەشی پێوەبوو، پاشان فەرمانی کرد بە لەتکردنی سنگی و دڵی دەرهێنا و تۆپەڵێکی ڕەق بوو هەروەك بەرد، دەڵێن دەیاندا بە زەویدا بە ئەندازەی بەژنی مرۆڤێك بەرز دەبووەوە.

لە گێڕانەوەیەکی تردا هاتووە سەبارەت بە کوژرانی شبیب تیایدا هاتووە کە هەندێك لە هاوەڵەکانی ڕقیان لێی هەستا و سەر پردەکەیان لێگرتووە و پەلاماریان داوە ئیدی ئەسپەکەی بەرزدەبێتەوە و ئەویش دەکەوێتە نێو ئاوەکە.

کاتێك هەواڵی کوژرانی شبیب هات بۆ دایکی ووتی:

ڕاست دەکەن.. من کاتێك ئەوم لە سکدا بوو خەوم بینی کە بڵێسەیەك ئاگر لێوەی دەرچوو، زانیم کە ئاگر تەنها بە ئاو دەکوژێتەوە، ئەویش هیچ شتێك نایکوژێنێتەوە ئاو نەبێت.

دایکی زۆر ئازا و بەهێز بوو لە شەڕدا وەکو ژنەکەی شبیب.. هەروەك ئیبن خەلەکان باسی کردووە دایکی (شبیب)یش هەر لەم شەڕەدا کوژراوە.

بەم جۆرە ئاژاوەکەی (شبیب کوڕی یەزید) کۆتایی پێهات کە بانگەشەی بۆ خەلافەتی خۆی دەکرد و بەخۆی دەگوت ئەمیری بڕواداران.

***

٨

# چەند ڕاپەڕین و شۆڕشێك دژی زۆرداریی

- سەرەتای شۆڕشەکان دژی ستەمی حەجاج دەست پێدەکات و کۆتایی پێ نایەت.
- شۆڕشی (عبدالله بن الجارود).
- شۆڕشی (زنجەکان).
- شۆڕشی (مطرف بن المغيرە بت شعبە).

# سەرەتای شۆڕشەکە لەدژی زۆرداری و ستەمەکانی حەجاج دەستی پێکرد و کۆتایی پێنەهات

## "سەرەتا..شۆڕشەکەی عبداللەی کوڕی جارود"

زۆرداری و ستەم هەرگیز لە ڕژێمە دیکتاتۆریەکان جیانابێتەوە، حەجاجیش کە بەناوبانگ ترین فەرمانڕەواکانی بەنی ئومەییە بوو، بە تێڕوانین بۆ زۆر و ستەمی خۆی و سەردارەکەشی (عبدالملك کوڕی مەروان)، جێنشین و سەرۆك وەزیرانەکەشی (حەجاج) دوو ڕووی یەك دراو بوون، ئامرازی دەستەمۆی دەستی خەلیفە بوو و تیرێکیش بوو لە تیرەکانی و نەخشەکانی ئەوی جێ بەجێ دەکرد.

لەبەر ئەمە عبدالملك کاتی سەرەمەرگی ڕاسپاردە و وەسیەتی بۆ (وەلید)ی کوڕی و جێنشینی کرد کە حەجاج بگرێت و دەستی لێ بەر نەدا و لە دەسەلاتدا بیهێڵێتەوە، تەنانەت (وەلید کوڕی عبدالملك) کاتێك بە مردنی حەجاجی زانی، ووتی: داوا لە خودا دەکەم لە حەجاج خۆش ببێت.[1]

خەلیفە (وەلید) خەمبار بوو بۆ حەجاج و پاش چەند مانگێك دوای حەجاج ئەویش کۆچی دوایی کرد.

ئیدی حەجاج وای لێهات هەر کەناوی دەبرا لە مێژوودا یەکسەر ناوی ئەو زۆرداری و ستەم و خوێن ڕشتنەی دەهێنایەوە بیری خەڵك کە لەپێناوی دەسەلآت دا ئەنجامی

---

[1] سەیری (المحاسن والأضداد)ی (جاحظ) و (النجوم الزاهرة)ی (أتابكي) بکە.

دابوون، سەرەڕای ژمارەیەکی زۆر کەمی نوسەرەکانی سەردەم نەبێت کە بیانویان بۆ کارەکانی هێناوەتەوە و پاکانەیان بۆ کردووە.

بەڵام ئایا خەڵکی و سەرکردە و زانایان بە بێ دەسەڵاتی و دەستەوئەژنۆ ڕاوەستاون لەبەردەم حەجاج و زۆرداریەکانیدا؟

بێگومان نا...چون زۆر لە زانایانی وەکو (حەسەنی بەصری) و (سەعیدی کوڕی جوبەیر) و بەدەر لەوانیش دژی ستەم و زۆرداریەکانی حەجاج وەستانەوە و حەجاجیش دەری کردن و زۆری لێ کوشتن، کە دواهەمینیان سەعید بوو.

هەروەها هەندێك لەسەرکردە سیاسیەکانیش – بە تێگەیشتنی ئێمە– دژی زۆرداریەکانی حەجاج وەستانەوە ، ئەمەش بەجیا لە خەواریجەکان کە لە فەرمانڕەوایەتی ئەمەویەکان و حەجاج دەرچوون وەك باسمان کرد، یەکەم شۆڕشیان لە بەصرە هەڵگیرسا دژی توندوتیژی حەجاج کاتێك حەجاج ڕوی کردە بەصرە و لە (رستقباذ) قسەی بۆ خەڵکی کرد تاکو هێز و پشتیوانی بۆ (مهلب بن أبی صفرە) زیاتر بکات لە شەڕەکەیدا دژی خەواریجەکان.

لەم وتارەدا حەجاج ئەو موچە زیادەیەی – بەزاراوەی ئەمڕۆ– کە خەلیفەی پێشو (عەبدوڵای کوڕی زوبێر) بڕیاری لەسەردابوو لایبرد و نەیهێشت و ووتی:

ئەم زیادکردن و پێدانی موچە زیادەیەی کە ئیبن زوبێر کردوویەتی زیادکردنی تاوانبارێکی دوو ڕووە، ئێمە جێبەجێی ناکەین[1].

دەست بەجێ یەکێك لە گەورەکانی بەصرە (عبدالله بن جارود) بەرپەرچی دایەوە و ووتی: ئەوە زیادکردنی ئیبن زوبێر نیە بەڵکو بڕیاری ئەمیری بڕواداران (عبدالملك)ە، کە لەسەر دەستی براکەی (بیشری بن مروان)جێ بەجێی کردووە .

ئینجا حەجاج پێی ووت: تۆ و ئەم قسەیە، یان سەری خۆت باش هەڵدەگریت یان دەتبەم بۆلای.

---

١ .سەیری (انساب قریش)ی (أحمد بن یحیي بن جابر البلاذري) و (البدایة والنهایة ) بکە

هەربۆیە ئیبن جارود زۆر سەری سوڕما لەم وەڵامدانەوە ناکامەی حەجاج و گوتی: ئاخر بۆچی؟ من ئامۆژگاریم کردی و بەڕاستی ئەمەش خەڵکە پشتیوانیم دەکەن.

ئابەم جۆرە یەکەمین شۆڕش و بەرهەڵستی دژی ستەم و زۆری حەجاج سەری هەڵدا، بەهۆی (خەرجیەکانەوە) کەبریتی بوون لەو موچە و خەرجیانەی بۆ سەربازەکان خەرج دەکران، ئیبن جارود بەناوی زیانمەندان و لێقەوماوانی خەڵکی بەصرەوە قسەی دەکرد، ئەوەی ئیبن جارود کردی وەك ئەوەیە کە لە سەردەمی خۆماندا ئەوانەی پیشەیەکیان هەیە لە حکومەتدا ئەنجامی دەدەن لە خۆپیشاندان و مانگرتن و بەرهەڵستکاری دژی حکومەتەکەیان کە موچەکانیان کەم دەکاتەوە یان دژی یاسایەك کە ژیان و گوزەرانیان بەرەو خراپی دەبات، بەم جۆرە یەکەم شۆڕش دژی ستەم سەرەتای تۆفانەکە بوو وەك چۆن پەندێك هەیە دەڵێت: (**قەپ لە دڵم بگرە نەك لە کولێرەکەم**).

ئەوەی سەیری ڕوداوەکان بکات لەیەکەمین ساتەوەختەکانی فەرمانڕەوایەتی حەجاج و ئەو کارەی کردی کاتێك چووە کوفە و پاشان بەصرە و کوشتنی هەرکەسێك کە دوابکەوتایە لە دەرچوون بۆ چوونە نێو سوپای ئەمەویەکانەوە بۆ شەڕی خەواریجەکان و ڕانەپەڕانی خەڵکی لێی لەسەر ئەم کارەی بۆی دەردەکەوێت کە شۆڕشەکە بەهۆی کەمکردنەوەی موچەکان و ئەو زۆرداریەی حەجاجەوە سەری هەڵدا کە لەیەکەم دەرفەتدا توندوتیژانە مامەڵەی لەگەڵ کردن بە بێ گوێدان بە خەمەکانیان.

لەپاڵ ئیبن جارود دا چەندین بەرهەڵستکار کۆبوونەوە دژی حەجاج و دەیانەویست بوو هەڵگەڕێنەوە لە فەرمانڕەوایەتیەکەی، دژی ستەمەکانی بووەستنەوە و بۆ کەمکردنەوەی موچەکانیشیان دەنگ هەڵبڕن، حەجاج دەیویست هێز و زۆری خۆی بۆ خەڵکی عێراق دەربخات.

نابێت لەبیرمان بچێت کە لە کاتی گفتوگۆ و کۆبوونەوەکاندا لەبارەی کەمکردنەوەی موچە و بەخشینەوە لە زەمانی حەجاجدا و هەموو سەردەمێکدا دەستەیەك لە خەڵکی دوو ڕوو دەردەکەون پشتگیری و پشتیوانی لە دەسەڵاتی فەرمانڕەوا و بڕیارەکانی دەکەن، هەر ئەمەش بوو ڕوویدا لە سەردەمی حەجاج دا بەجۆرێك یەکێك لە پیاوەکانی کە

(مصقلة بن كرب العبدي) بوو بەرپەرچی بەرهەڵستکارەکانی دایەوە بە ووتنی: " زێر دەست و گەل بۆی نیە بەرپەرچی سەردار و سەرکارەکەی بیێتەوە، ئێمەش ئەوەی فەرماندە ووتی بیستمان بە ملکەچی و گوێڕایەڵیەوە جا بەدڵمان بێت یان بەدڵیشمان نەبێت".

دەست بەجێ سەرکردەی بەرهەڵستکاران (عبدالله بن الجارود) وەڵامی دایەوە و ووتی: ئەی کوڕی (جورموقانی)[1] تۆ و ئەم قسەیە، کەی کەسی وەك تۆ دەمی کردۆتەوە و قسەی لەم جۆرەی کردووە؟

پاشان ئەوەبوو کە بەرپەرچی ئەو زۆرداریە بە شۆڕش و ڕاپەڕین لەدژی درایەوە ، بەرهەڵستکاران لەلای ئیبن جارود کۆبوونەوە و لەسەرو هەموشیانەوە (عبدالله بن حکیم المجاشعي) و (هزیل بن عمران) و بێجگە لەوانیش لە گەورە و سەرکردەکانی بەصرە و پەیمانیان پێدا کە لەگەڵی بووەستنەوە دژی ستەم و زۆرداریی حەجاج و ووتیان:

گەر ئەم پیاوە — حەجاج — واز نەهێنێت و ئەو ریادە موچەیەمان لێ کەم دەکاتەوە، کەواتە یەڵلا پەیمانت پێ دەدەین بۆ دەرکردنی لە عێراق و پاشان نامە دەنوسین بۆ عبدالملك داوای لێ دەکەین کەسێکی تر بێجگە لەو بکاتە فەرمانڕەوامان، ئەگەر بەگوێی نەکردین ئەوا ئێمەش لە بەیعەت پێدانی پاشگەز دەبینەوە، دڵنیاین تاکو خەواریج هەبن پێمان دەدات[2].

هەر بەم جۆرە نەخشەی شۆڕش لە بەصرە سەری هەڵدا دژی حەجاج بەبێ خەلیفە، مەگەر لە حاڵەتێك کە خەلیفەش ڕازی نەبێت فەرمانڕەوایەکی تر بێجگە لە حەجاج

---

[1] . الجرمقانية: وشەیەکی باوی پڕاوپڕی کوردی نیە لەگەڵیدا هاوتابێت کە بۆ ئەو سیاقە بگونجێت بەڵام زۆربەی فەرهەنگە کوردی و عەرەبیەکان ئەو وشەیە بە وشەی (سەرپێڵاو) لێك دەدەنەوە...کە بریتیە لە پێڵاوێکی کورت بەسەر پێڵاودا دەکرێتە پێ...(خف صغير يلبس فوق الخف).. هەندێکیش پێیان وایە مەبەست لێی هۆزێکە لە عەجەم لە سەرەتاکانی ئیسلامدا لە موصڵ نیشتەجێ بوون.... سەرچاوە...
.www.almaany.com.... ..www.maajim.com/dictionary

[2] .سەیری (انساب قريش) و (الكامل في التأريخ) و (مقدمة ابن خلدون) بکە.

دابنێت، خەڵکی بەصرە هیچ نەترسان لەوەی کە لە هەمان ئەو ساتەوەختەدا دەسەڵات و سوڵتانی خەلافـەت لەلایـەن خـەواریجی ئەزاریقـەوە ڕوبـەڕووی هەڕەشـە بـوو بوویـەوە، یەکیان ئەم هۆنراوەیەی گووت:

أخلق بعَبْد اللّهِ إن يسوسا ... وأن يقود جحفلا خميسا

ويخلعوا الخليفة المتعوسا...... إذ قلدوا أمرهم الرئيسا

أكرم بِهِ من قائد قدموسا.. ... نحن قتلنا مصعبا وعيسى

وكم قتلنا منهم بئيسا

ئەم شۆڕشە لە مانگی ڕەبیعی کۆتایی ٧٦ك دا بوو.

کاتێك حەجاج بە کاری ئەو شۆڕشەی زانی سوپاکەی ئامادە کرد و ئەو پردەی بڕی کە لەنێوان خەڵك و گەنجینەی دەوڵەتدا بێ بار وەستابوو، پاشان نامەی نارد بۆ (عبداللـە ی کوڕی جارود) و داوای لێکرد دانوستانی لەگەڵ بکات، ئیبن جارودیش بە نامەهێنەرەکـەی حەجاجی گووت: نا.. کوڕی (أبـو رغـال[1]) هـیچ ڕێـز و شـکۆیەکی نیـە، یـان بـە سـوکی و ڕسوایی و دەرکراوی لەناومان دەردەچێت، یان بەرەنگاری دەبینەوە.

وەڵامـی نامەبەرەکـەی حـەجاجیش کـە هـاوەڵێکی (بیشـر کـوڕی مـەروان) بـوو چـەند ووشەیەك بوو حەجاج پێی ووتبوو لـە ئەگـەری ئـەوەی کـە ئـیبن جـارود بـە نـەرێ وەڵام بداتەوە بۆ فەرمانەکەی حەجاج. کە پەیامێکی زارەکی بوو:

ئایا دڵت ئاودەخواتـەوە بەکوشـتنی خـۆت و کوشـتنی کـەس و کـار و خزمانـت؟! دە سوێند بـەوەی گیـانی منـی بـە دەسـتە گـەر نەیـەی کۆمەڵەکـەت بەگشـتی و کەسوکارت بەتایبەت دەکەم بە پەندی زەمانە.

---

[1] - أبو رغال: پیاوێك بوو لە خەڵکی ثمود کە خوای گەورە بەمبلاکیا بردن و ئەم لە تورەیی خـودا ڕزگـاری بـوو چونکە لە ناو حەرەمی مەککەدا بوو.

ئینجا ئیبن جارود پێی گووت: گەر تۆ نامەبەر نەبوویتایە و نامەبەریش ناکوژرێت.....دەمکوشتی.

فەرمانی کرد لێیدا و ڕۆیشت و گەڕایەوە بۆلای حەجاج و پێداگریەکەی ئیبن جارودی پێ ڕاگەیاند سەبارەت بە داواکاریەکانیان کە خۆیان وێنا دەکەن لە ڕۆیشتنی حەجاج لە وڵاتەکە، ئەم مەرجەش ئەوەبوو کە حەجاج پەرچی دەکردەوە، مەگەر خەلیفە عبدالملك خۆی فەرمانی پێ بکات جێی بهێڵێت.

ڕاپەڕیوان کشان بەرەو دەوار و هەوار و چادرگەی حەجاج هەرچی توانایان بەسەریدا شکا بردیان و تالآنیان کرد لە خواردن و ئازوقە و ئاژەڵ، هەروەها ژنەکەی حەجاج کە (کچی نعمان بن بشیر) و (ئوم سەلەمە )ی کچی (عبدالرحمن بن اسماعیل بن عمرو) یان بەدیل گرت، ئەوەش بۆ ترساندنی حەجاج تا وای لێ بکەن وڵات جێ بهێڵێ وبڕوات[1].

وەلێ هەموو ئەمانە حەجاجیان نەترساند، دەستی کرد بە کۆکردنەوەی شوێنکەوتوان لە دەوری خۆی و هەڕەشە و گوڕەشەی دەکرد لە هەرکەسێك کە لەم ئاژاوەیەدا نایەتە پالی.

بەڵام ئیبن جارود ڕاوێژی بە هاوەڵەکانی کرد لەم ڕەوشەدا، (غضبان بن القبعثري الشيباني) پێی باش بوو کە ئیبن جارود ڕاپەڕینەکە دژی حەجاج تەواو بکات و پێی گووت:

ژەمی ئێوارە لە (جدی) بخۆ، پێش ئەوەی ئەو دەستپێشخەری بکات هێرشی بۆ بکە، ئایا نابینیت کێ هاتووە لەنێوە ، ئەگەر ڕۆژ بکاتەوە پشتیوانەکانی زیاتر دەکات.

ئیبن جارود وەڵامی دایەوە: ئێوارە نزیك بۆتەوە، بەڵام ئێمە بەرەبەیان بەپەلە لێیان رادەپەڕین.

---

[1] .سەیری (الكامل في التأريخ) و (أنساب قريش) بکە.

لەگەڵ وازهێنانی خەڵك لە حەجاج و چوونە ڕیزی ئیبن جارودەوە حەجاج و ئەوەی لە بەصرەدا بوون گیریان خوارد و گەمارۆدران، حەجاج ڕاوێژی بە کەسە تایبەتەکانی خۆی دەکرد، بۆیە (زیاد بن عمرو العتکی) پێشنیاری بۆ کرد:

کە ئەو دەسەبەری بێ وەیی و سەلامەتی بۆ دەکات لای ئیبن جارودەوە تا خۆی بگەیەنێتە لای خەلیفە.

واتە پێشنیاری کرد بۆ حەجاج هەڵبێت بۆشام کە مەڵبەندی خەلافەتە، بەڵام (عثمان بن قطن الحارثي) ڕای وابوو کە خۆڕاگربێت و ووتی: ئەمیری بڕواداران لە کاروباری خۆیدا تۆی کردە هاویەش و لەگەڵ خۆی تێکەڵی کردیت، ئامۆژگاری کردیت و دەسەڵاتی پێدایت، هەربۆیە چووی بۆ ئیبن زوبێر کە لەهەموو خەڵکی مەترسیدارتربوو و کوشتت، خودای گەورە شەرەفی ئەوەی پێ سپاردیت و ئاسانی کرد بۆت، ئەمیری بڕواداران حیجازی پێ سپاردیت پاشان پلەت بەرزبووەوە و عێراقی پێ سپاردیت، جا هەرکات ئەم کار و سپاردەیەشت تەواو کرد لەسەر تەختەوە دەڕۆیت بۆ شام.

بەخودا گەر وابکەی هەرگیز بەوێنەی ئەو دەسەڵاتەی کە ئێستا هەتە بەدەست ناهێنیت لەلای عبدالملك، بگرە پلە و پایەکەت لەدەست دەدەیت، بۆیە من پێم باشە بە شمشێرەکانمانەوە بڕۆین بەرەنگاریان بینەوە هەتاکو سەرکەوتن بەدەست دێنین یان بەسەر بەرزی دەمرین.

ئینجا حەجاج پێی گوت: ڕای من هەمان ڕای تۆیە.

هەر بەکردەیی هەندێك لەوانەی کە ئیبن جارود بەشداری پێ نەکردبوون لە شۆڕشەکەیدا هاتنە ڕیزی حەجاجەوە، وەك (عباد بن الحصين الحبطي) بە سەد پیاوەوە، پاشان (قتيبة بن مسلم ) بە کۆمەڵێکەوە هاتە ڕیزیەوە و ووتی: بەخوا ناهێڵین (قیس)یەك بیکوژێ و ماڵەکەی بخوا.

پاشان (سبرة بن علي) و (أسلم بن زرعة الكلبي) و (جعفر بن عبدالرحمن بن مخنف) هاتنە ڕیزی حەجاجەوە.

هەروەها (سمع بن مالك) هەستا بە ڕاکێشانی سەرنجی خەڵك و کۆکردنەوەیان لە دەوری حەجاج و ئەوەش بەفەرمانی حەجاج خۆی، تا بەرەیەیان لەدەوری حەجاج شەش هەزار جەنگاوەر خڕبوونەوە، ئالەو کاتەدا ئیبن جارود پەشیمان بوویەوە کە بەگوێی (غضبان)ی نەکرد کە پێی ووت هێرش بکەرە سەر حەجاج و دارودەستەکەی پێش ئەوەی ڕۆژ بێتەوە.

بەیانی شەڕێکی گەرم ڕویدا لەنێوان حەجاج و ئیبن جارود دا و شکستیش بۆ سوپاکەی ئیبن جارود بوو هەر لەسەرەتاوە، هەتاکو کوژرا و دواتر هاوەڵەکانی تێك شکان و شەڕەکەش لەبەرژەوەندی حەجاج کۆتایی پێهات و شۆڕشەکەی ئیبن جارودی دامرکاندەوە و حەجاجیش کەوتە شوێن سەرکردەکانی شۆڕشەکە و هەموویانی کوشت و هیچ تکا و پاڕانەوەیەکی لێ وەرنەگرتن.

دواتر لەلایەن حەجاجەوە پاش کوژرانی ئیبن جارود بانگەواز کرا کە گشت خەڵکی بێ وەی دەبن و سەلامەت بێجگە لە (هذیل) و (ابن حکیم)، حەجاج سەری (ئیبن جارود) و هەژدە لە هاوەڵەکانی نارد بۆ (مهلب کوڕی ئەبو صفره) کە شەڕی خەواریجی ئەزاریقەی دەکرد تاکو هێز و ورەی زیاتری بداتێ و خەواریج بتۆقێنێت.

هەروەها نامەی نارد بۆ خەلیفە عبدالملك و پێی گووت:

لەپاشان... سوپاس بۆ خودا کە ئەمیری بڕواداڕانی پاراست، بەڕاستی من کە لە شوێنێك لە (رستقبان) دابەزیم خەڵکی عێراق هەڵیان کوتایە سەرم و دژم وەستانەوە و بەرهەڵستیان کردم و چوونە دەوارەکەمە و ماڵ و سامانەکەیان بردم و ووتیان بڕۆ دەر لە ولاتەکەمان بۆلای ئەو کەسەی تۆی نارد بۆلامان، دورەکە لێم جیابوویەوە و نزیکەکەش پاراستمی.

منیش بە شمشێرەکەم چووم بە گژیاندا و ڕووبەڕویان بوومەوە بە کۆمەڵەکەمەوە، ووتم مردن باشترە لە چۆڵکردن و دەرچون لەوێ؛ سوێند بەخوا هێندەی نەخایاند خوای گەورە هەر لەخۆیان چەندین پشتیوانی بۆ ئەمیری بڕواداران دڵنەرم کرد و بەوەی پێشەوەیان دام دوابینەکەیان و بە گوێڕاڵەکانیشیان دام لە یاخیەکانیان، ئینجا خوای

گەورە (ئیبن جارود)ی زۆردار و سەرداری کۆمەڵەکەی لەناوبرد لەگەڵ هەژدە لە سەرکردەکانیشیان.

خوای گەورە دای لە لوتیان و بە ڕۆژهەلات و ڕۆژئاوادا ملی ڕێیان گرتە بەر، پاشان من دڵنیایی و گرەنتی سەلامەتیم دا بەخەڵك ئەوانەی لەوێ بوون و ئەوانەش لەوێ نەبوون هەربۆیە گەڕانەوە و کۆبوونەوە و خەڵکی چوونەوە شار و شوێنی خۆیان..... زۆر سوپاس بۆخوای گەورە بۆ هەموو ئەو سەروەریانە...والسلام.

عبدالملك وەلامی دایەوە و ووتی: لەپاشان..نامەکەتم پێگەیشت، تۆ دڵسۆز و ئامۆژگارێکی وەجاخزادە و جێ باوەڕی و کەم عەیبی، گەر خەڵکی عێراق گومانێکیان لێت کرد نزیکەکەیان بکوژە تاکو دورەکەیان لێت بترسێ و بتۆقێت...والسلام.

ئابەم جۆرە خەلیفە نەخشەی سیاسەتی زۆرداریی و ستەمکاریی داڕشت و حەجاجی دانا وەك پێویست و زیاتریش جێبەجێی بکات ، تاکو خەڵکی گومانیان دەکرد کە حەجاج لەخۆیەوە هەرچی بیەوێ دەیکات لە کوشتن و بڕین.

عبدالملك پاش ماوەیەك (عبدالرحمن بن مسعود) ی نارد تاکو گوێ بگرێت لە خەڵکی عێراق ئەو کاتەی کە سکاڵایان کرد لەدەست ستەم و زۆرداریەکانی حەجاج، هەربۆیە خەلیفە بەو ڕوکارەوە دەرکەوت کە ڕازی نیە بە زوڵم و ستەم ...گەرچی ڕازی بوو بە کارەکانی حەجاج!!.

***

## شۆڕشی زنجەکان
## بەدوای شۆڕشەکەی ئیبن جارود دا

زەنجەکان ئەو کۆیلانە بوون کە لە کیشوەری ئەفەریقاوە هێنرابوون لەلایەن بازرگانەکانی کۆیلە فرۆشیەوە و لە بەصرە فرۆشرابوون ، کاری قورسیان دەکرد، وەکو هەڵکەندنی بیر و زەوی ماڵین و کارکردن لە کانگاکانی خوێ و بەدەر لەو ئیشانەش لە پیشە قورسەکانی دونیا.

وای لێهاتبوو خەڵکی بە سوك سەیریان دەکردن و بە مرۆڤیان دانەدەنان، بەڵکو لای ئاژەڵەکانیان دەیانخەواندن و دەیانهێشتنەوە، ئەمە لە ئیسلامدا نیە، کە هێشتاش لە سەردەمی نوێدا ئەو ڕەگەزپەرستی و جیاخوازیە ڕەگەزییە بوونی هەیە تەنانەت لە وڵاتە پێشکەوتووەکانیشدا.

لەبەر ئەمە ئەو زنجانە هەستیان بە ڕق و کینە دەکرد بەرامبەر سەرگەورەکانیان لە خەڵکی بەصرە هەربۆیە هەڵدەستان بە شۆڕش لە دژیان، ئەوەش ڕویدا لە سەردەمی حەجاج دا کاتێك خەڵکی بەصرە ڕاپەڕین لە دژی بەسەرکردایەتی ئیبن جارود و دوای ئەویش شۆڕشی زنجەکان دوبارە بوویەوە.

بەڵام لەسەردەمی حەجاج دا زنجیەکان لەو کاتەی حەجاج سەرقاڵی دامرکاندنەوەی شۆڕشەکەی ئیبن جارود بوو هەستان بە شۆڕشێك و خۆیان یەك خست لەژێر سەرکردایەتی پیاوێك لە خۆیان پێی دەگوترا (ریاح شیرازنجی) یان شێری زنج، دواتر دەستی گرت بەسەر ناوچەی (فورات) دا و (کراز سلمی) دەسەڵاتداری ئەوێ بوو

(شیرازنجی) نامەیەکی بۆ نارد و تیایدا ووتی: لە پاشان.. کاتی منداڵبوونی دایکی ئەمیری برواداران هاتووە..کەواتە ژنەکەت بنێرە بۆلای تاکو مامانیەکەی بکات...والسلام.

ئابەم جۆرە (شیرازنجی) خۆی وەك ئەمیری برواداران راگەیاند، داوای لە جێگرەکەی حەجاج کرد ژنەکەی بنێرێت تاکو بیێتە مامانی ژنەکەی!!

سەیرەکە لەوەدایە کە (کراز سلمی) کاتێك ئەو نامەیەی پێگەیشت ترسا و هەڵات و بەصرەی جێهێشت.

دوابەدوای تەواوبوونی حەجاج لە شۆڕشەکەی ئیبن جارود فەرمانی کرد بە (زیادە بن عمر) سەرۆکی پۆلیسی بەصرە کە سوپایەك بنێرێت بەسەرکردایەتی (حفص)ی کوڕی بۆ شەڕی زنج، هەر بەو جۆرە (زیادە) کوڕەکەی نارد بەسەرکردایەتی سوپایەك بۆ شەڕی زنجەکان، دواتر (حفص) کوژرا و سوپاکەشی تێکشکا و پێگەی زنجەکان بەرزتر بوویەوە.

کاتێك حەجاج هاتە بەصرە وتاری بۆ خەڵکەکەی دا و ووتی:

ئەی خەڵکی بەصرە کۆیلە و گسك لێدەر و تۆکەرەکانتان سەرپێچی ئێوەیان بینی بۆیە ئەوانیش چاویان لەئێوە کرد، سوێند بەخوا گەر نەچن بۆ ئەو سەگانە ئەوا خۆم چاریان دەکەم بەس خورماکانتان زۆر و بێ بەر دەکەم و دادەبەزمە سەر ئێوەش چونکو ئەهلی ئەو جوامێریە نین.!

هەر بۆیە خەڵکی بەصرە هاتن بەدەم داواکەیەوە و سوپایەکیان بۆ کۆکردەوە و ئەویش (کراز سلمی)ی کردە سەرکردەی ئەو سوپایە.

ئینجا بەرەنگاری زنجەکان بوونەوە هەتا شۆڕشەکەیانی کۆتایی پێهێنا و سەرکردەکەیان (شیرازنجی) کوشت و تەنها کەمێکیان دەرباز بوون، لەسەردەمی حەجاج دا هەڵنەستانەوە ، شۆڕشەکەیان لەسەردەمی حەجاج دا زۆر درێژەی نەکێشا و بە ئاسانی لەناو برا، بەپێچەوانەی شۆڕشەکەیانەوە لە سەردەمی عەباسیەکاندا کە بۆ ساڵانێکی دوورودرێژ بەردەوامیی هەبوو و دەوڵەتێکیان پێ دامەزراند کە بەردەوام لەگەڵ دەوڵەتی عەباسیدا دەجەنگی تاکو ئەو کاتەی کۆتایی پێهێنرا.

لەبەر ئەمەش کاتێك مێژوزانان باسی شۆڕشی زنجەکان دەکەن باسی ئەو شۆڕشە دەکەن کە لە سەردەمی عەباسیدا هەڵگیرسا (٢٥٥هـ – ٢٧٠هـ) (٨٦٩م – ٨٨٣م)، بنکە و مەڵبەندی شۆڕشەکەش شاری بەصرە بوو.

دەستپێکردنی شۆڕشەکەشیان لەسەردەمی عەباسیەکاندا هەروەکو سەردەمی ئەمەویەکان وابوو بەهۆی ئەو واقیعە پڕ ئێش و ئازار و چەوساندنەوە کۆمەڵایەتی و ئابوریەوە بووکە لە نێو زەلکاوەکانی بەصرە و دەشتەکانیدا تێوەی گلابوون.

***

## شۆڕشەکەی (مطرف بن المغیرة بن شعبة) دژی حەجاج

(مطرف بن المغیرة) کوڕی هاوەڵی پێغەمبەر (المغیرة بن شعبة) بوو، یەکێك بوو لە پشتیوانەکانی بەنی ئومەییە و یەکێك لە یاریدەدەرەکانی معاویەی کوڕی ئەبو سوفیان، کوڕەکەی لەباوکیەوە بۆی مابوویەوە کە دڵسۆز بێت لە بەرگریکردن و ملکەچ بوون بۆ بەنی ئومەییە، کوڕەکانیشی هەریەکە و لەشوێنێك بریکار و کاربەدەستی حەجاج بوون: (عروة بن المغیرة) لە کوفە و (مطرف بن المغیرة) لە (مەدائن) و (حمزة بن المغیرة)ش لە هەمەدان.

کاتێك (مطرف بن المغیرة) وەك بریکاری حەجاج ڕوی کردە مەدائن وتاری بۆ خەڵکەکە دا و ووتی:

"ئەی خەڵکینە فەرماندە حەجاج خوا چاکی بۆ بکات منی کردۆتە سەرۆکی ئێوە ڕای سپاردوم کە بە ڕاستی و دادگەری کارەکانم بکەم ، جا ئەگەر بەو جۆرەی ئەو کارم کرد ئەوا من بەختەوەرترین مرۆڤم، ئەگەریش وام نەکرد ئەوا خۆم فەوتاندووە و خۆم بەدبەخت کردووە".

هەرکات دانیشتم لە لاتان پێداویستیەکانتان بۆلای من بەرزبکەنەوە و پرس و ڕاوێژم لەگەڵ بکەن لەو شتانەی بۆخۆتان و شارەکەتان باشە.

بەڕاستی من خێرتان لێ ناگێڕمەوە تا بتوانم...پاشان لەسەر بڵندگۆ هاتە خوارێ.

بەم جۆرە (مطرف بن المغيرە) دڵسۆزی خۆی بۆ حەجاج و دواتریش بۆ بنەماڵەی ئەمەویەکان دەرخست ئەوەش هیچ شتێکی نوێی تێدا نیە.

وەڵامی خەڵکی مەدائن لەڕێی قسەی یەکێك لە پیاو ماقوڵەکانی ئەوێدا درایەوە کەناوی (حكيم بن الحارث الازدي) و ووتی: خوا چاکت بۆ بکات من لەتۆ دووربووم کاتێك قسەت دەکرد بۆیە هاتم بەرەو لات تاکو وەڵامت بدەمەوە، بەڕێکەوت لەگەڵ هاتنە خوارەوەی تۆدا لەسەر بڵندگۆ منیش گەیشتمە لات، ئێمە تێگەشتین لەوەی بۆت باسکردین، ئەوە عەهد و پەیمان بێ بۆتۆ، خوا ڕێی ڕاست نیشانی پەیمان دەر و پەیمان پێدراو بدات، ئاواتی دادگەریت لەخۆتا خواستووە، هەروەها داوای هاوکاریت کردووە لەسەر ڕاستی، خوا یارمەتیت بدات لەسەر نیازەکەت، تۆ لە باوکت دەچیت لە ژیانیدا خودا و خەڵکیش لێی ڕازی بوون.

(مطرف) لە سەر کار و دڵسۆزیی خۆی مایەوە بۆ حەجاج تاکو شۆڕشەکەی (شبيب بن يزيد) هەڵگیرسا دژی حەجاج و عبدالملك، ویستی بێتە مەدائینەوە، هەربۆیە (مطرف) پردی (دیجلە)ی بڕی تاکو نەهێڵێت بگەنە ئەوێ و نامەی نارد بۆ حەجاج و هەواڵەکەی پێ ڕاگەیاند.

ئینجا حەجاج سوپایەکی بۆ نارد لە چوار سەد جەنگاوەر پێکهاتبوو بەسەرکردایەتی (سبرة بن عبدالرحمن) و (عبدالله بن كنان)، (مطرف)یش ناردی بەدوای شبیب دا دەیویست دانوستانی لەگەڵ بکات و داوای لێکرد هەندێك لە هاوەڵەکانی بنێرێت بۆلای، (شەبیب) لەبەرامبەردا داوای لێکرد هەندێك لە هاوەڵەکانی خۆی بنێرێت کە بارمتە بن لای تاکو هاوەڵەکانی دەگەڕێنەوە.

هەر بەکردەیی (مطرف) هەندێك لە هاوەڵەکانی خۆی نارد بۆلای شەبیب وەك بارمتە و شبیب لەبەرامبەردا هەندێك هاوەڵی خۆی نارد بۆلای (مطرف) بۆ گفتوگۆ.

کاتێك (مطرف) گفتوگۆی لەگەڵ هاوەڵەکانی شبیب دا کرد باوەڕی بە تێڕوانینەکەیان هێنا لەبارەی هەڵگەڕانەوە لە خەلافەتی حەجاج و خەلیفە عبدالملك، ئەویش داوای دەکرد بینە شوێنکەوتەی ئەو و دەستیان بخەنە دەستیەوە!!

ئەوانیش ووتیان: چی دەزانی پێمان بڵێ ئەگەر زانیمان ڕاستە وەڵامت دەدەینەوە.

ووتی: بەڕاستی من بانگتان دەکەم بۆ بەرەنگاربوونەوەی ئەو ستەمکار و زۆردارانە، بانگەوازدەکەین بۆلای قورئان و سوننەتی پێغەمبەرەکەی، دەمانەوێت کاروبارەکان بە ڕاوێژ بێت لەنێو موسوڵماناندا، ئەوەی لێی ڕازین لەخۆیان دەیکەن بە فەرماندار و فەرمانڕەوایان، وەك هەمان حاڵ کە عومەری کوڕی خەتاب جێی هێشتن لەسەری، عەرەب گەر زانیان کە مەبەست لە ڕاوێژ ڕازیبوونە بە قورەیش ڕازی دەبن و شوێنکەوتووتان زۆر دەبێت لەوان، هەروەها یارمەتیتان دەدەن دژی دوژمنەکەتان، ووتیان پێی: بۆ ئەمە وەڵامت نادەینەوە.

خەواریجەکان پێیان باش نەبوو کە هەر خەلافەت بەس بۆ قورەیش بێت جگە لە کەسانی دی، هەر لەبەر ئەوەش بەرپەرچی داواکەیان دایەوە کە پێشنیاری لابردنی سەرکردەکەیان (شبیب بن یەزید)ی بۆکردن کە ئەوان پێیان دەووت ئەمیری برواداران.

ئینجا گەڕانەوە بۆلای شبیب و ئەوەی (مطرف) ووتبووی پێیان ڕاگەیاند و دانوستانەکانی نێوان هەردوولا نەگەیشتە ئاکامێکی پێویست.

ئەو دانوستانانەش نهێنی بوو، کەچی یەکێك لە پیاوەکانی (مطرف) کە ناوی (یزید) بوو، کاربەدەستی (مطرف بن مغیرة بن شعبة) بوو پێی ووت: بەخوا ئەوەی نێوان تۆ و ئەوان یەك وشەشی لە حەجاج شاراوە نابێت و هەر وشەیەك دە وشەی تری وەکو خۆی دەدرێتە پاڵ، بۆیە ئەگەر وەك هەور و ڕەشەبا هەڵبێیت حەجاج هەر دەتگرێت تاکو لەناوت دەبات، ڕزگاربوونیش ڕزگاربوونە لەم شوێنەی خۆتا، بەڕاستی خەڵکی مەدائن لەم لا و لەو لایەشەوە، هەروەها خەڵکی سەربازگەکەی (شبیب)یش باسی گفتوگۆکانی ئێوە دەکەن ، ئەمڕۆ ناگەیتە نێوارە هەواڵەکە دەگاتەوە بە حەجاج، کەواتە دیار و هەوارێکی تری بێجگە لە مەدائن هەڵبژێرە.

هەر بەڕاستی (مطرف) گوێی بۆ ئامۆژگاریەکەی (یەزید) گرت و مەدائینی جێهێشت و لەترسی حەجاج هەڵات کە چاوەدێریی دەکرد، ئەو کەسانەی هاتبوونە ڕیزی بزوتنەوەکەیەوە کۆی کردنەوە پاش ئەوەی مەدائینی جێهێشت و هانی دان بۆ

جیهادکردن و گەواهی دانیّ لەسەر لابردنی حەجاج و عبدالملك و بانگەوازکردن بۆ قورئان و سوننەتی پێغەمبەری خوا و هەروەها کاروبارەکان دەبێتەوە بە ڕاوێژ لە نێو موسوڵمانانندا.

(مطرف) بەو سەربازانەی لەگەڵی بوو لە دسکەرەوە ڕۆی بەرەو (حلوان)، فەرمانڕەوای ئەو شوێنە (سوید بن عبدالرحمن السعدی) بوو، ئەم (سوید)ە خەڵکی شارەکە و کوردەکانی لیّ خڕ کردەوە و پەیامی نارد بۆلای (مطرف) و گوتی:

گەر ئێوە شار و وڵاتەکەی ئێمەتان دەوێت ئەوا ئێمە ڕێگریتان لێدەکەین، ئەگەر ناشتاندەوێت لێی بچنە دەر، چونکە ئێمە پێمان خۆش نیە خەڵك پێیان وابیّ و بیبیستینەوە کە ئێمە دەرپەڕیوین بۆتان.

(مطرف) بە داواکەی (سوید) ڕازی بوو و نەچووە ناوەوە بۆ شارەکە و شەڕی نەکرد لەگەڵیان، کەچی کوردەکان بوو بەشەڕیان لەگەڵ پشتیوانەکانی (مطرف) دا و ڕێگریان لێکردن لە یەکێك لەو ڕێگایانەوە بڕۆن کە (سوید) بۆی کێشابوو، بەڵام کوردەکان تێکشکان و زۆریان لیّ کوژرا.

(مطرف) ڕۆیی هەتا نزیکبوویەوە لە هەمەدان و نەچوویەوە ناویەوە و بەرەو لای چەپ ڕۆیی بەرەو (ماه دینار) و لە هەمەدان داوای لە براکەی کرد کە ناوی (حەمرە) بوو تا یارمەتی بدات بە پارە و چەك، ئەویش داواکەی بەجیّ گەیاند بە نهێنی، بەڵام حەجاج بەمەی زانی.

هەروەها (مطرف) و شوێنکەوتوانی ڕۆیشتن بۆ شاری (قوم) ی فارس و (قاشان) و (ئەصفەهان) و نامەی نوسی بۆ هەردوو (سوید بن سەرحانی سەقەفی) و (بەکیر کوڕی هارونی بجلی)ی هاوڕێی، داوای لێکردن بێنە ناو بزوتنەوە شۆڕشگێڕیەکەیەوە، ئەوانیش هاتن بەدەم داواکەیەوە و هاتنە ڕیزیەوە.

بریکارەکەی حەجاج لە ئەصفەهان (بەڕا کوڕی قەبیصە) ترسا هەژمون و دەسەڵاتی (مطرف) زیاد بکات هەربۆیە نامەی نوسی بۆ حەجاج و داوای لێکرد سوپایەکی گەورە بنێریت بۆی بۆ لەناوبردنی شۆڕشەکەی (مطرف) لەکاتێکدا شوێنکەوتوانی زۆر بووبوو.

حەجاج فەرمانی پێکرد بەهەموو ئەو سەربازانەی لەگەڵینی کۆببنەوە بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی (مطرف) و هەروەها نزیکەی پێنج سەد سەربازی تری بۆ نارد، ئیدی ژمارەی ئەو سەربازانەی لەلای بوو بوویە دوو هەزار و پێنج سەد جەنگاوەر لە ڕووبەڕووبوونەوەی (مطرف) و شوێنکەوتووانیدا.

حەجاج (حمزة بن المغيرة)ی برای (مطرف)ی دوورخستەوە و لەسەر کار لای برد پاش ئەوەی زانی کە بە ماڵ و پارە و شتومەکی سەربازی یارمەتی پێشکەشی براکەی کردووە وەک باسمان کرد، هەروەها دەست بەسەری کرد تاکو خۆی بپارێزێت لەوەی نەکا خراپەیەک یان پلانێك بگێڕێت و جارێکی تر یارمەتی براکەی بداتەوە کە لە هەمەدانە.

هەروەها حەجاج نامەی نوسی بۆ (عدی بن زياد الايادی) و فەرمانی پێکرد بڕوا بۆ (مطرف) و بچێتە ڕیزی سوپاکەی (بەڕائی کوڕی قەبیصە)ەوە و دژی (مطرف) بجەنگێت و شۆڕشەکەی لەناوبەرێت.

سوپاکەی (بەڕا ) نۆسەد کەس بوون لە خەڵکی شام و سەرکردەکەشیان (عومەر کوڕی هوبەیرە) بوو، هەموویان دوو ڕۆژ لە (بجی) بارگەیان خست، پاشان ڕۆیشتن بۆ شەڕی (مگرف)، ئەم سوپایە گەیشتە شەش هەزار جەنگاوەر، (مطرف) یش ئاگاداری هەموو بەرەوپێشچوونەکانی دوایی بوو، هەربۆیە شوێنکەوتوەکانی خۆی تەیار کرد بۆ شەڕ.

(مطرف) هەوڵی دا سەرکردەی ئەو سوپایەی کە هاتووە بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی ڕابکێشێت، بۆیە پێی ووتن: لەبارەی عەبدولمەلیکی کوڕی مەروان و حەجاجەوە سەرنجی خۆتانم بدەنێ، ئایا ئێوەش وەك دوو زۆردار و داگیرکار نایانبینن کە شوێنی هەوا و هەوەس کەوتوون و بەگومانێك حەڵك دەگرن و لەتوڕەییدا خەڵك دەکوژن؟

پێیان ووت: هۆی دوژمنی خودا درۆ دەکەیت ئەوان وانین ( – کە لە ڕاستیدا ئەوان وان – ).

ئینجا شەڕێکی قورس و خوێناوی لەنێوانیاندا ڕوویدا و هەردوولا بەشەڕهاتن، دواتر شەڕەکە بە شکانی (مطرف) و شوێنکەوتووانی کۆتایی پێهات، (مطرف) لەم شەڕەدا بە

دەستی (عومەر کوڕی هوبەیرەی فەزاری) کوژرا و سەری بڕی و وەك نەریتی ئەو سەردەمە کەللە سەرەکەی نارد بۆ حەجاج.

بەوەش شۆڕشەکەی (مطرف) کۆتایی پێهات و کەبەرواری ڕوداوەکە سالّی ٧٧کۆچی بوو، شۆڕشێکی بێ هێز بوو و حەجاج زۆر بە ئاسانی کۆتایی پێهێنا، بە پێچەوانەوەی شۆڕشی خەواریجەکانی (صفرية)و شۆڕشەکەی ئیبن ئەشعەس کە خەریك بوو حەجاج لەبن بێنن وەك لەمەودوا گەر خوا بیەوێت باسی دەکەین.

***

٩

# حەجاج و شۆڕشەکەی ئیبن ئەشعەس

- سەرەتای سەرهەڵدان و هۆکارەکانی شۆڕشەکەی ئیبن ئەشعەس دژی حەجاج و خەلیفە عبدالملك.

- مەسەلەی لابردنی ئیبن ئەشعەس لەسەر کارەکەی لەلایەن عەبدولمەلیکی کوڕی مەروانەوە.

- شەڕەکانی ئیبن ئەشعەس لەگەڵ حەجاج لە بەیرە و لە کوفە.

- کۆتاییهاتن و کوژرانی ئیبن ئەشعەس پاش شکان و بەزینی لە (دیر جماجم).

# شۆڕشەکەی ئیبن ئەشعەس[1]
# دژی حەجاج و خەلیفە عبدالملك

### ئیبن ئەشعەس کێ بوو؟

ئەو (عبدالرحمن بن محمد بن الأشعث بن قیس الکندي)بوو؛ یەکێك بوو لەو فەرماندە و سەرکردانەی کە حەجاج ناردی بۆ (سجستان) بۆ شەڕی پاشای (ترك) "رتبیل"[2] پاشان لە خودی حەجاج راپەڕی و چەندین زانا و پیاوچاك هاتنە ریزیەوە لەڕقی زۆر و ستەمەکانی حەجاج[3].

زانایانی هاوچەرخ ئەوەی ئیبن ئەشعەس کردی ناویان لێناوە (شۆڕش)، زانایانی کۆنیش بە (فیتنە) ئاژاوە ناویان ناوە، چونکە خەڵکی کرد بە دوو بەش و کۆمەڵەوە، یەکیان چوونە ریزی ئیبن ئەشعەسەوە و ئەوی تر چوونە ریزی حەجاجەوە کە نوێنەرایەتی دەوڵەت و خەلافەتی دەکرد.

چۆن ئەو ئاژاوەیە ڕوویدا کە هەزاران موسوڵمانی لە هەردوو کۆمەڵەکە چنیەوە؟ هەندێك لە زانا چاکەکانی وەکو (سعید بن جبیر) و (الشعبي) هاتنە پاڵی.

سەرەتای شۆڕشەکە ساڵی ٧٨ك بوو، کاتێك خەلیفە عبدالملك خۆراسان و سەجستانی خستە ژێر ڕکێفی حەجاجی سەقەفیەوە، پاش لابردنی (أمیە بن عبدالله) لە خۆراسان،

---

[1]. ابن أشعث.

[2], [3]. (سیر أعلام النبلاء – للذهبي– ج ٥)، هەندێك پێیان وایە ئەو پادشایەی تورك كە حەجاج ئیبن ئەشعەسی بۆ نارد ناوی (زنبیل) بووە نەك (رتبیل).. بەڵام زۆرینەی سەرچاوە مێژووییەکان ناوەکەیان بە (رتبیل) هێناوە.

هەروەها پاش ئەوەی حەجاج تەواو بوو لە شەڕی هەڵگەڕاوەکانی وەکو (شبیب) و (مطرف) و لە کوفەوە ڕووی کردبوویەوە بەصرە و (مغیرة بن عبدالله)ی کردبووە جێنشین و فەرمانڕەوای ئەوێ، دەڵێن (عبدالرحمن الحجری) بووە، پاشان لای دەبات و لەجێگەی ئەودا مغیرە دادەنێت.

کاتێك (مهلب کوڕی ئەبی صوفرە) لە شەڕی خەواریجەکانی ئەزاریقە تەواو بوو چوو بۆلای حەجاج و ئەویش لەلای خۆی دایناو، حەجاج (مهلب)ی کردە فەرمانڕەوای (سەجستان) و (خۆراسان)، ئینجا مهلب پێی ووت: ئایا پیاوێکت پێ بڵێم لەمن باشتر بێت و زاناتربێت بە کاروباری سەجستان، ئەو پیاوە (کابل) و (زابل)ی گرتە دەست و باجی لەخەڵکەکەی سەند و شەڕی لەگەڵ کردن و دواتریش لەگەڵیان ڕێککەوت و ئاشتەوایی ئەنجام دا؟

حەجاج ووتی: بۆچی نا ئەو پیاوە کێ یە؟

ووتی: (عبیدالله بن أبی بکرە)یە.

بەم جۆرە عوبەیدوڵا کاروباری سەجستانی گرتە دەست و شەڕی لەگەڵ شای تورك (رتبیل) دا ئەنجام دا، باج و سەرانەی لەعەرەب دەسەند، هەربۆیە حەجاج سوپایەکی بەسەرکردایەتی (عوبەیدوڵا) نارد بۆی تاکو بجەنگێ لەگەڵی و خاکەکەی داگیربکات و قەڵا و پەناکانی خاپور بکات.

(ئیبن ئەبی بکرە) تێی تەقاند بەرەو شوێنی مەبەست و خەڵکی کوفە و بەصرەی لەگەڵ بوون، سەرکردەی خەڵکی کوفە (شریح بن هانئ الحارثی) و سەرکردەی خەڵکی بەصرەش (عبیدالله) بوون.

شەڕەکان بەردەوام بوون تاکو ساڵی ٧٩ ك لە خاکی (رتبیل) دا، موسوڵمانەکان لەسەرەتادا چەندین سەرکەوتنیان بەدەست هێنا، بەڵام سەرکەوتنی کۆتاییان بەدی نەهێنا کەبریتی بوو لە دەست بەسەرکردنی (رتبیل)، دواتر حەجاج نامەی نارد بۆ عبدالملك و ئەو هەواڵەی پێ ڕاگەیاند.

لەم ئانوساتەدا ( عبدالرحمنی کوڕی ئەشعەس – ئیبن ئەشعەس–) کە یەکێك بوو لە سەرکردەکانی حەجاج هەوڵی ئەدا بۆ داماڵین و پەراوێزخستنی حەجاج، حەجاجیش ڕقی لێی بوو و دەیگوت: هەرکات بینیومە ویستومە بیکوژم.

هەربۆیە حەجاج ویستی ڕزگاری بێ لە ئیبن ئەشعەس و ناردی بۆ سەجستان بۆ بەرەنگاربوونەوەی (رتبیل).

لە شەعەبیەوە دەگێڕنەوە فەرمووی: لەلای حەجاج دانیشتبووم (عەبدولڕەحمانی کوڕی محمدی کوڕی ئەشعەس) خۆی کرد بە ژوردا و کاتێك حەجاج چاوی پێی کەوت وتی: سەیری ڕۆیشتنەکەی بکە، بەخوا زۆرم حەز لێیە بدەم لە گەردنی.

وتی جا کاتێك عەبدولڕەحمان چووە دەر منیش دەرچووم و پێشی کەوتم و لەلای دەرگای (سەعیدی کوڕی قەیسی سەبیعی) چاوەڕێم کرد، کاتێك گەیشتە لای دەرگاکە پێم وت: لەم دەرگا وەرە ژورەوە لەگەڵمان من دەمەوێت قسەیەکت بۆ بکەم، سپاردە بێ لات تا حەجاج زیندوو بێت باسی نەکەیت.

فەرمووی: بەڵێ.

قسەکەی حەجاجم پێی ڕاگەیاند کەلەبارەی ئەوەوە کردبووی ، ئەویش وتی: منیش هەروەك حەجاج گەر نەشتوانم لە دەسەڵات بیهێنمە خوار و لایبدەم، ئەوا کۆشش دەکەم و درێغی ناکەم تاکو هەردووکمان لەژیاندا مابین[١].

حەجاج سوپایەکی چل هەزار جەنگاوەریی ئامادەکرد بەسەرکردایەتی (ئیبن ئەشعەس) لە خەڵکی کوفە و بەصرە.

تەبەری باسی کردووە کە بیست هەزاریان لە خەڵکی کوفە بوون و بیست هەزاری تریان لە خەڵکی بەصرە بوون، حەجاج بە باشترین شێوە ئەم سوپایەی ئامادەکرد.

---

[١] تأريخ الطبري.

لەو ئانوساتەدا مامی (عەبدولڕەحمانی کوڕی ئەشعەس) کە پێیان دەوت (اسماعیلی کوڕی ئەشعەس) هات بۆلای حەجاج و داوای لێکرد (عەبدولڕەحمانی کوڕی ئەشعەس) نەنێرێت بەسەرکردایەتی ئەو هەڵمەتە و پێی ووت:

ئەو مەنێرە من ترسی ئەوەم هەیە دژتان بووەستێتەوە، بەخوا هەر پردی فوراتی تێپەڕاند فەرمانڕەوایەکی تری بینی یەکسەر دەچێتە ژێر فەرمانی ئەوەوە، زۆر بە ملکەچی و گوێڕایەڵانە.

حەجاج پێی گووت: لەوێ بۆی دەست نادات.. خۆ من حەزم لێ یە سەرپێچی فەرمانەکەم بکات و لە فەرمانم دەربچێت.

هەربۆیە کردیە سەرکردەی ئەو سوپایە، ئەویش بەسوپاکەوە ڕۆیشت تا گەیشتە سەجستان ساڵی ٨٠ك.

کاتێك (عبیدالله بن أبی بکره) مرد ساڵی ٨٠ك حەجاج نامەی نوسی بۆ ئیبن ئەشعەس و کردی بە فەرمانڕەوای سەجستان و یەك ملیۆن جەنگاوەری تری خستە سەر ئەو سوپایەی کە ئامادەی کردبوو، ناوی ئەو سوپایە نرا بە (سوپای تاوسەکان) کە ئەوکات حەجاج خۆی فەرمانڕەوای هەموو عێراق و ڕۆژهەلات بوو، بۆ هەر ویلایەتێکیش کاربەدەستێکی خۆی ناردبوو تاکو لەژێر سەرۆکایەتی ئەمدا فەرمانڕەوایەتیان بکات.

کاتێك ئیبن ئەشعەس گەیشتە سەجستان خەڵکەکەی کۆکردەوە و سەرکەوتە سەر بڵندگۆ و سوپاس و ستایشی خودای کرد و پاشان ووتی: ئەی خەڵکینە فەرماندە حەجاج منی کردە فەرمانڕەوای ناوچەکەی ئێوە، فەرمانی پێکردم تێ بکۆشم دژی ئەو دوژمنەی کە وڵاتەکەتانی داگیرکردووە و چاکەکانتانی قرتێ خستووە، هەرگیز نەکەن هیچ پیاوێکتان دوا بکەوێت و سەرپێچی بکات سزا بەخۆی بگەیەنێت، بڕۆن بۆ سەربازگەکە و لەگەڵ خەڵکی کۆمەڵ بەستن.

خەڵکی هەموو بەدەم داواکەیەوە چوون و لەو سەربازگەیەی کە بۆی ئامادەکردبوون جەم بوونەوە، بەشی دواوەی سوپاکەی بۆ دانان و ئەوانیش دەستیان کرد بە خۆئامادەکردن بە کەرەستەکانی شەڕ.

(رتبیل) بەم ئامادەبوونەی زانی و ترسا لە زەبر و هێزی ئەو سوپایەی کە پێشتر شتی وا نەبووە، هەربۆیە ناردی بۆلای ئیبن ئەشعەس و پۆزشی بۆ هێنایەوە و داوای ئاشتی لێکردوو و پێشنیاری ئەوەی بۆکرد کە باجی لێوەبگرێت، بەڵام ئیبن ئەشعەس وەڵامی نەدایەوە و بە سوپاکەیەوە ڕۆیشت بەرەو خاکی ڕوتبیل کە هەر ئەوەندەی پێکرا واز لە ڕووبەڕووبوونەوە بهێنێت و لەبەردەمیا کشایەوە وئیدی ئیبن ئەشعەس دەستی گرت بەسەر ڕوبەرێکی فراوانی خاکەکەیدا و قەڵاگەلێکی زۆری داگیرکرد کە ڕوتبیل جێی هێشتبوون.

ئیبن ئەشعەس فەرمانڕەوای بۆ هەر شارێك دادەنا کە دەستی بەسەردا دەگرت و هێزێکی بۆ پاراستنی ئەو شارە جێدەهێشت کە تەنانەت ئەو خەڵکەی لەگەڵی بوون پێیان ووت: بەس نیە ئەمساڵ ئەوەندەمان لە وڵاتەکەیان گرتووە هەتا باجیان لێ وەردەگریت و دەیناسیت، پاشان دوای ئەوە بۆ ساڵی داهێ خۆمان دەکەین بە شوێنی دواتردا.

ئینجا ئیبن ئەشعەس نامەی نارد بۆ حەجاج و دوایین بەرەوپێشچوونەکانی پێ ڕاگەیاند لە سەرکەوتن و خاك و دەستکەوتەکان و ئەو پێشنیارەش کە خەڵکی بۆیان کردبوو خستیە ڕوو.

حەجاجیش بە زمانێکی زبر وەڵامی دایەوە و لەنامەکەیدا هاتبوو.

لەپاشان...نامەکەتم پێ گەیشت، ئەوەی باست کردبوو تیایدا تێی گەیشتم، نوسینەکەت نوسینی کەسێکە حەزی لە وچان و پشودان بێت، وەك ئەوەی دوژمنێکی کەم و لاواز و بێ دەسەڵات خراپی پێ کردبێت، بەڵایەکی باشیان بەسەر موسوڵمانانا هێنابێت، دەستکەوتێکی زۆریشیان لە ئیسلام و سوپای ئیسلام چنگ کەوتبێت...

بەتەمەنت ئەی کوڕی دایکی عەبدولڕەحمان گەر تەنها یەك سەربازیشت لەناو بچێت بۆ کۆتاییهێنان بەو دوژمنە ئەوا سەخاوەتی و دەستودڵت باشە، چونکە خوێنی یەك موسوڵمان هاوتای هەموو سوپاکەی ئەوانە.

من ڕقەبەرایەتی ناکەم لەگەڵ ڕاکەت کە خۆت بە فێڵ وپلانت زانیوە بۆ هەنگاوەکانی دواتر، بەڵکو وای بۆچووم کە ئەوەی هانی دایت بۆ ئەو پشودانە لاوازیت، یان بۆچونی

هەڵەتـە، کەواتـە بـەردەوام بـە لەسـەر ئـەوەی فـەرمانم پـێ کردیـت لـە چـوونە نـاو خاکەکەیانەوە و تێکدان و خاپورکردنی قەڵا و پەناکانیان و کوشتنی جەنگاوەرەکانیان و بەدیلگرتنی منداڵ و وردەکانیان.

پاشان بەدوای ئەو نامەیەدا نامەیەکی تری نارد و تیایدا هاتبوو:

بـەردەوام بـە لەسـەر ئـەوەی فـەرمانم پێکردیـت، بچـۆرە خاکەکەیانـەوە، ئەگـەر نـا (ئیسحاقی کوڕی محمد) کە برای خۆتە دەبێتە فەرماندەی خەڵك و ئەو ئەو کارە دەکات.

هەربۆیە شیبن ئەشعەس لـەو سوکایەتی و هەڕەشەیەی حەجاج توڕەبوو و خـەڵکی کۆکردەوە و سوپاس و ستایشی خوای کرد و پاشان ووتی:

ئەی خەڵکینە مـن ئامۆژگارتـانم، حـەزم بـە چاکەی ئێوەیـە، ورد دەبمـەوە بـزانم چـی لەدەورووبەرتان بەسودە بۆئێوە، لـەوەی لـەنێوان ئێوە ودوژمنەکەتانـدا هـەبوو ڕایەکـەم هەبوو پرسم بە خاوەن ڕاکانتان کرد، پرسم بە ئەزموندارەکانی شەڕکرد لە نـاو خۆتانـدا، هەربۆیە ڕازی بوون بە ڕاوبۆچونێك، بۆ ئێستا و دواتری ئێوە ئەو بۆچونەیان بەچاك زانی، منیش نامەم نوسی بۆ فەرماندەکەتان حەجاج، ئینجا لەوەوە نوسراوێکم بۆهات پەست و سوکی کردم، فەرمانم پێ دەکـات کـە زوو بتانکـەم بـە خـاکی دوژمنـدا، کـە ئـەو وڵاتـەیە دوێنێ براکانتان تیایدا بەهیلاك چوون، کەواتە ئێسـتا مـن پیـاوێکم لەگـەڵ ئێـوەم ئەگـەر ویستان بۆ هەرکوێ بچن یان نەچن.

لەبەردەم ئەم وتارە ئاگرینـەدا خـەڵکی هـەژان و پێیـان گـووت: نـەخێر (نـا)، بـەگوێی دوژمنی خوا ناکەین، گوێی لێ ناگرین و گوێڕایەڵ نابین بۆی.

حـەجاج پێـی وابـوو کـە دوژمنەکـە هـیچ ئـەرزش و نرخێکـی نیـە و ئـەو دەکشـێتەوە لەبـەردەم سـوپای موسـوڵمانانـدا، سـەرەنجامیش هـەل دەڕەخسـێت بـۆ گرتنـە دەسـتی زیاتری خاك و دەستکەوتەکان و لکاندنی وڵاتان بە دەوڵەتی ئەمەویەوە.

لەهەمان کاتدا ئیبن ئەشعەس و هاوڕێکـانی لەسـەرخۆیی و خاوەخاوکردنیـان بـە بـاش دەزانی، تاکو نەچنە ناو خاکە نوێ و فراوانەکانەوە وەك چۆن ئەوی پێش ئەوان وایکرد و دوژمنەکەیان توانی لەناویان ببات.

(عامر بن وائلة الكناني) کە شاعیر و وتاربێژ بووە ئەو تێڕوانینەی شیکردۆتەوە و بەم وتەیە:

بەڕاستی حەجاج وەك ئەو کەسە بیردەکاتەوە کە بە یەکێکی تری وت: بەندەکەت سوار ئەسپەکە بکە ئەگەر لەناوچوو ئەوە لەناوچووە، ئەگەریش ڕزگاری بوو ئەوە هی خۆتە.

بەڕاستی حەجاج گوێ نادات کە بتانخاتە مەترسیەوە و کوێرانە بتانخاتە ولاتانێکی پڕ ئاگر و تەنگەبەرەوە، جا ئەگەر سەرکەوتن و دەستکەوتتان هەبوو ئەوا دەبێتە موڵکی حەجاج، ئەوەش دەسەلات و سوڵتانی ئەو زیاتر دەکات، ئەگەر دوژمنەکەشتان سەرکەوت ئەوا ئێوە وەك دوژمنێکی بێزراوتان لێ دێت کە گوێتان پێ نادات و لەسەریشتان ڕانەوەستێت.

کەواتە ئەو دوژمنەی خوا –حەجاج– لابەن و بەیعەت و پەیمان بە (عبدالرحمن ) بدەن، من شایەتیتان بۆ دەدەم کە یەکەم کەس دەبم وار لە حەجاج بهێنم.

ئینجا دوای ئەوە دەنگەکانی خەڵکی بەرزبوونەوە بە وەلام و بەدەمەوە هاتن بۆ ئەو مەبەست و بانگەوازە و ووتیان: ئەوا ئێمە وامان کرد، ئێمە وامان کرد، دوژمنی خوامان لەفەرمانڕەوایی خۆمان داماڵی.

(عبدالمؤمن بن شبث بن ربيع التميمي) کە سەرکردەی شورتە بوو ووتی: گەر ئێوە بەگوێی حەجاج بکەن ئەوا ئەم ولاتانە دەکاتە ولاتی ئێوە دەبێت هەتا ماون لەناویدا بمێننەوە، وەك چۆن فیرعەون کە شوێنێکی داگیر دەکرد سەربارەکانی لەوێ خڕدەکردەوە و نیشتەجێی دەکردن بۆ هەتاهەتایە ئەویش ئاواتان لێ دەکات[1].

کەواتە باشترە بەیعەت بە فەرماندەکەتان بدەن و واز لە دوژمنەکەتان بێنن و لە ولاتی خۆتان وەدەری نێن.

---

[1] . مەبەستی ئەوەیە حەجاج نایانگێڕێتەوە بۆ شارەکانی خۆیان جارێکی تر و لەو شارانەی ئازادی دەکەن جێگیریان دەکات وەك کۆچکردوو دایان دەمیشێنێت تیایاندا، ئەوەش سیاسەتی حەجاج بوو تاکو دڵسۆزی خەڵکی ئەو شارە بەدەست بێنێت کە ئازادی دەکات.

ئینجا خەڵکی بازیان دا بۆلای (ئیبن ئەشعەس) و پەیمانیان پێ دا، ئەویش پێی گوتن. ئایا پەیمانم پێ دەدەن لەسەر لابردنی حەجاج و پشتیوانی بۆ من و وەستانەوە لەدژی حەجاج لەگەڵ من هەتاکو خوای گەورە لە خاکی عێراق دەیکاتە دەرەوە.

لەسەر ئەم بنەمایە خەڵکی پەیمانیان پێ دا، ئەو ڕۆژە لە پەیمانەکەیاندا باسی لابردنی خەلیفە عبدالملك کوڕی مەروانیان نەکرد، ئەوەش ساڵی ٨١ك بوو.

ئەبو مخنف دەڵێت: (سیف بن بشر العجلی) لە (المنخّل بن حابس العبدی)یەوە بۆی باس کردم کە (ئیبن ئەشعەس) کاتێك گەیشتە سەجستان دەسەڵاتی دایە (بست عیاض بن همیان البکری) لە (بنی سدوس بن شیبان بن ذهل بن ثعلبه) و هەروەها (زرنج عبدالله ابن عامر التمیمی) و پاشان (دارمی)، پاشان ناردی بۆلای (روتبیل) و ڕێککەوت لەگەڵی لەسەر ئەوەی کەئەگەر ئیبن ئەشعەس سەرکەوت و دەرکەوت ئەوا هەتا ماوە سەرانەی لەسەر نیە ، ئەگەر تێکشکا و ویستی لەلای ئەو بمێنێتەوە دەبێت پەنای بدەن.

ئیبن ئەشعەس لە سەجستانەوە ڕۆی بۆ شەڕی دژ بە حەجاج لە عێراق و (ئەعشا)ی شاعیریش لەگەڵی ڕۆیشت و دەیگوت:

شطت نوى من داره بالإيوان * إيوان كسرى ذي القرى والريحان

من عاشق أمسى بزابلستان * إن ثقيفا منهم الكذابان

كذابها الماضي وكذاب ثان * أمكن ربي من ثقيف همدان

يوما إلى الليل يسلي ما كان * إنا سمونا للكفور الفتان

حين طغى في الكفر بعد الايمان * بالسيد الغطريف عبد الرحمن

سار بجمع كالدبا من قحطان * ومن معد قد أتى من عدنان

بجحفل جم شديد الأركان * فقل لحجاج ولي الشيطان

يثبت لجمع مذحج وهمدان * فإنهم ساقوه كأس الذيفان

وملحقوه بقرى ابن مروان

سوپاکەی ئیبن ئەشعەس بەسەرکردایەتی (عطیة بن عمرو العنبري) گەیشت و حەجاجیش چەند یەکەیەکی لە (الخیالة) نارد بۆی و (عطیة) تێکی شکاندن.

شوێنکەوتوانێکی زۆری هاتنە ریزەوە لە ولاتانی فارس و بەدەر لەوانیش و هۆکارەکەشی زۆر و ستەمی حەجاج بوو، هەرکات خەڵکی گوێیان لە دەنگێکی ناڕەزایی و شۆڕشێك بووایە دژی حەجاج دەچوونە ریزیەوە و پشتیان لەو فەرمانڕەوایەش دەکرد کە حەجاج دایناببوو، لەوانەش دیسان (تیجان بن أبجر بن تیم الله بن ثعلبة) هەستایەوە و هاواری کرد لەناوخەڵکدا و ووتی: ئەوا من (أبو ذبّان) م گۆڕی وەك گۆڕینی کراسەکەم - کە مەبەست لێی گۆڕینی عبدالملك کوڕی مەروان بوو - .

ئیدی زۆر خەڵکی تر بەدوایدا لە عبدالملك هەڵگەڕانەوە و هەڵپەیان کرد بۆلای ئیبن ئەشعەس.

شێوازی بەیعەت پێدانەکە بەم جۆرە بوو : بەیعەتت پێ دەدەین لەسەر قورئان و فەرموودە و ڕێبازی پێغەمبەرەکەی و گۆڕین و لابردنی پێشەوا گومڕاکان.

ئینجا حەجاج نامەی نوسی بۆ عبدالملك و هەواڵی ڕاپەڕینەکەی ئیبن ئەشعەسی پێ ڕاگەیاند کە دواتر گۆڕا بۆ ئەوەی بەیعەت وەربگرێت بۆ بوون بە جێنشین و ئەمیری بڕواداران و داماڵینی شوێنکەوتووەکانی لە عەبدولمەلیك.

ئینجا خەڵکی ئامۆژگار هاتنە ناو دۆخەکە بۆ دورخستنەوەی ئەم ئاژاوەیە، هەربۆیە سەرکردە (مهلب بن ئەبی صوفره) نامەی نارد بۆ ئیبن ئەشعەس و هۆشداری دایە لەسەر ڕەوشەکە و بۆی نوسی:

بەڕاستی ئەی ئیبن ئەشعەس تۆ پێت خستۆتە ناو خەباتێکی دوورودرێژەوە، تۆخوا تۆخوا لەسەر ئۆمەتی محمد بمێنەرەوە!! لەخۆت بڕوانە و خۆت وێران مەکە، خوێنی موسوڵمانان مەڕێژە، گرۆی مووسوڵمانان دووکەرت مەکە و مەیانکە بە دوو بەرەوە، پەیمان مەشکێنە و هەڵی مەوەشێنەرەوە، ئەگەر وتت لەخۆمەوە لە خەڵکی دەترسم ئەوا خودا لەپێشترە کە لێی بترسی وەك لە خەڵك، خۆت ڕووبەڕوی خوێن ڕشتن و حەڵاڵکردنی حەرامێك مەکەوە، والسلام....

هەروەها نامەشی نوسی بۆ حەجاجی سەقەفی و ووتی:

بەڕاستی خەڵکی عێراق وەك لافاو کە هیچ شتێك نایگێڕێتەوە تا دەگاتە شوێنی خۆی دێن بەرەو ڕوت، خەڵکی عێراق سەرەتای دەرچوونیان زۆر تورەن، هەروەها پەرۆشی و ژن و منداڵەکانیانن ؛ کەواتە هیچ شتێك نایانگێڕێتە دواوە تا دێنەوە ناو کەسوکار و خێزان و منداڵەکانیان و لەپەنایاندا دەوەستن، خوا سەرت بخا بەسەریاندا ان شاو الله.

بەڵام خەلیفە عبدالملك کاتێك بە هەوڵەکەی ئیبن ئەشعەسی زانی زۆر تورە بوو و وتارێکی بۆ خەڵکی دا و پاش سوپاس و ستایشی خودا ووتی:

خەڵکی عێراق تەمەنم لەگەڵ ئەواندا درێژبوو و کەچی پەلەیان کرد لە قەدەری مندا، خودایە شمشێرەکانی خەڵکی شامیان بەسەردا زاڵ بکەی تاکو دەگەن بە ڕازی بوونی تۆ.

خەلیفە عبدالملك دەستی کرد بە ئامادەکردنی سوپایەك کە حەجاج سەرکردایەتی دەکرد بۆ شەڕی ئیبن ئەشعەس و ئەوانەی لەدەوروبەری خڕبووبوونەوە، کە دەڵێن زۆرێك لە جەنگاوەران و زانایان لەدەوری کۆبووبوونەوە، هەروەك دەڵێن تەنانەت سی و سێ هەزار سوارچاك و ئەسپ سوار و سەد و بیست هەزار سەربازی پیادەشی لەگەڵ بوون.

ئیبن ئەشعەس و ئەوەی لەگەڵی بوو چوونە بەصرەوە و وتارێکی دا و خۆی وەك خەلیفەی موسوڵمانان ڕاگەیاند پاش ئەوەی خەلیفە عەبدولمەلیکی وازلێهێنا و خەڵکیش لەسەر ئەوە پەیمانیان پێدا و پەیمانیشیان پێدا لەسەر پشتکردنە خەلیفە و جێگرەکەشی حەجاجی سەقەفی، ئیبن ئەشعەس ئەم قسەیەی دوبارە دەکردەوە:

حەجاج هیچ نیە بەڵام وەرن با بڕۆین لەگەڵ عبدالملك شەڕ بکەین.

هەمووان ڕەزامەندیان نیشان دا لەسەر بۆچوونەکەی ئیبن ئەشعەس و بەوانەشەوە کە لەناویاندا بوون لە زانا و قورئان خوێنەکان.

ئەبو مخنف دەڵێت: (ئەبو زوبێری هەمدانی) بۆی باسکردم ووتی: لەناو هاوەڵەکانی ئیبن ئەشعەس دا بووم کاتێك بانگی خەڵکی کرد و بە لێشاو چوون بۆ لای، پاشان وتی: لەم شوێنەوە بپەڕنەوە بۆیان ؛ ئینجا خەڵکی بە ئەسپ و سواریەکانیانەوە چوونە ناو (دجیل)ەوە لەو شوێنەوەی کە فەرمانی پێکردبوون، سوێند بەخوا سەرکەوتن ئەوەندە

خێرابوو کە هێشتا ئەسپ و سوارییەکان هەموو نەپەڕیبوونەوە تاکو هەڵیان کوتایە سەر (مطهر بن حر) و (عبدالله بن رميثة الطائي) و تێکمان شکاندن ڕۆژی قوربانی ساڵی ٨١ ی کۆچی و کوشتارێکی زۆرمان لەناودا کردن، کۆمەڵەکەیانمان گرفتارکرد و حەجاج شکستی هێنا. کە دواتر ئەو ڕوداوە ناوترا بە شەڕی (تستر).

(أبو كعب بن عبيد بن سرجس) بە پەلە چوو بۆلای حەجاج و بەزینی خەلکەکەی پێ ڕاگەیاند، ئەویش ووتی: ئەی خەلکینە، بڕۆن بۆ بەصرە بۆ ناو سەربازگە لەوێ کۆمەڵانی خەڵك و جەنگاوەر و خواردنیشی لێ یە، چون ئەم جێ یە کە ئێمەی لێین سەربازێکیش هەڵناگرێت.

پاشان گەڕایەوە و ئەسپ سوارەکانی خەڵکی عێراق شوێنی کەوتن و هەرکات کەسێکیان بدیتیایە لە سوپا دواکەوتووە، دەیانکوشت، حەجاج دەڕۆیشت و هیچ شتێك سەری لێ تێك نەدەدا تاکو لە (الزاوية) دابەزی، ناردی ئازوقەی بازگانەکانیان گرت و بردنی بۆسەربازەکانی خۆی، بەصرەی وازلێهێنا بۆ خەڵکی عێراق.

کاربەدەستەکەی حەجاج لەوێ بوو کەناوی (حكم بن أيوب بن الحكم بن أبي عقيل الثقفي) بوو، ئینجا خەڵکی عێراق هاتن هەتا چوونە بەصرەوە.

حەجاج لە کاتێك توشی ئەو کۆست و کۆسپە بوو گەڕایەوە داوای کرد نامەکەی (مهلب )ی بۆ بهێننەوە، تا چاوی پیا بخشێنێتەوە، کە دووبارە خوێندیەوە ووتی:

ئافەرین بۆ باوکت...!! چ سەرکردەیەکی جەنگێکە ئەوە!! ڕایەکی دروستی بۆ پێشنیارکردین کەچی لێی وەرنەگیرا [1].

سەرەتا ئەوە بوو حەجاج بە سوپاکەیەوە ڕۆیشت تا لە (رستقبان) دابەزی و لەوێ بارگەی خست، ئیبن ئەشعەسیش هات تا لە (تستر) دابەزی و لایدا، لەنێوانیاندا ڕوبارێك هەبوو، ئەوەش دەمەو ئێوارەی ڕۆژی عەرەفەی ساڵی ٨١ك بوو، سوپاکەی حەجاج تێکشکا وەك ئەبو زوبێری هەمدانی باسی کردووە، لە خەڵکی شام لەناو سوپاکەی

---

[1]. تأريخ الطبري.

حەجاجدا هەزار و پێنج سەد کەس کوژران، ئەوانی تریش بە بەزیوی هەڵاتن، ئەو ڕۆژە حەجاج سەد و پەنجا هەزارکەسی لەگەڵ بوو.

حەجاج و سوپاکەی بە شکاوی بەرەو بەصرە ڕۆیشتن و حەجاج وتارێکی دا وەکو باسمان کرد.

هەروەها عبدالرحمنی کوڕی ئەشعەس بەسەرکەوتووی چوویە بەصرەوە و خەڵکەکەشی پەیمانیان پێدا لەسەر جەنگی دژە حەجاج و پشت کردن لە خەلیفە عبدالملك وەك باسمان کرد، کە ساڵی ٨١ك کۆچی بوو کاتێك چووە ناو بەصرەوە.

شەڕەکانی نێوان حەجاج و ئیبن ئەشعەس نزیکەی سێ ساڵ درێژەی کێشا تەنانەت لە مانگی (محرم) و گشت مانگە حەرامکراوەکانیشدا شەڕیان دەکرد.

یەکەمین شەڕ لەدوای ئەوەی ئیبن ئەشعەس چوویە بەصرەوە شەڕەکەی (محرم)ی ساڵی ٨٢ك بوو، کە حەجاج و سوپاکەی تێکشکان و گشت قورەیش و سەقیف بەزین، ئەو شەڕە یان ئەو ڕوداوە ناسرا بە شەڕی (الزاویة).

سەرەتای شەڕەکە وەك باسمان کرد لە بەرژەوەندی خەڵکی عێراق بوو بەسەرکردایەتی ئیبن ئەشعەس بەڵام کۆتایی پێ نەهات چون لە ڕۆژێکی تردا سوفیانی کوڕی ئەبرەد کە یەکێك بوو لە فەرماندەکانی شام هەڵی کوتایە سەر ڕاستی سوپاکەی ئیبن ئەشعەس و تێکی شکاند و ژمارەیەکی زۆریش لە قورئان خوێنان (قرّا ) کوژران کە خواپەرست و ئەو کەسانە بوون زۆر پەرستشیان دەکرد لەناو سوپاکەی ئیبن ئەشعەس دا.

ئینجا حەجاج سەری بردە سوژدە وەك خۆشحاڵی و سوپاسگوزاریەك بۆ ئەم سەرکەوتنە پاش ئەوەی کە لەڕۆژی پێشودا خەریك بوو بکوژرێت.

ئیبن ئەشعەس و ئەوەی لەگەڵی بوو هەڵاتن بەرەو کوفە و خەڵکی بەصرەش ئەوانەی پەیمانیان پێدابوو لەسەر خەلافەت شوێنی کەوتن و یەکێك لە سەرکردەکانی کە بریتی بوو لە (عبدالرحمن بن عیاش بن ربیعة بن الحارث بن عبدالمطلب) لەوێ مایەوە بۆ ئەوەی بەرەنگاری حەجاج ببێتەوە بەو سەربازانەی لەگەڵی مابوونەوە لە خەڵکی بەصرە،

نزیکەی پێنج شەو گەرمترین شەڕی کرد و پاشان خۆی گەیاند بە ئیبن ئەشعەس لە کوفە.

لەم ڕۆژەدا حەجاج کەوتە سەر چۆك و بەشێك لە شمشێرەکەی هەڵکێشا و تەرەحوم ولاواندنەوەی خۆی بەسەر موصعەبی کوڕی زوبێردا کرد و دەیگوت:

چەندە بەخشندە و بەڕێز بوو تەنانەت خۆی ڕاگرت تا کوشتن.

لەنێو ئەو کوژراوانەی کە یاوەری ئیبن ئەشعەس بوون (أبو طفیل بن عامر بن واثلة اللیثي) هەبوو.

(الواقدی) دەڵێت: کاتێك سوپای حەجاج و سوپای ئیبن ئەشعەس بەیەك گەیشت لە (الزاویە) سوپاکەی حەجاج جار لەدوای جار هەڵیان دەکوتایە سەریان، قورئان خوێنەکان دەیانگوت لەسەرو هەموویانەوە (جبلە بن زحر): ئەی خەڵکینە هەلاتن لەهیچ کەس هێندەی هەلاتنی ئێوە ناشیرین نیە کەواتە شەڕ بکەن لەپێناوی دین و دنیاتاندا.

(شەعەبی) کە لەگەڵ ئیبن ئەشعەس بوو دەیگوت:

شەڕیان لەگەڵ بکەن لەدژی ستەم و زۆرەکانیان هەروەها لەژی ئەوەی لاوازەکان دەچەوسێننەوە و نوێژەکانیان دەمرێنن.

قورئان خوێنەکان کە ئەوی ڕۆژێ زانایانی ئەو ڕۆژە بوون شەڕێکی قورسیان کرد و هێرشیان بردە سەر حەجاج و سوپاکەی هەتا سەرکردەکەیان (جبلە بن زحر) کوژرا و ئینجا حەجاج هاواری کرد : ئەی دوژمنانی خوا ئیتر ئەوە گومڕا و زۆردارەکەتان کوژرا.

پاشان سوفیانی کوڕی ئەبرەد هەڵی کوتایە سەر چەپی سوپاکەی ئیبن ئەشعەس و تێکی شکاندن کە (ئەبرەدی کوڕی موڕڕەی تەمیمی) لێ بوو.

وێڕای سەرکەوتنی حەجاج کەچی شۆڕشەکەی ئیبن ئەشعەس کۆتایی پێ نەهات بەڵکو بەهێزتر بوو و تاوی سەند کاتێك پەنای بردە بەر کوفە و زۆرینەی خەڵکەکەی هاتنە ڕیزیەوە و پەیمانیان پێدا، ئینجا حەجاج بە سوپاکەیەوە گەیشتە لای و بەجۆرێك بەهێزترین و چارەنوسسازترین شەڕ ڕوویدا لە (دیر جماجم) کە دواتر گەر خوا بیەوێت ڕونی دەکەینەوە.

***

## پرسی هەڵگەڕانەوەی ئیبن ئەشعەس و شوێنکەوتووانی لە عەبدولەلیک

پێشتر باسمان کرد ڕاپەڕینەکەی ئیبن ئەشعەس بە هەڵگەڕانەوە لە حەجاج دەستی پێکرد بە بێ گۆڕین و هەڵگەڕانەوە لە خەلیفە عبدالملك کوڕی مەروان، بەڵام بیرۆکەی پرسی هەڵگەڕانەوە لە خەلیفە عبدالملك کاتێك دەستی پێکرد کە ئیبن ئەشعەس و شوێنکەوتوانی چوونە وڵاتی فارسەوە و لە کاروبارەکەدا ڕاوێژیان کرد و ووتیان: ئێمە ئەگەر پشتمان لە حەجاج کردبێت واتە پشتمان لە عبدالملك کردووە.

پاش خستنە ڕووی کێشە و مەسەلەکە ڕویان کردە ئیبن ئەشعەسی سەرکردەیان، ئەویش ڕازی بوو لەسەری، یەکەمین کەس کە وازی لە خەلیفە عبدالملك هێنا و لە بەیعەتی بە خەلیفە زانینی ئەو پەشیمان بوویەوە (تیجان بن أبجر) بوو و گووتی: ئەی خەڵکینە ئەوا من (أبو ذبّان)[1] م گۆڕی وەك گۆڕینی ئەم کراسەی بەرم.

لێرەوە کێشەکە ئاوەڕوو بوویەوە لە ڕاپەڕین دژی حەجاجەوە گۆڕا بۆ ئاژاوەیەکی گەورەتر و ڕاپەڕین دژی خودی شێوازی فەرمانڕەوایەتیەکە، ئەو فەرمانڕەوایەتیەی کە ئیبن ئەشعەس خۆیشی پەیمانی پێ دابوو، خۆی یەکێك بوو لە پایەکانی ئەو حوکمڕانیە، ئەوەبوو خەڵکی هەستان بە هەڵگەڕانەوە لە خەلیفە و پەیمان دان بە ئیبن ئەشعەس وەك باسمان کرد.

ڕەنگە مەترسیدارترین شت لەم ئاژاوەیەدا ئەوە بووبێت کە ژمارەیەکی ئێجگار زۆر لە زانایان و ناوداران لەو زەمانەدا وەکو (سەعیدی کوڕی جبیر) و (ئیبن ئەبی لەیلا) و

---

[1] .أبو ذبّان : نازناوی خەلیفە عبدالملك بوو.

(شەعبی) و چەندین کوڕانی هاوەڵانی پێغەمبەر وەکو (محمد کوڕی سەعید کوڕی ئەبی وەقاص) یەکیان گرتبوو، هەروەها کەسە دیارەکانی وەك (مسلم بن یسار) و (مالك بن دینار) و (أبوالجوزا ) و (أبو المنهال الرياحی) لەناویاندا بوون، وتیان بە ئیبن ئەشعەس ئەگەر دەتەوێ خەڵکی لە چواردەوورت شەڕ بکەن وەك چۆن لە دەوری کەژاوەکەی خاتو عائیشە لە شەڕی (جمل) دا شەڕیان کرد ئەوا حەسەنی بەصری لەگەڵ خۆت ببە، ئەویش بە نابەدڵی لەگەڵ خۆی هێنای بۆ شەڕ.

یەکێکی تر لەوانەی کە هاتە ڕیزی ئیبن ئەشعەسەوە (طلحة بن مطرف) و (عطاء بن السائب ) و بێجگە لەو دووانەش بوون کە پێیان دەوترا (قورئان خوێنەکان).

(ابن کثیر) –ڕەحمەتی خوای لێ بێت– ڕەخنەی لە بەیعەتدان بە ئیبن ئەشعەس گرتووە چونکە قورەیشی نەبوو، کە خەلافەتی گشتی موسوڵمانان وەك چەندین فەرموودەی پێغەمبەر ئاماژەی پێدەکەن دەبێت لە قورەیش بێت نەك هۆزەکانی تری بێجگە قورەیش، لەبەر ئەمە (ابن کثیر) سەری سوڕماوە لە ڕازیبوونی ئەو زانایانەی کە شوێن ئیبن ئەشعەس کەوتن و پەیمانیان پێ‌دا.

هەروەها دیسان لەم بارەیەوە (ابن کثیر) دەفەرموێت: ئیبن ئەشعەس هاتە عێراق و خەڵکەکەی بەیعەتیان پێدا لەسەر هەڵگەڕانەوە لە حەجاج و خەلیفە عبدالملك کوڕی مەروان، ئیدی کارەکە ئاڵۆزکا و کێشەکە گەورەتر بوو، شوێنکەوتووانی ئیبن ئەشعەس تێدبوون و یەك دەنگیی موسوڵمانان درزی تێکەوت[1].

(ابن کثیر) ئەوەی کردە بەڵگە لەسەر شەرعی نەبوونی خەلافەتی ئیبن ئەشعەس کە خەلافەت تەنها بۆ قورەیشە نەك بێجگە لەو بە بەڵگەی فەرموودەگەلێك لەوانەش.

ئەوەی کە ئەبو داود لە موسنەدەکەیدا و ئەحمەد و ئەبو یەعلی لە موسنەدەکەیاندا و (طبراني) لە (أبي برزة) وە گێڕاویانەتەوە کە پێغەمبەر درودی خوای لێ بێت فەرمووی: " پێشەواکان لە قورەیشن... کە حوکمڕانییان کرد دادپەروەر دەبن.. کە بەڵێنیان دا بە

[1] . البداية والنهاية.

وەفا دەبن.. کە داوایـان لێکردن دڵیـان نەرمـە، کـە پاڕانـەوە بەرامبـەریان لێیـان خۆش دەبن)[١]...

هەروەها ئەبو هورەیرە دەگێڕێتەوە کە پێغەمبـەر دروودی خـوای لێبێـت فـەرمووی: " سەرداریی لە قورەیش و دادوەریی لە پشتیوانان و بانگیش لە حەبەشیەکان[٢].

هەروەها فەرموویەتی: " جێشنینی لە قورەیش و دادوەری لە پشتیوانان و بانگەواز لە حەبەشیەکان[٣]".

بـەڵام مـەرجی مانـەوەی فـەرمانڕەوایی و سـەرداریی و جێنشـینی لـەنێو قورەیشـدا دادپـەروەری و بـەجێهێنانی بەڵێنـەکان و نـەرمونیانی و بەزەییهاتنەوەیـە بـە خـەڵك دا، چـونکە دادگـەری و دادپـەروەری بنـەمای سـەرداریی و حوکمڕانیـە، بـەبێ ئـەو خاڵـە نـە حوکمڕانیەك بوونی هەیە نە گوێڕایەڵیەك نە بەیعەت دانێك، ئەمـەش بـوو کـە ئەوانـەی لـە فەرمانی حەجاج دەرچوون لەگـەڵ ئـیبن ئەشعەس کردیانـە بنـەما و بیـانوی دەسـتیان، هەروەها بێجگە لەمانیش خەواریج و هەڵگەڕانەوەکانی تر کە بـەردەوام بـوون لـە شۆڕش تاکو دەسەڵاتی ئەمەویەکان ڕوخا بەدەستی عەباسیەکان.

لەبەر ئەمە خەلیفە عبدالملك ویستی کۆتایی بە شۆڕشەکەی ئیبن ئەشعەس بێنێت بە لەکارلابردن و پەراوێزخستنی حـەجاجی سـەقەفی و ڕادەسـتکردنی هـەر ویلایـەتێکیش بـە ئیبن ئەشعەس کە خۆی حەزی لێ بـەتی و هـەڵی دەبژێرێت، بـەڵام شۆڕشـگێڕەکان ئـەم پێشنیارەیان پـەرچ کردەوە و ویسـتیان لـە خەلیفـە خۆیشـی هەڵبگەڕێنـەوە وەك چۆن خـودی خەلیفـە کـاتی خـۆی ئـەو کـارەی کـرد لەگـەڵ ئـیبن زوبێـردا، بـەڵام لەوەیانـدا سەرکەوتوو نەبوون.

هەربۆیە شۆڕشەکەی ئیبن ئەشعەس پاش چەندین شەڕی بـەردەوام و سـێ سـاڵ دوای هەڵگیرسـانی لـە (دیـر الجمـاجم) دامرکێنرایـەوە و لـەناوبرا، پـاش ئـەوە حـەجاج هـەموو

---

١ . قال الرسول صلى الله عليه وسلم: " الأئمة من قريش ماحكموا فعدلوا ووعدوا فوفوا و استرحموا فرحموا".

٢ .رواه الترمذي بإسناد حسن.

٣ . أخرجه أحمد والحاكم في المستدرك.

ئەوانـەی کوشـت کـە پاشمـاوەی شۆرشـەکە بـوون هـەتاکو ژمـارەی ئەوانـەی کـە شوێنکەوتووی ئیبن ئەشعەس بوون و پاش شکانەکەی لە (دیرالجماجم) لەبەردەمی خۆیەوە هێواش هێواش کوشتنی گەیشتە سەدوسی هەزار، کە گەورەپیاوانی هەڵبژاردە و زانایانی چاکەکاریشیان لەناودا بوو، لەبەر ئەوەیە کە هەندێك کەس ئەو ڕوداوەیان ناونا بە (فیتنە) ئاژاوەکەی ئیبن ئەشعەس.

ئاژاوە یاخود بڵێین شۆڕشەکەی ئیبن ئەشعەس ساڵی ٨٢ك کۆتایی پێهات.

بەڵێ شۆڕشەکەی ئیبن ئەشعەس کۆتایی هات، یەکەم شۆڕش بوو کە زانایان و (فقها ) ی لەخۆ گرتبوو لەو سەردەمەدا، بەڵام کۆتاهەمین شۆڕش نەبوو، چەندین شۆڕش و ڕاپەڕینی تر سەریان هەڵدا و بەردەوام بوون.

شۆڕشەکەی ئیبن ئەشعەس لە هیچ شۆڕشێکی دیکە نەدەچوو کە حەجاج و عبدالملك ڕوبەڕووی ببنەوە، چون بەڕاستی لەگەڵ ئیبن ئەشعەسدا هەموو (فقها ) زانایانی بەصرە و زۆرێك لە زانایانی کوفەش ڕاپەڕین، تەنانەت زانایان یەکەیەکی سەربازیی تایبەتیان هەبوو لە نێو شۆڕشەکەی ئیبن ئەشعەس دا، دروشمەکەیان لەو ڕۆژگارەدا بریتی بوو لە : **(یا لثارات الصلاة)**.

سەرەنجامی جەنگەکەش بێ هیوابوونی ئەو زانا فەقیهانە بوو، چونکە حەجاج لە شەڕەکەدا سەرکەوت و کۆمەڵێکی بێ شوماری لێ کوشتن، بگرە ئەم شۆڕشە حەجاجی لە زۆر و ستەم نەخست بەڵکو دڵڕەقی و زۆرداریەکەی زیادی کرد.

شۆڕشەکەی ئیبن ئەشعەس کە دواتر ناونرا بە (ئاژاوە) ساتەوەختی جیاکەرەوە بوو لە پێکهێنانی دیدی سیاسیانەی سوننیدا، بەجۆرێك لە هزری زانایانی ئەهلی سوننەدا ئەوە چەسپی کە ڕوبەڕووبوونەوەی چەکداری میکانیزمێکی دروست نیە بۆ ڕوبەڕووبوونەوەی (ستەم و تەشەنەکردنی نەخوازراوە دینی و دونیاییەکان)، ئەوەش بەهۆی تێکدانی پەرشی ئەمنی و ئاسایش و ئارامیەوە کە کاتی ئاژاوەکە و دوای ئەوەش ڕوودەدات و خراپەکاری دێتە ئاراوە، بەجۆرێك حەجاج هەستا بە کوشتنی کۆمەڵێکی زۆر لە

شوێنکەوتووانی ئیبن ئەشعەس کە زانا فەقیهەکانیشیان لەناودا بوو، پاشان زیادەڕۆیی کرد لە ستەمکردن بەبێ ترسان لەهیچ کەسێك.

(ئەیوبی سختیانی) لەباسی نیشاندانی پەشیمانی کە باڵی کێشا بەسەر ناوەندە فیقهیە سونیەکاندا پاش بەشداریکردنیان لە شۆڕشەکەی ئیبن ئەشعەس دا دەڵێت: هەر کەس لەگەڵ ئیبن ئەشعەس دا شکا ڕازی بوو بە کەوتن و شکستەکەی، هەر کەسیشیا ڕزگاری بووایە پەشیمان بوو لەسەر ئەو هەڵوێستەی کە بەشداری تیاکرد.

لەبەر ئەمە لە فیقهی سوننیدا قسە یەکخراوە و جێگیر کراوە لەسەر (قەدەغەکردنی هەڵگەڕانەوە لە پێشەوای ستەمکار و تاوانبار بە شمشێر، هەروەها ئاسایش و ئارامی خراوتە پێش دادپەروەرییەوە).

لە ووتەکای ئەهلی سوننە ئەوەیە : " **وال غشوم خیر من فتنة تدوم**" واتە : فەرمانڕەوایەکی ناشی و زۆردار، باشترە لە ئاژاوەیەکی بەردەوام.

هەربۆیە پاش ئەوە بوویە پیشەی زانا و فەقیهەکان کە هاوکار بن لە بەرقەرارکردنی ئاسایش و جێگیربوونی ڕەوشی سیاسیدا و پارێزگاری بکەن بە (ئاشتی)ەوە نرخەکەشی لە بەرامبەردا هەرچۆن بێت.

هیچ لادانێکیش لەم یاسایە نابینین لای (زەیدی) و (خەواریجەکان) نەبێت، ئەو دووانەش ئەو دوو ڕێباوەڕەن کە (دادپەروەریی) پێش (ئاسایش) دەخەن، بەڵام شیعەی دوانزە ئیمامیش هەڵوێستیان نزیکە لە هەڵوێستی زانا فەقیهەکانی سوننەوە، چون لەپاش کوژران و شەهیدکردنی حسەینی کوڕی عەلی، شیعەکان دڵنیابوون و بۆیان دەرکەوت کە ڕووبەڕوو بوونەوەی سەربازی بەرامبەر دەسەڵات و فەرمانڕەوایان کەڵکی نیە، بۆیە لایاندایەوە بەلای کاری نهێنیدا، زانایانی شیعە کردیانە ڕێ باوەڕی خۆیان کە هەڵگرتنی چەك حەرام بێت دژی دەسەڵاتی حوکمڕان، ئەوەش تا ئەوکاتەی کە مەهدی دێت، لەوەشە (ئەو)یکیان گێڕاوەتەوە کە هەر بەیداخێك پێش بەیداخەکەی مەهدی سەرهەڵبدات بەیداخی گومڕایی و سەرلێشێواویە.

زانایانی سوننە و شیعە لایەنگیریان لەبەردەم دەسەڵاتی سیاسیدا بە پێویست زانیوە، کە لایەنگیری زانا سوننییەکان لایەنگیرییەکی ئەرێنی بووە، چونکە ئەوان دان بە شەرعی بوونی دەوڵەتدا دەنێن، بەڵام زانایانی شیعە لایەنگیرییەکەیان نەرێنییە چونکە دژی قسەی خۆیانە کە دەوڵەت بە ناشەرعی دەزانن، بەڵام ئەم ناکۆکییە تیۆری بووە و هاوڵاتیانی شیعەی لە بەشداری کارا و دروستکەر قەدەغە نەکردووە لە دەوڵەت و خزمەتکردنیدا.

جێی سەرنجە کە بزوتنەوە ئوصوڵییەکان کە لە جیهانی ئیسلامیدا سەریان هەڵداوە لە سەدەی ڕابردودا بە بانگەشەی دروستکردنی دەوڵەتێکی ڕاستەقینەی ئیسلامی یان دەوڵەتێکی شەرعی، لە ناوەڕۆکدا لەسەر پشتی کەسانێك دامەزران کە لە دەرەوەی دەزگا و دامەزراوە دینیە سوننیە باوەکان بوون، وەکو (مەودودی)، (حسن بەننا)، (سەید قوتب).. بێجگە لەوانیش.

بەڵکو بەڕاستی ئەم ئوصوڵیانە لاوازکردنی دامەزراوەی دینی و کەمکردنەوەیان گرتە ئەستۆی خۆیان بە تۆمەتی ماستاوکردنی بۆ دەسەڵاتی سیاسی و نەبوونی سەربەخۆیی و هی تریش لەو تۆمەتانە، ئەو کارەی کە کۆتایی هات بە پەراوێزخستنی ئەم دامەزراوەیە، پاشان بەدوای ئەوەشدا ئوصوڵییەکان توانیان دزە بکەنە نێو دامەزراوە دینیە باوەکان لە گرنگترین ئەو مەڵبەندە ئیسلامیانەی کە هەیان بوو لە مصر وسعودیە و پاکستان و ئەندەنوسیا.

ئەم پێشەکیە مێژووییە دوورودرێژە میکانیزمی ئێمەیە کە بەهۆیەوە دەگەین بە تێگەیشتن لە دوو بزوتنەوەی سوننی، کە دەرهاویشتەی ڕێبازە ناسراوەکانن لە دامەزراوەی دینیدا، ئەوانیش بزوتنەوەی تاڵیبان لە ئەفغانستان و (محاکم الاسلامیە) لە صۆماڵ، ئەو دوو بزوتنەوەیە لە بنەڕەتدا لەوەدا یەکدەگرن کە هەردووکیان ئەنجامی دامەزراوە ئیسلامیە باوەکەن، نەك بەرهەم و کۆرپەی بزوتنەوە ئوصوڵییەکان، تاڵیبان بەرهەمی قوتابخانە ئیسلامیەکان بوو لە پاکستان کە میراتگری فیقهی حەنەفی بوون لە ناوەڕاستی ئاسیا، بەڵام (محاکم الاسلامیە) میراتگری هەردوو فیقهی حەنەفی و شافیعی بوون، زۆربەی زاناکانیشیان لە دەرچووانی زانکۆی (الازهر الشریف قلعة الاسلام السني

التقليدي) بوون، لەناویانیشدا ژمارەیەك لە سەلەفیەکان هەبوون کە دەرچووی زانکۆی ئیسلامی مەدینەی مونەووەرە بوون، هەندێك لەو کەسانەش هاتنە ناویانەوە کە نزیکی گروپە ئوصولیەکان و ڕێکخراوی قاعیدە بوون.

کەواتە کەسێتیی زانای موسوڵمان کە لەگەڵ شۆڕشەکەی ئیبن ئەشعەس دا بەدەرکەوت و بەشداری شۆڕشەکانی بەرەنگاربوونەوەی زۆر و ستەمی کرد هەتا ئێستاش کۆتایی پێ نەهاتووە.



## کۆتاییهاتنی شۆڕشەکەی ئیبن ئەشعەس
## لە (دیرالجماجم)

ئیبن ئەشعەس لەدوای شکانەکەی لەبەرامبەر حەجاج دا لە بەصرەوە ڕوی کردە کوفە، ئینجا خەڵکی لە دەوری خڕبوونەوە و پەیمانیان پێدا و سەد هەزار کەس هاتنە پاڵی بە ژێردەستەکانیشیانەوە، سوپاکە لە ناوچەیەک جێگیر بوو کە پێی دەوترا (دیر الجماجم) لە دەرەوەی کوفە، لەدوری حەوت فەرسەخەوە لەڕوی ڕێگای بەصرەوە.

لەم ئان و ساتەدا حەجاج ناردی بۆلای خەلیفە عەبدولمەلیك و داوای یارمەتی لێکرد بۆ ڕوبەڕووبونەوەی سوپاکەی ئیبن ئەشعەس، ئەویش هاوکارانێکی لە سەربازەکانی شام بۆ نارد، ئەوەبوو سوپایەکی گەورەی بۆ کۆبوویەوە و هەرکام لەوان خەندەقێکی بەدەوری سەربازەکەیدا لێدا لە (دیرالجماجم) ساڵی ٨٢ك، لە سەرەتای ڕەبیعی یەکەمەوە، ئینجا شەڕ دەستی پێکرد لە نێوانیاندا و سەد ڕۆژ بەردەوام بوو هەربۆیە شەڕەکە ناسرا بە (حرب المائة) جەنگی سەد ڕۆژە.

(الواقدی) دەڵێت: بەڕاستی ئیبن ئەشعەس کاتێك ڕوی کردە کوفە خەڵکەکەی هاتن بەرەو پیریەوە و لەچواردەوری کۆبوونەوە و هاتنە بەردەستی بێجگە لە کۆمەڵێکی کەم نەبێت کە ویستیان ڕوبەڕووی ببنەوە بەسەرکردایەتی (مطر بن ناجیة) بەڵام نەیان توانی ئەو کارە بکەن، ئینجا گەڕانەوە بۆ کۆشك، جا کاتێك ئیبن ئەشعەس چوویە کوفەوە

فەرمانی کرد پەیژە و پلیکانە بچەقێنن بۆ سەرکەوتنە سەر کۆشکی فەرمانڕەوا، لای (مطر بن ناجیة[1]) هاتە خوارێ و دابەزی، ویستی بیکوژێت ئەویش پێی ووت:

بمهێڵەوە دەبمە باشترین سوارچاك بۆت.

ئیتر نەیکوشت و بەندی کرد، پاشان لەبەندیخانە ڕزگاری کرد، ئەویش بەیعەتی پێدا.

کاروباری کوفە بۆ ئیبن ئەشعەس جۆر بوو، ئەوانەش کە خەڵکی بەصرەبوون و هاتبوون چوونە ڕیزیەوە، وەك (عبدالرحمن بن العباس بن ربیعة بن عبدالمطلب)، فەرمانی کرد بە چەکدارەکان لە هەموو لایەکەوە و هەموو دەرچە و دەروازە و ڕێگا و ڕێڕەوەکانی داخست و پاسەوانی لێدانا، پاشان کە حەجاج لە بەصرەوە هات بەرەو کوفە لەگەڵ ئەوانەی لەگەڵیا بوون لە سەربازەکانی شام و گەیشتە نێوان (القادسیە) و (العزیب)، ئیبن ئەشعەس (عبدالرحمن بن العباس)ی بۆ نارد بە کۆمەڵێك سوارچاکی زۆرەوە لە میصریەکان و ڕێگریان کرد و نەیانهێشت حەجاج بچێتە قادسیەوە.

ئینجا حەجاج ڕۆیی تا لە (دیر) لایدا، هەروەها ئیبن ئەشعەسیش هات بەخۆی و سوپاکەیەوە لە بەصری و کوفیەکان تاکو لە (دیرالجماجم) لایدا، گشت ئەوانەی کە

[1] . مطر بن ناجیة الریاحي: کاربەدەستی حەجاج بوو لەسەر (مەدائن) و کاتێك هەواڵی هەڵگەڕانەوەی ئیبن ئەشعەسی پێگەیشت لە حەجاج و خەلیفە عبدالملك و تێکشکانی حەجاج لە (تستر)، ئەمیش چووە کوفە و پشتیوانان لە دەوری خڕبوونەوە و کاربەدەستەکەی حەجاجیان دەرکرد کە ناوی (عبدالرحمن بن عبدالله الحضرمي) بوو، ئیبن ناجیە لە کوفە بەردەوام بوو بەڵام نەیتوانی خەڵکی بۆلای خۆی ڕابکێشێت تاکو ئیبن ئەشعەس هاتە کوفەوە و گەمارۆی کۆشکی فەرمانڕەوای دا، هات بۆ ئیبن ناجیە و دەستگیری کرد، ویستی بیکوژێت ئینجا ئیبن ناجیە داوای لێکرد کە نەیکوژێت و بیهێڵێتەوە و هاتە ڕیزیەوە.

بەڕاستی هەموو هەوڵەکانی ئیبن ناجیە شکستی هێنا لە وەرگرتنەوەی پەیمان لێی دوای ئەو پڕوپاگەندەیەشی کە بڵاوی کردەوە گوایا ئیبن ئەشعەس کوژراوە پێش گەیشتنی ئیبن ئەشعەس بە کوفە و شەڕی (الجماجم).

لەبەر ئەمەیە کە بزوتنەوەکەی ئیبن ناجیە هیچ گرنگایەتیەکی نەبوو و وون بوو لە نێوان ملمانێکەی ئیبن ئەشعەس و حەجاج دا.

لەگەڵ ئیبن ئەشعەس بوون سەد هەزار جەنگاوەر بوون لەوانەی کە ئازاد بوون و هێندەی ژمارەی خۆیشیان ژێر دەستەیان لەگەڵ بوو.

خەڵکانێکی زۆر و یارمەتیەکی زۆر بەدوور لە چاوی ئەوەوە هاتن بۆ حەجاج، هەریەك لەو دوو کۆمەڵەیە بۆخۆی و بەدەوری سوپاکەیدا خەندەقێکیان لێدا بۆ ڕێگرتن لەوەی دەستی دوژمنیان پێ بگات، شوێنی سوپاکەشی لە (دیر قرة)بوو.

سەرباری ئەوەش خەڵکی هەموو ڕۆژێك خۆیان بۆیەك دەردەخست و شەڕێکی قورسیان دەکرد هەموو کاتێك، تاکو لە سەرگەورەی خەڵکەکان کەسانێك لە قورەیش و بەدەر لەوانی کوژران و بریندار بوون، ئەم ڕەوشە ماوەیەکی دوورودرێژ بەردەوام بوو ، ئینجا فەرماندە بە ئەزمون و خاوەن پرس و ڕاکان لەدەوری عبدالملك کۆبوونەوە و پێی وتن: ئەگەر لابردنی حەجاج و دورخستنەوەی لە نێوە ڕازیتان دەکات ئەوا دوری دەخەمەوە لێتان، هەروەك خەڵکی شام پشك و بودجەی خۆتان بۆ دەنێرم، با ئیبن ئەشعەسیش هەر وڵات و شارێك خۆی پێی خۆشە هەڵی بژێرێت کە ببێتە ئەمیر و فەرمانڕەوای هەتاکو هەردووکمان مابین لە ژیاندا، فەرمانڕەوایەتی عێراقیش بۆ محمدی کوڕی مەروان بێت.

لە سەردەمی خۆیدا ئەمەی وت: ئەگەر خەڵکی عێراق وەڵامی ئەو پێشنیارەم نەدەنەوە، ئەوا حەجاج وەك خۆی لەو شوێنەی خۆی دەمێنێتەوە و جڵەو و فەرمانی شەڕەکەشی بەدەستە، محمدی کوڕی مەروان و عبداللەی کوڕی عبدالملك گوێڕایەڵی حەجاج دەبن و لەژێر فەرمانی ئەودا دەبن، لە ڕا و فەرمانی دەرناچن لەکاتی شەڕ و ئاشتیدا.

عبدالملك دەیویست کۆتایی بەو ئاژاوەیە بهێنێت بە لابردن و دەرهێنانی شا دەماری فەرمانڕەوایەتیەکەی کە حەجاجی کوڕی یوسف بوو و شۆڕشی عێراقیەکان لەبەر ئەو هەڵگیرسا.

هەربۆیە حەجاج زۆر ترسا کاتێك بە پرسی لابردن و دورخستنەوەی زانی بۆ ڕازیکردنی ئیبن ئەشعەس و شوێنکەوتوانی و دامرکانەوەی ئاژاوەکەی کە زۆر سامان و گیانی کردبوویە قوربانی.

هەربۆیە حەجاج نامەیەکی نوسی بۆ خەلیفە و داوا و تکای لێکرد کە دوری نەخاتەوە و لای نەبات و پاڕایەوە کە بیهێڵێتەوە لە حوکمڕانیدا، ئائەوەیە نەریت و سروشتی ستەمکاران کاتێك هەست بە لابرانیان دەکەن لەسەر کورسی دەسەڵات دەپاڕێنەوە...وەك لە نامەکەیدا هاتبوو:

ئەی ئەمیری بڕواداران بەخوا گەر فەرمانی لابردنی من بدەیتە دەست خەڵکی عێراق ئەوا زۆری پێ ناچێت سەرپێچی لەجەنابیشت دەکەن و دێن بۆت، ئەوە هەڵوێستەی تۆ تەنها بوێری ئەوان زیاتر دەکات بەرامبەرت، ئایا هیچت نەبیستووە لەبارەی ڕاپەڕینی خەڵکی عێراقەوە لەگەڵ (أشتر النخعي) دژی ئیبن عەففان؟!

کاتێك پرسیاری لێکردن چیتان دەوێت؟ ووتیان: لابردنی (سەعیدی کوڕی عاص)، کە سەعیدی دورخستەوە ساڵێکی پێ نەچوو چوون بۆ خۆیشی و کوشتیان؟ ئاسن بە ئاسن دەکوترێت، خوا پشتیوانت بێ هەرچی بکەیت و بیرت لە هەرچی کردەوە .. والسلام[1].

بەڵام خەلیفە داوا و تکاکەی حەجاجی پەرچ کردەوە و سووربوو لەسەر پێشنیازی لابردن و دورخستنەوەی لە عێراق لەبەرامبەر کۆتاییهاتنی شۆڕش و ڕاپەڕینەکەدا، بەڵام گەر نەهاتن بەدەم پێشنیازەکەیەوە ئەوا دەستی حەجاج دەکاتەوە بۆ شەڕکردن لەگەڵیان.

(عبداللەی کوڕی عبدالملك)( و محمدی کوڕی مەروان) چوونە ناو خەڵکەوە، عبدالله بانگەوازی کرد بەناو خەڵکی عێراقدا و ووتی: ئەی گرۆی خەڵکی عێراق من عبداللەی کوڕی ئەمیری بڕواداران عبدالملك کوڕی مەروانم، بەڕاستی خەلیفە پێشنیازی ئەمە و ئەوەتان بۆ دەکات.

---

١ .سەیری : البداية والنهاية و التأريخ الطبري...... بکە.

هەموو ئەو پێشنیاز و هەڵبژاردنانەی خستە ڕوو کەباوکی بۆی کردبوون.

هەروەها محمدی کوڕی مەروان ووتی: منیش نێردەی براکەم ئەمیری بڕواداران هاتوم بۆ هەمان شت.

ئەوانیش ووتیان: سبەینێ لە کاروباری خۆمان دەڕوانین و ئێوارەکەی وەڵامتان لێ دەگێڕینەوە.

پاشان ڕۆیشتن و ئینجا هەموو فەرماندەکان لای ئیبن ئەشعەس کۆبوونەوە، هەستا وتارێکی بۆ دان و هانی دان بۆ پەسەند کردنی پێشنیازەکە بە لابردنی حەجاج کە هۆکاری ئاژاوەکەیە و ئەوەی بۆیان پێشنیار کراوە لە دیاری و دەستەکەوتەکان بۆیان و پەیمان دان بە عبدالملك وەك خەلیفە و کردنی محمدی کوڕی مەڕوان بە فەرمانڕەوای عێراق لەجیاتی حەجاج.

بەلام ئەهلی دوبەرەکی ووتیان: نا بەخوا ئەوە پەسەند ناکەین ئێمە زیاترین لە ژمارە و کەلوپەلی شەڕدا و ئەوان لە تەنگانەدان ئێمە هەمانە بەسەریاندا و ئەوان بێ دەسەڵاتن بەرامبەرمان ، بەخوا ئێمە هەرگیز بەو پێشنیارە ڕازی نابین.

پاشان لابردنی عبدالملك و حەجاجیان نوێکردەوە و هێنایانە بەرباس، ئائەم جۆرەیە حاڵی خەڵکی عێراق، هەمان کاریان کرد لەگەڵ (ئیمامی عەلی) و پاشان (حوسەین)ی کوڕی و پاشان نەوەکەی (زید بن علی) ڕەزای خوایان لێبێت و بێجگە لەوانیش لە پێشەوا و سەرکردەکان.

کاتێك ئەهلی دوبەرەکی پێشنیارەکەی خەلیفە عەبدولمەلیکیان ڕەت کردەوە (عبدالله)ی کوڕی خەلیفە و مامی (محمدی کوڕی مەروان) بە حەجاجیان ووت: ئیتر ئیشی خۆتە چیان لێدەکەیت، ئێمە گوێڕایەڵی تۆین وەك چۆن ئەمیری بڕواداران فەرمانی پێکردووین.

ئەوەبوو حەجاج کاروباری شەڕەکەی گرتە دەست و هەر لایەك خۆی بۆ لاکەی تر دەردەخست و شەڕێکی قورس و خوێناوی ڕوویدا، حەجاج لە ڕاستی سوپاکەیدا (عبدالرحمن بن سلیمان) و لە چەپیشیدا ( عمارة بن تمیم اللخمی) داینابوو، بۆ سەرکردەی

سوارییەکان ( سفیان بن الابرد) ی دانابوو، بۆ پیادەکانیش (عبدالرحمن بن حبیب الحکمی) دانابوو.

بەلام ئیبن ئەشعەس لە ڕاستی سوپاکەیدا (حجاج بن حارثة الجشمی) و لە چەپیشدا (الابرد بن قرة التمیمی) و بۆ سوارییەکان (عبدالرحمن بن عیاش بن أبی ربیعە) وبۆ پیادەکانیش (محمد بن سعد بن أبی وقاص الزهری) دانابوو، کەتیبەی قورئان خوێن و زانایانیش لە سوپاکەیدا ( جبله بن زحر بن قیس الجعفی) پێشەنگیان بوو کە (سعید بن جبیر) و (عامر الشعبی) و (عبدالرحمن بن أبی لیلی) و (کمیل بن زیاد) و (أبو البحتري الطائي) و بێجگە لەوانیش لە زانایانی کوفە و بەصرە لەناویاندا بوون .

شەڕەکە لەنێوان هەردوو لا نزیکەی سەد ڕۆژ بەردەوام بوو ، خەلکی عێراق خۆراکیان لە هەرێمەکانی نزیک خاکی عێراقەوە بۆ دەهات، لە فەرعانە و خۆشگوزەرانیدا بوون، بەلام خەلکی شام لە تەنگانە و کەمخۆراکیدا بوون، تەنانەت ئەوان گۆشتیان بەتەواوی لەدەست دابوو، هەروەها سەرکەوتن زۆربەی جار لەبەرژەوەندی خەلکی عێراق بوو.

حەجاج لە سالی ٨٢ك یەکێك لە زاناکانی کەناوی (کمیل بن زیاد بن نهیك بن خیثم النخعی الکوفی)بوو بەدیل گرت و هێواش هێواش کوشتی، (کمیل) لە سوپاکەی ئیبن ئەشعەس دا لە ڕیزی قورئان خوێنەکاندا بوو، یەکێك بوو لە پشتیوانانی ئیمامی عەلی ڕەزای خوای لێبێت، حەجاج بۆیە کوشتی چونکە بە دیلی کەوتە دەستی. ئینجا حەجاج جنێوی بە ئیمامی عەلی دا ڕەزای خوای لێ بێت، ئەویش صلاواتی لەسەردا و ووتی (علیه السلام) حەجاجیش پێی ووت: دە بەخوا کەسێکت بۆ دەنێرم بتکوژێ زیاتر لەوەی تۆ خۆشت دەوێ ئەو ڕقی لە عەلی بێت، هەربۆیە (ئیبن ئەدهەم)ی نارد کە خەلکی حیمص بوو پێی دەوترا (ئەبا جەهم ئیبن کەنانە) و دای لە گەردنی.

سالی ٨٣ك دەستی پێکردو و جەنگ و شەڕ لەنێوان هەردوولادا بەردەوام بوو و لەزۆربەی ڕۆژەکاندا سەرکەوتن بۆ خەلکی عێراق بوو، هەشتا و ئەوەندە جار بەسەریاندا سەرکەوتن بەلام حەجاج لە سەربازگەکەیدا جێگیر بوو و نەجولا، ئەگەر ڕۆژێك سەرکەوتایە هەنگاوێك دەچووە پێشەوە بەرەو سوپاکەی ئیبن ئەشعەس و هەر بەو

جۆرە بوو تاکو فەرمانی کرد بە هێرشکردنە سەر کەتیبەی قورئان خوێنەکان چونکە خەڵکی شوێنکەوتەی ئەوان بوون، ئەوان بوون خەڵکیان گەرم دەکرد و هان دەدا بۆ شەڕ.

قورئان خوێنان خۆیان ڕاگرت لەبەردەم هێرشەکەی حەجاج دا، تیرهاوێژەکانی سوپاکەی لێ کۆکردنەوە و پەلاماری دان و زۆری لێ کوشتن، پاشان پەلاماری سوپاکەی ئیبن ئەشعەسی دا و هاوەڵەکانی ئیبن ئەشعەس تێک شکان و ئیبن ئەشعەس لە گۆڕەپانی جەنگەکە هەڵات و هەندێك لە هاوەڵەکانیشی لەگەڵ بوو، سوپاکەی حەجاج بەدوایان کەوتن تاکو ئیبن ئەشعەس چووە خاکی (رتبیل)ی تورکیەوە لە سەجستان.

هۆکاری سەرکەوتن و شکستی ئیبن ئەشعەس لە کۆتاییدا هەر کەتیبەی قورئان خوێن و زاناکان بوون کە (جبلە بن زحر) سەرکردایەتی دەکردن.

حەجاجیش سێ کەتیبەی بۆ پەلاماردانی ئەو کەتیبەیە ئامادەکردبوو لەژێر سەرکردایەتی (الجراح بن عبداللە الحکمي) و پەلاماری کەتیبەی قورئان خوێنەکانیان دا بە هەڵمەتێکی بەهێز و بەزیان، کەتیبەی قورئان خوێنەکانیش بە باشی ڕووبەڕوویان بوونەوە و خۆیان ڕاگرت، بەڵام ئەو سێ کەتیبەیە لە کۆتاییدا توانیان سەرکردەی قورئان خوێنەکان ( جبلة بن زحر) بکوژن، سەریان بڕی کەللە سەرەکەیان نارد بۆ حەجاج کە بەوە زۆر دڵخۆش بوو و مزگێنی سەرکەوتنی دا بە سەربازەکانی و پێی ووتن: ئەی خەڵکی شام مژدە بێت ئەوە سەرەتای سەرکەوتنەکەیە، بەخوا هەرگیز ئاژاوەیەك هەڵنەگیرساوە و دامرکابێتەوە هەتا گەورەیەك لە گەورەکانی خەڵکی یەمەنی تیا نەکوژرابێت. ئەمەش یەکێکە لە گەورەکانیان[1].

کوژرانی (جبلە بن زحر) بوویە هۆی لاوازبوونی کەتیبەی قورئان خوێنەکان و هەروەها سوپاکەی ئیبن ئەشعەس.

---

[1] . سەیری : تأريخ الطبري و الكامل في التاريخ...بکە

پاش ئەوە بە چەند ڕۆژێك ئیبن ئەشعەش تێك شكا و هاوڕێكانی پێشنیاری هەڵاتنیان بۆکرد بۆ وڵاتی پاشا (رتبیل)، کە لەسەر ڕێگەدا بوو بەلای شاری (بوست) دا تێپەڕی کە سەر بە (رتبیل) بوو و کاربەدەستەکەی کە یەکێك بوو لە شوێنکەوتووانی ئیبن ئەشعەس، پێی ووت:

بێرە لای من لەم شارە، خۆتی تیا بشارەوە لە دوژمنەکەت، بەڵام مەهێڵە هیچ کام لەوانەی لەگەڵتن بێنە شارەکە.

ئەویش وەڵامی ئەو داوایەی دایەوە، بەڵام ئەو کاربەدەستە فێڵ و تەڵەکەی لەمێشكدا بوو بۆ ئیبن ئەشعەس و هاوەڵەکانی، دەیویست ڕادەستی حەجاجیان بکات.

بۆیە کاتێك ئیبن ئەشعەس چوویە ئەو شارەوە ئەو فەرمانڕەوایە دەستگیری کرد، کە گوایا ئیبن ئەشعەس سەرۆکی بوو، کاتێك ئەم ڕوداوە گەیشتەوە بە پاشا (رتبیل) چوو بۆ ئەو شارە (شاری بوست) هەڕەشەی لە کاربەدەستە فێڵبازەکەی کرد و ووتی: بەخوا گەر ئازاری ئیبن ئەشعەست دابێت لێرە ناڕۆم هەتاکو لە تەخت دانەگرم و هەموو ئەوانەی لە شارەکەتدان دەیکوژم.

ئەویش لەو هەڕەشەیە ترسا و ئیبن ئەشعەسی ئازادکرد و دای بەدەستی پاشا (رتبیل)ەوە ئەویش ڕێزی لێنا و سوپاسی کرد.

***

## کوژرانی ئیبن ئەشعەس

پاش هەڵاتنی ئیبن ئەشعەس لە گۆڕەپانی شەڕەکە، شوێنکەوتووەکانی پەرتەوازە بوون و حەجاج فەرمانی کرد بانگەواز بکەن بەناو پاشماوەی سوپاکەی ئیبن ئەشعەس دا کە هەرکەس بگەڕێتەوە بێ وەی و پارێزراو دەبێت و هەرکەسیش بچێتە سوپاکەی (قتیبە بن مسلم) لە (الری) دیسان بێ وەی و پارێزراو دەبێت.

( محمدی کوڕی مەڕوان) گەڕایەوە بۆ موصڵ و کوڕەکەی خەلیفە عبدالملك گەڕایەوە بۆ شام تاکو مژدەی سەرکەوتنەکە و کۆتایی پێهێنانی ئاژاوە و شۆڕشەکە بدات بە ئەمیری بڕواداران.

حەجاجیش وتارێکی بەخۆنازانەی لەکوفە بۆ عێراقیەکان پێشکەش کرد وەك وتارەکانی تری ئەوکاتەی کە چوویە کوفە بۆ یەکەم جار و بووە فەرمانڕەوایان، پێی وتن:

" ئەی خەڵکی عێراق بەڕاستی شەیتان هاتە نێو هەناو و سکتانەوە و تێکەڵ بوو لەگەڵ گۆشت و خوێن و دەمار و گوێ و پەل و پۆ و پەڕی دڵتاندا پاشان چوویە مێشك و دەمارتانەوە، ئینجا چوویە سەرترو و هێلانەی دانا و هێلکەی کرد، هێلکە تروکا و بوویە بێچوو، پڕی کردن و ئاخنینی بە دووڕوویی و دوبەرەکی و خراپترین ئاکۆکی، ئێوەش کردتانە ڕێبەرێك شوێنی کەوتن و ڕابەرێك گوێڕایەڵی بوون و فەرمانبەدەستێك پرس و ڕای پێ دەکەن".

جا ئیتر نە ئەزموونێك سودتان پێ دەگەیەنێت و نە ڕوداوێك دەبێتە پەند بۆتان و نە ئیسلامێك دەتانگرێتەوە لە تاوان و نە ڕونکردنەوەیەك سودتان پێ دەگەیەنێت؟

هەر ئێوە نەبوون کە لە ئەهواز هاوەڵم بوون، کەچی فێڵتان کرد و هەوڵی غەدرتان دا و کۆبوونەوە بۆ بێ بڕوایی و پێتان وابوو کە خوای گەورە دینەکەی و خەلافەتەکەی لەناو دەبات؟

مـن لای خۆمــەوە سەرزەنشـم کـردن ئێـوەش چـوونە سـەر کـەلێ بـەرز و بـەخێرایی تێکشکان.

پاشان ڕۆژی (الزاوية).. جا چ ڕۆژێك بوو ڕۆژی (الزاوية) ؟ شکست و ناکۆکی و بەزین و بێ بەری بووبی خـوا لـەئێوە و پەشیمانی و وازهێنـانی گەورەکەتان لـەئێوە لـەو ڕۆژەدا ڕوویدا، بەجۆرێك ئێوەش وێڵ بوون وەك وشتری سەرلێتێکچوو و داماڵراو لە پێستەکەی.

ئیتر ئەوکاتی کە شمشێر قەپی لێگرتن و تیر کونی کـردن مرۆڤێکتـان نەیدەپرسی لـە براکەی، گەورە ئاوڕی بەلای نەوەکانیدا نەدەدایەوە و دڵی بۆ نەدەسوتان.

پاشان ڕۆژی (ديرالجماجم) هاتە کایەوە، ئای چ ڕۆژێك بوو؟! لەو ڕۆژەدا شەڕ و شۆڕ و جەنگ بەرپابوو. لەو ڕۆژەدا:

بضرب يزيل الهام عن مقيله ويذهل الخليل عن خليله.

بە لێدانێك سەرەکان لە گەردن جیادەکرانەوە...هاوڕێ لە هاوڕێکەی خۆی هەڵدەهات.

ئەی خەڵکی ئەهلی خراپەکاری دوای خراپەکاری و ناپاکی لـە دوای ناپـاکی، بێ بـاری لەدوای بێ باری.

گەر قیت بوونەوە لە شوێنی خۆتان دەبنە داگیرکار و ناپاکی دەکەن، ئەگەر لە ئاشتی و بێوەییدا بوون ئاژاوە دەنێنەوە، ئەگەریش ترسان دوڕوویی دەکەن، نە باسـی چاکەیەك دەکـەن، نـە سوپاسـی نیعمـەتێك دەکـەن، هـەر دەسـتبڕێك سـوکایەتی پێکـردبن یـان فریودەرێك فێڵـی لێکـردبن یـان ستەمکارێك پشتی نـەگرتبن یـان فێڵبازێك باوەشـی بـۆ نەگرتبنـەوە ئێـوە شـوێنی ئـەوە کـەوتوون و پـەناتان داوە و پشـتیوانیتان لێکـردووە و باوەشتان بۆکردۆتەوە!

ئەی خەڵکی عێراق هەر یاخیەك ئاژاوەی نابێتەوە یان هەر هاتوهاوارکەرێك هاوارێکی کردبێت یان هەر کەس بایەکی لە سکی خۆی دەرکردبێ ئێوە بوونەتە پشتیوان و شوێنکەوتووی.

ئەی خەڵکی عێراق ئایا لە پەندەکان پەند وەرناگرن، ئایا مردن ناتاون وەستێنێت، ئایا ڕووداوەکان ناتان ترسێنێت؟

حەجاج جارێکی تر بەیعەتی وەرگرتەوە بۆ عەبدولمەلیك و بەهێواشیش لەبەردەمی خۆیەوە نزیکەی سەد و سی هەزاری لە سوپا بەزیوەکەی ئیبن ئەشعەس کوشت.

بەڵام ئیبن ئەشعەسی هەڵاتوو لە وڵاتی (رتبیل) بە زاراوەی ئێستا (لجوئی سیاسی) بۆخۆی بەدەست هێنا و ڕێکەوت لەگەڵ رتبیل کە شەڕ نەکات لەگەڵی ئەگەر سەرکەوت بەسەر حەجاج دا، وە ئەگەر بەزی ئەوا ڕوتبیل پەنای بدات، پاشا رتبیل بەو جۆرە تا ماوەیەك وەفاداریبوو بۆی ، چونکە حەجاج بەردەوام نامەی لەگەڵ ڕوتبیل دەگۆڕیەوە و داوای لێدەکرد ئیبن ئەشعەسی ڕادەست بکات، سوێندی بۆ دەخوارد بەو خوایەی کە هیچ خوایەك نیە جگە لە ئەو ئەگەر ڕادەستی نەکات یەك ملیۆن لە پیاوە جەنگاوەرەکانی دەنێرێتە سەری، سەرەتا (عمارة بن تميم اللخمي ) بە سی هەزار سوارچاکەوە لە سوارچاکەکانی خەڵکی شام نارد بۆ شەڕکردن لەگەڵی ئەگەر ئیبن ئەشعەس و ئەوانەی لەگەڵیەتی ڕادەستی نەکات.

هەربۆیە ڕوتبیل پرسی بە ڕاوێژکارەکان و هەندێك لە فەرماندەکان کرد و ئەوانیش پێشنیاری ڕادەستکردنی ئیبن ئەشعەسیان بۆ کرد پێش ئەوەی حەجاج لە شوێنی خۆی بێتە دەر، ئینجا نێردەی نارد بۆلای حەجاج بەو مەرجەی کە دە ساڵ شەڕی لەگەڵ نەکات.

حەجاج بە داواکەی ڕازیبوو، ئەوکات ئیتر ڕوتبیل ناپاکی لە ئیبن ئەشعەس کرد و دەڵێن فەرمانی کرد بدەن لە ملی و کەللە سەرەکەی بنێرن بۆ حەجاج.

دەشڵێن کە ئیبن ئەشعەس توشی نەخۆشی سیل بووە و مردووە دواتر ڕوتبیل سەری لێکردۆتەوە و ناردویەتی بۆ حەجاج.

بەڵام ئەوەی زیاتر باوە وەك ئیبن کەسیر و ئیبن جەریر و بێجگەلەوانیش دەڵێن: روتبیل بەخۆی و سی لە نزیکەکانیەوە دەستگیریان دەکات و بە زنجیر و کەلەبچە دەیانبەستێتەوە لەگەڵ نێردەکەدا دەیان نێرێت بۆ حەجاج.

کاتێك لە ڕێگادا بوون گەیشتنە شوێنێك پێی دەوترا (الرجح) ئیبن ئەشعەس سەرکەوتە سەر بانی کۆشکێك و پیاوێکیشی پێوە بەسترابوو بە کۆت و کەلەبچەوە تاکو هەڵنەیەت، خۆی لەو کۆشکەوە خستە خوارێ و ئەوەشی لەگەڵی ڕاسپێردرابوو کەوتە خوارەوە و هەردووکیان مردن.

ئینجا سەری خۆی و ئەو هاوەڵانەی لەگەڵی بوون بڕدران و کەللەسەرەکانیان نارد بۆ حەجاج ئەویش فەرمانی کرد خەڵك بێن بۆ بینینی کەللە سەرەکەی لە عێراق.

پاشان ناردی بۆ خەلیفە عبدالملك لە شام و لەشام دەهاتنە سەیری کەللە سەری.

دواتر نێردرا بۆ میصر کە فەرمانڕەواکەی براکەی عبدالملك بوو، کە عبدالعزیز کوڕی مەروان بوو و سەری ئیبن ئەشعەسیان هەڵواسی و خەڵکی دەهاتنە سەیری و پاشان لە میصر سەری ئەسپەردە کرا و لاشەکەشی لە (الرجح) بوو و هەندێك لە شاعیرەکانیش لەو بارەیەوە ووتویانە:

**هيهات موضع جثة من رأسها　　　　رأس بمصر وجثة بالرجح**

واتە: چەند دورە شوێنی لاشە لە کەللە سەرەوە کەللە لە میصر و لاشە لە (رجح)ە.

ئیبن جەریر باسی کردووە کە کوژرانی ئیبن ئەشعەس ساڵی ٨٥ك بووە ..والله أعلم.

بەڵام ئیبن کەسیر دەڵێت کوژرانەکەی ساڵی ٨٤ ك بووە.

ئیبن کەسیر لە ژیاننامەی ئیبن ئەشعەس دا دەڵێت:

سەیرە زۆریش سەیرە ئەو خەڵکانەی کە بەیعەتی فەرمانڕەوایەتیان پێدا و لەکاتێکدا ئەو لە قورەیش نەبوو، بەڵکو پیاوێکی یەمەنی بوو، هاوەڵان ڕۆژی (سەقیفە) لەسەر ئەوە کۆدەنگ بوون کە ئیمارەت و خەلافەت تەنها بۆ قورەیشە و ئەبوبەکری صدیقیش فەرمودەیەکی بۆ کردنە بەڵگە.

ئینجا چۆن دەچن بۆ خەلیفەیەك کە چەندین ساڵە پەیمانی بوون بە خەلیفەی موسوڵمانانی پێدراوە و لێی هەڵدەگەڕێنەوە لەکاتێکدا ئەو لە پشتی قورەیشە، و

لەهەمان کاتدا پەیمان دەدەنە پیاوێکی (کندی) یەمەنی، پەیماندانێک کە ئەهلی (الحل و العقد) کۆک نین لەسەری؟

لەبەر ئەمە، ئەوە لێکترازان و بەرهەم و سەرەنجامەکەی بوو، کە بەهۆیەوە خراپەیەکی زۆر دروست بوو و خەڵکانێکی زۆر تیایدا لەناو چوون... انا لله وانّا الیه راجعون..

خەلیفە عەبدولمەلیک پاش کوژرانی ئیبن ئەشعەس ساڵی ٨٦ك کۆچی دوایی کرد.

پاشان حەجاج کەوتە شوێن پشتیوانەکانی ئیبن ئەشعەس و دەستی بە کوشتیان کرد دانە دانە و دووان دووان هەتا وتراوە وەك باسمان کرد لەبەردەمی خۆیەوە بە هێواشی سەد و سی هەزاری لێ کوشتن، کە کۆمەڵێك لەوانە گەورە و خانەدان و زانا و چاکەکاران بوون، کۆتاهەمینیان (سەعید کوری جوبەیر) بوو -ڕەحمەتی خوای لێ بێت-، کە دواتر ڕوی دەکەینەوە، بەکوژرانی سەعیدی کوری جوبەیر حەجاج خۆیشی مرد.

ئیبن جەریر بە ڕەحمەت بێت دەفەرموێت: کاتێك دیلەکان گەیەنرانە لای حەجاج زۆربەیاتی کوشت و لە هەندێکیشیان خۆش بوو، ئەگەرچی حەجاج ئەو ڕۆژەی کە سەرکەوت بەسەر ئیبن ئەشعەس دا بانگەوازی کرد لەناو خەڵکدا: هەرکەس بگەڕێتەوە ئەوە بێ وەی و پارێزراوە و هەرکەسیش بچێتە ریزی (مسلم بن قتیبة بالري) دیسان بێ وەی و سەلامەتە، هەربۆیە خەڵکێکی زۆر لەوانەی لەگەڵ ئیبن ئەشعەس بوون چوونە ریزی (مسلم)ەوە و حەجاجیش پاراستن و دڵنیایی پێدان، ئەوانەش کە نەچوونە ریزیەوە حەجاج دەستی کرد بە وەدوکەوتنیان و خەڵکێکی زۆری لێکوشتن و هەتا دواهەمین کەس کە کوژرا سەعید کوری جوبەیر بوو.

(ئیبن أثیر) لە مێژووەکەیدا باسی کردووە: پیاوێك لە پشتیوانان هات بۆلای عومەری کوری عەبدولعەزیز و ووتی: من فلانی کوری فلانم، ڕۆژی بەدر باپیرم فلانی کوشت، ڕۆژی ئوحود فلانی کوشت، بەو جۆرە باسی جوامێریی پێشینەکانی خۆی دەکرد.

ئینجا عومەر تەماشای ئەو کەسەی لەتەنیشتیدا بوو کرد و ووتی: بەخوا ئەمە جوامێریە، نەك ڕۆژی (الجماجم) وڕۆژی (راهط)، کە موسوڵمان لە موسوڵمان هەڵگەڕایەوە و چەکی لە موسوڵمان ڕاکێشا. ولاحول ولاقوه الا بالله رب العالمین.

بەڕاستی ئاژاوەکەی ئیبن ئەشعەس ئاژاوەیەکی گەورەبوو یەك قسەیی و یەکدەنگیی موسوڵمانانی کرد بە دوو بەرەوە، زیاتر لە سەد هەزار موسوڵمانی تیادا کوژرا، لەم ڕوداوەشدا چەند سودێك هەیە یەکەمینیان ئەوەیە: ئاژاوەکان لەسەرەتای سەرهەڵدانیاندا چێژ و شیرینییەك هەیە زۆر کەس بەلای خۆیدا کەمەندکێش دەکات، مەگەر کەسێك خوا بیپارێزێت و ڕزگاری بکات، هەربۆیە زۆرێك لە قورئان خوێنەکان لەگەڵ ئیبن ئەشعەس هاتنە شەڕ، وێڕای خەڵکە ئاساییەکە، قسەیان لەسەرەتای ئاژاوەکەدا بەهێز و هەژێنەر بوو، وتەبێژەکانیان قسەیان دەکرد و وتاربێژەکانیان داهێنانیان دەکرد لە هاندانی خەڵك بۆ شەڕی دژ بە سەربازەکانی خەلیفە و یاریدەدەر و وەزیرەکانی.

خوای گەورە دەفەرمویت :﴿ وَاتَّقُوا فِتْنَةً لَّا تُصِيبَنَّ الَّذِينَ ظَلَمُوا مِنكُمْ خَاصَّةً﴾[1]

هەروەها دەڵێت کاتێك حەجاج سوپاکەی ئیبن ئەشعەسی تێکشکاند دەستی کرد بە بەیعەت سەندنەوە لە خەڵکی بە زۆر، بەیعەتی لەکەس وەرنەدەگرتەوە تاکو پێی دەووت گەواهی بدە لەسەر خۆت کە کافر بوویت، واتە بە هەڵوەشاندنەوەت بۆ بەیعەت و هەڵگرتنی چەك، جا گەر بیوتایە بەڵی بەیعەتی لێ وەردەگرت ئەگەرنا دەیکوشت.

ئینجا پیاوێك لە (خثعم) هات بۆلای کە پەرێز بوو لە گشت خەڵکی، حەجاج پرسیاری حاڵی لێکرد ئەویش هەواڵی دورەپەرێزیەکەی پێدا، حەجاج ووتی: بەڵکو تۆ چاوەڕێی چی دەکەیت لێمان، ئایا گەواهی دەدەیت کە بێ باوەڕیت؟

پیاوەکە ووتی: پیاو خراپ من هەشتا ساڵە بەندایەتی بۆ خوا دەکەم، پاشان گەواهی بدەم لەسەر خۆم بە بێ باوەڕبوون و کافری.

حەجاج ووتی: کەواتە دەتکوژم؟

پیاوەکەش ووتی: ئەگەریش بمکوژی نایڵێم.

هەربۆیە حەجاج کوشتی، ئیتر کەسێك نەما لە خەڵکی شام و عێراق خەمبار و پەرۆش نەبووبێت بە کوشتنی ئەو پیاوە.

---

[1] . الأنفال: ٢٥. بۆ ڕاڤەی ئایەتەکان سەیری تەفسیری ئاسان بکە

کەواتە گەر ئاژاوەکە لە جڵە دەرچوو ئەوکات ئەوەی چووەتە ناوی پەشیمان دەبێتەوە لەو هەموو خراپەکارییەی تیایدا دەیبینێت و ئەو شەڕەی کە لێوەی دێتە ئاراوە، هەر ئەمەشە کە پێشهات بۆ ئەهلی ئاژاوەکەی ئیبن ئەشعەس، هێتران هەتا کەوتنە دەست حەجاج.

وەکو (عمرو بن موسى) بە متمانەوە هێنرا بۆلای، ئینجا حەجاج پیایا هەڵشاخا و لێ تووڕەبوو، ئەویش پۆزشی هێنایەوە و وتی خوا چاك بۆ فەرماندە بکات!! ئاژاوەیەك بوو چاکەکار و تاوانباریشی گرتەوە، خوای گەورە تۆی توانادار کرد بەسەر ئێمەدا، جا گەر لێم خۆش بوویت ئەوا لە چاکەی خۆتەوەیە، ئەگەر سزاشت دام ئەوا سزای ستەمکار و تاوانبارێکت داوە.

ئینجا حەجاج وتی: بەڵام ئەوەی کە دەڵێی چاکەکار و خراپەکاری گرتەوە، درۆت کرد، بەڵکو خراپەکاری گرتەوە و چاکەکارانی لێ بێ بەش بوون، خۆزگا دانپیانانەکەشت بە کەڵکت بهاتایە.

ئینجا خەڵکی تکایان کرد سەلامەتی بکات.

بەڵام حەجاج فەرمانی کرد سەری بەڕێنن.

پاشان حەجاج بانگی کرد لە (الهلقام بن نعيم) و وتی: چی وای کرد لەگەڵ ئیبن ئەشعەس لێمان ڕاپەڕی؟ چیت دەویست و بەتەمای چی بوویت؟ ئەو پیاوە وتی: تەمام هەبوو ئیبن ئەشعەس ببێتە پادشا و بمکاتە فەرمانڕەوای عێراق، وەك چۆن عبدالملك تۆی کردە فەرمانڕەوا، ئینجا حەجاج ئەویشی کوشت.

پێغەمبەر درودی خوای لێبێت پەنای دەگرت بەخوا لە ئاژاوە و لەهەموو نوێژێکدا فەرمانی بەوە دەکرد، چونکە هەندێك لەو ئاژاوانە ئەو کەسەش کە نەرمونیان و لەسەرخۆیە سەرگەردان و حەیران دەکەن، ئەوەش چونکو ئەهلی ئاژاوە کارەکەیان دەڕازێننەوە بە زۆریی کردارە بەجێکانیان، هەربۆیە ئیبن ئەشعەس زیاتر لە سەد و پەنجا هەزار کەسی لەگەڵ بوو و کۆمەڵێك لە گەورەپیاوەکانیشی شوێن کەوت.

پێشەوا (ابن بگە العکبری) هۆشداری دەدات سەبارەت بە فریوخواردن بە ژمارە زۆری دەڵێت: خەڵکی لەم سەردەمەی ئێمەدا وەك پۆلە باڵندە هەندێکیان شوێن یەکتری دەکەون!! ئەگەریش کەسێکیان لەناو دەرکەوت بانگەشەی پێغەمبەرایەتی بکات ئەگەرچی دەشزانن کە محمد دوا پێغەمبەری خوایە درودی خوای لەسەربێت یان کەسێك کە بانگەشەی خوایەتی بکات ئەوا خەڵکانێك شوێنی دەکەون و باوەڕی پێ دێنن.

ئەوەتا ئیبن ئەشعەس بە سوپایەکی ئیسلامیەوە وەك خەباتکارێك لەپێناوی خوادا ڕاپەڕی، کەچی دواتر سەری لە ئاژاوەوە دەرچوو، شەڕی بێ باوەڕانی وازلێهێنا و هێرشی کردە سەر ئەهلی ئیسلام، بەهۆیەوە کۆمەڵێکی زۆر کوژران، کاروبارەکان تێکچوون و خراپەکاری زۆربوو، پاشان دۆخەکە وای لێهات پەنای بردە لای پادشایەکی بێ باوەڕ کە دوێنێ شەڕی لەگەڵ دەکرد، ئینجا بێ باوەڕەکە دڵخۆش بوو و ڕێزی لێنا بۆ تورەکردنی موسوڵمانان.

ئابەم جۆرە ئاژاوە خاوەنەکەی دەبات بەرەو ئەو شتەی کە نایەوێت.

دواتر ئەو پادشا بێ باوەڕە ناپاکی و خیانەتی لێکرد و ڕادەستی حەجاجی کرد، کەوتە بەردەستی و کاتێك لە ڕێگادا بوو سەرکەوتە سەر کۆشکێك و خۆی فڕێدایە خوارەوە و مرد، جا کێ دەیزانی سەرەنجامەکەی ئاوای لێدێت.

ئیبن ئەشعەس بەرگی شەرعی کردە بەر ئەم ئاژاوەیەی، وای تێگەیاندن ڕویەڕوی خراپە دەبێتەوە و سەرخەری دینە، بەڵام لەناوەڕۆکدا پێچەوانەی ئەوەبوو، ئیبن ئەسیر باسی کردووە کە حەجاج ڕقی لە ئیبن ئەشعەس دەبوویەوە، دەیووت: هەرکات دەمبینی حەزم دەکرد بیکوژم، ئەویش ئەوەی دەزانی، هەڕەشەی دەکرد و دەیووت: ئەمن بەخودا هەوڵدەدەم حەجاج لە دەسەڵات بخەم ئەگەر مام.

وە ئیبن کەسیر وتویەتی کە هۆکاری ئەم ئاژاوەیە ڕق لێبوونی ئیبن ئەشعەس بووە لە حەجاج، پاشان لەدەوری خۆی کەسانێکی خڕکردەوە کە ڕقیان لە حەجاج بوو، سەیر بکەن چۆن ڕقی خەڵکی بەکارهێنا تاکو تۆڵەی لێ بسەنێتەوە و ئابڕوی بەرێت، لەبەر ئەمەیە هەرکەس بانگەشەی پەرتەوازەیی کۆمەڵی موسوڵمانان و ئاژاوە دروستکردن

بکات ئەوا خاوەن هەوەس و دڵ نەخۆشە، ناکۆکە لەگەڵ سوننەت، گەرچی ئەو کارەشی وەك نکۆڵیکارێك لە خراپەکاری پیشان بدات.

بەڕاستی خەلیفە نامەی نوسی بۆ ئیبن ئەشعەس و پێشنیاری لابردنی حەجاج و دانانی ئەو لەشوێنی حەجاجی بۆکرد، هەروەها هێشتنەوەی بەخشش و موچەی خەڵکی وەك خۆی، ئینجا ئیبن ئەشعەس دڵی بۆ ئەو پێشنیارە چوو وتارێکی بۆ خەڵکەکە داو وتی: ئەوەی بۆتان پێشنیارکراوە پەسەندی بکەن بە ڕێز و هێزەوە، نەفامانیش لەگشت لایەکەوە لێی ڕاستبوونەوە و دەیان ووت: نا بەخوا ئێمە ئەوە پەسەند ناکەین لەوان زۆرترین لە ژمارە و چەکدا، بۆیە دوبارە گەڕانەوە بۆ بەزمی لابردنی خەلیفە و بەیعەتیان دا بە ئیبن ئەشعەس، ئەویش بەگوێی کردن و ڕێککەوت لەگەڵیان هەتا کاری بەو ڕۆژە گەیشت.

لەبەر ئەوە پێشەوایان سورن لەسەر یەکدەنگی و یەکڕیزی لە کاتی ئاژاوەکاندا، ئیمامی حەنبەل دەفەرموێت: فەقیهەکانی بەغداد لەسەردەمی (واثق) دا هەستان چوون بۆلای پێشەوا ئەحمەدی کوری حەنبەل – ڕەحمەتی خوای لێبێت پێیان ووت: کارەکە ئاڵۆزاوە و دەماودەم کەوتووە – مەبەستیان ئەوەبوو باسی بە دروستکراو زانینی و خەلقی قورئان کەوتۆتە سەر زار - ئێمەش ڕازی نین بە دەسەڵات و فەرمانڕەوایەتی ئەو، پێشەوا ئەحمەدیش گفتوگۆی کرد لەگەڵیان لەوبارەیەوە و فەرمووی: پێویستە لەدڵدا نکۆڵی ئەوە بکەن، دەست لە گوێڕایەڵی بەرمەدەن، یەکڕیزی موسوڵمانان کەرت مەکەن، خوێنی خۆتان و موسوڵمانانیش لەگەڵ خۆتان بەڕشتن مەدەن، سەیری کۆتایی کارەکەتان بکەن، ئارام بگرن تاکو چاکەکار پشو دەدات و لە خراپەکار ڕزگاری دەبێت.

وە پێی ووتن: ئەمە – واتا دەست هەڵگرتنیان لە گوێڕایەڵی – باش نیە.

لەو پەند و وانانەی کە لە ئاژاوەکەی ئیبن ئەشعەس کەڵکیان لێوەردەگیرێت:

پەیوەست بوون بە کۆمەڵی موسوڵمانان و پێشەواکەشیانەوە و خۆپاراستن لە دوبەرەکی، لەبەر ئەو وتەیەی حوزەیفە خوای لێ ڕازی بێت کاتێك پێغەمبەر درودی

خوای لێبێت باسی ئاژاوەکانی بۆ کرد ووتی فەرمانی چیم پێ دەکەیت ئەگەر کەوتینە سەردەمی ئاژاوەوە؟

فەرمووی: لەگەڵ کۆمەڵی موسوڵمانان و پێشەواکەیاندا بە.

یەکێکی تر لەو سودانە ئاوڕدانەوەیە بەدەوری زانایانی سوننە و ئەهلی یەکتاپەرستی و خۆپاراستن لە دوبەرەکی و ناکۆکی لەگەڵیان، هەروەها گوێگرتن لە ڕاوبۆچونەکانیان و بەدەمەوە چوونی ئامۆژگاریەکانیان.

یەکەمین دەرگا کە پیاو لێوەی بچێتە نێو ئاژاوەوە تانەیە لە زانایان، کەللەڕەقی و نوسانە بە ڕا وبۆچوونێکەوە بەبێ ڕای ئەوان، هەرکەستان بینی کە قسە بە زانایانمان دەڵێت بزانن ئەوە فریوی خواردووە و لایداوە، چون لە نیشانەکانی ئەهلی بیدعە کە کەوتۆتە نێو ئەهلی سوننەتەوە ئەوەیە کە ئەگەر ئاژاوە ڕویدا هەموو ئەوەی دەزانرێت دەوترێت، کەس کاروبار بۆ زانا گەورەکان جێ ناهێڵێت بۆ پاراستنی یەکدەنگی، خۆی دەبێت خەڵکی دواجار بۆ کاروبارەکانیان پرس بە زانایان بکەن، هەرکەس ڕایەکی هەبوو بیخاتە ڕوو بۆیان :﴿ وَإِذَا جَاءَهُمْ أَمْرٌ مِّنَ الْأَمْنِ أَوِ الْخَوْفِ أَذَاعُوا بِهِ وَلَوْ رَدُّوهُ إِلَى الرَّسُولِ وَإِلَىٰ أُولِي الْأَمْرِ مِنْهُمْ لَعَلِمَهُ الَّذِينَ يَسْتَنبِطُونَهُ مِنْهُمْ﴾[1].

چون ناکۆکی لە نەزانیەوە دەگەڕێتەوە بۆ شەیتان کە هەندێك لە ئەهلی گومڕایی فریودەدات لە هەڵگیرساندنی ئاژاوەدا، بێجگە لەوەی دەبێتە هۆی بێ هێزکردن و لاوازی و دوبەرەکی و پەرتەوازەیی.

یەکێکی تر لەوانەی کە حەجاج کوشتنی لە گەورەپیاوان و زانایان (محمد بن سعد بن أبی وقاص) بوو، کە پێش ئەوەی لە گەردنی بدەن پێیان ووت: ئەی سێبەری شەیتان و لەهەموو خەڵك بەفیز و لوتبەرزتر، بەیعەتی یەزیدت ناوێ – مەبەست خەلیفە یەزید کوڕی موعاویەیە –خۆت دەچوێنیت بە حسین و ئیبن عومەر و پاشان بوویتە بانگ بێژ بۆ (ابن عبد بنی مجر)[2].

---

[1] . النساء:٨٣.

[2] واتە (عمر بن أبی الصلت)، کە ڕۆژێك لە هاوەڵەکانی ئیبن ئەشعەس لێی هەڵاتن پاش (دیرالجماجم)، کە دواتر کوژرا پاش ئەوەی لە حەجاج هەڵات بەرەو (طبرستان).

هەروەها (عبدالله بن عامر) کاتێك (یەزیدی کوڕی مهلب) دەستگیری کرد و ناردی بۆ حەجاج بە حەجاجی گووت: چاوت بە بەهەشت نەکەوێت ئەگەر (ابن مهلب)ت بەرزکردەوە لەسەر ئەو کارەی ئەنجامی داوە.

حەجاجیش بە سەرسامیەوە پێی ووت: (ابن مهلب) چی کردووە؟

ئەویش بەم هۆنراوەیە وەڵامی دایەوە:

لأنه كاس في اطلاق اسرته     وقاد نحوك في أغلالها مضرا

وقى بقومك وردَ الموت أسرته     وكان قومك أدنى عندة خطرا

حەجاج بۆماوەیەکی درێژ بیری لەو وشانە کردەوە لە ناخی خۆیدا و پاشان پێی ووت: تۆچی و ئەوە چی.

ئینجا حەجاج پاش قسەکانی ئیبن عامر لەبارەی (ابن مهلب)ەوە هەستا بە لابردن و بەندکردنی (ابن المهلب) و خێزانەکەشی.

لە گەورەپیاوانی تر وەکو (فیروز حصین) کەیەکێك بوو لەو خانەدانانەی شۆڕشی ئیبن ئەشعەس کەوتبوو کاتێك دەستگیر کرا حەجاج پێی ووت: ئەی باوکی عوسمان بەخوا تۆ گۆشتت لەگۆشتی ئەوان و خوێنت لەخوێنی ئەوان نیە.

ئیحا فیرزو وەڵامی دایەوە: ئاژاوەیەك بوو خەڵکی کوێرکرد و ئێمەش لەناویدا بووین.

ووتی: پاشان چی؟

ووتی: سەرەتا بینوسە.

فیرزو ووتی: من دڵنیابم لەخوێنی خۆم؟

حەجاج ووتی: ئەم سامان و ماڵەت لەکوێ بوو؟

ووتی: هی خۆمە.

حەجاج ووتی: بیاندەرەوە.

ووتی: من دڵنیابم لە خوێنی خۆم؟

حەجاج ووتی: بەخوا دەیاندەیتەوە و پاشان دەتکوژم.

فیروز ووتی: دە بەخوا هەم ماڵ و هەم خوێنەکەم پێکەوە بەدەست ناهێنێت[1].

پاشان حەجاج فەرمانی پێکرد دوریان خستەوە و دواتر هێنرایەوە و پێی ووت: لەسەر کەللە سەری حەجاج سەد هەزار درهەمت دەدا[2].

فیروز ووتی : ئێ وام کرد.

ئەویش پێی ووت: تەختت دەکەم و هەڵدەکوتمە سەرسەرت[3].

ئینجا حەجاج فەرمانی کرد ئەشکەنجەیان دا و کاتێك فیروز نزیك مەرگ بوویەوە لەژێر ئەشکەنجەدا بەو کەسەی کە ڕاسپێردرابوو ئەشکەنجەی بدات ووتی: خەڵکی نازانن کەمن کوژراوم، ماڵ و پارەی دانراوم هەیە لای خەڵکی هەرگیز ناتاندەنەوە، بمبەن پیشانی خەڵکم بدەن تاکو بزانن من زیندوم و ماڵەکە بدەنەوە.

هەربۆیە حەجاج فەرمانی کرد بیبەنە دەرەوە بۆلای دەروازەی شار، ئینجا فیروز هاواری کرد لەناو خەڵکدا: هەرکەس دەمناسێتەوە ئەوە منی ناسیوەتەوە، هەرکەسیش نامناسێتەوە ئەوە من (فیروز حصین)م، من لای هەندێك خەڵك پارە و ماڵم هەیە، جا هەرکەس شتێکی منی لایە ئەوە بۆخۆی و گەردنی ئازادکراوە، یەك درهەمی نەدەنەوە بە کەس، با ئەوانەی لێرەن بەوانەش بڵێن کە لێرە نین.

پاشان حەجاج فەرمانی کرد کوشتیان[4].

یەکێکی تر لەوانەی کە حەجاج کوشتنی بەرپرسی ڕاگەیاندنی ئیبن ئەشعەس (ئەعشا همدانی) شاعیر بوو، کە ڕێبەرێك بوو بۆ بەرزکردنەوەی گیانی مەعنەوی سەربازەکانی ئیبن ئەشعەس، بەخراپە باسی حەجاج و خەلیفە عەبدولمەلیکی دەکرد، کاتێك هێنرا بۆلای حەجاج پێی ووت:

---

[1] . تأريخ الطبري.

[2] . مەبەستی ئەوەیە کە فیروز سەد هەزار درهەمی دانابوو وەك بەخشش بیدات بەو کەسەی کە حەجاج بکوژێت لە (رستقباذ) وەك پەرچەکردارێك لە ئەرخانکردنی بەخششی سەد هەزار درهەم لەلایەن حەجاجەوە بۆ ئەو کەسەی کە سەری فیروزی بۆ بێنێت.

[3] . سەیری (الکامل للمبرد) بکە — أبو العباس محمد بن یزید.

[4] . سەیری: تأريخ الطبري و الكامل في التأريخ و والكامل للمبرد... بکە.

ئایا تۆ نەبوویت بە ئیبن ئەشعەست ووت:

أنت الرئيس ابن الرئيس          وأنت على الناس كعب

نبئت أن بُنيّ يوسف          حزمـــن زلق فتبا

حەجاج دەنگی بەرزکردەوە و توڕەبوو و ڕەنگی گۆڕا، ئینجا ئەعشا بە لەسەرخۆییەوە پێی ووت:

ئەی فەرماندە من دەڵێم:

أبى الله إلاّ أن يتم نـــوره          ويطفئ نار الفاسقين فتخـــمدا

وينزل ذلاً بالعراق وأهـــله          كما نقضوا العهد الوثيق المؤكدا

بەردەوام بوو لە شیعر گوتن کە تیایدا ستایشی حەجاج و خەلیفەی دەکرد و بەخراپە باسی خەڵکی عێراق و ئیبن ئەشعەسی دەکرد، پاش ئەوەی لە هۆنراوە خوێندنەوە تەواو بوو هەندێك لە ئامادەبووان بە حەجاجیان ووت: ئەی فەرماندە چاکی کردەوە لێگەڕێ بابڕوات بەڕێی خۆیەوە.

حەجاج پێی وتن: ئایا پێتان وایە کە ئەو مەبەستی ستایشکردن بووبێت، نا بەخوا، بەڵکو ئەمەی وت وەك داخ و پەژارەیەك بۆ سەرکەوتنتان بەسەریاندا و ویستی هاوەڵەکانی بپارێزێ و پاك بکاتەوە.

پاشان بە ئەعشای وت: ئایا پێت وایە ئەی دوژمنی خودا تۆ بەم هۆنراوەیە بمخەڵەتێنی؟ لەمە پرسیارم لێ نەکردی، بەڵکو شیعرەکەتمان لە نێوان (الأشج) بۆ (قیس باذخ) بخوێنەرەوە.

ئەویش خوێندیەوە تاکو گەیشتە: (بخ بخ لوالده وللمولود) (واتە ئافەرین بۆ باوکەکەی و کوڕەکەی)....حەجاج پێی وت: دە بەخوا دوای ئەمە بۆ هیچ کەس بەخ بەخ ناکەیت.(دوای ئەمە ئیتر ئافەرین لەکەس ناکەیت).

پاشان فەرمانی کرد دایان لە ملی[1].

---

[1] سەیری : تأريخ الطبري و الكامل في التأريخ و الأغاني للأصفهاني و مروج الذهب للمسعودي بکە

یەکێکی تر لەوانەی حەجاج لێیان خۆش بوو و دڵنیایی پێ بەخشین پاش ڕوداوی (دیر الجماجم) کاتێك بانگەوازخوێنی حەجاج بانگی کرد لەناو خەڵکیدا هەرکەسێك بچێتە سوپاکەی (مسلم بن قتیبە)ەوە ئەوە بێوەیی و سەلامەت دەبێت، زانای ئاینی عێراق (الشعبي) بوو – بەڕەحمەت بێت – کە یەکێك بوو لە شوێنکەوتووانی ئیبن ئەشعەس، چووە بەدەم بانگەوازەکەی حەجاجەوە، چووە شەڕەوە لە سوپاکەی (مسلم بن قتیبە)دا، جا کاتێك حەجاج پێی زانی داوای کرد لە (ابن قتیبە) بۆی بنێرێت، ئەویش ناردی، کاتێك لەبەردەم حەجاج ڕاوەستابوو بە حەجاجی وت:

سڵاوی خوات لێ بێت ئەی فەرماندە، فەرمانیان پێکردم کە داوای لێبوردنت لێ بکەم بێجگە لەوەی کە خوا دەزانێت ڕاستە، بەخوا من لەم بارەیەوە هیچ ناڵێم ڕاستی نەبێت، سوێند بەخوا ئێمە یاخی بووین لەتۆ و خەڵکمان هاندا و خۆمان ماندوکرد ئێمە لە بەهێزە خراپەکارەکان نەبووین و لە پاکە چاکەکارەکانیش نەبووین، خوا تۆی سەرخست بەسەرماندا و ئێمەت بەزاند، جا گەر ئێمەت کوشت ئەوە خەتای تاوانی خۆمانە، ئەگەریش لێمان خۆش بوویت ئەوە نەرمونیانی و لەسەرخۆیی خۆتە و دەبێتە بەڵگەی تۆ لەسەرمان.

ئینجا حەجاج پێی ووت: بەخوا تۆ قسەکانت لای ئێمە پەسەندترە و خۆشترە لەو کەسەی کە دێتە لامان و شمشێرەکەی خوێنی ئێمەی لێدەچۆڕێت و پاشان دەڵێت نەمکرد و نەمبینی و بێ کێشە بووم.

پاشان ووتی: ئەی شەعەبی خەڵکی چۆن دەبینیت دوای ئێمە؟

ووتی: خوا چاك بۆ فەرماندە بکات دوای تۆ خەو نەچووە چاوم لەنێو ترسا مامەوە، برا باشەکانم لەدەست دا، هیچ کات پەیمان شکاندنم لە فەرماندە نەبینیوە.

حەجاج ووتی: برۆ ئازاد بە ئەی شەعەبی.

شەعەبیی زانا پێش ئاژاوە و شۆڕشەکەی ئیبن ئەشعەس یەکێك بوو لە هاونشینەکانی حەجاج و حەجاج زۆری خۆش دەویست.

***

(٩)

## حەجاج و (سعید بن جبیر)

- سەعیدی کوڕی جوبەیر و ئاژاوەکەی ئیبن ئەشعەس

- حەجاج سەعیدی کوڕی جوبەیر دەکوژێت - بەڕەحمەت بێت - بەپێی گێڕانەوە دروستەکان.

## سەعیدی کوڕی جوبەیری تابیعی
## و ئاژاوەکەی عەبدولڕەحمانی کوڕی ئەشعەس

سەعیدی کوڕی جوبەیری ئەسەدی ناسراو بە ئەبو محمد یان ئەبو عبدالله یەکێکە لە گەورە هاوەڵانی ئیبن عەباس – خوا لێیان ڕازی بێت – یەکێك لە پێشەوایانی ڕاڤەکاری قورئان و زانستی دینی، خەڵکانێکی زۆری لە هاوەڵان بینیوە و لە کۆمەڵێکیانەوە فەرمودەی گێڕاوەتەوە، لێی دەگێڕنەوە کە لەشەوێکدا لە کابە خەتم و نیوێکی قورئانی کردووە، یان ڕەنگە خوێندبێتیەوە لە ڕکاتێکدا لە ناو دڵی کابەدا.

یەکێك لەو وتانەی کە ئیبن کەسیر لەوەوە باسی کردووە ئەوەیە کە فەرموویەتی: بەڕاستی باشترین ترسان ئەوەیە لەخودا بترسیت ترسانێك نێوانی تۆ و سەرپێچیکردنت بەرامبەر خودا بگرێت، خۆڕاگریت پێ بدات بەرامبەر گوێڕایەڵیکردنی، ئائەوە ترسانی بە کەڵکە، یادکردنەوەی خودا گوێڕایەڵیە، جا هەرکەس گوێڕایەڵی خودا بکات ئەوە یادی دەکاتەوە و هەرکەسیش گوێڕایەڵی خودا نەکا یادی نەکردووە، با تەسبیحات زۆربکات و قورئانیش زۆر بخوێنێتەوە.

پرسیار کرا لە سەعید: کێ لەهەموان بەندایەتی زیاترە؟

فەرمووی: پیاوێك تاوانی کردبێت، هەرکات تاوانێکی خۆی بیردەکەوێتەوە بەسوك سەیری ئەو تاوانە بکات.

کاتێك حەجاج هەڵی کوتایە سەری و ویستی بیکوژێت پێی ووت: بەلا لێت دا.

سەعید فەرمووی: بەلا لەو کەسە بدات کە لە بەهەشت جێی خۆی لەق کرد و خۆی خستە ئاگرەوە.

ئینجا حەجاج ووتی: بدەن لە گەردنی.

سەعید فەرمووی: شاهێدی دەدەم کە هیچ خودایە نیە بەحەق بێجگە لە (الله) و محمد پێغەمبەری خودایە، بەوە خۆم لەتۆ دەپارێزم هەتا ڕۆژی دوایی دەتبینمەوە، ئیدی ئەو ڕۆژە من دوژمنی تۆم لای خودا.

ئینجا لە پشتە ملەوە سەریان بڕی، ئەو هەواڵە گەیشتەوە بە حەسەنی بەصری و فەرمووی: ( اللهمّ یاقاصم الجبابرة اقصم الحجاج)...واتە خوایەگیان ئەی تۆڵەسێن و شکێنەری زۆردارەکان لوتی حەجاج و حەجاج بشکێنە.

ئیبن کەسیر دەفەرموێت: تەنها سێ ڕۆژ مایەوە – واتە حەجاج – تائەو کاتەی کرمێك کەوتە هەناو و سکیەوە و بۆگەنی پێکرد و دایڕزاند و پاشان مرد.

سەعید پێدەکەنی کاتێك هێنرا بۆ ئەوەی بدرێت لەملی، حەجاج پێی ووت: چی تۆی خستە پێکەنین؟

فەرمووی: پێدەکەنم لەبەر ئەو بوێریەی کە تۆ بەرامبەر من هەتە و ئەو لەسەرخۆیی و بەئارامیەی خوداش کە بەرابەر تۆ هەیەتی[1].

ئیبن جبیر لە مەککە بوو کاتێك حەجاج هاتە ئەوێ، پاش ئەوەی ئیبن زوبێری کوشت پەیمانی لێ سەند بۆ عەبدولمەلیکی کوڕی مەڕوان، پاشان کاتێك حەجاج چووە عێراق جارێکی تر پەیمانی لێسەندەوە، پێشنوێژیی پێ سپارد، پاشان دادوەریی پێ سپارد، بەڵام خەڵکی کوفە کردیانە هاتو هاوار، ووتیان ناگونجێت و ناشێت هیچ کەس دادوەری بکات عەرەبیەك نەبێت.

ئینجا حەجاج (أبو بردة بن أبي موسى الأشعري) دانا لە شوێنی و فەرمانی پێکرد کە هیچ فەرمانێك دەرنەکات بە بێ وەرگرتنی بۆچوونی سەعیدی کوڕی جوبەیر، پاشان سەد هەزار درهەمی پێدا دابەشی بکات بەسەر خاوەن پێداویستیەکاندا و کردی بە یەکێ لە هاوڕێیانی کۆڕی شەوانی، کە هەموویان لە سەرگەورەکانی عەرەب بوون، بەردەوام

---

[1] . هەمان سەرچاوەی پێشوو.

حەجاج باسی چاکە و پێگەی دینی بۆ خەڵکی دەکرد ئەگەرچی ئەو یەکێك بوو لە ژێر دەستەکانی عەرەب (واتە عەرەب نەبوو)، کاتێك ئیبن ئەشعەس دەرچوو بە هەڵمەتەکەیەوە پووە و (روتبیل)ی پاشای تورك، حەجاج کردیە خەزنەداری سەربازەکان؛

ئیبن قوتەیبە لە (الإمامة والسیاسة) دا باسی دەکات کە حەجاج سەعیدی نارد بۆلای ئیبن ئەشعەس بە نامەیەکەوە تیایدا حەجاج وەڵامی لێدوانێکی ئیبن ئەشعەسی دابوویەوە ، سەرزەنشتی دەکرد و باسی خراپەکانی دەکرد.

جا کاتێك سەعید گەیشتە لای ئیبن ئەشعەس، شپرزە بوو و ترسا لێی، چونکە فەقیە و زانای خەڵکی عێراق بوو، سەعیدی پیشان خەڵك نەدا، هەروەها نامەکەی شاردەوە، دوو قۆڵی لەگەڵیا دانیشت و هەوڵی دا بۆ ئەوەی سەعید لە گوێڕایەڵی حەجاج هەڵگەڕێتەوە بۆئەوەی خۆی بەهێز بکات، سەعیدیش دەرچوون لە فەرمانی حەجاج و هەڵگەڕانەوە لێی بەباش نەدەزانی ، بەڵام ئیبن ئەشعەس کۆڵی نەدا لێی و پێداگری کرد، باسی چەندین خراپەی حەجاجی کرد هەتا سەعید لەگەڵی ڕێککەوت بە نابەدڵی.

لە یەکێك لە شەڕەکاندا سەعید بەدیل گیرا، کاتێك هێنرا بۆلای حەجاج ووتی: بەڵا لێت دا ئەی سەعید! ئایا شەرم ناکەی لەمن و تەریق نابیتەوە لێم؟ ئایا شەرمت نەکرد لەو چاودێرەی سەرەوەی من و خۆت؟

ئینجا سەعید فەرمووی: خوا چاك بۆ فەرماندە بکات، تەمەنی درێژبکات، ئەوە کارەساتێك بوو ڕوویدا، سزایەك بوو دابەزی، قسەش قسەی فەرماندەیە، چۆنی پێ باشە با وابێت، بەڵام من وەك پیاوێك کە لوتی پێ بەرزکراو و کردیانە زۆردار، بەرگی ئاژاوەی کرایە بەر، شەیتان چووە سەرشانەکانی، هاتوومەوە، جا ئەگەر سزا درا ئەوە تاوانی خۆیەتی، ئەگەریش لێی خۆش بووی ئەوە ئاکاری جوانی خۆتە.

حەجاج پێی ووت: ئەوا ئێمە لێت خۆش بووین، جارێکی تریش دەتنێرینەوە بۆلای.

پاشان نامەیەکی نوسی و بە سەعیدا ناردی، کاتێك سەعید لە ڕێگادا بوو، نامەکەی سوتاند، چوو بۆلای (عبدالرحمن) و هەواڵەکەی پێ ڕاگەیاند.

هەر لەگەڵ ئیبن ئەشعەس مایەوە هەتاکو شەڕی (دیر الجماجم) ڕوویدا و ئیبن ئەشعەس تیایدا شکستی هێنا، ئەوەی کوژرا کوژرا، ئەوەی هەڵات هەڵات، سەعیدیش یەکێك بوو لەوانەی کە دەربازیان بوو و ڕویان کردە ئەصبەهان، ئینجا حەجاج نامەی نوسی بۆ کاربەدەستەکەی کە دەستگیری بکەن، کاربەدەستەکە ئەوەی بە کارێکی باش و جوان نەزانی، هەربۆیە نامەی نارد بۆ سەعید و ئاگاداری کردەوە، داوای لێکرد بەنهێنی لەوڵات بچێتە دەرەوە ، ئەویش چووە دەرەوە، ڕۆیشت بۆ ئازەربایجان.

ماوەیەکی زۆر لەوێ مایەوە، بێ تاقەت بوو لەوێ و چوو بۆ مەککە بە نهێنی و لەوێ نیشتەجێ بوو.

ئینجا کاتێك (خالد القسری) بوویە فەرمانڕەوای مەککە، هەندێك کەس بە سەعیدیان ووت کە هەڵبێت، ئەویش ووتی: ئیدی تەریق دەبمەوە، ناتوانین لە شتێك کەخوا بۆی داناوین هەڵێین، شاری مەدینە (عیمان بن حیّان المُرّی) فەرمانڕەوایەتی دەکرد، خەڵکی عێراقی دەناردەوە بۆلای حەجاج، (خالد القسری)یش چاوی لەم کرد و (عطاء بن أبی رباح) و (سعید بن جبیر) و (عمرو بن دینار) و (طلق من حبیب) و (مجاهد)ی ناردەوە، حەجاج لە (عطاء و عمرو) خۆش بوو چونکە مەککەیی بوون، وە (طلق) لە ڕێگادا خۆی مرد و (مجاهد) بەندکرا تا ئەوکاتەی حەجاج مرد.

دەگێڕنەوە کاتێك سەعیدی کوڕی جوبەیریان نارد بۆ حەجاج لەوە زۆر ئازاری چەشت و داخی خوارد پاشان پێی ووت: ئەی سەعید! ئایا کە هاتمە مەککە بەیعەتم لێ وەرنەگرتیت؟

فەرمووی: بەڵێ.

حەجاج ووتی: ئایا دادەوریتیم بە تۆ نەسپارد و خەڵك کەوتنە هاتوهاوار، ووتیان هیچ کەسێکی تر بێجگە لە عەرەب بۆ دادوەری ناشێت، ئینجا منیش (أبو بردة بن موسی الأشعری)م کردە دادوەر بە مەرجێك بڕیارێك بەبێ تۆ دەرنەکات ؟

ئیبن جوبەیر فەرمووی: بەڵێ وابوو.

حەجاج وتی: ئایا نەمخستیتە ناو كۆڕی دانیشتنی شەوانەوە كە هەموویان لە سەرگەورەكانی عەرەب بوون؟

فەرمووی: بەڵێ.

حەجاج وتی: ئایا سەد هەزار درهەمم پێ نەدایت بیدەیت بە خاوەن پێداویستیەكان، پاشان پرسیاری هیچ شتێكیم لێ نەكردیتەوە؟

سەعید فەرمووی: بەڵێ وابوو.

زەهەبی لە مێژوەكەیدا باسی ئەوە دەكات كە حەجاج یەك لەدوای یەك ئەو پرسیارانەی لێدەكرد تا ئیبن جوبەیر پێی وت: من كەسێكم لەو موسوڵمانانەی، كە جارێك ڕاست دەكات و جارێك چەوت دەكات.

ئینجا دەرونی حەجاج پاك بوویەوە و دڵنیابوویەوە.

پاشان جارێكی تر گەڕایەوە بۆلای، پێی وت: چی وای لێكردیت لە من ڕاپەڕیت؟

سەعید پێی وت: لە گەردنمدا پەیمانێك هەبوو بۆ ئیبن ئەشعەس، چونكە ئەو سوێندی دابووم و تكای تیاكردم.

دوای ئەم قسەیە حەجاج تووڕە بوو وتی: هێی! پابەندبوون بە پەیمانێكەوە كە بە دوژمنێكی خوات دابوو بە حەق زانی و ئەو پەیمانەی بە ئەمیری بڕواداران و منت دابوو بە ناحەق؟!، دوو پەیمان هەڵدەوەشێنیتەوە و بەوەفا دەبیت بەدانەیەكەوە بۆ ئەو فشەكەری كوڕی فشەكەرە، بدەن لە ملی!

ئەو هۆنراوەیەی جەریر هەر من دەگرێتەوە:

يا رُبَّ ناكث بيعتَيْنِ تركتَهُ وخضابُ لحيَتِهِ دمُ الأوداجِ.

# حەجاج سەعید کوڕی جوبەیر دەکوژێت

پرسی کوشتنی زانا و فەقیهی ناودار سەعیدی کوڕی جوبێر پانتاییەکی گەورەی داگیر کردووە لە ژیاننامەی حەجاجی سەقەفیدا، ئەگەرچی ئەوە لە کۆتایی ژیانیدا ڕوویداوە، چون حەجاج پاش چەند ڕۆژێك لە کوشتنی سەعیدی کوڕی جبێر بە نەخۆشیەکی نادیار و ناڕوون دەمرێت کە دەڵێن گوایا (شێرپەنجە)ی گەدە بووە.

هۆکاری کوشتنی سەعید بەشداریکردنی بوو لە شۆڕشەکەی ئیبن ئەشعەسدا لەگەڵ هەندێك لە زاناکانی سەردەمی خۆیدا، ئیبن جوبەیر پاش شکستەکەی ئیبن ئەشعەس لە (دیرالجماجم) دا بەردەوام هەڵدەهات و ڕایدەکرد لەملا بۆ ئەو لا ماوەی نزیکەی دە ساڵ، تاکو حەجاج پێی زانی و دەستگیری کرد لەڕێی فەرمانڕەوای مەککەوە (خالد القسری).

چەندین چیرۆکی خەیاڵی چنراوە و دروستکراوە لەبارەی ئەوەی کە ڕوویدا لەنێوان حەجاج و سەعید دا، کە مێژوونوس و نوسەرانی ژیاننامە باسیان کردوە، ئەوەی ئەو چیرۆکانە یەکلاییان کردۆتەوە ئەوەیە کە حەجاج پاش کوژرانی ئیبن جوبەیر بە چەند ڕۆژێك دوای ئەو خۆیشی مردووە، هیچ کەسی تری دوای ئەو نەکوشتووە، هەندێکیش دەڵێن بەڵکو تەنها یەك کەسی تری کوشتووە.

لەسەرەتادا پێش شۆڕشەکەی ئیبن ئەشعەس پەیوەندی نێوان حەجاج و سەعید باش بوو، بەجۆرێك حەجاج کردبووی بە بەرپرسی خەرجیی سەربازەکان کاتێك لەگەڵ ئیبن ئەشعەس ناردی بۆ شەڕی (ڕوتبیل)ی شای تورك لە وڵاتی ئەفغان.

کاتێک ئیبن ئەشعەس بەیعەتی خۆی لە حەجاج هەڵوەشاندەوە ئیبن جوبەیریشی قایل کرد کە بەیعەتەکەی هەڵوەشێنێتەوە، خراپەکانی حەجاجی بۆ ڕونکردەوە، دەڵێن ئیبن جوبەیر لەگەڵ ئیبن ئەشعەس بە نابەدڵی خروجی کردووە، کە ئەمەش ڕاست نیە، چونکو ئیبن جوبەیر لە قسەی کۆتاییدا لەگەڵ حەجاج بۆی ڕون کردەوە کە ئەو بە ویستی خۆی بەیعەتی بە ئیبن ئەشعەس داوە، هەروەها ئەو پارێزەری ئەو بەیعەتەیە، سەرباری ئەوەی کە حەجاج کاتێک ئیبن جوبەیری بەدیل گرت یەکەم جار ئازادی کرد، پاشان جارێکی تر گەڕایەوە بۆلای ئیبن ئەشعەس و چوویە سوپاکەیەوە و شانبەشانی شەڕی کرد.

ئیبن کەسیر و بەدەر لەویش دەڵێن کە حەجاج لەیەکێک لە شەڕەکاندا سەعیدی کوڕی جوبەیری کەوتەوە بەردەست و پێی ووت: بەلا لێت دا ئەی سەعید ئایا لەمن تەریق نابیتەوە، ئایا شەرمت نەکرد لەوەی کە چاودێر و ئاگادارە بەسەر من و تۆیشەوە؟

ئینجا سەعید پێی ووت: خوا چاک بۆ فەرماندە بکات، تەمەنی درێژبکات، ئەوە کارەساتێک بوو ڕوویدا، سزایەک بوو دابەزی، قسەش قسەی فەرماندەیە، چۆنی پێ باشە با وابێت، بەڵام من وەک پیاوێک کە لوتی پێ بەرزکراو و کردیانە زۆردار، بەرگی ئاژاوەی کرایە بەر، شەیتان چووە سەرشانەکانی، هاتوومەوە، جا ئەگەر سزا درا ئەوە تاوانی خۆیەتی، ئەگەریش لێی خۆش بووی ئەوە ئاکاری جوانی خۆتە.

حەجاج پێی ووت: ئەوا ئێمە لێت خۆش بووین، جارێکی تریش دەتنێرینەوە بۆلای.

پاشان نامەیەکی نوسی و بە سەعیدا ناردی، کاتێک سەعید لە ڕێگادا بوو، نامەکەی سوتاند، چوو بۆلای (عبدالرحمن) و هەواڵەکەی پێ ڕاگەیاند.

هەر لەگەڵ ئیبن ئەشعەس مایەوە هەتاکو شەڕی (دیر الجماجم) ڕوویدا و ئیبن ئەشعەس تیایدا شکستی هێنا، ئەوەی کوژرا کوژرا، ئەوەی هەڵات هەڵات، سەعیدیش یەکێک بوو لەوانەی کە دەربازیان بوو و ڕوویان کردە ئەصبەهان، ئینجا حەجاج نامەی نوسی بۆ کاربەدەستەکەی کە دەستگیری بکەن، هەربۆیە سەعید هەڵات لە دەستی و پەنای بردە بەر مەککە و لەوێ نیشتەجێ بوو تاکو ئەوکاتەی کە (خالد بن عبدالله القسری) فەرمانڕەوایەتی ئەوێی گرتە دەست، ئینجا هەندێک ئامۆژگاری سەعیدیان کرد کە هەڵبێت

لەترسی ئەوەی نەکا خالد القسری ڕادەستی حەجاجی بکاتەوە و ئەویش فەرمووی: بەخوا ئیدی شەرم دەکەم لەخوا کە هەڵبێم، ناتوانین هەڵبێین لەوەی خوا دایناوە بۆمان.

ئیبن جوبەیر دە ساڵ لە حەجاج هەڵات تاکو ساڵی ٩٤ك، کە حەجاج داوای کردبوو لە فەرمانڕەوای مەدینە و مەککە ئەوانەی کە ماون لە پاشماوەی سوپاکەی ئیبن ئەشعەس و لەوێ خۆیان شاردۆتەوە ڕادەستی بکەنەوە.

دوای ئەم داوایەی حەجاج فەرمانڕەوای مەدینە (عثمان بن حيّان)ی کە یەکێك بوو لە هاوەڵانی ئیبن ئەشعەس لە عێراق بە کۆت و کەلەپچەوە ناردەوە بۆ حەجاج ، فەرمانڕەوای مەککەش بەدوای ئەودا (سعيد بن جبير) و (عطاء بن رباح) و (مجاهد بن جبر) و (عمرو بن دينار) و (طلق بن حبيب)ی ناردەوە.

ئەویش لە (عطاء) و (عمرو بن دينار) خۆش بوو چونکە خەڵکی مەککە بوون، (طلق)یش لەڕێگادا مرد و (مجاهد)ی بەند کرد تاکو ئەوکاتەی حەجاج مرد

بەڵام سەعیدی کوڕی جوبەیر کاتێك لەبەردەم حەجاج ڕاوەستێنرا حەجاج پێی ووت: ئەی سەعید ئایا لە سپاردەکەمدا نەمکردیتە هاوبەش؟ ئایا کارم پێ نەدایت؟ ئایا ئەوەم نەکرد و ئەوەم نەکرد؟

بۆ هەموو ئەوانە سەعید دەیفەرموو: بەڵێ وابوو، تەنانەت ئەوانەی لەلای بوون وایان زانی کە ڕێی دەدات بڕوات، تاکو پێی ووت: چی وای لێکردیت کە لەمن ڕاپەڕی و پەیمانت بە ئەمیری بڕواداران هەڵبوەشێنیتەوە؟

سەعید فەرمووی: ئاخر ئیبن ئەشعەس بەیعەتی لێ سەندم و سوێندی دام.

دوای ئەمە حەجاج زۆر تورەبوو و بای کردە خۆی تاکو لایەکی عەباکەی کەوتە خوارەوە لەسەر شانی و پێی ووت:

– ئایا نەهاتمە مەککە و ئیبن زوبێرم کوشت و بەیعەتم لە خەڵکەکەی وەرگرت و بەیعەتیشم لەتۆ سەند بۆ ئەمیری بڕواداران عبدالملك؟

– فەرمووی: بەڵێ وابوو.

– ووتی: پاشان هاتم بۆ کوفە وەك فەرمانڕەوای عێراق و بەیعەتم بۆ ئەمیری بڕواداران نوێ کردەوە و بەیعەتی تۆیشم دوبارە وەرگرتەوە؟

– فەرمووی: بەڵێ وابوو.

– ووتی: تۆیش دوو بەیعەتت هەڵوەشاندەوە لە بەر بەیعەتێك بۆ ئەو فشەکەری کوڕی فشەکەرە؟

– پاشان بانگی پاسەوانەکەی کرد، ووتی هۆی پاسەوان بدە لە ملی.

– ئەویش دای لە ملی.

(ابن جریر الطبري) باسی کردووە و (ابن کثیر)یش لەوەوە لە (البدایة والنهایة) نقڵی کردووە لە (ئەبی بەکری باهیلی)ەوە ووتی: بیستم ئەنەسی کوڕی ئەبی شێخ دەیگوت: کاتێك سەعیدیان هێنا بۆ لای حەجاج چووە پێشەوە لێی و پێی ووت: ئەی سەعید ئایا چی بوو تۆی لەمن هەڵگێڕایەوە؟

ئەویش فەرمووی: خوا چاك بۆ فەرماندە بکات، منیش یەکێکم وەك ئەو موسوڵمانانەی کە جارێك ڕاست دەکات و جارێك چەوت.

ئینجا دەروونی حەجاج هێوربوویەوە و ڕوخساری گەشایەوە و حەجاج تکای لێکرد کە ئیتر واز لەکاری ئەو بێنێت، پاشا بۆ شتێك گەڕایەوە بۆلای.

سەعید پێی ووت: بەیعەتێك لە گەردنمدا بوو.

لەو کاتەدا حەجاج توڕە بوو و ئەو قسەیە بوویە هۆی کوشتنی.

(عتاب بن بشر بن سالم الأفطس) دەڵێت: سەعیدی کوڕی جوبەیریان هێنا بۆلای حەجاج کە دەیویست سواری ئەسپەکەی ببێت و قاچێکیانی کردبوو بەناو ئاوزەنگی زینی ئەسپەکەیدا قاچەکەی تریانی هێشتا لە سەر زەوی بوو وتی بەخوا سوارنابم تاکو شوێنی خۆت لە دۆزەخ دەبینیت، ئینجا وتی بدەن لەملی.

دەشڵێت: حەجاج لەبەر خۆیەوە دەیگوت (قیودنا.. قیودنا) واتە کەلەپچەکانمان.. کەلەپچەکانمان..ئەوانیش وایانزانی کۆت و کەلەبچەکانی دەوێت کە لە دەست و قاچی

ئیبن جوبەیر تەوق کرابوون، هەربۆیە هەردوو قاچیان لەنیوەوە بڕیەوە و کۆتەکانیان هەلگرتەوە.

لە (عبدالملك بن عبدالله خباب)ەوە وتی: سەعیدیان هێنا بۆلای حەجاج پێی ووت: بەخوا دەتکوژم.

کەواتە من سەعیدم وەك دایکم ناوی ناوم سەعید – (سەعید واتە شادومان یان بەختەوەر واتا ئەگەر بمکوژی بەڕاستی من شادومانم وەك دایکیشم ئەو ناوەی لێناوم) –.

ووتی: ئینجا کوشتی، کە ئیتر حەجاج دوای ئەو ڕوداوە تەنها چل ڕۆژ لەژیان مایەوە، کاتێك دەخەوت لە خەودا دەیبینی و چمکی کراسەکەی دەگرت و دەیووت: ئەی دوژمنی خوا لەبەرچی کوشتمت؟

حەجاج دەیگووت: ئای چی لەمن و سەعیدی کوڕی جوبەیرمات، چیمان بەسەرهات.

ئیبن خەلەکان دەلێت: سەعیدی کوڕی جوبەیری کوڕی هیشامی ئەسەدی یەکێك بووە لە ژێردەستەکانی (بەنی والبة)ی کوفی، یەکێك بوو لە کەسایەتیە دیارەکانی تابیعین و ڕەش پێست بوو.

باس لەوە دەکەن کە کوژرانەکەی لە مانگی شەعبان دا بوو و حەجاجیش پاش ئەو لە ڕەمەزان دا سالی ٨٤ ك مرد.

هەندێك گێڕانەوەی تر هەن کە دروست نین و ئیبن کەسیر لەبارەیانەوە دەفەرموێت: هەندێك وتەی نامۆ لەبارەی چۆنیەتی کوژرانەکەیەوە دەگێڕنەوە، زۆربەیان ناڕاستن، حەجاج دوای ئەو سزا درا و بەخێرایی سزاکەی چەشت، ماوەیەکی کەم نەبێت نەژیا دوای ئەو ڕوداوە، پاشان خوای بەهێز و بەتوانا گرتی، وە دەلێن کە حەجاج پاش ئەو بە پانزە ڕۆژ مردووە، دەشلێن بە چل ڕۆژ یان شەش مانگ...والله أعلم[1]....

---

[1]. البداية والنهاية.

(١٠)

# حەجاجی وتاربێژ

- وتاربێژی یەکێکە لە بنەماکانی کەسێتی عەرەبی و سەرکردەی نایبەتمەند.

- وتاربێژی لای عەرەبەکانی پێشوو.

- هەندێك لە وتار و وتەکانی حەجاج.

# وتاربێژی وەك یەكێك لە بنەماكانی كەسێتی عەرەبی و سەركردەی تایبەتمەند

وتاربێژی یەكێكە لە تایبەتمەندیە دیارەكانی كەسێتی حەجاج، ئەمەش كاتێك ڕون دەبێتەوە كە نمایشی ژیانی بكەین و لە هەڵوێستەكانی لەگەڵ نەیارەكانی و لەگەڵ گەورەكەی و هەروەهاش لەگەڵ كاربەدەستانی سوپا و ویلایەتەكان وردبینەوە، دیسان وتاربێژی لە ئاكاریدا (شێوازی ژیانیدا) ڕوندەبێتەوە لەمیانەی ناردنی نامە بۆ سەركردەكان لە سەردەمی خۆیدا و ئەو وتارانەی كە لەسەر بڵندگۆ بۆ جەماوەری دەدا بەبێ خۆ ئامادەكردن.

لەبەر ئەمە پێویست بوو لەسەرمان تیشك بخەینە سەر هونەری وتاربێژی، تاكو نیشانە و تایبەتمەندیەكانی كەسێتی حەجاجی سەركردەمان بۆ ڕون ببێتەوە كە فەرمانڕەوایەتی دوو عێراقی كردووە (عێراقی عەرەب و عێراقی عەجەم[1]) نزیكەی بیست ساڵ و هەموو نەیارەكانیشی لەناوبرد.

---

[1] لەكۆندا بە كوفە و بەصرەیان وتووە یاخود ئەم عێراقەی ئەمڕۆكە لە كۆندا پێی گوتراوە عێراقی عەرەب، بەلام عێراقی (فارس) یان عێراقی (عەجەم)یشیان پێووتووە، ئەو ناوچە جوگرافیایە گوتراوە كە دەكەونە ڕۆژهەلاتی عێراقی عەرەبەوە كە ئەم شارانەی ئێستای ئێرانی تێدابووە وەك (ئەصفەهان و الری و قەزوین و كرماشان)، هەروەها ناسراویشە بە (ناوچە شاخاویەكان) كە ناوچە شاخاویەكانی كورد و فارس و ئازەری لەخۆ گرتووە، واتا بەناوچە دەشتاییەكانی سەر ڕوباری دیجلە و فورات گوتراوە عێراقی عەرەب و ناوچە شاخاویەكانی سنوری ڕۆژهەلاتیش بە عێراقی عەجەم یان فارس ناوزەد كراوە، كە زنجیرە چیاكانی زاگرۆس ئەو دوو ناوچەیەی لەیەكتر جیاكردۆتەوە... ..سەرچاوە: ویكیپیدیا، ar.wikipedia.org.

وتاربێژی چەندین پێناسـەی زۆر و هاوشێوەی بۆ کراوە، هەیانـە هـەموو جۆرەکانی وتاربێژی ناگرێتەوە، وەکو وەسیەت و وانەبێژی.

ڕونترین پێناسە بۆ وتاربێژی کە کرابێت ئەوەیە: هونـەری قسـەکردنە بۆ خـەڵکی و جەماوەر بە ڕێگەیەکی خۆکاری و خۆرس کە قـایلکردن و سەرنجراکێشـان لـەخۆ بگرێت، چـونکە وتاربێـژی هونـەری قایلکردنـە، مامەڵـە لەگـەڵ ژیری و سۆزدا دەکـات، هونـەری گەیاندنی ویستی وتاربێژە بەگوێی جەماوەر.

وتاربێژی لای زانا و داناکان: کۆمەڵێك یاسا و ڕێسایە بەهۆیـەوە دەتوانرێت جـەماوەر قایل بکرێت لەهەر بابـەتێك کـە مەبەسـت بێـت، قـایلبون ئەوەیـە گـوێگر خـۆی بـدات بـە دەستی ڕاستی و دروستی وتراوەکەوە.

کـە دوو جـۆرە: بەڵگـەیی، ڕاسـپاردەیی (یـان لێـدوانی)، مەبەسـتی یەکـەم: خۆبەدەستەوەدانی عەقڵە بۆ سەرەنجامێکی دامەزراو لەسەر ئەو پێشەکیانەی کە ڕاستی و دروستیان جـێگیر بـووە بۆی، وەك کـە دەڵـێین: ژمـارەی (چـوار) جووتـە، چـونکە بـە یەکسـانی دابـەش دەبێـت، یـان کـە دەڵـێین: جیهـان نـوێ دەبێتـەوە چـونکە گـۆڕاوە؛ مەبەستی دووەم: خۆبەدەستەوەدانی عەقڵە بـۆ دروسـتی وتەکـە و ڕاسـتێتی ئەنجامـداتی کردارەکـە یـان ئـەنجام نـەدانی لـە تێـڕوانین بـۆ نمونەگـەلێکی پشـت بەسـتوو بـە وتـە گومانـاویەکانەوە، کە بە گریمانەی دروست وەرگیراون، یان پەسەند دەرچوون لەوانەی کە ڕاستگۆییان بڕواپێکراوە و ڕایەکەیان بەهێزە.

هەروەها پێویستی بە توانایە، چونکە پێگەی ئەم پیشـەیە سـازکردنی دەرونەکانـە بـۆ هێزی قـایلکرن، ئەگـەریش نەگاتـە ئامانجەکـەی هەنـدێك جـار ،ئـەوا دەرونـەکان ئامـادە دەکات بۆ کاری تایبەت بەپێی یاسا وڕێسا سنوردارەکان،.

لەهەر بابەتێك مەبەست بێت، چونکو پەیوەست نیە بـە شـتێکی دیـاریکراوەوە، بـەڵکو لە هەموو شتێك دەدوێت و دەئاخڤێـت بـە پێچـەوانەوەی پیشـەکانی تـرەوە، بۆ نمونـە: خۆش نوسی، سەیری وێنەی پیتەکان و شێوازەکەیان دەکات، پزیشکی سەیری بارەکانی جەستەی مرۆڤ و ئاژەڵ دەکـات لـەڕوی تەندروسـتی و نەخۆشـیەوە، لـە ئـیبن ڕوشـدەوە

دەگێڕنەوە کە لە ئەرستۆوە گێڕاویەتیەوە: بەڕاستی وتاربێژی بابەتێکی تایبەتی نیە بە تەنها بۆی بگەڕێی لەنێو بابەتەکانی تردا، چونکە ئەو هەموو زانست و هونەرەکان دەدوێنێت، هیچ شتێکی بایەخدار وبێ بایەخ یان ماقوڵ و بەرهەست نیە نەچێتە ژێر فەرمانیەوە و ملکەچی هەژمونی نەبێت، لێرەوەیە لێکۆڵەران لەبارەیەوە دەڵێن: پێویستە وتاربێژ شارەزایی هەبێت لە گشت زانست و هونەرەکاندا تا دەتوانێت، هەمیشە هەوڵبدات هەموو ڕۆژێك زانستێکی زیاتر فێر ببێت، واتە بەمانای سەردەم، ڕۆشنبیر بێت.

پوختەی ووتە ئەوەیە کە فەیلەسوفەکان وتاربێژیان بە زانستێك داناوە کە یاسا و ڕێسای خۆی هەیە، زانستی وتاربێژی گرنگی دەدات بە خوێندنی ڕێگاکانی کارتێکردن و میکانیزمەکانی قایلکردن، هەروەها ئەوەی کە پێویستە وتاربێژ هەی بێت و لەسەری بێت لە سیفەت و ئاکارەکان، شارەزایی و پەیبردن بە خواست و مەیلی گوێگران، ئەوەی کە پێویستە هەی بێت لە هۆکارەکانی وتاردان، هەروەها ڕێکخستنی بەشەکانی و پەیوەستبوونیان بەیەکەوە، کە ئیدی ئەو بەو مەشخەڵە ڕێنوێنی دەکات و چرایەکە ڕێگاکان ڕۆشن دەکاتەوە لەبەردەم ئەو کەسەی کە ئامادەگیی تێدایە بۆ وتاربێژیی تاکو بەهرەی خۆی تێدا تاویدات و پەروەردەی بکات و گەشەی پێ بدات.

لە وتاربێژیدا بەهرە و توانای قایلکردن شتێکی پێویستە، ڕاکێشانی دڵەکان و بردنی ئەوانی تر بۆ ئەو شتەی کە مەبەستیەتی، وتاربێژی بەهرە و توانایەکە خاوەنەکەی دەتوانێت گوێگرانی پێ قایل بکات لەهەر کارێکدا کە پێی وایە دروستە.

ئامانجی وتاربێژی لای دانایان و زانایان بریتیە لە: بەدەستهێنانی هێزی قایلکردن، کە پلەیەکی گەورە و بایەخێکی گرنگی هەیە، وەك بایەخ و پلەی هەر پیشە و زانستێکی تر کە بە ئامانجەکەیەوە بەستراوەتەوە، وتاربێژیش ئامانجەکەی پلەیەکی مەترسیداری هەیە، کە بریتیە لە ناردنی خەڵکی و ڕێنوێنی کردنیان بەرەو ڕاستیەکان، هاندانیان بۆ ئەو شتانەی کە درەنگ یان زوو بە کەڵکیان دێت، وە وتاربێژی بە یەکێك لە کەرەستە و میکانیزمەکانی سەرکردایەتی و سەرگەورەیەتی لە قەڵەم دراوە، بە مەرجی چوونە

تەختی فەرمانڕەوایەتی دانراوە، کە مرۆڤ تەواو دەکات و بەرزی دەکاتەوە بۆ پلەی ڕێز و شکۆمەندی.

ئیبن سینا لە (الشفا) دا دەڵێت: وتاربێژ بەڕاستی گونگر ئاراستە دەکات بەرەو ئەو شتەی کە پێویستی پێیەتی لە کاروبارەکانی دین و دونیای، چەندین بۆنەی بۆ ڕێکدەخات بۆ چەسپاندن و قایمکرنی ژیان و گوزەرانی و ئامادەبوون بۆ ڕۆژی زیندوبوونەوەی، بە بایەخدار زانینی وتاربێژی هۆکارەکەی ئەوەیە کە پیشەی سەرکردەی گشت گەلان بووە لە پێغەمبەر و نێردراوەکان، سڵاو و درود لە سەر هەموویان بەگشتی، ئەوانەش کە هاوشێوەی ئەوان بوون لە زانایانی خزمەتکار، گەورە پادشاکان، سیاسەتمەداران، سەرباری ئەو سودە فرە زۆرانەی وتاربێژی هەیەتی.

ئەم زانستە خاوەنەکەی فێردەکات کە چۆن دڵەکان داگیردەکات، دەرونەکان کەمەندکێش دەکات، سۆز و هەستی ئەوانی تر دەبزوێنێت، ئەندێشە و یادەکان دەجوڵێنێت بۆلای ئەو مەبەستەی کەخۆی دەیەوێت، بە مەشخەڵەکەی دەستیەوە ڕێگاکانی ڕێنوێنی ڕۆشن دەکاتەوە، سەرچاوەکانی سەلماندن ڕون دەکاتەوە بۆ ڕزگارکردنی هەر کارێکی شکۆمەند و گەیاندن و تێگەیاندنی هەر مەبەستێکی پیرۆز، پاساکانی ئەم زانستە قوتابی ڕێنوێنی دەکات بۆ شوێن و خاڵە لاوازەکان و مەودا هەڵە و هەڵخلیسکاوەکان، ئیدی ئەو لاوازانە بەهێزدەکات و پوچەکان بە بەڵگەوە ڕاست دەکاتەوە.

هەر ئەوە کە دەروبە نوستو و کەمتەرخەمەکان تاوپێدەدات، دەرونە تۆراوەکان دێنێتەوە سەر ڕێی ڕاست، ئەوەیە کە ڕاستی بەرز دەکاتەوە و پوچ و درۆش نزم و نەوی دەکاتەوە، دادپەروەریی دەچەسپێنێت و ستەم پەرچ دەکاتەوە، گومڕا و سەرلێشێواو دێنێتەوە سەر ڕێی ڕاست، دووبەرەکی لەبن دێنێت و دوژمنایەتیەکان دەبڕێنێتەوە و بەکۆتادێنێت.

وتاربێژی زیرەك و خاوەن سەلیقە لەنێوان خاوەن بۆچون و باوەڕە جیاوازەکان و ڕا دژ بەیەکەکاندا دەوەستێت، هەمیشە و بەردەوام بێ سود و بەسود و ڕاست و هەڵەیان بۆ

جیادەکاتەوە لەیەکتری، هەتا هەمووان دەخاتە چنگی خۆیەوە، وتاربێژی سەرکەوتوو لەنێوان دوو لایەنی دژ بەیەکدا ڕادەوستێت کە ئاگری دوژمنایەتی و کینەی نێوانیان هەڵگیرساوە، ئینجا سەرەنجامەکانی دوبەرەکییان بیری دێنێتەوە، هۆشداری دەدا و دەیانترسێنێت لە ئاکامە خراپەکانی، ئیدی دڵەکانیش دەکاتەوە یەک و دەروونەکان ئاوێزانی یەکتر دەکاتەوە.

بەگشتی وتاربێژیی ڕێگایەکە بۆ کارتێکردن و قایلکردن، کاتێك کە بەڵگە سوودی نەبێت، زانای ناودار (ئیبن ڕوشد) کە لە ئەرستۆوە وەری گرتووە دەڵێت: هەموو جۆرەکانی خەڵکی پێویست ناکات لەگەڵیان بەڵگە بەکاربهێنرێت لە شتە تیۆریەکاندا کە دەخوازرێت لێیان باوەڕی پێ بێنن، ئەوەش چونکە یان مرۆڤەکە گەشەی کردووە و پەروەردە بووە لەسەر ئەو شتە باوانەی کە پێچەوانەی ڕاستین، بۆیە گەر ڕێی گرتە بەر بەرەو ئەو شتانەی کە لەسەری گەشەی کردووە ئەوا قایلکردنی ئاسانە ، یان لەبەر ئەوەی سروشتی خۆی هەر لە بنەڕەتەوە ئامادەی پەسەندکردنی بەڵگە نیە، یان ئەوەیە کە ناکرێت لەو زەمەنە کورتەدا ئەو شتەی بۆ ڕوونبکرێتەوە کە داوای لێ دەکرێت باوەڕی پێ بێنێت ، کەواتە ئەو جۆرە مرۆڤەی کە بەڵگەهێنانەوەی لۆژیکی کەڵکی نیە لە گەڵی، وتاربێژ لەڕێی وتارەکەیەوە ڕێنوێنی دەکات بەرەو ئەو ڕاستیەی کە دەخوازێ باوەشی بۆ بکاتەوە، چونکە هونەری وتاربێژیی هەموو ئەو بەرنامە و ڕێوشوێنانە دەگرێتە بەر کە لۆژیك نایگرێتە بەر، کە ئەمەش جیاوازی و تایبەتمەندیەکی گەورەیە و گاڵتەی پێ ناکرێت.

دەشتوانین بڵێین هونەری وتاربێژیی پەیوەندیەکی پتەوی هەیە بە ( منطق)ەوە، بەجۆرێك هەر بەڕاستی زانستی مەنتیق ها لە خزمەتیدا، چونکە هەندێك لە یاساکانی وتاربێژی پشت بە بنەماکانی مەنتیق دەبەستێت، وتاربێژی لەگەڵ مرۆڤدا دروست بووە، گەڕان بەدوای ڕیشەی سەرهەڵدانیدا دەکەوێتە پێش سەردەمی نەفامی و سەردەمی ئیسلامیشەوە، هەروەها کاریگەریی ڕەوانبێژیی لەسەر دڵ و دەروونەکان تایبەت نیە بە نەتەوە یان ئەوەی سەردەمێکەوە.

وە بنەماکانی وتاربێژی دەتوانرێت کورت بکرێنەوە لە:

- بەهرە و ئامادەگیی خۆڕسك کە ئەمە بنەمایە.
- زانینی ئەو یاسا و ڕێسایانەی کە زانایان دایان ناوە.
- زیاد خوێندنەوە و تەماشاکردنی میکانیزمەکانی ڕەوانبێژان و دەنگی گەورە و زمانی پاراوی وتاربێژان، هەروەها وردبوونەوە لێیان بە وردبوونەوەی ئەو کەسەی کە دەیەوێت لایەنەکانی کارتێکردن و قایلکردن تیایاندا بزانێت ، یان وردبوونەوەی کەسێکی چێژوەرگر لەو بەهرەیەی تیایاندایە لە شێوازی قسەکردنی ڕێکوپێك و دەستەواژەی جوان و کوالێتی بەرزی بیرکردنەوە.

(ابن أثیر) لە پەرتوکەکەیدا بەناوی (المثل الثائر) دەڵێت: بەڕاستی چاولێکردن و تێڕوانین لە وتەی پێشینەکان لە (هۆنراوە و وتە نەستەقەکان) گەلێك سودی هەیە، چونکە بەهۆیەوە مەبەستەکانی خەڵکی و ئاکامی بیرکردنەوەکانیان دەزانرێت، ئەم شتانەش لەوانەن کە هزر بەهێز و مێشك پاراو دەکەن.

هەروەها پڕۆڤەکردن لەسەر وتاردان بەهرەکە گەشە پێدەدات و بەهێز دەکات بە کارتیاکردن و بەکارهێنان و نەرمکردن، چونکە زمانیش وەك هەر ئەندامێکی تر ئەگەر ڕات هێنا ڕادێت و نەرم دەبێت، وەك دەست کە بە کارپێکردن زبر و پتەو دەبێت، وەك جەستە کە بەهێزی دەکەیت بە بەرزکردنەوە قورسایی، هەروەها قاچ کە ئەگەر ڕاتهێنا لەسەر ڕۆیشتن دەڕوات.

وەك چۆن پێویستە لەسەر خوێندکاری بواری وتاربێژی کە سەیری میکانیزمەکانی کەسانی پێش خۆی بکات، لاساییان بکاتەوە، بەپێ ودانی ئەوان بچنێت و بهۆنێتەوە، نابێت دەستبەرداری لاساییکردنەوە و چاولێکردنی پێشینان ببێت، نابێت وازبێنێت لە وەرگرتن و تێهەڵکێشکردن لەهونەر و سەلیقەی یەکەمینەکان کە لەڕێگای ئەواسەوە گەیشتە ئێرە، چونکە لاساییکردنەوە و چاولێکەری بەجێ داکوتاوە لە مرۆڤدا وەك شاعیر دەڵێت:

وَتَشَبَّهوا اِنْ لَمْ تَكونوا مِثْلَهُمْ     اِنَّ التَّشَبُّهَ بِالرِّجالِ فلاحٌ[١].

وتابێژی دیسان بریتیە لە دەربڕینی توانای وتاربێژ لەسەر باش لێکدانەوە و باش گوتن و قایلکردن و وتووێژ و ڕاکێشانی شوێنکەوتوو و پشتیوانان، هەروەك لە فەرمودەیەکی پێغەمبەردا – درودی خوای لێبێت – هاتووە کە دەفەرموێت :" إنّ من البَيانِ لَسحرا". واتە ...ڕونبێژی و جوان بێژی کاریگەریی جادوویيان تیادایە.

ڕونبێژی بریتیە لە سودەکانی وتاربێژی و قسەکردن و زمان پاراوی کە خوای گەورە مرۆڤی پێ جیاکردۆتەوە و ڕێزی پێ لێناوە بەسەر گشت دروستکراوەکانی تردا، بەخششێکە خوای گەورە بەخشیویەتی بە مرۆڤ.

پێویستی مرۆڤ بە توانای ڕون کردنەوە و دەربڕین بایەخی کەمتر نیە لە پێویستبوونی بە عەقڵ؛ چونکە ئەو کەسەی نەتوانێت ئەوەی لەناخیدایە دەری ببڕێت و ڕونی بکاتەوە ئەوا سودی عەقڵ و ئاوەزی کەم دەبێتەوە یان هەر نامێنێت.

لەبەر ئەمەیە کە خوای گەورە هیچ پێغەمبەرێکی نەناردووە بە زمانی گەل و نەتەوەکەی خۆی نەبێت، تاکو مەبەستی پەیامەکە بێتە دی کە بریتیە لە : ڕون کردنەوەی ڕێگای گەیشتن بە خوای گەورە، و ورياکردنەوەيان لە ڕێگاکانی شەیتان، هەربۆیە خوای گەورە دەفەرموێت :﴿ وَمَا أَرْسَلْنَا مِنْ رَسُولٍ إِلَّا بِلِسَانِ قَوْمِهِ لِيُبَيِّنَ لَهُمْ ﴾[٢]. وە هەروەها پێغەمبەر درودی خوای لێبێت فەرموویەتی :" لَم يَبْعَثَ اللهُ نَبِيّاً إلاّ بِلُغَةِ قَوْمِهِ"[٣]. واتە خوای گەورە هیچ پێغەمبەرێکی نەناردووە بە زمانی گەل و نەتەوەوەی ئەو پێغەمبەرە خۆی نەبێت.

---

[١] واتە: چاولێبکەن با وەك ئەوانیش نەبن وەك ئەوایش دەربتەچن.....خۆ چاولێکردن لە پیاوان هەر دەتکا بە پیاو و مایەی پێشکەوتن و سەرکەوتنە.

[٢] سورة : ابراهيم: الآية ٤.

[٣] (أحمد) لە (المسند) دەری هێناوە و ( السيوطي) لە ( الجامع الصغير) ڕاستی کردۆتەوە و هەروەها (الألباني) لە (صحيح الجامع) .

بۆ هەر میکانیزمێك لە میکانیزمەکانی ڕونکردنەوە و دەربڕین یاسا و ڕێسا و شێوازی تایبەت بەخۆی هەیە، کە مرۆڤ ئەوەیان ناساندووە و ڕێککەوتوون لەسەری، هیچ ڕێگایەکیش نیە لە نێوانیاندا بۆ تێگەیشتن لەیەکتری مەگەر بەو ڕێگایانە نەبێت کە لەسەری ڕێککەوتوون.

وتاردانی خۆکار بەبێ ڕێکخستن و ئامادەکردن، یەکێکە لە هۆکارەکانی ڕونکردنەوە و دەربڕین و قایلکردن، لەهەموویان زیاتر بەکارهێنراوە لای مرۆڤەکان، لەبەر ئەوەشە کە هەر لەدێرزەمانەوە گرنگیان پێداوە، لە کۆنەوە لەنێو زانستی فەلسەفەدا دایان ناوە، بەشی لە زانکۆکاندا بۆ کراوەتەوە، بەرنامەی خوێندن و مامۆستایانی پسپۆڕیان بۆ داناوە، زۆرێك پەرتوك و نامەی زانستی لەبارەوە نوسراوە وەك ئەمڕۆ دەیبینین.

یەکێکی تر لە گرنگترین هۆکار و بنەماکانی وتاربێژی سەرکەوتوو هێزی دەنگیەتی، چون دەنگی وتاربێژ وەرگێڕی مەبەستەکانیەتی، دەرخەری ویستەکانیەتی، گەر دەستەواژەی باشی لەگەڵ بەکارهێنا و پێشکەشکردنەکەی باش بوو ئەوا ئەو دەنگە ماوتا و شانبەشانی ڕونکردنەوەی ماناکان دەوەستێتەوە، کە یارمەتیدەرێکە بۆی بۆ گەیاندنی وتەکان بەگوێی گوێگران، پاشانیش بە دڵیان، کە پێشینان ناویان لێناوە بە (ڕوناکی) چونکە وتاربێژ مەشخەڵی ڕۆشنایی پێیە بەرەو هزرەکان، چەند وتاربێژ هەن کە گوێگرانیان سەرسام کردووە بە دەنگە خۆشەکانیان، زیاتر لە جادوی دەربڕین و ڕونبێژیەکانیان.

یەکێك لە بەڵگەکانی کاریگەریی دەنگ لەسەر دەرونەکان ئەوەیە کە: ڕەنگە کەسێکی قورئان لەسنگ و تەجوید زان قورئان بخوێنێتەوە، بەڵام بە دەنگێکی ڕێك و خۆش نەیخوێنێتەوە، بۆیە کارناکاتە سەر گوێ لێگرانی، کەسێکیش قورئان دەخوێنێتەوە بە دەنگێکی خۆش و ڕێکوپێك کەچی تەجویدیش نازانێت و باش نایخوێنێتەوە بەڵام گوێلێگرانی دەکاتە گریان.

وتاری باش ئەگەر کەسێك پێشکەشی کرد نەیتوانی بەدەنگێکی باش و ڕێکوپێك پێشکەشی بکات وەك ئەو شمشێرە بڕندەیە وایە کە بەدەستێکی لاواز و لەرزۆکەوەیە،

ئەو وتاربێـژە زمـان پـاراوەی کـە وتـارێکی لاواز پێشـکەش دەکـات وەك ئـەو پاڵەوانـە جوامێرە وایە کە بە شمشێرێکی کوڵ شەڕ دەکات.

جا ئەگەر هێزی شمشێر و هێـزی دەسـتێك کـە مـەڵی بگرێـت یـەکانگیر بـوون، لەگـەڵ هێزی دڵی خاوەنەکەیدا ئەوا کاری خۆی دەکات، وتاردانیش هەر بـەم چەشـنەیە گـەر لـە ڕەوانبێـژی و زمـان و شـێوازی پێشکەشـکردنەکەیدا بـاش بـوو بـەدەنگێکی ڕەسـەن و ڕێکوپێك ئەوا کاری خۆی دەکات لە دڵی گوێگرانی.

چەند کەس هەن گوێمـان لـە وتارەکانیـان بـووە، کاریـان لێکـردووین، بـەڵام کاتێـك بـە نوسراوی خوێندومانەتەوە وەك ئەوە نەبوون کە گوێمان لێبوون، گەرچی یـەك پیـتی بـۆ زیـاد و کـەم نـەکراوە، ئەمـەش بەڵگەیـە لەسـەر ئـەوەی کـە پێشکەشـکردن و دەنـگ کاریگەریەکی گەورەی هەیە لەسەر گوێگر.

دەنگ خۆشی بەخششێکی خوداییە و یەکێکە لە تایبەتمەندیەکانی کەسێتی، زۆرێك لـە وتاربێـــژان بـــەدەنگی خۆیـــان دەڵـــێن ناخۆشـــە، بـــەڵام ناخۆشـــی و ناباشـــی لـــە پێشکەشـــکردنەکەیاندایە نـــەك دەنگەکـــە، دەستەوســـان دادەنیشـــێت لـــە باشـــکردنی پێشکەشکردنەکەی بەبیانوی ئەوەی کە خوا ئەمەی پێ نەبەخشیوە.

دەنگەکان جۆراوجۆرن، هەر دەنگێکیش ڕێگایەکی پێشکەشـکردن و دەربـڕین لەگـەڵی تەبایە، ئەو شێوازەی بۆ دەنگێك خۆشە بۆ دەنگێکی تـر خـۆش نیـە، بەبەڵگـەی ئـەوەی ئێمە گوێ لە دوو وتاربێژ دەگرین کە یەکیان لاسایی ئـەوی تریـان دەکاتـەوە لـە ڕێگـەی پێشکەشکردنی وتارەکـەی تـاکو خەریکـە لـەو بچێـت، ئەگـەر جیـاوازی تـۆنی دەنگیـان نەبووایە، لەگەڵ ئەوەشدا خەڵکی یـەکیان پەسـەند دەکـات و ئـەوی تـر پەسـەند ناکـەن، هۆکەشی ئەوەیـە کـە یـەکیان دەنگـی خـۆی لەگـەڵ ڕێگـای پێشکەشکردنی وتارەکەیـدا گونجاندووە بە پێچەوانەی ئەوی تریانەوە.

پێویسـتە وتاربێـژ ڕێگـەی پێشکەشـکردنی ڕێـك وگونجـاو لەگـەڵ دەنگـی و خـۆی بدۆزێتەوە، ئەوەش بە تاقیکردنەوەی چەندین ڕێگا، تێڕوانین لە ئاستی کاریگـەرییان لـە

گوێگران، لەگەڵ پرسیارکردن لە خەڵکانی شارەزا و ئەزموندار لەو بوارەدا، ئینجا پاش چەند هەوڵێك بۆی دەردەکەوێت کە کام ڕێگا گونجاوە لەگەڵ ئەو دەنگەی کە هەیەتی.

هەروەهاش دەوترێت کە لە نزمکردنەوە و بەرزکردنەوەی دەنگ و نەرمکردن و زبرکردن و دووبارەکردنەوەی وشە و بڕین ودرێژکردنەوەی لەوتاردا شوێنی خۆیان هەیە، تاکو وتاربێژ گوێگران بهەژێنێت و سەرنجیان ڕابکێشێت، کە یەکێکن لەوانەی یارمەتیدەرن بۆ سود وەرگرتن لە وتارەکە.

**هەندێك مەرج پێویستن بۆ کاریگەربوونی دەنگی وتاربێژ وەکو:**

١- گونجاندنی دەنگی لەگەڵ بارودۆخی وتارەکە، چون دەنگ دەگۆڕێت بە گۆڕینی ئامادەبووان و کات و شوێن و بابەتی وتارەکە، دەنگی وتاربێژ دەبێت جیاوازبێت لە بۆنەی خۆشدا وەك لە بۆنە ناخۆش و خەمباریەکاندا، وەك چۆن گۆڕانی بەسەردا دێت لە شوێنە تەنگەبەرەکاندا جیاواز لە شوێنە بەرفراوان و کەم گوێگرەکاندا.

جابۆیە پێویستە وتاربێژ ڕەچاوی ئەم دۆخانە بکات و دەنگی خۆیشی بسازێنێت لەگەڵیان.

هەندێك لێکۆڵەر پێیان گونجاوە کە وتاربێژ بە دەنگی نزم دەست پێ بکات، پاشان وردە وردە بەرزی بکاتەوە، چونکە دەنگ بەرزکردنەوە دوای نزمی ئاسانترە، وەلای گوێگران پەسەندترە، بەڵام نزم کردنەوە پاش دەنگی بەرز، ئەوا باش ناچێتە گوێ[1].

پێویستە وتاربێژ توانا دەنگیەکانی خۆی بزانێت و خۆی وا پەرۆش و گەرم نەکات کە دواتر نەتوانێت وتارەکەی لەسەر ئەم چەشنە تەواو بکات، لەبەر دووودرێژی وتارەکەی، توانای دەنگییشی لاوازە، ئینجا بکەوێتە شپرزەیی و شەرمەزاریەکی زۆرەوە، ڕاکێشانی دڵی گوێگران تێك بدات.

---

١. سەیری: (فن الخطابة) ی ...أنطوان القوال، و (الخطابة)ی (محمد أبو زهرة). .. بکە.

٢- دەنگی لەسەر یەک جۆر تۆن نەوەستێنێت، چونکە ئەوە لەدەروونی گوێگراندا ساردی و بێزاری دروست دەکات، بەڵکو تۆنی دەنگی بگۆڕێت بەگونجاندنی لەگەڵ ئەو مانایانەی کە دەستەواژەکان لەخۆیانی دەگرن.

٣- مێشک و بیری خۆی بەتاڵ بکاتەوە لەکاتی قسەکردندا بۆ ئەو مانایانەی کە پێشکەشیان دەکات، دڵی خۆی پێ بجوڵێنێت، لەگەڵی کارلێک بکات بەپێی توانای، دڵسۆزی لە ئامادەکردنی وتار و پێشکەشکردنیدا چانسێکی گەورەیە بۆ جوڵاندنی دڵەکان پێی، بەتایبەت ئەگەر لە دڵدا پەرۆشیەک بۆ دینی خوا هەبوو، یان دڵسۆزیەک بۆ سودی برا موسوڵمانەکان، هەروەها سەرقاڵیی هزریی لەکاتی قسەکردندا زۆر کاردەکاتە سەر دڵ و زۆرێک لە قوڵبوونەوە و تێرامان لەناو دەبات.

هەموو کات ئامادەکاریەکی باش بۆ وتاردان لەگەڵ دڵسۆزی و پەرۆشیدا دەسەبەری ئەوە دەکەن وتاربێژ کارلێک بکات لەگەڵ وتارەکەیدا، پاشانیش گوێگران کارلێک بکەن، هەتاکو ئامادەکردنەکەی لاواز بێت و دڵسۆزیشی کەم بێت، ئەوا کاریگەریی کەمتر و لاوازتر دەبێت.

هەروەک دەڵێن: وشە لەدڵ دەرچوو بۆ دڵ دەڕوات، لە زاریش دەربچێت لەگوێکان تێپەڕناکات.

کاتێک موعاویە - ڕەزای خوای لێبێت - پرسیاری لە (صحار بن عیاش العبدی) کرد لە نهێنی ڕەوانبێژیەکەیان، ووتی: " شتێکە سنگ و دڵمان دەهەژێنێت و فڕێی دەداتە سەر زمانمان"[١].

حەسەنی بەصری - بە ڕەحمەت بێ - بە وتارخوێنێکی کە وتارەکەی کاری لێنەکرد فەرموو: " ئەمە چیە، دڵی تۆ خوی شەڕ بووە یان دڵی من"[٢].

---

١. (فن الخطابة) ی (الحوفی).

٢. البیان و التبیین.....الجاحظ.

٤- گرنگیدانی وتاربێژ بەو ئامێرە دەنگیانەی كە وتارەكەی دەگەیەننە گوێی گوێگران، ئەم ئامێرانە بەخششیی خودان، خزمەتی وتاربێژانی كردووە و بێ خەمی كردون لە بەرزكردنەوەی دەنگدا بەجۆرێك كە زیانیان پێ بگەیەنێت، مانای گرنگی پێدان ئەوەیە: دەنگەكە لەرێی ئەم ئامێرانەوە هاوسەنگ بێت و گوێگر وەرس نەكات و تەشویشی تیا نەبێت، هەندێك لە وتاربێژەكان ئاسودە نابن هەتاكو دەنگی (دەنگەوەرەكان)یان نەگەرێتەوە بۆ گوێی خۆیان، هەندێكی تر ئامێرەكانیان دەنگەكە بەباشی ناگەیەنن لەبەر نزمی دەنگەكانیان، كەواتە هاوسەنگی شتێكی پێویستە.

ئەگەر وتاربێژ دەنگ بەرز بوو، دەبێت دەنگی ئامێرەكە نەوی بكات تاكو بێزاری دروست نەكات، چونكە بێزاركردن و لاوازی دەنگ رێگرن لە سود وەرگرتن لە وتارەكە.

٥- ناوەندگیری لە خێرایی دەنگدا، با وتاربێژ هێندە خاو نەبێت گوێگران توشی بێزاری بكات، هێندەش خێرا نەبێت رێگریان لێ بكات لە قوڵبوونەوە و تێگەیشتنی ماناكاندا، خێرایی هۆكارە بۆ دەنگ ماندو كردن بەتایبەت لە وتارە دوورودرێژەكاندا، هەندێك زانا تێكڕاییەكیان بۆ ئەوە داناوە كە نزیك بێت لە (١٢٠) وشە لەیەك خولەكدا[1].

بەڵام ئەگەر لەهەندێك رستەدا پەلەی كرد تاكو لەیەكێك لە وشەكانیاندا خاوی بكاتەوە بە مەبەستی راكێشانی سەرنج لەبەر گرنگیەكەی، ئەوە شێوازێكە لە شێوازەكانی راكێشان و جڵەوكردنی سەرنج، هەربۆیە هەندێك لە وتاربێژە ناودارەكانی (افرنج) چەند وشەیەكیان بە خێراییەكی زۆر گۆ دەكرد تا دەگەیشتنە ئەو دەستەواژە یان وشەیەی كە دەیانویست جەختی لەسەر بكەنەوە پاشان دەنگیان لەوێدا هێواش دەكردەوە و زمانیان لەسەر قورس دەكرد.

٦-وتاربێژ دەبێت دور بكەوێتەوە لەو شتەی كە ماندوی دەكات و دەنگی لاواز دەكات، وەك فشارخستنە سەر قورگ بە قۆپچەكانی كراسەكەی، ئەگەر لەو كەسانە بوو كە پێویستی بە ئاوە بۆ بەهێزكردنی دەنگی ئەوا قەیدی نیە كە پێش وتارەكە ئاو

---

[1] . فن الخطابة، انطوان القوال.

بخواتەوە، یان لە دانیشتنی نێوان دوو وتارەکەدا، یاخود تەنانەت لەکاتی وتاردانیشدا بەمەرجێك بیرۆکەکانی نەپچڕێنێت و گوێگران توشی بێزاری نەکات.

وێڕای هەبوونی دەنگێکی باش و ساز کە مەرجی سەرکەوتنی وتاربێژە، دەبێت بە باشی دان بنێ بە وشەکاندا و ئاخافتنی باش بێت، کە ئەمەش پێویستی بە چەند شتێکە، وەکو:

**یەکەم: گۆ کردنی باش (باش دان نان بە وشەکاندا):**

پیتەکان لە شوێنی دروستی خۆیان بێنێتە دەر، (ث) نەکات بە (س) و (ذ) نەکات بە (ز)، هەر بەو چەشنە هەموو شوێنی پیتەکانی تر، پێویستە وتاربێژ بایەخ بدات بەوەی کە پیتەکە لە سەرچاوەکەی خۆی دەربێنێت، لەو شوێنەی کە لای ئەو زمانەی ئەو قسەی پێدەکات باوە و ناسراوە.

گرنگیدان بە گۆکردنی پیتەکان گۆکردنێکی ڕاست و دروست، هەروەها دەرهێنانیان لە شوێنی خۆیان، مانای ئەوە نیە مرۆڤ دەمی پان یان تەسك بکاتەوە، وەك ئەوەی حاڵەی کە هەندێك لە وێژەران و وتاربێژان تێی دەکەون، گۆکردنی پیتەکەیان وا قورس کردووە کە لای گوێگران دەبێتە گاڵتە، یان وشەکەیان لەسەر قورس دەکات، بەڵکو مانای ئەوەیە دان بەو پیت و وشەیەدا بنێت لە شوێنەکەی خۆی بەبێ زۆر لەخۆکردن یان بەبێ دەم پان کردنەوە، یان بەبێ دەم باریك کردنەوە، بەڵکو زۆر بە ئاسانی، زۆر بە ئاسکی و سادەیی، چونکە ئەو دەم پانکردنەوەیە وا لە وتاربێژ و قسەکەر دەکات بکەوێتە حاڵەتێکەوە کە خۆی حەزی پێ ناکات، وای لێدێت پیتەکان بەدەر لە شوێنی خۆیان دێنێتە دەر.

**دووەم : دورکەوتنەوە لە هەڵەی ڕێزمانی و گەڕان و فێربوون بۆ توش نەبوون:**

پێویستە وتاربێژ گرنگی بدات بە ڕاستکردنەوەی ئەو قسەیەی کە دەیڵێت، ئاگاداربوونی لەو دەستەواژە و دەربڕینانە، سەرنجێکی تەواو لە بنچینەی وشەکان بدات.

چونکە ئەو وتاربێژەی دەکەوێتە هەڵەی ڕێزمانیەوە، ماناکەش تێک دەدات، بەڵکو ڕەنگە مانا و مەبەستی دەستەواژەیی لە قسەکانیدا هەڵبگێڕێتەوە بۆ دژی مەبەست و پێچەوانەوەی مانا بنچینەییەکە، هەڵەوونی کۆتایی وشەکان لەسەرو ئەوەی کە ماناکە تێک دەدات، ڕەونەقی وتارەکە و باش چونە دڵ و جوان کارتێکردنیشی لەدەست دەدات، وتاربێژ با وانەزانێت کە کوالێتی بەرزی مانا و جوانی و ئەستەقیەکەی هەندێک لە هەڵەکان لەناو دەبات، چونکە هەڵەکان با بچوکیش بن ئەگەر زۆر بوون کاریگەرییەکی خراپ لەوتارەکە دەکەن، هەروەها کاریگەریی ماناکەش ناهێڵن.

**سێیەم: دان نان بە وشەکاندا بەجۆرێك وێنەیەکی ڕاستی مانای وشەکان بدات پیشان بدات:**

واتە مافی تەواو بدات بەهەر وشە و دەربڕینێك، بەشێوەیەکی جیاوازی لەوی دی دەری بحات، بۆ نمونە ڕستەی دڵنیایی (دوپاتکردنەوە) بەجۆرێك دەربڕێت کە ئاماژەبێت بۆ جەخت کردنەوە لە ئاوازەکاندا، ڕستەی پرسیاری بەجۆرێك دەربڕێت کە پرسیارەکەی لێوە ڕون بێتەوە.

یەکێك لەو شتانەی کە وتاربێژ پێویستە لێی دووربکەوێتەوە پەلە کردنە لە وتارەکەیدا، چونکە ئاخاوتنی خێرا و بەپەلە، کە پێویستی بە لەسەرخۆیی بێت تێکدانی شوێنی پیتەکان و تێکەڵکردنی پیتەکانی لەگەڵ یەکتری لێوە بەرهەم دێت، چونکە ماسولکەکانی دەم و زمان کاتی پێویستیان نابێت بۆ گواستنەوە و چوون لە وشەیەکەوە بۆ وشەیەکی تر.

پەلەکردنی لەڕادەبەدەر وتاربێژ ناچاردەکات کە لە برگە باش و جوانەکان دا یان ئەو برگانەی کە کاریگەریی باشیان هەیە نەوەستێت.

وتاربێژی پەلە لە ئاخاوتنیدا دەرفەتی تەواو نادات بە گوێگر بۆ تێگەیشتن لەوەی دەیبیستێت، یان چێژوەرگرتن لە وشە دەرەوشاوە و مانا جوان و ئەندێشە ئاوازەکان.

بەڵام لەسەرخۆیی وادەکات دەنگەکە ئاسان بچێتە گوێی گوێگران بە کەمترین ماندووبوونی گونجاو لەگەڵ شوێن و ژماردا، لەکاتێکدا پەلە کردن وادەکات وشەکان پێویستیان بە کۆششێکی دەنگیی گەورەتر هەبێت تاکو قسەکە بگاتە گوێیەکان.

هەندێك جار وتاربێژە وتاردەدات و هەندێك كەس ڕووبەڕووی دەبنەوە لە وتارەکەدا، ئەگەر ڕاستەوخۆ و بێ لێکدانەوە ئامادەنەبێت وەڵامی ڕەخنەکە بداتەوە بە بەڵگەی بەهێز ئەوا وتارەکە و کاریگەریی وتارەکە لەدەست دەچێت.

دەگێڕنەوە کە ئەبو جەعفەری مەنصور جارێك وتاری دەدا: ووتی: لەخوا بترسن، پیاوێکیش ڕاستەوخۆ هەستایەوە و پێی ووت: منیش هەمان شت بیری تۆ دەخەمەوە.

ئینجا ئەبو جەعفەر ووتی: گوێ ڕادێرن گوێ ڕادێرن بۆ ئەو کەسەی کە لەخوا تێگەیشت و بیری ئەوی هێنایەوە، پەنا دەگرم بەخوا کە ئەگەر من یادتانی بێنمەوە و خۆم لەبیری بکەم، یان غیرەت بمگرێ بۆ تاوانکردن، ئەوکاتە من گومڕا دەبم و لەوانە نابم کە ڕێنوێنی کراون؟"

ئینجا ڕوی وەرگێڕا بەلای پیاوەکە و ووتی: تۆ کێی؟ بەخوا مەبەستت خوا نەبوو لەو قسەیە، بەڵام بۆئەوەی بوترێت: هەستایەوە و وای گوت، دواتر بردیان سزا درا و ئەویش ئارامی گرت...

پاشان گەڕایەوە شوێنی خۆی لە وتارەکەدا.

جا ئەگەر خەلیفە ئەبوجەعفەری مەنصور توانای سەرپێی و کتوپڕی نەبووایە، نەیدەتوانی ئەو جۆرە قسەیە بکات، ئەوکات نەیدەتوانی وەڵامی هێرشبەرێك بۆسەر پێگەی فەرمانڕەوایەتی بەو جۆرە هێرشە بداتەوە.

عەرەب ڕۆژگاری سەرهەڵدانی وتاربێژیی یەکێك بوون لە بەهێزترین خەڵکی کە بتوانن سەرپێی و بێ خۆ ئامادەکردن بدوێن، (جاحظ) لە وەصفیاندا دەڵێت: هەموو شتێك لای عەرەب بێ خۆئامادەکردن و کتوپڕیە، وەك ئەوەی ئیلهام بێت، وەك ئەوەی دەردیسەری و تەڵەکەبازی لەوێندەر نەبێت، بیر ڕۆیشتن نەبێت، بەڵکو وەك ئەوەی بیەوێت خەمی خۆی بدات بە قسە، یان بە کێشی هۆنراوەی ڕۆژی بە شەڕهاتن، یاخود بەکۆڵی

وشترێکەوە گۆرانی بڵێت، یان کاتی دەهۆڵ کوتـان، وشە دادەبارێت بەسـەریدا هـەروەك باران، پاشان تە دەینوسیتەوە نە دەیلێتەوە بە یەکێك لە کوڕەکانی.

عـەرەب نەخوێنـدەوار بـوون و نەیاندەنوسـی، کەچـی فێربووبـوون و قـورس نـەبوو لەسەریان، قسەی جوان لای ئەوان لەهی هـەموو کـەس دیارتر و زۆرتـر بـوو، بـۆ قسـەی جوان بـەتواناتر و دەوڵەمەنـدتر بوون، هـەموو یـەکێکیش لەخۆیـەوە و بەسروشـت زمـان پاراوترین کەس بوو، عەرەب پێگەی لە ڕونبێژیدا بەرزترین بوو، وتاربێژەکانی کورتبڕترین بوون، قسەکردن لەلای ئەوان ئاسانترین شت بوو، ئـەوە قسـەکردنە سـەرپێیە بەلایانـەوە زۆر ئاسانتر بوو لەوەی کە پەنا ببەنە بەر لەبەرکردن یان پێویستیان بە خوێندن هـەبێت، وەك ئەوە نەبوون کە زانستی کەسێکی تر لەبەر بکەن لەوانەی پێشی خۆیان، لەبـەرکردن نەبوو تەنها و تەنها دەنوسـا بـەدڵ و سنگیانەوە، دەلکا بـە عـەقڵ و هۆشـیانەوە بـەبێ ویست و مەبەست و لەبەرکردن و خواستن.

یەکێك لەو هۆکارانەی کە هاوکاری وتاربێژ دەکات لەسەر جوان وتنی سەرپێی و بێ خۆ ئامادەکردن زۆر گوێگرتنە لـە وتاربێـژە بـەهرەدارەکان، چـونکە گوێگرتن ئـەو توانسـتە خۆرسکەی هەیـەتی لـە قسـەکردندا دەجوڵێنێـت، هـەروەها لەبـەر ئـەوەی هـزری مرۆڤ تێردەبێت و دەبوژێتەوە بە چاولێکردن و لاسایی.

ڕێگایەکی تر ئەوەیە کات ناکاتێك سـەرپێی خـۆی بباتـە بـاری قسـەکردنەوە، بچێتە کۆڕەکانەوە، قسە بکات، تاکو گرێی زمانی و بەندی شەرمی بکرێتەوە.

باشترین ڕێگا ئەوەیە: هەوڵبدات لە کاغەزدا وتار نەدات بەڵکو پوختەی ئەوە بزانێت کە دەیڵێت پاش ئامادەکردنی، جا ئەگەر لەسـەر ئـەوە ڕامـات و لەسـەر ئـەو حاڵـە ڕۆیشـت، سروشتێکی بەهێز و ئامادەگیەکی تەواوی هەبوو لەگەڵیدا ئەوا دەتوانێـت قسـە بکـات بـە ڕاستەوخۆ و بێ خۆ ئامادەبۆکردن کاتی پێویست ..

***

## وتاربێژیی لای عەرەبە پێشینەکان

وتاربێژی یەکێکە لەو شتانەی کە عەرەب وەستا و کارامەبوون تیایدا لە سەردەمی نەفامیدا، لە دۆخە جۆراوجۆرەکانیان لە شەڕ و ئاشتییان پشتیان پێ دەبەست ، مێژوو زۆرێك لە وتاری گەورە ناودارەکانی عەرەبی بۆ تۆمارکردوین، کە ڕاوەستابوون لەسەر سەربێی دوان و وتاری ڕاستەوخۆ و بێ خۆ ئامادەکردن.

وتاربێژیی دەهاتە ئاراوە کاتێك هۆز و تیرە کۆدەبوونەوە بۆ پرس و ڕا لە کارێك لە کاروبارە گرنگەکانیان، یان شەڕ و ئاشتبوونەوە لە گەڵ دوژمنەکانیان، ئەوکات وتاربێژەکان دەکەوتنە کێبەرکێ و زۆران لە بازاڕەکانی شیعرگوتن دا.

شاعیر و وتاربێژەکان شانازیی و شکۆ و سەربەرزیی هۆز و تیرە بوون، گەر شتێکیان بووتایە ئەوە – لای هۆزەکەیان – گوێیان لێ دەگیرا، ئەگەریش بناخاوتنایە وتەکانیان بەرزکەرەوە و نزمکەرەوە بوو، شکۆ و پێگە و پایەی وشە گەیشتە ڕادەیەك کە لەمەناوی کابەدا لە پیرۆزترین شوێن لای ئەواندا و بە خۆشەویسترین و پیرۆزترین دیوارباندا هەڵیان دەواسی، لە ناودارترین وتاربێژەکانی عەرەب : (قس بن ساعدە الإیّادي، خارجە بن سنان، خویلد الغطفاني) و زۆری تریش بێجگە لەوان.

وتاربێژیی لەسەردەمی خەلیفەکانی ڕاشیدینیشدا پێگە و پایەیەکی بەرچاو و شیاوی هەبوو، هەربۆیە خەلیفەکان وتاربێژبوون و وتاریان بۆ خەڵکی دەدا لە کۆبوونەوە و جەژن و بۆنەکاندا قسەیان بۆ سوپاکان دەکرد و سەرکردەکانیان ئاڕاستەدەکرد.

وتار لە سەردەمی ئیسڵامیدا لە قورئانی پیرۆز و فەرمودەی پیرۆزی پێغەمبەرەوە ڕونبێژیی و بێ خەوشی و بەڵگەی بەهێز و جوانی و ناسکی دەستەواژەی تێهەڵکێشی

خۆی کرد، دورکەوتەوە لە سەروارێکیی کەشیشە ئاسا و جادوگەران و فیز و شانازی بەخۆکردن و ستایشی هۆز و تیرە و ڕەچەڵەك و شانازی کردن بە باوانەوە، بێجگە لەوانەش لە نەریتەکانی نەفامی، هەربۆیە بەوە هێزی کاریگەریی بەدەستهێنا و گەیشتە کێشکردنی دڵان و هەموو ڕەنگ و ڕەگەزێکی گرتەوە، بەرزبوویەوە بۆ چوارچێوە و بازنەی پەیامی جیهانی و ڕاستەقینەی مرۆڤایەتی، بەوەش زاڵبوو بەسەر شیعردا تەنانەت هەندێك لە شاعیرانی کەڵە هۆنەر وازیان لە شیعر وتن هێنا پاش هاتنی قورئانی پیرۆز و فەرمودە، بەهۆی ئەو ڕەوانبێژیی و کاریگەریەی کەهەیانە و هیچ شتێکی تۆ ناگاتەوە پێیان.

وتاری سەردەمی ئیسلامی هەندێ تایبەتمەندی هەبوو پێی جیادەکرایەوە لە وتاری سەردەمی نەفامی، وەك ئەوەی بە سوپاس کردنی خودا و پاشان درود ناردن بۆسەر پێغەمبەری خودا دەستی پێ دەکرد ، واتا وتاری کۆڵ کۆتایی پێهات، چونکە پێغەمبەر – درودی خوای لێبێت – دەیفەرموو :" كُل خطبة ليس فيها التشهّد فهي كاليد الجذماء" (الجذماء) واتە: براو...واتە هەر وتارێك (تشهد – واتە شایەتومان)ی تێدا نەبێت وەك دەستی کۆڵ وایە.

***

## وتاربێژیی لە قورئان و ڕێبازی پێغەمبەردا

بەڕاستی قورئانی پیرۆز لە شوێن و جێگایەکدا باسی لە پەیوەندی گەورەی ڕونبێژیی قسەکردنی بە پەیام و بانگەوازەکانەوە کردووە ، لەوانەش خوای گەورە ڕێزی لە مرۆڤ ناوە و منەتی کردووە بەسەریدا بەوەی کە بەشێك لە ئەندامەکانی وا لێکردووە بتوانێت مەبەست و خواستەکانی پێ ڕون بکاتەوە و هەست و بیر و ئەندێشەکاس پێ دەرببڕێت، وەك دەفەرموێت: ﴿أَلَمْ نَجْعَلْ لَهُ عَيْنَيْنِ (٨) وَلِسَاناً وَ شَفَتَيْنِ﴾[1]. واتە. ئایا دوو چاومان بۆ مرۆڤ نەکرد، لەگەڵ زمان و دوو لێودا...

ئەوەی کە نرخ و بەهای ئەم بەخشش و دیاریە گەورە و گرنگە و هەستکردن بە مەزنیەکەی دەردەخات ڕوانینە بۆ کەسێك کە خوا لەم بەخششە بێ بەشی کردووە یان هەندێکی پێ نەداوە، هەربۆیە کاتێك فیرعەونی دوژمنی خوا ڕەخنەی لە موسا گرت و ڕوبەڕوی بوویەوە بە هۆکاری نەخۆشیی زمانی وەك قورئان لەسەر زاری ئەوەوە باسی دەکات :﴿أم أنا خَيْرٌ من هذا الَّذي هو مهين ولايكاد يبين﴾.

لەبەر ئەو ڕوداوە و پاش ئەوەی کە خوای گەورە فەرمانی کرد بە موسا بانگەوازی فیرعەون و ئەوانەی لەگەڵینی بکات پاڕایەوە لەخوای گەورە کە براکەی (هارون) بنێرێت لەگەڵی بۆ پشتیوانیکردنی – چونکە موسا سەلامی خوای لێبێت زمانی دەیگرت و نەیدەتوانی بەباشی قسان بکات – ، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿قَالَ رَبِّ إِنِّي أَخَافُ أَن يُكَذِّبُونِ (١٢) وَيَضِيقُ صَدْرِي وَلَا يَنطَلِقُ لِسَانِي فَأَرْسِلْ إِلَى هَارُونَ (١٣)﴾[2].

---

[1] . سورة البلد: الآية: ٨–٩.

٢ .الشعراء: ١٢–١٣.

هەروەها دەفەرموێت: ﴿وَأَخِي هَارُونُ هُوَ أَفْصَحُ مِنِّي لِسَانًا فَأَرْسِلْهُ مَعِيَ رِدْءًا يُصَدِّقُنِي إِنِّي أَخَافُ أَنْ يُكَذِّبُونِ﴾[١].

ڕاڤەکارانی قورئان دەبێژن کە زمانی موسا قورس بوو، نەدەتوانرا بەباشی لە قسەکانی بگەن، هەربۆیە داوای لەخوای گەورە کرد گرێکەی زمانی بکاتەوە، تاکو لەوەی دەیڵێت تێ بگەن و مەبەستی تەواو لە ئاخاوتن و ڕونکردنەوەی ماناکاندا بێتە دی.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿قَدْ أُوتِيتَ سُؤْلَكَ يَا مُوسَى﴾[٢].

چونکە ڕونکردنەوە و دەربڕین بەزمان کەرەستەی یەکەمە لە بانگەوازکردندا بۆلای خودای گەورە، خوای گەورە دەفەرموێت: :﴿ وَمَا أَرْسَلْنَا مِنْ رَسُولٍ إِلَّا بِلِسَانِ قَوْمِهِ لِيُبَيِّنَ لَهُمْ﴾[٣].

بەڵێ پێغەمبەران بە زمانی هۆز و تیرە و نەتەوەکانی خۆیان دەنێردران تاکو ڕاستییان بۆ ڕون بکەنەوە و بەڵگەیان بۆ بهێننەوە بە پاراوترین دەربڕین و جوانترین شێوازی قسەکردن، کە ئەوەش بەدی نایەت بە ئاخاوتنێکی ڕێکوپێك و سەرکەوتوو نەبێت.

بەڵام سەبارەت بە وتاربێژیی لە ڕێبازی پێغەمبەردا:

یەکێك لەو شتانەی کە بایەخدانی پێغەمبەر - درودی خوای لێبێت - نیشان دەدات بە پێشکەشکردنی وتارەکانی، دانانی بڵندگۆیە بۆوەی ڕۆژی هەینی لەسەری وتاربدات تاکو زیاتر کاریگەریی بکاتە سەر گوێگران و سودیان پێ بگەیەنێت، لە صەحیحی بوخاریدا لە بەشی وتارداندا لەسەر بڵندگۆ هاتووە، جابر دەگێڕێتەوە دەفەرموێت: " كان جذع يقوم إليه النبي – صلّى الله عليه وسلّم - فلمّا وضع له المنبر، سمعنا للجذع مثل أصوات العشار حتى نزل النّبي فوضع يده عليه" ، واتە قەدی درەختێك هەبوو پێغەمبەر کاتی وتاردان و ئاخاوتن بۆ موسوڵمانان لەسەری ڕادەوەستا ، کاتێك بڵندگۆی بۆ دانرا،

---

١ . القصص: ٣٤

٢ . طه:٣٦

٣ . سورة : ابراهيم: الآية ٤.

دەنگێکمان بیست لە قەدی درەختەکە وەک دەنگی وشتری ئاوس تاکو پێغەمبەر هاتە خوارێ و دەستی خستە سەری.

وەک چۆن لە فەرمودەکەدا گرنگی و بایەخی وتار لە ئیسلامدا دەرکەوت.

لە ئەبی عوسمانەوە دەگێڕێتەوە دەڵێت: دانیشتبووم لەژێر بڵندگۆکەی عومەردا کە وتاری بۆ خەڵکی دەدا، لە وتارەکەیدا فەرمووی: بیستم لە پێغەمبەری خوا – درودی خوای لێبێت – دەیفەرموو: مەترسیدارترین شت کەلێی بترسم بۆ ئۆمەتەکەم هەموو دووڕوەکی زمان لوس و زمان زانە[1].

کەواتە ترسی پێغەمبەری خودا – درودی خوای لێبێت – لە کەسی دوو ڕووی زمان زان و زمان لوس لەبەر هێزی کاریگەرییە خراپەکەی بووە لەسەر خەڵکی، لەبەر جوان ئاخاوتن و ڕازاندنەوەی وشەکانی و سەر لێتێکدانیان.

**وتاربێژی لەسەدەی نوێدا:**

وتاربێژی کەرەستەی زانایانی موسوڵمان و بانگخوارەکانیەتی، بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی دوژمنانی دین ئەو عەلمانی و دووڕووانەی کە بە باشی هونەری قسەکردن و چۆنیەتی گەیشتنە دڵی خەڵکیان دۆزیوەتەوە، ئەو فێڵبازە فریودەرانە وایان لێهاتووە لە هەمووشوێنێك قسە بۆ خەڵکی دەکەن لەڕێگای دەزگا جۆراوجۆرەکانی ڕاگەیانەوە، ئەوانە ئەو جۆرە کەسانەن کە پێغەمبەر ئاماژەی پێکردون لە فەرمودەکەی پێشودا: " مەترسیدارترین شت کەلێی بترسم لەسەر ئۆمەتەکەم هەموو دووڕوەکی زمان لوسە ".

ئەوەی سەیری حاڵی ئەمڕۆی موسوڵمانان بکات دەبینێت هەیانە دورکەوتۆتەوە لەدین و وایان لێهاتووە بایەخ بە باوەڕ و شەرع و یاسا و ڕێساکانی نادەن، هەربۆیە گەندەڵی و خراپەکاری لەناویاندا تەشەنەی کردووە لە هەموو ڕووەکانی ژیانەوە، لەبەر ئەوە جێی گرنگی پێدانە کە زانایان و بانگخوازانی ڕێگای خوا گرنگی وتاردانی باش و زانینی

---

[1] (أحمد) لە موسنەدەکەی دەری هێناوە.

بابەتەکانی بەباشی لەبەرچاو بگرن بۆ بوژاندنەوەی ئوممەت و گێڕانەوەی بۆ ئەو سەربەرزی و سەربڵندی و شکۆمەندی و پایەبەرزیەی کە هەیبوو لەناو گشت ئوممەتەکاندا.

وتاردان لەکاتی بانگەواز بۆلای خوادا ئەرکێکی پێویستە چونکە بانگەواز ئەرکە، بانگەوازیش لەڕێی وتارەوە دەگەیەنرێت، کەواتە ئەو شتەی کە ئەرکێك (واجب) بەبێ ئەو ئەنجام نادرێت خۆیشی دەبێتە ئەرك و واجب، لەبەر ئەوەی هەندێك لە پەرستشەکان بەستراون پێیەوە وەکو وتاری هەینی و بێجگە لەویش.

هەروەها وتاربێژیی بەلای بانگخوازەوە چەکێکە بەرگری پێدەکات لە بانگەوازەکەی، فێڵی فێڵبازان و نکوڵیکردنی نکۆڵی کاران و بێ بڕوایانی پێ پەرچ دەکاتەوە، کەرەستەیەکە بۆ داڕشتنی ڕێباوەڕ و بنەماکان و بەدەرخستن و بەرزکردنەوەی پایە و پێگەیان، وەك چۆن مۆکاری سەرکەوتنی ڕاستیە، هەندێك جار تاکە کەرەستە و میکانیزمی بانگخوازە بۆ دەرخستنی ڕاستی و خزمەتکردنی بیروباوەڕ و بنەماکانی.

کرۆکی فەرمان بەچاکە و ڕێگری لە خراپەیە بۆ پاراستنی جەستەی ئوممەت لە داڕزان و داخوران، وەك چۆن دیسان پێویستە بۆ وەدەرنانی هەوا و هەوەسی شەیتانەکان.

بەڵگەی بەرهەست لەسەر ئەوە ڕاوەستاوە کە ئەو ئوممەتەی وتاربێژە چاکسازەکان و سەرکردە هزریەکانیان تیادا بڵاوبۆتەوە زیندودەمێننەوە بە ئەندازەی کۆششی وتاربێژەکانیان و زۆری کاریگەرییان.

وتاربێژیی پێویستە بۆ ئامادەکردنی سوپاکان و هاندانیان بۆ کۆشش (جهاد) و بەرزکردنەوەی بەیداخی ڕاستی، خوای گەورە بە پێغەمبەری فەرمووە :﴿ يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ حَرِّضِ الْمُؤْمِنِينَ عَلَى الْقِتَالِ﴾[1].

وتاربێژیی پاشەکەوتێکی باش بووە کە سەرکردەکان پاراستوویانە تاکو سەربازەکانیانی پێ یارمەتی بدەن، ئامانجەکەیانی پێ ڕوون بکەنەوە، وەك چۆن پێویستە بۆ سیاسەتی گەل و نەتەوەکان، چون وەلی ئەمر و فەرمانڕەواکان گرنگی دەدەن بە

---

[1] . الأنفال: ٦٩.

پێشاندانی سیاسەتی خۆیان بە موسوڵمانان و ڕێگای فەرمانڕەوایەتیان، جەژن و وتارەکانی هەینی و بۆنە جیاوازەکانیان بەکارهێناوە بەتایبەتی لە بۆنەی حەج دا، وە هەروەهاش میکانیزمێکی گرنگە بۆ هێورکردنەوەی ئاژاوەکان و بڵاوکردنەوەی سۆز و خۆشەویستی.

وتاربێژیی لەڕوی بابەتەوە دەکرێت بەچەندین جۆرەوە، لەوانەش:

**١- وتاری ئامۆژگاری (ئاینی):**

لەم جۆرە وتارەدا وتاربێژ بەلای ڕونکردنەوەی بنەماکانی باوەڕی ئیسلامی و ڕونکردنەوەی ئەوەی ها لە پەیامی ئیسلامدا لە جوانی و بەختەوەریی و کەڵک و ئارامی و خۆشگوزەرانی دەڕوات بە مژدە و ترساندنیش، بە فەرمان بەچاکە و ڕێگری لە خراپە، لە هاوشێوەکانی: وتاری (هەینی، هەردوو جەژنەکە - نوێژەبارانە).

**٢-وتاری سیاسی:**

ئەم وتارە دەڕوات بەلای سەرنج خستنە سەر سیاسەتی دەوڵەت، وەك پەشخنامەیەك یان وەك ڕەخنەیەك یان ڕونکردنەوەی سیاسەت و ویستی حکومەت لەگشت لایەنە جیاوازەکاندا، لە نمونەی ئەم جۆرە وتارەش. وتاری سەرکردە پاڵێوراوەکان یان کاندیدکراوەکان، وتاری ئەندامانی ئەنجومەنی نوێنەران (پەرلەمان) و ڕاوێژ.

**٣-وتاری دادوەری: (یاسای بەرگری):**

ئەوەیە کەزۆربەی جار لە دادگاکان و دەرگا یاسایی و دادوەریەکاندا پێشکەش دەکرێت، یەکێك لە لایەنەکان یان جێگرەکانیان لە پارێزەر و نوێنەران بەکاری دێنن، وەکو: وتاری پارێزەران لە دادگاکاندا.

**٤-وتاری بۆنەکان:**

ئەو جۆرەیە کە لە ئاهەنگ و بۆنە گشتیەکاندا پێشکەش دەکرێت و بەلای ڕێزلێنان و بەخێرهاتن و پیرۆزبایی و پرسەنامە یان چارەسەری کێشەیەکی دیاریکراودا دەڕوات، وەکو: ئاهەنگەکانی ڕێزلێنانی قوتابیان، یاخود کردنەوەی پڕۆژەکان.

**٥- وتاری جەنگی:**

ئەو جۆرەیە کە لە گۆڕەپانەکانی جەنگدا دەدرێت و بەزۆریش سەرکردەی سوپاکان یان فەرماندەکان پێشکەشی دەکەن، کە حەزی شەڕکردن لای سەربازەکان و جوامێری و نەبەردی دروست دەکەن، ڕێزی شکۆی شەهیدەکانیان و باشەکانیان ڕون دەکەنەوە یان پرس و ڕایان پێدەکەن وەك دان نانێك بە ئارەزو و ڕاوبۆچونەکانی ئەوانیشدا.

**٦- وتاری کاتی هاوسەرگیری:**

ئەمە ڕێبازێکە لە پێغەمبەرەوە ماوەتەوە - درودی خوای لێبێت - بە (حمدلله) سوپاسکردنی خودا و درود ناردن بۆ پێغەمبەرەکەی دەست پێدەکات ، ئامۆژگاریی ئامادەبووانی تێدا دەکرێت پێش بەستنی گرێبەستی هاوسەرگیری (واتە پێش مارەکردن).



# بەشێك لە وتارەكانی حەجاجی كوڕی یوسفی سەقەفی

**١- وتارەكەی بۆ خەڵكی مەدینە:**

یەكەمین ویلایەتی حەجاج پاش كوشتنی (ئیبن زوبێر) بریتی بوو لە مەككەی پیرۆز ساڵی ٧٣ك، پاشان لە ساڵی ٧٤كۆچی دا عەبدولمەلیكی كوڕی مەڕوان فەرمانڕەوایەتی مەدینەی لە (طارق بن عمرو) سەندەوە و خستیە سەر فەرمانڕەوایەتی حەجاج.

(ابن كثیر) لە (البدایة والنهایة)دا دەفەرموێت:

دوای ئەوەی عەبدولمەلیك فەرمانڕەوایەتی مەدینەشی سپاردە حەجاج ئەویش هاتە ئەوێ و مانگێك تیایدا مایەوە، پاشان بۆ عەمرەكردن لەوێ چووە دەرەوە، پاشان گەڕایەوە بۆ مەدینە لە مانگی (صفر) دا، ئینجا سێ مانگ تیایدا مایەوە، لە (بەنی سەلەمە) دا بەردی بناغەی مزگەوتێكی دانا.

جا كاتێك گەیشتە مەدینە چووە سەر بڵندگۆی پێغەمبەری خودا و وتارێكی بۆ خەڵكەكە دا و وتی: ئەی خەڵكی (خبیثة) - واتە شوێنە پیسەكە لەجیاتی بڵێت (طیبة)[1] - پەنا بەخوا لە وتەكەی وتی: ئێوە خراپترین نەتەوە و سوكترینن، ئەگەر ئەمیری بڕواداران فەرمانی پێنەكردمایە بمنێرێت بۆلای ئێوە ئەوا وەك ناوسكی گوێدرێژم لێدەكرد، ئەی خەڵكی (خبیثة): منەت دەكەن ، ئایا خۆتان بەم دارە ڕەقە دەپارێزن - مەبەستی بڵندگۆكە بوو- .

پاشان هاتە خوارێ و ناردی بەدوای (سهل بن سعد الساعدی) دا و پێی ووت: چ شتێك نامێڵێت پشتیوانی لە ئەمیری بڕواداران - عوسمان- بكەیت؟

---

[1] - طیبة: یەكێكە لەناوەكانی مەدینەی پیرۆز.... كە مەبەستی لێی پاكی و پیرۆزی و ئارامیە.

ووتی: ڕەنگە کردبێتم.

ووتی: درۆت کرد.

پاشان فەرمانی کرد مۆری قوڕقوشمیان دا لە گەردنی.

هەربەوجۆرەشی کرد بە (جابری کوڕی عبدالله) و مۆری دا لە دەستی، هەروەها (ئەنەسی کوڕی مالیك) لە گەردنی، کە مەبەستیشی ئەوەبوو سوکایەتیان پێ بکات، خوا نابوتی بکات[١].

٢- وتارەکەی لە مەککە پاش کوشتنی ئیبن زوبێر:

کاتێك حەجاج عەبدوڵلای کوڕی زوبێری کوشت مەککە بە گریان هات لەرزین و هەژا، ئەویش چوویە سەر بڵندگۆ و ووتی: ئایا ئیبن زوبێر لە زانا چاکەکانی ئەم ئوممەتە نەبوو تاکو دڵی چووە بە خەلافەتدا و لەناویدا ململانێی کرد و وازی لە گوێڕایەڵیکردنی خوا هێنا و خۆی دا بەدەست حەرامکراوەکانی خواوە، گەر ڕێی شتێك لە سەرپێچیکاران بگیرایە، ئەوا ڕێی حەرامکراوەکەی بەهەشت لە ئادەم دەگیرا، چونکە خوای گەورە بەدەستی خۆی دروستی کرد و کڕنوشی بە هەموو فریشتەکان برد بۆی، بەهەشتەکەی خۆی بۆ ڕام کرد، جا کاتێك ئادەم سەرپێچی کرد خوا دەری کرد تیایدا بەمۆی هەڵەکەیەوە، گەرچی ئادەم لای خوا بەڕێزترە لە ئیبن زوبێر و شکۆی بەهەشتیش لای خوا گەورەترە لە کابە.

ئینجا حەجاج پاش کوشتنی ئەو سەرکەوتە سەر بڵندگۆ و بە ڕوداپۆشراوی، ئینجا ڕوپۆشەکەی لادا و ووتی: تاریکایی شەو ڕونبوویەوە و کۆتایی هات بە ڕوناکی ڕۆژەکەی و خۆرهەڵاتن، ئەی خەڵکی حیجاز چۆن بینیتانم، ئایا تاریکایی ستەمم بەتیشکی ڕاستی بۆ دەرنەخستن، بەخوا حەجاج نەرمە لە گەڵتان وەك نەرمی نواندنی بەسۆزێك و خاوەن بەزەیەك، گەیشتوەتە خزمایەتی لەگەڵتان، نەکەن دەست هەڵگرن لەو ڕێبازانەی کە ئێوەمان لەسەری داناوە ئیدی ئەوەی پێتان گەیشتووە لێتانی بگرینەوە و ببڕین بە تیژە بڕندەکە – شمشێر – .

---

١ . البداية والنهاية.

پاشان هاتە خوارێ و دەیگوت:

أخو الحرب ان عضت به الحرب عضها      وان شمرت عن ساقها الحرب شمرا

**٣-وتارەکەی کاتێك عێراقی گرتە دەست:**

(عبدالله بن عمير الليثي) دەگێڕێتەوە دەڵێت: کاتێك ئێمە لە مزگەوتی گەورەی کوفە بووین و خەڵکی کوفە لەو ڕۆژەدا لە بارێکی باشدا بوون، پیاوێك بەدەرکەوت بە (دە) یان (بیست) لە دەستوپێوەندەکانیەوە، ووتیان، ئەمە حەجاجە، وەك فەرماندەی عێراق نێردراوە بۆ ئێرە، کاتێك هاتە مزگەوتەکەوە سەری بە عەمامە یان مێزەرێك پێچابوو کە زۆربەی ڕوخساریشی پێ داپۆشیبوو، شمشێرێك بە لاقەدیەوە و کەوانێك بە شانیەوە بوو لەڕێکی بڵندگۆکە، خەڵکی بەرەو لای ئەو هەستانەوە هەتا چوویە سەر بڵندگۆ و ئینجا ساتێك بەبێ قسەکردن مایەوە.

خەڵکی هەندێکیان دەیان ووت: نابوت بێ بەبی ئومەییە کە نمونەی وەك ئەمە دەکاتە بەرپرسی سەرکاروباری عێراق، هەتا (عمير بن ضابئ البرجمي) گووتی: وردە بەردی ئێنەگرم بۆتان ، وتیان هێواش کە تاکو ببینین، جاکاتێك حەجاج سەیری چاوەکانی خەڵکی کرد کە سەیریان دەکرد ڕوپۆشەکەی لە دەمی کردەوە و هەستایەوە و ووتی:

أَنَا ابنُ جَلَا وطَلَّاعُ الثَّنَايَا ........ متَى أضَعِ العِمامَةَ تَعرِفُوني

پاشان گووتی : ئەی خەڵکی کوفە سوێند بەخوا من ڕوبەڕوی خراپ بەخراپ دەبمەوە، بە پێوانەی خۆی بەرەنگاری دەبمەوە و وەك خۆی جەزای دەدەمەوە، من چاوم، چاوە بەتەماع و ملە درێژەکان و سەرانێك نابینێت کە پێگەیبون و وەختی لێکردنەوەیان هاتووە و من خاوەنیانم، من ئەو خوێنانە دەبینم لە نێوان مێزەر و ڕیشەکاندایە.

پاشان ووتی:

هذَا أوَانُ الشَدِّ فَاشْتَدِّي زِيَمْ ..... قَدْ لَفَّهَا اللَّيْلُ بِسوَاقٍ حَطَمْ

ليس بِرَاعِي إِبِلٍ ولا غَنَم .......... ولا بِجَزَّارٍ على ظَهْرِ وَضَمْ

پاشان ووتی:

قَدْ لَفَّهَا اللَّيْلُ بِعَصْلَبِيٍّ ............ أَرْوَعَ خَرَّاجٍ مِنَ الدَّوِيِّ
مُهَاجِرٍ لَيسَ بِأَعْرَابِيٍّ

ئیجا گووتی:

قد شمرت عن ساقها فشدوا ... وجدت الحرب بكم فجدوا
والقوس فيها وتر عرد ... مثل ذراع البكر أو أشد
لابُدَّ مما ليس منه بد

بەخوا ئەی خەڵکی عێراق و کانزای شیقاق و نیفاق و خراپیی ئەخلاق (یان کانزای دوبەرەکی و دووڕوویی و ڕەوشت خراپی)، من وەك داری هەنجیر بەیەك ڕەشەبا و فشار ناچەمێمەوە و ناشکێم، بە هێرش و پەلاماردان نابەزێم و ناترسم، هەربۆیە لەبەر زیرەکی هەڵبژێردرام و هاتوم بۆلای ئێوە بۆ مەبەستێکی ئەوپەڕی گرنگ.

ئەمیری بڕواداران (عبدالملك) دەمی تیردانەکەی[1] کردەوە پاشان تیرەکانی تاقیکردەوە و منی دیتەوە وەك ڕەقترین دار و شکێنەرترین نوکیان[2]، هەربۆیە ناردمی بۆلای ئێوە چونکە بەردەوام کەوتوونەتە ئاژاوەوە و ڕێگای نادروستان گردۆتە بەر.

ئەمە و سوێند بەخوا وەك چیلکە دەتان تاشم، لێتان دەدەم وەك چۆن لەوشتر دەدرێت بۆ ئەوەی لە ناو دوریکەوێتەوە.

من بەڵێنم نەداوە بەجێم نەهێنابێت، شتێکم بڕیارنەداوە جێبەجێم نەکردبێت.

من ئەمێنم و ئەم کۆمەڵ کۆمەڵ و ووتی وتی و قسە وباس و چی دەڵێ و چی ناڵێ و چی دەکەی و ئەو شتانە؟

بەخوا یان دەچنە سەر ڕێی ڕاست یان هەر پیاوێك لەئێوە لەجەستەیدا شوێنەوارێك جێدەهێڵم.

---

١ . تورەکەی تیر.

٢ .لێرەدا مەبەستی ئەوەیە عبدالملك هەموو پیاوەکانی خۆی کۆدەکاتەوە کامەیان لەهەموویان توندوتیژتر و بوو بەرگەگر و ڕەقتر بوو لە مامەڵەکردندا ئەوەیانی هەڵبژارد بۆ فەرمانڕەوایەتیکردنی ئێوە چونکە ئێوە پێویستتان بەو جۆرە کەسانەیە بۆ ڕێککردنەوەتان.

بەڕاستی ئەمیری بڕواداران فەرمانی پێکردوم موچەکانتان بدەمێ و بتان نێرم بۆ شەڕی دوژمنەکەتان لەگەڵ (مهلب بن أبي صفره) دا، بۆیە سوێند دەخۆم بەخوا کە هەر پیاوێك ببینم پاش ئەوەی حەقی خۆی وەرگرت و موچەی خۆی وەرگرت لەدوای سێ ڕۆژی ترەوە ئەوا خوێنی دەڕێژم و ماڵەکەی دەخۆم و خانوەکەی دەڕوخێنم.

**٤- وتارێك کە گوێی لە (الله أكبر) کردن بوو لە بازاڕدا:**

کاتێك ڕۆژی سێیەم بوو گوێی لە تەکبیر (الله أكبر)ێك بوو لە بازاڕدا، هەربۆیە دەرچوو لە کۆشکەکەی و چووە سەر بڵندگۆ و ئینجا گوتی:

یاأهل العراق، وأهل الشقاق والنفاق، و مساوئ الاخلاق.......ئەی خەڵکی عێراق، ئەی ئەهلی دووبەرەکی و دوو ڕوویی و بەدخویی... ئەی کوڕی ژنە گێژەکان، کۆیلە و بەندەی دار و کوتەك...من تەکبیرێکم گوێ لێ بوو ئەو تەکبیرە نەبوو کە خودا دەیەوێت بە ئارەزومەندی، بەڵکو ئەو تەکبیرە بوو کە مەبەست لێی ترسە و شەیتان دەیەوێت،، بۆم دەرکەوت ئەوە چەرەدوکەڵێکە لەژێریا بۆنێکی تیژ و ناخۆش هەیە نمونەی من و ئێوە وەك ئەو وتەیەی (عمرو بن براق الهمزاني) دەڵێت:

| | |
|---|---|
| **وكنت إذا قوم غزوني غزوتهم** | **فهل أنا في ذا يا لهمدان ظالم** |
| **متى تجمع القلب الذكي وصارما** | **وأنفا حميا تجتنبــك المظالم** |

سوێند بەخوا دار بیدات بەدارا دنیا دەکەم بە دوێنێ ڕابردوو...- واتە وەك دوێنێ چۆن تێپەڕیوە و باس و خواسێکی نەماوە ئێوەش وا لێدەکەم باس و خواستان نەمێنێت- .

**٥- وتارەکەی کاتێك گەیشتە بەصرە**

کاتێکیش هات بۆ بەصرە وتارێکی بۆ خەڵکی بەصرە پێشکەشکرد و هەڕەشەی دەکرد و دەیترساندن و دەیگوت: ئەی خەڵکینە کێ بەنەخۆشیەکەیەوە دەتلێتەوە ئەوا دەرمانەکەی لای منە، کێش مردنی درێژەی کێشاوە ئەوا پێویستە من بۆی پێش بخەم، کێش سەری خۆی لاقورسە با ئەو بارە قورسەی لەسەر لابەم، چ کەسیش ڕابردووی

تەمەنی درێژ بووە ئەوەی ماوە بۆی کورت دەکەینەوە، بەڕاستی شەیتان تارمایی هەیە و سوڵتانیش شمشێر، هەرکەسیش شت شاردنەوەکەی نەخۆشی خستووە ئەوا سزادانی چاکی دەکاتەوە، هەرکەسیش تاوانەکانی خستویانە ئەوا لە قەنارەدانی هەڵی دەسێنێتەوە.

هەرکەسیش هەبوون و لەش ساغی دڵخۆشی نەکات ئەوا لەناوچوون و تیاچوونیش دڵتەنگی ناکات، هەرکەسیش دەمی پێش خۆی کەوتبێت ئەوا ڕژانی خوێنیشی پێش جەستەی دەکەوێت، من دەتانترسێنم و دواتر چاوەڕێ ناکەم، هۆشداری دەدەم و دواتر لەکەس خۆش نابم.

دوێنێ ئەو قامچیەی کە ئێوەی پێ زیر و تەمبێ دەکەم لێم کەوت و ئەمەم لەجێی دانا — ئاماژەی بۆ شمشێرەکەی کرد —

بەخوا فەرمان بەهەرکامتان بکەم لەدەرگایەک لەدەرگاکانی مزگەوتەوە بچێتە دەرێ و ئەو لەوی تریانەوە بچێت لەملی دەدەم.

**٦-وتارەکەی پاش شەڕی (دیرالجماجم):**

هەروەها پاش شەڕی (دیر الجماجم) وتارێکی بۆخەڵکی عێراق پێشکەشکرد و وتی: ئەی خەڵکی عێراق بەڕاستی شەیتان هاتە نێو هەناو و سکتانەوە و تێکەڵ بوو لەگەڵ گۆشت و خوێن و دەمار و گوێ و پەل و پۆ و پەڕی دڵتاندا پاشان چوویە مێشک و دەمارتانەوە، ئینجا چوویە سەرترو و هێلانەی دانا و هێلکەی کرد، هێلکە تروکا و بوویە بێچوو، پڕی کردن و ئاخنینی بە دووڕوویی و دوبەرەکی و خراپترین ناکۆکی، ئێوەش کردتانە ڕێبەرێك شوێنی کەوتن و ڕابەرێك گوێڕایەڵی بوون و فەرمانبەدەستێك پرس و ڕای پێ دەکەن".

جا ئیتر نە ئەزمونێك سودتان پێ دەگەیەنێت و نە ڕوداوێك دەبێتە پەند بۆتان و نە ئیسلامێك دەتانگرێتەوە لە تاوان و نە ڕونکردنەوەیەك سودتان پێ دەگەیەنێت؟

هەر ئێوە نەبوون کە لە ئەهواز هاوەڵم بوون، کەچی فێڵتان کرد و هەوڵی غەدرتان دا و کۆبوونەوە بۆ بێ بڕوایی و پێتان وابوو کە خوای گەورە دینەکەی و خەلافەتەکەی لەناو دەبات؟

من لای خۆمەوە سەرزەنشم کردن ئێوەش چوونە سەر کەلێ بەرز و بەخێرایی تێکشکان.

پاشان ڕۆژی (الزاویة).. جا چ ڕۆژێك بوو ڕۆژی (الزاویة) ؟ شکست و ناکۆکی و بەزین و بێ بەری بوونی خوا لەئێوە و پەشیمانی و وازهێنانی گەورەکەتان لەئێوە لەو ڕۆژەدا ڕوویدا، بەجۆرێك ئێوەش وێڵ بوون وەك وشتری سەرلێتێکچوو و داماڵراو لە پێستەکەی.

ئیتر ئەوکاتی کە شمشێر قەپی لێگرتن و تیر کونی کردن مرۆڤێکتان نەیدەپرسی لە براکەی، گەورە ئاوڕی بەلای ئەوەکانیدا نەدەدایەوە و دڵی بۆ نەدەسوتان.

پاشان ڕۆژی (دیرالجماجم) هاتە کایەوە، ئای چ ڕۆژێك بوو؟! لەو ڕۆژەدا شەڕ و شۆڕ و جەنگ بەرپابوو. لەو ڕۆژەدا:

**بضرب یزیل الهام عن مقیله          ویذهل الخلیل عن خلیله.**

بە لێدانێك سەرەکان لە گەردن جیادەکرانەوە... هاوڕێ لە هاوڕێکەی خۆی هەڵدەهات.

ئەی ئەهلی خراپەکاری دوای خراپە و ناپاکی لە دوای ناپاکی، بێ باری لەدوای بێ باری.

گەر قیت بوونەوە لە شوێنی خۆتان دەبنە داگیرکار و ناپاکی دەکەن، ئەگەر لە ئاشتی و بێوەییدا بوون ئاژاوە دەبێنەوە، ئەگەریش ترسان دووڕوویی دەکەن، نە باسی چاکەیەك دەکەن، نە سوپاسی نیعمەتێك دەکەن، هەر دەستبڕێك سوکایەتی پێکردبن یان فریودەرێك مێڵی لێکردبن یان ستەمکارێك پشتی نەگرتبن یان فێڵبازێك باوەشی بۆ نەگرتبنەوە ئێوە شوێنی ئەوە کەوتوون و پەناتان داوە و پشتیوانیتان لێکردووە و باوەشتان بۆکردۆتەوە !

ئەی خەڵکی عێراق هەر یاخیەك ئاژاوەی نابێتەوە یان هەر هاتوهاوارکەرێك هاوارێکی کردبێت یان هەر کەس بایەکی لە سکی خۆی دەرکردبێ ئێوە بوونەتە پشتیوان و شوێنکەوتووی.

ئەی خەڵکی عیراق ئایا لە پەندەکان پەند وەرناگرن، ئایا مردن ئاتان وەستێنێت، ئایا ڕوداوەکان ناتان ترسێنێت؟

پاشان ئاوڕی دایەوە بەلای خەڵکی شامدا و وتی:

ئەی خەڵکی شام ئێوە قەڵغان و پۆشاکن، ئێوە چەکن بۆ من

**٧-وتارێکی تری لەناو خەڵکی کوفە و خەڵکی شامدا:**

وتارێکی دا و ووتی: ئەی خەڵکی کوفە بەڕاستی ئاژاوە بە چپە چپ تۆو دەکرێت، بە سکالا دێتە بەر ، بەشمشێریش دەدورێتەوە، جا سوێند بەخوا گەر ڕقتان لێم بێتەوە زیانم پێناگەیەنن، گەریش خۆشتان ویستم کەڵکم پێناگەیەنن، من لە دوژمنایەتی ئێوە ناترسم و بێزار نابم وەك چۆن ناحەوێمەوە بە سۆز و خۆشەویستیتان، پێتان وابوو کە من جادوگەرم(ساحرم) خوای گەورەش فەرموویەتی :﴿ولايفلح الساحر﴾ . واتە جادوگەر سەرناکەوێت – کەچی من سەرکەوتم.

پێتان وابوو کە من زۆر زانم، کەواتە بۆچی شەڕ لەگەڵ کەسێك دەکەن کە ئەوەی ئەو دەیزانێت ئێوە نایزانن.

پاشان ئاوڕی دایەوە بەلای خەڵکی شامدا و ووتی: بۆ هاوسەرەکانتان بۆنخۆشتربن لە میسك، بۆ ئەوە و منالەکانتان دڵ نەرمتر لەبن لە کۆرپەی ساوا. ئێوە هیچ نین وەك ئەوە نەبێت کە شاعیر دەڵێ:

**إذا حاولت في أسد فجورا — فإني لست منك ولست مني**

واتە: گەر هەوڵتدا خراپەیەك لەگەڵ شێر بکەی.. ئەوا من لەتۆ نیم و تۆش لە من نیت.

ئەوان ئەو برینپێچەن کە ڕۆژی زامداربوون خۆم پێ ساڕێژکردەوە، ئەوان قەڵای پتەوی منن.

پاشان ووتی: ئێوە ئەی خەڵکی شام وەك خوای گەورە دەفەرموێت :﴿ وَلَقَدْ سَبَقَتْ كَلِمَتُنَا لِعِبَادِنَا الْمُرْسَلِينَ (١٧١) إِنَّهُمْ لَهُمُ الْمَنصُورُونَ (١٧٢) وَإِنَّ جُندَنَا لَهُمُ الْغَالِبُونَ (١٧٣)﴾، پاشان لەسەر بڵندگۆ هاتە خوارێ.

**٨-وتارەکەی بۆ خەڵکی بەصرە:**

جارێکیش لە بەصرە وتاری پێشکەش دەکرد و وتی: خوای گەورە دەفەرموێت :﴿ فَاتَّقُوا اللَّهَ مَا اسْتَطَعْتُمْ﴾ واتە لەخوا بترسن تا دەتوانن..جا ئەمەیان بۆخوایە و پاداشتی تیایە بۆتان، هەروەها دەفەرموێت ﴿ وَاسْمَعُوا وَأَطِيعُوا﴾ واتە گوێڕادێرن و گوێڕایەڵ بن...کە ئەمەشیان بۆ بەندەی خوا و خەلیفەی خوا و خۆشەویستی خوا (عبدالملك بن مراون)ە.

بەڵام بەخوا گەر فەرمان بکەم بە خەڵکی لە دەرگایەکەوە بڕۆن و بێن بەڵام ئەوان لەدەرگایەکی ترەوە هاتوچۆ بکەن ئەوا خوێنیان حەڵاڵ دەبێت بۆم... پاشان دەستی کرد بەقسە وتن بە (عبداللەی کوڕی مسعود – خوا لێی ڕازی بێت) وتی: عبداللەی کوڕی مەسعود سەرۆکی دووڕووەکانە، گەر دەستم پێی گەیشتبا زەویم تێراو دەکرد بەخوێنی ئەو.

هەروەها سولەیمانی کوڕی داود بە خوا دەڵێت.﴿ وَهَبْ لِي مُلْكًا لَا يَنْبَغِي لِأَحَدٍ مِنْ بَعْدِي﴾[1]:

دوای خوێندنەوەی ئایەتەکە گوتی: بەخوا سولەیمانیش حەسود بووە (نستغفرالله).

**٩-وتارێکی تری لە بەصرە:**

سوپاس و ستایشی خوای کرد و پاشان وتی: بەڕاستی خوای گەورە ڕۆزی و ئازوخەی دونیای بۆ تەواو کردوین و فەرمانمان پێدەکات بۆ دواڕۆژ هەوڵبدەین، جا خۆزیا ئازوخەی دواڕۆژی پێدابایین و فەرمانی کردبا بۆ دونیا هەوڵ بدەین.........– پەنا بەخوا لە قسەکەی ئەو – .

دەبینم زاناکانتان دەڕۆن و نەزانەکانتان فێرنابن و خراپەکارەکانتان تۆبە ناکەن.

دەتانبینم ئەوەی پێتان دراوە کۆڵی لێنادەن و هەر بەدوایدا ڕادەکەن و ئەوەشی فەرمانتان پێکراوە فەرامۆشتان کردووە.

---

[1] . ص:٣٥

زانست خەریکە هەڵبگیرێت، ڕۆیشتنی زاناکان هەڵی دەگرن، من شارەزاترم بە خراپەکارەکانتان زیاتر لە شارەزایی ناڵبەند لە ئەسپەکان، خراپەکارەکان ئەوانەن کە قورئان ناخوێننەوە و پشتی تێ دەکەن، نوێژ ناکەن لەکوڵ خۆکردنەوە نەبێت، دونیاش ڕاخراوە و ئامادەیە چاکەکار و خراپەکاریش لێی دەخوات.

بەڵام دوارۆژ داهاتویەکی دورە و پادشایەکی بەتوانا فەرمانڕەوایە تیایدا.

ئەمە و بزانن کە ئێوە لەلایەن خواوەلە ژێرچاودێریتان ، بزانن کە پێی دەگەنەوە تاکو سزای ئەوانە بدرێتەوە کە خراپەیان کرد و پاداشتی ئەوانەش بدرێتەوە کە باشەیان کرد، بزانن کە چاکە بەگشتی لە بەهەشتایە، خراپەش هەمووی بەگشتی لە دۆزخدایە، هەرکەس هێندەی تۆزێك چاکەی هەبێت دەیبیبنێتەوە و هەرکەسیش هێندە تۆزێك خراپەی هەبێت دەیبینێتەوە. خوا لەمن و ئێوەش خۆش بێت.

**١٠ – وتارەکەی لەناو خەڵکی عێراقدا کاتێك ڕقی خۆی بەرامبەریان ئاشکرادەکات:**

دەستی کرد بە وتاردان بۆ خەڵکی عێراق و ووتی: ئەی خەڵکی عێراق من هیچ دەرمانێکی دەردبڕترم بۆ دەردی ئێوە نەدۆزیەوە جگە لەم تورەبوون و چاوترساندنانە نەبێت، من نامەوێت خۆشحاڵیتان ببینم و حەوانەوەتان چاولێکەم، دەبینم و دەزانم ڕقتان لەقسەکانمە، دە بەخوا منیش زۆر زیاتر ڕقم لە بینینتانە، ئەگەر نەمویستایە فەرمانی ئەمیری بڕواداران جێبەجێ بکەم لەناوتان ئەوا خۆم نەدەخستە بەر هەڵسەنگاندنی ئێوە و ئارامگرتن لەسەر تەماشاکردنە ناحەزەکانی ئێوە.

داوا لەخوا دەکەم باشترین یارمەتیم بدات بۆ زاڵبون بەسەر ئێوەدا... پاشان هاتە خوارێ.

**١١– وتارێکی تری بۆ خەڵکی عێراق:**

وتی: ئەی خەڵکی عێراق پێم گەیشتووە کە ئێوە دەگێڕنەوە لە پێغەمبەرەکەتانەوە کە فەرمویەتی: هەرکەس گەردنی دە موسوڵمانی لەسەر بێت ڕۆژی دوایی دەهێنرێت بە دەست بەستراوی (دەستی لە ملیایەتی) تاکو دادپەروەریی دەستی دەکاتەوە یان زۆرداری زەبوونی دەکات، هەرچۆن بێت من پێم خۆشترە لەگەڵ ئەبوبەکر و عومەر

حەشر بکرێم بە دەستبەسراوی لەوەی کە لەگەڵ ئێوە حەشر بکرێم بە بەرەڵاکراوی!! — خوا بەپێی خۆی مامەڵەی لەگەڵ بکات —.

**١٢— وتارەکەی کاتێك عەبدولمەلیکی کوڕی مەروان مرد:**

کاتێك عەبدولمەلیکی کوڕی مەروان مرد هەستایەوە و سوپاس و ستایشی خوای کرد و پاشان وتی: ئەی خەڵکینە بەڕاستی خوای گەورە و دڵۆڤـان پێغەمبەرەکـەتانی لاوانـدەوە لای خۆیەوە (هەواڵی مەرگی پێغەمبەرەکەتانی ڕاگەیاند لای خۆیەوە) و فـەرمووی: ﴿إِنَّكَ مَيِّتٌ وَإِنَّهُم مَّيِّتُونَ﴾[١].

وە فەرموی: ﴿وَمَا مُحَمَّدٌ إِلاَّ رَسُولٌ قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِهِ الرُّسُلُ أَفَإِن مَّاتَ أَوْ قُتِلَ انقَلَبْتُمْ عَلَى أَعْقَابِكُمْ﴾[٢].

پێغەمبـەر کۆچـی دوایـی کـرد و خەلیفـە و جێنشینە ڕێـی ڕاستگرتووەکانیش مـردن لەوانیش ئەبوبەکر پاشان عومەر پاشان عوسمانی شـەهیدی سـتەملێکراو پاشـان بـەدوای ئەواندا معاویە و پاشان ئەو فەرمانڕەوا کارامە و دونیادیدەیەتان کە کاروبارەکانی بینی و ئەزموونەکان کردیانە دانا لەگەڵ شارەزایی لـەدین و خوێندنـەوەی قورئـان و لەسـەرخۆیی ئاشکراو ئەزموونیانی لەگەڵ ئەهلی ڕاستی و بەزەبری لەگـەڵ ئـەهلی خراپـە و سـەرپێچـی، بوویە چوارەمین جێنشینی ڕێ ڕاستگرتوو و ڕاشید.

هەربۆیە خوایش کەسانی وەك خۆی بـۆ هەڵبـژارد لـە عـەقڵ و ژیری و لەسـەرخۆیی و کۆڵنـەدەریی و هەسـتان بـە دڵسـۆزی بـۆ فـەرمانی خـودا و خەلافەتەکـەی ئـەو، کەواتـە گوێڕادێرن بۆی و گوێڕایەڵی بکەن.

ئەی خەڵکینە نەکەن سەرپێچی بکەن، چونکە سەرپێچـی تـەنها بـەرۆکی خاوەنەکـەی دەگرێتەوە، ئێوە ناوبـانگی منتـان بیسـتوە و منـیش دژایەتی و سەرپێچیەکانی ئێـوەم زانیوە، گەر بمزانیایە کەسێك بەهێزتر لەمن هەیە بۆ ئێوە یان لـەمن باشـتر بتـان ناسـێت

---

١ . الزمر: ٣٠.

٢ .آل عمران: ١٤٤.

من نەدەبوومە فەرمانڕەوای ئێوە، نەمن دەمێنم و نەئێوەش، جابۆیە هەرکەس قسەی کرد کوژراوە هەرکەسیش بێدەنگ بوو بەدەردی خۆیەوە لە مەراقا دەمرێت.

پاشان هاتە خوارێ.

**١٢ — وتارەکەی کاتێك ویستی بچێت بۆ حەج:**

حەجاج ویستی حەج بکات هەربۆیە محمدی کوڕی کردە جێگرەوەی خۆی بۆ سەر خەڵکی عێراق...پاشان وتارێکی دا و ووتی: ئەی خەڵکی عێراق ئەی خەڵکی شیقاق و نیفاق، من دەمەوێت حەج بکەم، کوڕەکەی خۆم (محمد)م کردە جێگرەوەی خۆم بۆ کاروباری ئێوە، ڕاسپاردووە لەناوتاندا بێت پێچەوانەی ئەوەی کە پێغەمبەری خودا پشتیوانەکانی پێ ڕاسپارد، کە ئامۆژگاری کردن چاکەکانیان پەسەند بکەن و خراپەکانیشیان تێپەڕێنن، من فەرمانم پێکردووە کە چاکەکانتان لێ وەرنەگرێت و لە خراپەکانیشتان خۆش نەبێت، ئێوە دوای من شتانێك دەڵێن کەناتوانن دەری بخەن، لەدوای من دەڵێن خوا چاکی بۆ نەکات، منیش پێش ئێوە دەکەوم لە وەڵامەکەیدا و دەڵێم خوا هەرگیز خەلافەت و فەرمانڕەوای کاری ئێوە چاك نەکات — واتە خوا هەمیشە فەرمانڕەوای خراپ بنێرێت بۆ ئێوە—.

**١٤— وتارەکەی کاتێك (محمد)ی کوڕی و (محمد)ی برای لە یەك ڕۆژدا مردن:**

دەڵێن کاتێك ئێوارەی ڕۆژی هەینی بوو محمدی کوڕی حەجاج مرد، کە گەیشتە شێوان نامەیەکی لە یەمەنەوە بۆ هات هەواڵی مەرگی محمدی براشیان پێدا، ئینجا خەڵکی عێراق دڵخۆش بوون و وتیان پشتی حەجاج شکا و لە پەلوپۆ کەوت، ئەویش هاتە دەر و چووییە سەر بڵندگۆ و ووتارێکی بۆ خەڵکی دا و وتی:

ئەی خەڵکینە دوو محمد لەیەك ڕۆژدا، بەس بەخوا حەزم نەدەکرد ئەوان لەگەڵم بن لە ژیانی دونیادا لەبەر ئەوەی خوازیاری پاداشتی دوارۆژ بووم بۆیان، بەخوا نزیك بۆتەوە ئەوەی ماوەتەوە لەمن و لەئێوەش لەناو بچێت، ئەوەشی تازەیە توشی بەڵا ببێت و تاقی بکرێتەوە، زیندوی من و ئێوەش بمرێت زەوی بمانسرێتەوە وەك چۆن لەخۆیەوە هاتین،

گۆشتەکانمان بخوات و خوێنەکانمان بخواتەوە وەك چۆن ئێمەش لەسەر پشتی ڕۆیشتین و لەبەروبومەکانیمان خوارد و ئاوەکەیمان خواردەوە.

پاشان ئەوە ڕوودەدات کە خوای گەورە دەفەرموێت:﴿ وَنُفِخَ فِي الصُّورِ فَإِذَا هُم مِّنَ الْأَجْدَاثِ إِلَى رَبِّهِمْ يَنسِلُونَ﴾[1].

پاشان بەم دێڕە هۆنراوەیەی نمونەی هێنایەوە:

**عزائي نبي الله من كل ميت وحسبي ثواب الله من كل هالك[2].**

**١٥- وتارەکەی کاتێك خەڵکی عێراق هەواڵی مردنیان بڵاوکردەوە:**

حەجاج نەخۆش کەوت و خەڵکی عێراق دڵخۆش بوون، خرۆشان بە مردنەکەی، جا کاتێك ئەوەی پێگەیشتەوە، بەرگەی گرت تا چوویە سەر بڵندگۆ و وتی:

بەڕاستی کۆمەڵێك لە خەڵکی عێراق ئەهلی دوبەرەکی و ونیفاق، شەیتان چووتە بنکڵێشەیانەوە و تۆوی خراپەی چاندووە لەنێوانیاندا و ووتویانە حەجاج مردووە

بەخوا بەوە دڵخۆش نابم نەمرم و دونیا و هەموو ئەوەی لەناویدا هەمبێت، نەشمبینیوە خودا ڕازی بێت بە نەمری و هێشتنەوەی هیچ کەس مەگەر بۆ سوکترین دروستکراوی خۆی کە (ئیبلیس)ە نەبێت: ﴿قَالَ أَنظِرْنِي إِلَى يَوْمِ يُبْعَثُونَ. قَالَ إِنَّكَ مِنَ الْمُنظَرِينَ﴾[3].

هەربۆیە بەندەی خودا (صالح) داوای لەخوا کرد و فەرمووی:﴿ قَالَ رَبِّ اغْفِرْ لِي وَهَبْ لِي مُلْكًا لا يَنْبَغِي لأَحَدٍ مِنْ بَعْدِي﴾[4].

خوای گەورەش ئەوەی پێدا بێجگە لە مانەوەی هەتا هەتایی (نەمری)، بەخوا من بەهەموو زیندویەکەوە لەئێوە وەك مردو وام، بەهەموو تەڕ و تازەیەکەوە وەك وشکبوو وام...... ئەوانەی کە ژێرن دەزانن چی دەڵێم.... پاشان هاتە خوارێ.

---

١. يس: ٥١.

[2]. واتە : دڵدەرەوەی من پێغەمبەری خوایە لە هەموو مردووییەکدا و پاداشتی خواشم بەسە بۆ هەر لەناوچوویەك.

[3]. الأعراف:١٤ - ١٥.

٤. ص: ٣٥.

**١٦- لە وتارە دینیەکانیشی (ئامۆژگاریەکانی):**

حەجاج ڕۆژێك وتاری دا و وتی: ئەی خەڵکینە لە پێناوی شتێکی کەم و کارێکی سنورداردا خۆتان شەکەت و ماندوکردووە بۆ بێجگە لەخۆتان، مردن لە گەردنتاندایە، ئاگریش لەبەردەمتان و بەهەشت لەپێشتان، لە نەفسی خۆتان بگرنەوە بۆخۆتان، لە دەوڵەمەندیتان بگرنەوە بۆ هەژاریتان، لەوەی کە لەدەستاندایە بگرنەوە بۆ ئەوەی کە لەبەردەستاندایە.

هەروەك ئەوەی کە لەدونیا ڕۆیشتووە هەر نەبوویێت، هەر دەڵێی ئەوانەی کە مردوون هیچ کات زیندوو نەبوون، هەرچی ئێوە دەیبینن ئەویش دەڕوات، ئەم خۆرە هی عاد و سەمود و خەڵکانی زۆر سەدەی ترە ئەم خۆرە لەسەر گەنجینە زۆر و زەبەندەکانیان و کۆشکە قایم و پتەوەکانیان هەڵدەهات، پاشان هەر ئەم خۆرە لەسەر گۆڕەکانیشیان هەڵهاتەوە، کوان پادشاکانی سەرەتای ڕۆژگار؟!، کوان زۆردارە خۆبەگەورەزانەکان کە خۆیان بەخوا دەزانی؟!، بەڕاستی پردی سیرات (صراط) چەقێنراوە و دۆزەخیش داگیرساوە و بڵێسەی دێ و خەڵکی بەهەشتیش لە باخەکانیدا شاد و دڵخۆشن، خوا ئێمە و ئێوەش بکات بەیەکێك لەوانەی کە یادی بەڵگە و ئایەتەکانی خوایان کردەوە و کەڕ و کوێر نەبوون.

حەسەنی بەصری بە ڕەحمەت بێ دەیفەرموو: ئایا سەرتان سوڕنامێنێت لەم تاوان کارە خراپەکارە کە دەچێتە سەر بڵندگۆ و بەقسەی پێغەمبەران قسە دەکات و کە دادەبەزێتەوە وەك زۆردارەکان دەکوژێ و دەبڕێ، بە وتەکانی لەگەڵ خوایە و بە کردارەکانیشی دژی خوایە.

مالیکی کوڕی دینار دەڵێت: زوو ڕۆیشتم بۆ وتاری هەینی ئینجا لەنزیك بڵندگۆکەوە دانیشتم، حەجاج چووە سەر و وتی: خوا لەو کەسە خۆش بێت...کەسێك کە سەیری تای تەرازووی خۆی دەکات، سەیری حیساب و کیتابی خۆی دەکات، مرۆڤێك کە کردارەکانی خۆی کێشانە و پێوانە دەکات، مرۆڤێك کە بیری کردۆتەوە لەوەی کە سبەینێ چی ئەنجامداوە لە دونیا لە نامەی کردەوەکانیدا دەیخوێنێتەوە و لە

تەرازووەکەیدا دەیبینێتەوە ، بۆ دڵی قەدەغەکارە و بەربەست دانەنێ و بۆ ویستەکانیشی فەرمانکارە، مرۆڤێك لغاوی کردەوەکەی دەکات وەك چۆن لغاوی وشترەکەی دەگرێت، ئەگەر بردی بەرەو لای گوێڕایەڵیکردنی خودا شوێنی دەکەوێت، ئەگەریش بردی بەرەو سەرپێچی خودا وازی لێدێنێت.

بەخوا ئێمە دروست نەکراوین بۆ لەناوچوون، بەڵکو دروستکراوین بۆ مانەوە و نەمری، وە تەنها لەماڵێکەوە دەیگوازینەوە بۆ ماڵێکی تر.

ڕۆژێکی تر وتاری دەدا و دەیگوت: هۆ خەڵکینە ئەم نەفسەتان جڵەوکەن، چونکە کە داتان بە دەمیەوە زۆرتر داوا دەکات، کە لێشت گرتەوە سەرپێچیت دەکات، بەرەحمەت بێ ئەو کەسەی کە دەرونی خۆی دەبەستێتەوە و جڵەوی دەکات، بۆئەوەی بیبات بەرەو گوێڕایەڵیکردنی خودا و دەیگرێتەوە لە سەرپێچیکردنی خودا، من وا دەزانم کە ئارامگرتن لەسەر قەدەغەکراوەکانی خودا ئاسانترە وەك ئارامگرتن لە سزای خوایی.

هەروەها دەیگوت:

خودایا تاوانم لا ناشیرین بکە تا لێی دوربکەومەوە ڕێی ڕاستم لا ڕاست بکە تا لەسەری برۆم، لاوازم مەکە لەبەرامبەر نەفسمدا گومڕا و سەرلێشێواو ببم و دوربکەومەوە، بەخوا حەزم لێی نیە ئەوەی کە ڕۆیشتووە لە دونیا بیگۆڕمەوە بە ئەم مێزەرەم، ئەوەشی کە ماوە وەك ئەوە بێت کە ڕۆیشتووە.

یەکێکی تر لە قسەکانی ئەوەبوو دەیگوت: مرۆڤێك کاتژمێرێك لە تەمەنی ڕۆیشتبێ و تیایدا یادی خوای نەکردبێت و داوای لێخۆشبوونی نەکردبێت لە تاوانەکانی و یادکردنەوە لەدوارۆژی شایستەیە کە خەم و پەژارەکەی درێژە بکێشێت و داخی چەند هێندە ببێت، بەڕاستی خودا چارەی دونیای بە لەناوچوون و کۆتایی پێهاتن نوسیوە و چارەی دوارۆژیش بە مانەوە، کەواتە نەمری و هەتاهەتایی بۆ شتێك نیە کە مۆڵەتی مانەوەی نەبێت و لەناوچون لەچارەی نوسرابێت، هەروەها لەناوچوونیش بۆ شتێك نیە نەمری و هەتا هەتاییبوون لەچارەی نوسرابێت، کەواتە با ئەوەی لەدونیا دەیبینن دوارۆژتان لەبیر

نەباتەوە، هیوادرێژ بن بۆ ئەو تەمەنە کورتەتان (مەبەستی ئەوەیە بیر لەوە بکەنەوە کە زوو دەمرن کەواتە زۆر کۆڵ بەدونیاوە هەڵمەگرن)[1].

بەڵێ حەجاج ئابەم جۆرە ڕەوانبێژ و زمان پاراو و وتاربێژێك بوو کە وتارەکانی ئاماژەبوون بۆ ئەو کەسێتیەی کە لە مێژودا پێی جیادەکرێتەوە وەك یەکێك لە سەرکردە بەزەبر و زۆر و بەهێزەکان، کە وتاربێژی لەو سەردەمەدا بەڵگەی هێز و هەیبەت بوو.

بەڕاستی حەجاج کاتێك دەردی گران بوو، کاری کرد بۆ ڕێکخستنەوەی کاروباری عێراق لەدوای خۆی بەوەی کە دەیپارێزێت لە شەڕ و ئاشوب و ئاژاوە و وەك بەشێك لە دەوڵەتی ئەمەوی دەیهێڵێتەوە ، تاکو کاتێك دڵنیابوویەوە ئینجا وەسیەتی خۆی نوسی تاکو ئەستۆی خۆی پاك بکاتەوە لەبەرامبەر دورستکارەکەی و خەلیفەکەشی کە بەرپرس بوو لەبەردەمیدا لە دونیادا هەتا کۆتا ساتی ژیانی و ئینجا نوسی و وتی:

بەناوی خوای بەخشندە و میهرەبان...ئەمە ئەوەیە کە حەجاجی کوڕی یوسف رایدەگەیەنێت: رایدەگەیەنێت کە شایەتی دەدات هیچ خوایەك نیە جگە لە (الله) ی تاك و بێ هاوتا، وە محمد بەندە و پێغەمبەری ئەو تاقە خوایە، رایدەگەیەنێت کە ئەو هیچ نازانێت بێجگە لە گوێڕایەڵیکردنی وەلیدی کوڕی عەبدولمەلیك، لەسەر ئەو گوێڕایەڵیە دەژی و دەمرێ و زیندودەبێتەوە....هتد...[2]

دەگێڕنەوە پێش مردنی پێیان ووت: ئایا تۆبە ناکەی؟

ئەویش وتی: ئەگەر خراپەکاریم ئێستا کاتی تۆبە نیە، ئەگەریش چاکەکارم بم ئێستا کاتی ترس نیە.

هەروەها هاتووە کە پاڕاوەتەوە و وتویەتی: خودایا لێم خۆشبە چونکە خەڵکی پێیان وایە تۆ ئەو کارە ناکەی[3].

***

---

1. سەیری (جمهرة خطب العرب) بکە.

٢ . سەیری (تهذیب تأریخ دمشق) بکە بەرگی ٤

٣ .(البدایة والنهایة) و (تأریخ دمشق).

(١١)

# ڕواڵەت و تایبەتمەندیە کەسێتی و سەرکردەیەتیەکانی حەجاج

- گرنگترین ڕواڵەت و تایبەتمەندیەکانی کەسێتی سەرکردە لای حەجاجی سەقەفی.
- جیاوازی نێوان سەرکردایەتی و بەڕێوەبردن.
- گرنگترین تیۆریاکانی بەڕێوەبردنی سەردەم.
- جۆرەکانی سەرکردە و دیاریکردنی جۆری سەرکردەیەتی حەجاجی سەقەفی.
- سایکۆلۆژیای سەرکردەی سەپێنەر (قەڵاچۆکار)و تایبەمەندیەکانی سەرکردەی سەرکەوتوو.
- ڕاسترەوی و سەرکردایەتی.
- میللەت... دروستکەری سەرکردەکەیانن.
- دانایی و سەرکردایەتی

## ڕواڵەت و تایبەتمەندیەکانی کەسێتی سەرکردە لای حەجاجی سەقەفی

گومانی تێدا نیە کە هەر کەسێتیەک لە ژیاندا ڕواڵەت و تایبەتمەندیگەلێکی تایبەت بەخۆی هەیە کە پێی جیادەکرێتەوە لەوانی تر، ئەمەش شتێکی زانراوە لە زانستی دەرونی شیکاریدا، بەڵکو بەڕاستی ڕوداوە مێژوییە جیهانی و ناوخۆییەکان دیسان کەسێتی سەرکردە دروست دەکەن، تەنانەت زۆر لە نەتەوەکان مێژو و چارەنوس و داهاتوی خۆیان بەستۆتەوە بە هەندێک لە کەسێتی و سەرکردەکانیانەوە و وەک پاڵەوان دایان ناون.

سەرکردایەتی بریتیە لەتوانای کاریگەریی تاک لە کۆمەڵێک خەڵک و ڕێنوێنی کردنیان لەپێناوی بەدەستهێنانی هاریکاریی ئەوان و هاندانیان بۆ کارکردن بە بەرزترین ئاست لەپێناوی بەدیهێنانی ئامانجە خوازراو و پێویستەکاندا.

هەروەها دەڵێن توانای سەرکردەیە لە کارتێکردنی ژێردەستەکانی بۆ کارکردن بە گوڕوتین و پەرۆشی و متمانەوە بۆ ڕاپەڕاندنی کارە پێ سپێردراوەکانیان، توانای کارتێکردنە لە هزر و بیری ئەوانی تر، لەبەر ئەمە پێویستە سەرکردە دەسەڵاتێکی جێبەجێکردنی هەبێت بتوانێت زاڵبێت بەسەر ئەوانەی هان لەژێر فەرمانیدا.

زانایان پێیان وایە کە جیاوازیەک هەیە لەنێوان سەرکردایەتی و بەڕێوەبردندا، بەجۆرێک هەندێک پێیان وایە کە بەڕێوەبەر سەرکردەشە و وای دادەنێن هەردوکیان ناون بۆ یەک کەس.

هۆکاری ئەم تێکەڵکردنەش کاتێك دێت کە بەڕێوەبەر و سەرکردەش هەرکامیان بە سەرکردایەتی و بەڕێوەبەرێتیەکەی تێ دەکۆشێت بۆ بەدیهێنانی ئامانجگەلێك، ئەگەرچی سەرکردە خۆی ئامانجەکان دادەنێت و فەرمان بە شوێنکەوتووەکانی دەکات جێبەجێی بکەن وەك چۆن دەیەوێت.

ڕاستی لۆژیکی ئەوەیە کە دەکرێت بوترێت هەمو سەرکردەیەك بەڕێوەبەریشە بەڵام هەموو بەڕێوەبەرێك سەرکردە نیە.

# گرنگترین تیۆریاکانی بەڕێوەبردنی سەردەم

بەڕێوبردن لە سەدەی بیستەمدا بوویە زانستێك کە یاسا و ڕێسای تایبەت بەخۆی هەبێت، هەر لەسەرەتای دروستبوونی مێژووەوە مرۆڤایەتی چالاکی بەڕێوبەردنی زانیوە و پێی ئاشنا بووە لە شارستانیەتە کۆنەکاندا، لەبەر ئەوەشە هەندێك لە چەمکە کارگێڕیە نوێیەکان ڕەگ و ڕیشەی مێژوییان دەگەڕێتەوە بۆ چاخ و شارستانیەتە کۆنەکان، تیۆریاکانی سەردەم لە سیەکانی سەدەی بیستەمدا دەرکەوتن، کە ئەوە کاریگەری کردە سەر پەرەپێدان و باشترکردنی ڕۆڵی سەرکردایەتی.

ئەم تیۆریایانە سەرنجیان خستۆتە سەر ڕۆڵی ڕەگەزی مرۆیی کە بە تەوەری کرداری کارگێڕی و بەڕێوەبردن دادەنرێت، وەك چۆن لێکۆڵینەوە نوێیەکان تەرکیزیان خستۆتە سەر کردەوەکانی سەرکردایەتی و پەیوەندیەکان و پاڵنەرەکان و کردەوەکانی بڕیاردان، وەك چۆن ئەم کۆڵینەوە و تیۆریایانە بوونەتە هۆی گۆڕانکاری لە چەمکی دەسەڵاتی کارگێڕیدا، بەجۆرێك سەرکەوتنی سەرۆکی کارگێڕی پێویستی بە توانا و بەهرەگەلێکی ڕوون هەیە بۆ بەڕێوەبردنی کارمەند و کارگوزاران و دروستکردنی پەیوەندیە مرۆییەکان لەگەڵیان.

**گرنگترین ڕێبازەکانی سەردەم سەبارەت بە بەڕێوەبردن**

١- ڕێبازی پەیوەندیە مرۆییەکان (human realation): ئەم ڕێبازە لە شیکردنەوەیدا بۆ بەڕێوەبردن پشت دەبەستێت بەوەی کە پەیوەندیی مرۆیی نێوان کارمەندان لە دەزگاکەدا بنەمایەکی پێویستە بۆ بەڕێوەبردن کە دەبێت تەرکیزی بخاتە

سەر و گرنگی بدات بە پڕکردنەوەی پێداویستیە دەرونی و کۆمەڵایەتیەکانی ئەندامان و کارمەندان لەوەی کە هانیان دەدا لەسەر پێشکەکردنی بەرهەمهێنانێکی بالاتر.

ئەم ڕێبازە جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە گرنگیدان بە پەیوەندیە مرۆییەکان لە بواری کارگێڕی و بەڕێوەبردندا بە یەکێك لە بنەما سەرەکیەکان دادەنرێت بۆ سەرکەوتنی سەرکردە کارگێڕیەکان.

لێرەوە پەیوەندیە مرۆییەکان پەیوەست کراون بە سەرکردایەتیە کارگێڕیەکانەوە و بووەتە یەکێك لە تایبەتمەندیە دیارەکانی کارگێڕی و بەڕێوەبردنی سەردەم.

٢- ڕێبازی ڕێکخستنی کۆمەڵایەتی (social organization theory): ئەم ڕێبازە پێی وایە کە ڕێکخستنی کارگێڕی ڕێکخستنێکی کۆمەڵایەتیە، بەجۆرێك پێك دێت لە کۆمەڵێك تاکی یەکگرتوو و پێکەوەبووی هاریکار، کە توانا مرۆیی و مادی و سروشتیەکان بەکاردێنن بۆ بەدیهێنانی ئامانجگەلێکی تایبەتی و کۆمەڵایەتی لەڕێی چالاکیەکی ڕێکخراوەوە، کە دەستەبەری ئامانجەکانی دەزگاکە و ئامانجەکانی کارمەندان تیایدا دەکات.

ئەم ڕێبازە وای دەبینێت کە کێشەی ڕێکخستنی کارگێڕیی خۆی لەوەدا حەشارداوە چۆن ئەو تاکە جیاوازانە لە تواناکانیاندا وا لێبکرێت کە هاریکاری یەکتر بکەن لە چالاکیەکی هاوبەشدا بۆ بەدیهێنانی ئامانجەکانی ڕێکخراو و دەزگاکە و بەدیهێنانی ڕەزامەندی ئەوانیش لەهەمان کاتدا، بەڕاستی چارەسەرکردنی ئەم مەسەلەیە بەستراوەتەوە بە سەرکردە کارگێڕیەکەیانەوە.

لێرەوە گرنگ و بایەخی ڕۆڵی سەرکردە و ئاستەنگەکانی بەردەمی ڕون دەبێتەوە لە بەڕێوەبردن دا، شیکارانی ئەم ڕێبازە تەرکیز دەکەنە سەر بەکارهێنانی شێوە ڕێگایەکی سەرکردەیی کە پشت دەبەستێت بە دروستکردنی هەستکردن بە دڵنیایی و ئاسودەیی لەکارەکەدا لای تاکی کارکەر و پێدانی بوار بۆ زیادکردن و پەرەدان بەتواناکانی لە کاردا، وەك چۆن بێگومان دەبێت کە بەڕێوەبەر وەك بوونەوەرێکی مرۆیی تەماشای (کارمەندان)ی بکات نەك وەك زنجیری ناو مەکینەیەك، بەجۆرێك کارمەندیش وەك

هاوڕێیەکی هاریکار و بەسۆز و کۆڵنەدەر بۆ بەڕێوەبەرەکەی بڕوانێت، وەك چۆن ئەم ڕێبازە جەخت لەسەر داپەروەریی بەڕێوەبەری سەرکردە دەکاتەوە لە مامەڵەکردنی لەگەڵ کارمەنداتی و متمانە پێبوونیان.

٣-ڕێبازی هاوسەنگیی دامەزراوەیی (organization equilibrium theory):

ئەم ڕێبازە پادەوەستێتە سەر بەشداری ئەندامانی دامەزراوە کارگێڕییەکە لە بڕیارداندا، پێویستە دەزگا کارگێڕیەکە کاریکات لەسەر نۆرینەوەی هاندەرە پێویستەکان بۆ دروستکردنی هاریکاری و بەشداریی پێویست لەلایەن تاکەکانەوە.

کە پاوەستاوە لەسەر ئەو بەشداریانەی کە تاك پێشکەشی دەکات لە دەزگاکە و ئەو هاندەرانەی کە بەدەستی دێنێت، ئەوەش چونکە تاك بەردەوام دەبێت لە پێشکەشکردنی خزمەتەکانی بۆ دەزگاکە بەدرێژایی ئەو هاندەر و پاڵنەرانەی پێشکەشی دەکرێن، یەکسان بێت یاخود زیاتر بێت لە نرخی ئەو بەشداری و کارانەی پێشکەشی دەکات.

دەشێ جیاوازی نێوان بەڕێوەبردن و سەرکردایەتی بکەین لەم خاڵانەدا:

١- بەڕێوەبردن گرنگی بە سیاسەت و چالاکی و ڕێکخستن دەدات لەکاتێکدا سەرۆکایەتی گرنگی بە پەیوەندیە تایبەتەکانی نێوان سەرۆك و کارمەندانی دەدات.

٢-بەڕێوەبردن تایبەتە بە لایەنە هونەریەکانەوە و سەرکردایەتیش تایبەتە بە لایەنە مرۆییەکانەوە.

٣-بەڕێوبردن ئاماژە دەکات بە کرداری ئاڕاستەکردنی کەسەکان و بەکارهێنانی ئەو توانستانەی لەبەردەستن بۆ ڕاپەڕاندنی ئامانجەکانی ڕێکخراو و دەزگاکە لەکاتێکدایە کە سەرکردایەتی کورت دەکرێتەوە لەسەر کردەوەی ئاڕاستەکردنی خەڵکی لەڕێی چەند میکانیزمێکی دیاریکراوە بۆ بەدیهێنانی ئەم ئامانجانە.

٤-بەڕێوبەر ئەو کەسەیە کە سەرقاڵی بنکەیەکی نێو بنکەکانی بەرپرسیاریەتیە لە دەزگاکەدا، تێدەکۆشێت بۆ بەدیهێنانی ئامانجەکان لەڕێگای کارمەند و بەردەستەکانیەوە.

بەلام سەرکردە ئەو کەسەیە کە سەرقاڵە یان سەرقاڵ نیە بە بنکەیەك لە بنکەکانی بەرپرسیارێتیەوە، بەلام توانای هەیە لەوەی کار لە ئاکار و رەفتاری ئەوانی تر بکات و بیانبات بەرەو ئامانجە هاوبەشەکان.

٥- بەڕێوبردن بریتیە لە دەستنیشانکردنی ئامانجەکان و سیاسەتە بالاکان، بەلام سەرکردایەتی بریتیە لە سەرپەرشتیکردنی ئەوانەی کە هەڵدەستن بە بەدیهێنانی ئەم ئامانج و سیاسەتانە.

٦- بەڕێوبەر لەکارەکەیدا پشت دەبەستێت بە زانست و پلان و چالاکی و لێپرسینەوەکان و دیاریکردنی ئامانج و کێشانی ئەو سیاسەتانەی کە کارمەندان لەسەری دەڕۆن.

بەلام سەرکردە لەکارەکەیدا پشت دەبەستێت بە توانای کارتێکردن لە بەردەستەکانی و هاندانیان بۆ هەستان بەکارەکانیان بەڕەزامەندیەوە، بەجۆرێك فەرمانەکانی جێبەجێ بکەن بە بێ دوودڵی.

٧- بەڕێوبەر دەسەلاتەکانی لە برگەنامە و یاساکانی دەزگاکەوە وەردەگرێت بۆ کارکردن، بەلام سەرکردە لە هێزی کارکردنی لە بەردەستەکانی، بۆیە پشت دەبەستێت بە هێزی کەسێتی و قایلکردنیان و خۆشەویستی ئەوان بۆی.

٨- سەرکردایەتی هەڵقوڵاوی ناخی کۆمەڵەکەیە، ئەندامەکانی هەست دەکەن پێویستیان پێیەتی، بەلام بەڕێوبردن دەسەلاتەکانی لە دەرەوەی کۆمەڵەکە وەردەگرێت چونکە بەڕێگەی دامەزراندن دەکرێتە بەڕێوبەر.

٩- هەست و سۆزی ئەوتۆ نیە لەنێوان بەڕێوبەر و بەردەستەکانیدا لە چوارچێوە کارگێڕیەکەدا بەجۆرێك بەردەستەکان کارەکانیان ئەنجام دەدەن لەژێر شمشێری برگەنامە و یاسا دانراوەکاندا و ناتوانن سەرپێچی بکەن لەترسی سزادان.

بەلام لە چوارچێوەی سەرکردایەتیدا سەرکردە و بەردەستەکانی هەست و سۆزی خۆشەویستی و پەرۆشی دەگۆڕنەوە لەنێوان یەکتردا و کارەکانیشیان رادەپەڕێنن بەبێ ترس لە سزادان بەڵکو بە بڕوا و ڕەزامەندیەوە.

١٠- بەڕێوبەر گرنگی دەدات بە بەدیهێنانی بەرژەوەندیەکانی دامەزراوەکە بەبێ ڕوانین بۆ بەرژەوەندیی تایبەتی بەردەستەکانی بەجۆرێك فەرمانیان پێدەکات بەپێی ئارەزو و خواستی کەسێتی خۆی، بەڵام سەرکردە تێناکۆشێت بۆ بەدیهێنانی ئارەزوە تایبەتەکانی خۆی یان کۆنترۆڵکردنی بەرژەوەندیەکانیان بەڵکو هانیان دەدا لەسەر بەدیهێنانی ئامانجە هاوبەشەکانیان وەك چۆن سەرکردە پابەندە بە بەها و پێوەرە مرۆییەکانەوە لە مامەڵەکردنی لەگەڵیان.

١١- لە بازنەی سەرکردایەتیدا بەردەستەکان بەشدارن لەگەڵ سەرکردە لە دروستکردنی بڕیاردا، بەڵام بەڕێوبەر بەردەستەکانی بەشدارناکات و فەرمانەکانی بەبێ دەسەڵات پێدان و سەرپشککردنی ئەوان دەردەکات، ئەو متمانەی بە بەردەستەکانی نیە و هەمیشە گومانی هەیە لێیان.

١٢- لە سەرکردایەتیدا بەردەستەکان هەست بە گرنگی خۆیان دەکەن بۆ سەرکەوتنی کارەکە و سەرەنجامیش بەدیهێنانی ئامانجەکان، بەڵام لەشێوازی کارگێڕیدا بەڕێوبەر گوێ بە بەردەستەکان نادات بەشێوەیەکی ئەوتۆ.

١٣- لە شێوازی سەرکردایەتیدا سەرکردە گرنگی دەدات بە بەدیهێنانی ئامانجەکە و کارمەندانیش وەکو یەك، بەڵام لە شێوازی کارگێڕیدا بەڕێوبەر بەدیهێنانی ئامانجەکانی کارەکەی لا گرنگە گەرچی لەسەر وێری ئامانجەکانی کارمەندانیش بێت کە بە ئامانجگەلی لاوەکی دادەنرێت بەلایانەوە.

١٤- لە شێوازی سەرکردایەتیدا بەردەستەکان قایلن و بڕوایان بەو شێوازە هەیە کە سەرکردە دەیگرێتە بەر، بەڵام لە شێوازی کارگێڕیدا ڕەنگە بەردەستەکان ڕازی نەبن لە شێوازی بەڕێوبردنی بەڕێوەبەرەکە، بەڵکو تەنها فەرمانەکانی جێ بەجێ دەکەن لەترسی دەسەڵاتەکانی.

***

# کۆبوونەوەی سەرکردە و بەڕێوەبەر لە یەک کەسدا

ئەمە ئەوەیە کە بەسەر کەسێتی حەجاج دا جێ بەجێ بوو کاتێک بەڕێوبردن و سەرکردایەتی یەکانگیر بوون بۆی لە ناوچەی ڕۆژهەلأت، چاکاتێک سەرکردایەتی و بەڕێوەبردن لەیەک کەسدا یەکدەگرن، واتە بەڕێوەبەر ئەو دەسەلأتە پیشەییەی کە هەیەتی جێبەجێی بکات بە پشت بەستن بە هێزی کارتێکردنی لە کۆمەڵ و هاندان و قایلکردنیان بۆ بەدیهێنانی ئامانجەکان و وازهێنان لە دەسەلأتە فەرمیەکە، ئینجا پشت بەستن بەو گوێڕایەڵیەی کە لەو کۆمەڵەوە سەرچاوە دەگرێت کە بەڕێوەیان دەبات. ئەوە بەو کارە دەبێتە بەڕێوەبەرێکی سەرکردە، بەجۆرێك لە بەدیهێنانی ئامانجی دامەزراوەکە فاکتەرێکی هاوبەش دروست دەکات بۆ هەموویان بەگشتی، لێرەدا دەکرێت ناوی لێ بنێین بەڕێوەبەری سەرکردە، یان بە بەڕێوبردنەکە بڵێین (سەرکردایەتی بەڕێوبردن)، چون ئەو بەڕێوبەرێکی جێبەجێکار نیە بەڵکو سەرکردەیەکە، ئەگەرچی پێڕەوی کەسێکیش بکات لە سەرکردایەتیەکەیدا، کەسێك بەرزتر لەخۆی کە خەلیفەی ئەمەویە.

سەرکردەی سەرکەوتوو ناوزەد دەکرێت بەوەی کەکاردەکات بۆ چاککردن و باشکردنی توانای بەرچاوڕونی و چاوکراوەیی لەبەرامبەر باروودۆخ و حاڵی ئەو تاکانەی کە لەگەڵیان کاردەکات.

**گرنگترین سیفاتەکانی سەرکردەی سەرکەوتوو:**

- سەرکردە ئاستێکی زیرەکیی بەرزتری هەیە لە ئاستی زیرەکی شوێنکەوتووەکانی.

– سەرکردە فراوانتر و ڕۆشنتر و دووربینتر و ڕاستر بیردەکاتەوە لە شوێنکەوتووەکانی.

– سەرکردە زمانی پاراوتر و دەربڕینی جوانتری لایە و توانای هەیە بۆ دروستکردنی پەیوەندی کارا لەگەڵ ئەوانی تردا.

– سەرکردە هاوسەنگی هەیە لەڕوی سۆزەوە و پێگەیشتووە لەڕوی عەقڵەوە و شیکردنەوەی لۆژیکی هەیە.

– سەرکردە خواست و مێزی کەسێتی هەیە بۆ گرتنە دەستی جڵەوی سەرکردایەتیکردنی ئەوانی تر.



## گرنگترین تیۆریاکانی سەرکردایەتی و پێوانەکردنیان لەسەر کەسێتی حەجاجی سەرکردە

**دوو بیردۆزەکەی سەرکردایەتی:**

١- بیردۆزی سەرکردایەتی بۆماوەیی.

٢- بیردۆز و ڕێبازی سەرکرایەتی بەدەستهاتوو.

**١- بیردۆزی سەرکردایەتی بۆماوەیی.**

بیردۆزی سەرکردایەتی بۆماوەئاسا پەیوەندیەکی پتەوی هەیە بە بیردۆز یان ڕێبازی (پیاوی گەورە)وە، کە ڕاوەستاوە لەسەر بنەمای ئەوەی هەندێك سەرکردە لەدایك دەبن و هەڵگری سیفاتە بۆماوەییەکانی سەرکردەن، نەك سیفاتە بەدەستهاتووەکان، بەمانای ئەوەی کە کەسانێك هەن لەدایك دەبن بۆئەوەی ببنە سەرکردە، لەکاتێکدا ڕێبازی سەرکردایەتی بەدەستهاتوو پێی وایە کە زۆرێك لە سیفاتە سەرکردەییەکان دەکرێت بەدەستبهێنرێن – لەپاڵ بۆماوەدا – لەڕێگەی فێربوون و مەشق و ڕاهێنانەوە لەسەر ڕووبەڕووبوونەوەی ئاستەنگەکان و مامەڵەکردن لەگەڵ کێشەکان و سود وەرگرتن لە ئەزموونە کردەییەکانی ژیان، ئەوەش لە بواری سەرکردایەتیکردنی کاروبارەکانی مرۆڤەوە.

دەشێت ئەم بیردۆزە بپێورێت بەباڵای کەسێتی سەرکردەیی حەجاج دا بەجۆرێك خانەوادەکەی و هۆز و تیرەکەی ڕۆڵێکی گرنگیان بینی لە دروستکردنی کەسێتی سەرکردەیی ئەودا، بەجۆرێك ئەو سەرکردە بوو بە بۆماوە.

ئەم بیردۆزە بریتیە لەوەی کە ڕەفتاری تاك دیاریکراوە بە سیفات و تایبەتمەندیە بۆماوەییەکان، واتا دەڵێت توانای سەرکردایەتیکردن چ نیە بێجگە لە سیفەتێك لە کەسەکەدا بوونی هەیە هەر لە لەدایکبوونیەوە لە سەرەنجامی کارلێککردنی کۆمەڵێك هۆکاری بۆماوەیی دیاریکراو.

گرنگترین ئەو سیفاتە بۆماوەییانەی کە بە پێکهاتەی کەسێتی سەرکردەی سەرکەوتوو دادەنرێت ئەم تایبەتمەندیانە دەگرێتەوە وەك: کۆڵنەدان و بوێری و هێزی وەرەبەرزی ، خواست و خۆگونجان و لەسەرخۆیی و پشت بەخۆ بەستن و متمانە بەخۆبوون و هێزی تیژبیری و زیرەکی، ئازایەتی، لە ئەستۆگرتنی بەرپرسیارێتی و نیگاداری و داهێنان و دەستپێشخەری و ڕەوشت بەرزی و مامەڵە باشی...و بێجگە لەوانەش ، زۆربەی ئەو سیفاتانە لە حەجاجی کوڕی یوسفدا هەبوون.

بەپێی بیردۆزی سەرکردایەتی بۆماوەیی، سەرکردە لەدایك دەبێت و دروست ناکرێت، بەمانای ئەوەی کە کەسانێك هەن لەدایك دەبن بۆئەوەیە سەرکردە بن، کەسانێکیش هەن لەدایك دەبن بۆئەوەی شوێنکەوتە بن، کەواتە حەجاج بە بۆماوە سەرکردە بوو.

کەواتە توانای سەرکردایەتی – بەپێی ئەم بیردۆزە – بریتیە لە سیفەتێکی بۆماوەیی کە لەگەڵ تاك دروست دەبێت وەك سیفاتەکانی تری ڕەگەزی و پێکهاتەی جەستەیی و ڕەنگ، ئەمەش مانای وانیە کە سەرکردە یان پێشەوا یان پاشا پێویستە کوڕەکەی وەك خۆی بێت، بەڵکو ئەو تاکەی کە کۆمەڵێك لەو سیفاتانەی هەیە ناوبراو ئامادەیە بۆئەوەی ببێتە سەرکردەیەکی سەرکەوتوو، بەجۆرێك ئەم سیفاتانە ڕیشەی داکوتاوی تایبەت بە خۆیان هەیە و ناکرێت بەدەستبهێنرێن لەڕێگەی فێرکردن و ڕاهێنانەوە.

**٢– بیردۆزی سەرکرایەتی بەدەستهاتوو:**

بریتیە لە بیردۆزێك کە پشت دەبەستێت بە دروستکردنی سەرکردە لەمیانەی بەدەستهێنانی ئەزموون و شارەزاییەوە لەڕێی ئەو کارەوە کە پێی هەڵدەستێ، بەمەش لەمیانەی ئەو شارەزایی و ئەزموونانەوە کەسێتی سەرکردە دروست دەبێت، بەڵام پێویستە تایبەتمەندیەکانی سەرکردە لەو کەسێتیەدا بوونی هەبێت.

هەروەها ئەو سەرکردایەتیەی کە تەرکیز لە سەر کارکردن دەکات بریتیە لە بنەمای ئەم بیرۆدە.

وەك سەرەنجامێك بۆ ئەم تێڕوانینە لە ڕەفتاری مرۆیی، سەرکردایەتی چڕبووەتەوە لەدەوری کار، هەروەها ڕۆڵی سەرکردە سنووردار بووە بە گریمانە پەیوەنددارەکان بە ڕەفتاری مرۆڤەوە.

لەبەرئەوەی ئەم بیردۆزە وای دادەنێت کە مرۆڤ بە سروشتی خۆی تەمبەڵە، چەندین هەڵە دەکات بەشێوەیەکی سروشتی لەکاتی کارکردندا، کەواتە گومانی تێدا نیە کە دەبێت چاودێری بکرێت و ڕاستبکرێتەوە بۆ پارێزگاریکردن بە مانەوەی دامەزراوەکە و سەرکەوتنیەوە.

بزوتنەوەی زانستی پێشنیاردەکا کە ڕاستکردنەوەی دۆخەکە تەنها بەیەکێك لەم دوو ڕێگایە بکرێت:

- بەهێزکردنی پەیکەری ڕێکخراوەیی دامەزراوەکە لەمیانەی دانانی بنەما کارگێڕیەکان و لێپرسینەوەکان و ئەو پێوەرانەی کە دەبێتە هۆی ڕێگرتن لە هەڵەکان، کارمەندان ناچاربکات ڕێز لە دەزگا و یاساکانی بگرن، بەستنەوەی کارمەند بە پیشەکەیەوە و هەروەها بەدەستهێنانی بەخشش و هاندەرەکان بەئەندازەی ملکەچبوونی بۆ سیاسەتەکانی دامەزراوەکە.

- باشکردنی ڕێگاکانی کارکردن لەمیانەی دانانی ئەو ئەرکە کارگێڕیانەی خراوەتە ئەستۆی ئاستەکانی چینی کارکەر، بەجۆرێك پێوەری ورد دابنرێت بۆ ڕێگری کردن لە هەڵەکان و هۆی باشکردنی چەندێتی بەرهەم.

بەپێی ئەم بیدۆزەبێت سەرکردە دەبێتە ژێردەستەی دامەزراوە و پارێزەری بەرژەوەندیەکانی، بەمانای ئەوەی کە ڕۆڵی سەرکردە لەوەدا خۆی دەبینێتەوە کاریکات بۆ بەدیهێنانی ئامانجەکانی دامەزراوەکە بەبێ گوێدان بە ئامانج و هەستی تاکەکانی کارکەر تیایدا.

بەڕێوەبەرایەتی کاتێك ئەم شێوازە لەسەرکردایەتی جێبەجێ دەکات و پێڕەودەکات کە گرنگیدان بە ڕێگاکانی کارکردن زاڵدەکات بەسەر گرنگیدان بە ڕەگەزە مرۆییەکەدا.

ئەو ڕێبازەی کە تەرکیز دەخاتە سەر کارکردن جەخت لەسەر گرنگی بەشداری تاك و گەشەپێدانی توانا شاراوەکانی دەکاتەوە لەبری تەرکیزخستنە سەر دامەزراوەکە لەنا پەیکەرە ڕێکخراوەییەکەی و ڕێگاکانی کارکردنیدا.

ئەم بیردۆزە جەخت دەکاتەوە لەسەر ئەوەی کە مرۆڤ تێدەکۆشێت بۆ پڕکردنەوە و تێرکردنی پێداویستی و خواستە دەرونیە بنەڕەتیەکانی کە دەشێ تێریان بکات لەمیانەی چوارچێوەی گشتی دامەزراوەکەوە.

لەبەر ئەمە مرۆڤ پێویستی بەوەیە ئەوانی تر بوونی بەگرنگ بزانن و ڕێزی لێ بگرن، دەرفەتی پێ بدەن بۆ گەشەپێدانی تواناکانی.

ئەمەش گرنگترین ئەو بیرۆدۆزانە بوون کە زانایان باسیان کردووە لەبارەی سەرکردایەتیکردنەوە، دەشێ بیردۆزی سەرکردایەتی بۆماوەیی بەسەر حەجاج دا بپێوین، چونکە ئەو سیفاتەی لە باوکی و تیرەکەی (سەقیف) وە بۆمایەوە کە زۆرێك لە کەسە زیرەك و گەورەکانی عەرەبی لێوە دەرچوون وەك (عروە کوڕی مەسعودی سەقەفی) کە باپیری بوو لە دایکیەوە، هەروەها (مغیرەی کوڕی شعبە) و زۆر کەسی سەرکردەی تریش بێجگە لەوان کە لە سەقیف بەدەرکەوتن.

کەسێتی حەجاج و باوکیشی هەر لە سەرەتاوە و بەخۆڕسك گەشەی کرد لەسەر سەرکردایەتی خۆڕسك بەجۆرێك وەك بەپیشەی مامۆستا کاریان دەکرد و لاوەکانیان فێری ئەسپ سواری و شمشێربازی دەکرد، باوکی حەجاج لە گەورە و خانەدانەکانی سەقیف بوو، بەڵکو سەقیف خۆیشی وەکو تیرەیەك کێبەرکێی لەگەڵ قوڕەیش دەکرد لە سەرکردایەتیکردندا؛ کە دوای ئازادکردنی مەککە هاتە نێو ئیسلامەوە.

باوکی حەجاج یەکێك بوو لەوانەی کە بەشداربوون لەگەڵ مەروانی کوڕی حەکەم دا بۆ گێڕانەوەی فەرمانڕەوایەتی بەنی ئومەییە و ڕۆژی شەڕەکەی (الربذة) کە لەدەوروبەری مەدینەی مونەووەرەدا ڕوویدا لەنێوان سوپاکەی مەروان و ئیبن زوبێردا بەیداخێکی

هەڵگرتبوو، هەروەها بەشداری کرد لەو هەڵمەتەی کە مەروان سەرکردایەتی دەکرد بۆ گێڕانەوەی میصر بۆ ژێر قەڵەمڕەویی ئەمەویەکان، یوسفی سەقەفی یەکێك بوو لە گەورە دەسەڵاتدار و خاوەن زەوی و زارەکانی مەککە و ئەو کاتی کە کوڕەکەی فەرمانڕەوای مەدینە بوو مرد [١].

سەقیف بەوە ناوبانگیان دەرکردبوو کە دڵسۆزبوون بۆ خەلیفەی ئەمەویەکان.

ئەوەش لەبیرنەکەین کە باپیرەی حەجاج لە دایکیەوە (فارعەی کچی عوروەی کوڕی مەسعود) سەرکردەی ئەو (قریتین) [٢] ە بوو کە ئایەتێکی خوای گەورە تیا دابەزی و لەسەر لەسەر دابەزی لەبارەی بیّ باوەڕەکانی قورەیشەوە: ﴿ وَقَالُوا لَوْلَا نُزِّلَ هَذَا الْقُرْآنُ عَلَى رَجُلٍ مِنَ الْقَرْيَتَيْنِ عَظِيمٍ ﴾ [٣].

جا هەموو ئەم بارودۆخە ژینگەیی و بۆماوەییانە کاریگەرییان لە کەسێتی سەرکردەیی حەجاج کرد و کردیان بەو جۆرە سەرکردە تاکڕەوە زۆردارەی کە هەڵدەستێت بە جێبەجێکردنی ئەو ئەرکەی پێی سپێراوە بە خۆماندوکردن و چەشنێك سنوریان نەبێت.

بۆئەوەی تیشك بخەینە سەر کەسێتی حەجاج پێویستە لەسەرمان جۆرەکانی سەرکردە بناسێنین تاکو وێنەکە تەواو بکەین.

**جۆرەکانی سەرکردە:**

زانایان سەرکردە دەکەن بە سێ جۆرەوە بەپێی ڕێگە وشێوازی کارکردنیان و تایبەتمەندیە کەسێتیەکانیان:

**یەکەم: سەرکردەی خۆسەپێن و دیکتاتۆر (ئۆتۆکراتی):**

سەرکردایەتی لێرەدا چڕبۆتەوە لە سەرکردەدا، ئەو سەرکردەیەیە کە پلان و نەخشەکەی خۆی دەسەپێنێت بەسەر ئەوانی تردا و ناچاریان دەکات جێبەجێی بکەن،

---

[١] . سەیری (المعارف لابن قتيبة) بکە.

٢ . مەبەست لە (قریتین) (مەککە) و (طائف)ە، بەڵام پیاوی یەکەم بریتیە لە وەلیدی کوڕی مقیرەی مەخزومی، سەیری (تفسير ابن كثير و طبري و القرطبي) بکە.

٣ . الزخرف : ٣١.

تاک لایەنە هەڵسوکەوت دەکات، مل بەکەس نادات، دەیسەپێنێت بەسەر هەمووان‌دا کە لە هەموو شتێکدا ملکەچی بن.

یەکێك لە ڕواڵەتەکانی سەرکردەی دیکتاتۆری تاکڕەو ئەوەیە کە دەسەڵاتەکان لە دەستی خۆی چڕ دەکاتەوە بە تەنها، هەرخۆی بڕیار دەدات، سیاسەت و ڕۆڵی تاکەکان دیاری دەکات، خۆی دادوەر و سەرچاوەی پاداشت و سزایە، واتە هەرخۆی داوەر و سکاڵاکاریشە.

گرنگی دەدات بەوەی دەسەبەری گوێڕایەڵی ئەو کەسانە بکات کە مافی هەڵبژاردنی کار یان بەشداریان نیە لە بڕیارەکاندا یان تەنانەت گفتوگۆ و دەرخستنی ڕای خۆیاندا.

دەست وەردەداتە زۆریەی کاروبارەکان و کارە جۆراوجۆرەکان و وردەکاریی شتەکان، چرکە چرکەی وردەکاریەکان، لەسایەی ئەم کەش و هەوا دیکتاتۆریەوە گوێڕایەڵیکردنی کوێرانە دروست دەبێت بەبێ گفتوگۆ و دەرخستنی ڕا، ئەمەش دەبێتە هۆی لەکارخستنی توانای داهێنان و نوێگەری بۆ شوێنکەوتوو بەردەستەکان، ئەم کەش و هەوایە بوارێکی تەواو نارەخسێنێت بۆ گەشەسەندنی پەیوەندیە مرۆییەکان لەنێوان تاکەکاندا، هەروەها دەبێتە هۆی دابەزینی گیانی هاریکاری و ورەی ئەو کەسانەی مان لەژێر دەستیدا.

ڕەفتاری تاك ڕەوانە ترس لەناخی بەردەستەکاندا و ئەوانەی کە لەژێر فەرمان و دەسەڵاتی سەرکردەدان دروست دەکات، وەك چۆن جەخت دەکاتەوە لەسەر بڵاوبوونەوەی گیانی نەرێنی لەلایان و خۆ خەریککردنیان بەو کارەوەی کە دەیانپارێزێت لە سزاکانی سەرکردە.

**دووەم: سەرکردەی بێ سەروبەرە و فەوزەوی (ئیدۆکراتی):**

لە ڕواڵەتەکانی سەرکردەی فەوزەوی ئەوەیە کە:

- هەر تاکێك بەو جۆرە کاردەکات کە پێی وایە گونجاوە بۆی (ئازادی تەواو بۆ تاك).
- نە یاسا و ڕێسا نە ئاست و پلە بەندی نە ئامانج هەیە

– ئازادی هەڵسوکەوتکردن جێدێڵێت بۆ بەردەستەکان، بەجۆرێك لەهەر بوارێك لەبوارەکاندا ئازادی تەواوی پێدراون لە بڕیاردان لەگەڵ کەمترین بەشداری سەرکردە لەگەڵیان.

ئەم جۆرە سەرکردەیە هەڵناسێت بەهیچ کارێکی تر لە گفتوگۆدا و بەشداریش نابێت لەگەڵیان لەهیچ کارێکدا، تەنها سەرنج دەخاتە ڕوو بەبێ فەرمانکردن لەکاتی دەسپێکی کارەکاندا، ئەم شێوازەش دەبێتە هۆی کۆمەڵە ئەنجامێکی نەرێنی کە ڕەنگدانەوەی دەبێت لەسەر سەرکردە و بەردەستەکانیش.

**سێیەم: سەرکردەی دیموکراتی (نمونەیی):**

لە ڕواڵەتەکانی سەرکردەی دیموکراتخواز ئەوەیە کە کارلێك لەگەڵ بەردەستەکان و شوێنکەوتووان دەکات تاکو دەبێتە یەکێك لەوان، گرانە لێکیان جیابکەیتەوە و بزانیت داخۆ کامە سەرۆکە و کامە کارمەندە، ئەم جۆرە سەرکردەیە کاردەکات لەسەر دابەشکردنی بەرپرسیارێتی، بڕیارەکانیش دەستەجەمعیە.

**نەتەوەکان سەرکردە دروست دەکەن:**

گومانی تێدانیە کە نەتەوەکان خۆیان سەرکردە و پێشەوا دروست دەکەن، نەتەوە بەهێز و میللەتە ئازاکان سەرکردەی بەهێز و خاوەن بیروباوەڕی دیموکراسی بەرهەمدێنن، میللەت و نەتەوە لاوازەکانیش سەرکردەی زۆردار و خۆسەپێن.

هەمیشە گەل و تاکەکان ئەوانەن کە سەرکردە دروست دەکەن، بەبێ ئەوان ئەو سەرکردە و پێشەوایە هیچ نرخ و بەهایەکی نیە، بەڵکو هەموو کۆمەڵگەیەك ڕێگەی تایبەت بەخۆی هەبووە لە دروستکردنی سەرکردە و یارمەتیدانی بە سیفاتە باشەکان و دەورەدانی کەسێتی ئەو بە داستان و ئەفسانە و ئەو کارانەی کە کەسە سادەکان ناتوانن ئەنجامی بدەن.

وەك چۆن (ئەریك فرۆم) لە پەرتوکەکەیدا بەناوی (ترسان لە ئازادی)، دان بەوەدا دەنێت، یان تەنانەت (جوستاف لوبون) لە پەرتوکەکەیدا (سایکۆلۆجیای جەماوەر)

دەڵێت: (( ئەو شتەی کە زاڵدەبێت بەسەر گیانی جەماوەردا پێویستبوون بە ئازادی نیە بەڵکو کۆیلەبوونە ! ! تینوبوونی بۆ گوێڕایەڵی لەڕوی غەریزیەوە وای لیَ دەکات مل کەچ بکات بۆ ئەوکەسەی خۆی وەك سەرکردە ڕادەگەیەنێت.

زۆر لە کۆمەڵگاکان ناتوانن بژین بە بیَ سەرکردە نەتەوەیی و دینی یان سیاسیەکان، ئەگەر گۆڕەپانەکەیان سەرکردەی تیا نەما، هەوڵدەدەن سەرکردە و ڕەمزەکەی تایبەت بەخۆیان دروست بکەن، ئەوەی کە گوزارشت لە خوێندنەوە و خەونەکانیان دەکات، چونکە زۆرینەی کۆمەڵگاکان دەژین یان دەیانەوێت بژین لەژێر سایەی دڵسۆزیی سیاسیباندا بۆ سەرۆك یان سەرکردەیەك، وەك کوڕێك کە دەستی خۆی دەگرێت بە دەستەکانی باوکیەوە ! !

لای ئەو کۆمەڵانە سەرسامبوون بەسەرکردە دەردەکەوێت، بەڵکو ئەم سەرسامبوونە توندتریش دەبێت ئەگەر هاتو کۆمەڵگاکەیان تێپەڕی بە تەنگژە و قەیرانە قورسەکاندا لەوانەی کە هەڕەشە دەبێت بۆ سەر ناسنامە و کیان و بیروباوەڕەکانیان، ئیدی دەبینین کۆمەڵ خۆیان دەبەستنەوە بە سەرکردەیەکەوە بەبیَ لێکدانەوە و هەڵبژاردنێکی هۆشیارانە و ورد، پەرێك یان ڕێڕەوێکی لیَ دروست دەکەن تاکو لێوەی دەربچن لە قەیرانە کاتی یان درێژخایەنەکەیان کە کۆمەڵگەکەیانی پیَ هاتۆتە لەرزە ، سا بەشکو ئەو هاوسەنگیەی لەدەستی دا بگەڕێتەوە یان هیوا و ئومێدی پیَ ببەخشێت بۆ داهاتوو.

ئەم کۆمەڵگایانە ئەوانەن کە سەرکردە و پێشەوای دیکتاتۆر بەرهەمدێنن.

سەرکردە لەم کۆمەڵگایانەدا لە دیدە دەرونیەکەوە خۆی وێنا دەکات لە گوزارشتی (من بەهای باڵام) بۆ کۆمەڵ، لەبەر ئەمە هەموو سیفاتە باش و لەسروشت بەدەرەکان دەدرێتە پاڵی و دەلکێنرێت پێیەوە، دەبێتە قەڵایەك بۆ خۆپاراستن لە بەرکەوتەکان و جەستە و عەقڵ و دڵ و کردارەکانی زۆر بە پوخت و بیَ عەیب تەماشا دەکریَ و بە هیچ کام لە دیاردەکانی دونیا ناچوێنرێت، بە دروستکردنی ڕەهەندی ئەفسانەیی و سەرکردەیی تیایدا.

جا ئەگەر ئەم کۆمەڵگایانە ئەو دامەزراوانەیان هەبووایە کە پارێزگاریان لێدەکات و بەرگری لە مافەکانیان دەکات پێویستیان بەو سەرکردە نەدەبوو، کە خەڵکی چاویان لەدەستیەتی سا بەشکو فریایان بکەوێت، یان لە کەشکەلانی بەرزی خۆیەوە بە بەخشندەیی خۆی چیان بووێت برژێنێت بەسەریاندا ، لەبەر ئەمە لەدەوری کەسێتی سەرکردە هەموو خواست و خەون و تێڕوونە دەرونیە خەیاڵیەکان خڕ دەبێتەوە.

چونکە سەرکردەکان کۆمەڵگاکان دروستیان دەکەن بۆ ئەو پێداویستیە دەرونیانەی ڕۆچووە بە ویژدان و ناخیاندا، بەیاوەری هۆکارە ناوخۆیی و دەرەکیەکان، ستراتیژە بینراو و نەبینراوەکان.

لە هەمان کاتیشدا سەرکردەی هاوسەنگ و دادپەروەر هەیە و مێژوی ئیسلامی و جیهانی پڕە لە نمونەی ئەم کەسایەتیانە ئەگەرچی کەمیش بووبن، هەندێك کەسیش پێیان وایە فەرمانڕەوای دادپەروەر بوونی نەبووە لەمێژودا تەنها لەناو پێغەمبەراندا نەبێت.

## ڕاستڕەویی و سەرکردایەتی:

پێویست ناکات بۆئەوەی ببیتە مرۆڤێکی ڕاستڕەو و ڕاستاڵ پێغەمبەر یان هاوەڵی پێغەمبەر یان زانایەکی پایەبەرز بیت، نەخێر باوك و دایك و خوشك و برا و قوتابی و دکتۆر و ئەندازیار و بەڕێوبەر و کارمەند پێویستە مرۆڤێکی ڕاستاڵ و ڕاستڕەو بێت چونکە خوای گەورە فەرمانی ڕاستڕەوی و دادپەروەریمان پێدەکات و دەفەرموێت:﴿ فَاسْتَقِمْ كَمَا أُمِرْتَ وَمَن تَابَ مَعَكَ وَلَا تَطْغَوْا إِنَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ﴾[1].

ڕاستڕەوی تەنها بە بەندایەتی و پەرستشەکان نیە، بەڵکو ڕاستڕەوی، ڕاستڕەوی لە پەرستشەکان و ڕەوشت و مامەڵەکردن لەگەڵ ئەوانی تریش دەگرێتەوە، جا سەرکردە و سەرۆك و فەرمانڕەوای ڕاستڕەو ودادپەروەرە لە فەرمانڕەوایەتیەکەیدا لە چاکەی

---

١ . هود: ١١٢

گەلەکەیەوە سەرچاوە دەگرێت، خوای گەورە دەفەرموێت:﴿ إِنَّ اللهَ لا يغيِّرُ ما بقومٍ حتى يُغيِّروا ما بأنفسِهِمْ﴾[١].

کەواتە کۆمەڵگە چاکەکار و باشەکان خوای گەورە سەرکردە و فەرمانڕەوا باشەکانیان بۆ دەنێرێت.

ڕاستڕەوی و چاکسازی بەتەنها مەرجی سەرەکی نین بۆ فەرمانڕەوا چاکەکارە بەهۆشەکان، بەڵکو مەرجی تریش هەن، ئەبو زەڕی غەفاری – خوا لێی ڕازی بێت – ڕۆژێك هات بۆلای پێغەمبەری خودا و فەرمووی بمکە بە فەرماندەی سوپایەك، پێغەمبەری خودا – درودی خوای لێبێت – پێی فەرموو : " ئەی ئەبو زەڕ تۆ مرۆڤێکی لاوازیت و ناتوانیت دادوەری دوو کەس بکەیت و دادوەری ماڵی هەتیوت پێ ناکرێت".

لێرەدا لەگەڵ ئەوەی ئەبو زەڕی غەفاری – خوا لێی ڕازی بێت – سیفەتی ڕاستڕەوی هەبوو بەتەواوی بەڵام پێغەمبەر – درودی خوای لێبێت – ڕای نەسپارد بۆچی؟

چونکە ئەوەی شتێکی نەبێت ناتوانێت بیبەخشێت، جا هەتاکو ئەو نەتوانێت دادوەری و فەرمانی دوو کەس بگرێتە دەست چۆن دەتوانێت فەرمان و کاری سوپایەك بە گشتی بگرێتە دەست؟

لێرەدا ئەزمون و شارەزایی پێغەمبەری ئازیز – درودی خوای لێبێت – ڕون دەبێتەوە سەبارەت بە هاوەڵانی و تواناکانی هەرکام لەوان.

لەبەرامبەردا با تەماشای خالیدی کوڕی وەلید بکەین – خوای لێ ڕازی بێت – ..خالید کاتێك نوێژی بە خەڵکی دەکرد سەرکردەش بوو سورەتە کورتەکانی دەخوێندەوە و هەڵەی دەکرد و دەیفەرموو ( جیهادکردن سەرقاڵی کردوم و لە قورئان دوری خستومەتەوە)، بەڵێ سیفاتەکانی لەخواترسان و خۆپارێزی و دین و زانست و متمانەی تێدا بوو، بەڵام لەلایەنی زانستی شەرعیەوە وەکو ئەوانی تر دیار نەبوو.

---

١. رعد: ١١

چون ئەو مانا شەرعیانەی کە ئەبا زەڕ تیایدا دەرکەوتبوو خالید تیایدا دەرنەکەوتبوو، پێچەوانەکەشی هەر ڕاستە پرسەکە پرسی گەڕانە بەدوای ماناگەلێکی دیاریکراودا کاتی گەڕان بەدوای سەرکردەدا.

تایبەتمەندیەکانی سەرکردەی هاوسەنگ و دادپەروەر و چاکەخواز شتانێکن یەکەمینیان (ڕاوێژە) وەك خوای گەورە دەفەرموێت:﴿ فَاعْفُ عَنْهُمْ وَاسْتَغْفِرْ لَهُمْ وَشَاوِرْهُمْ فِي الْأَمْرِ﴾[1].

هەروەها :﴿ وَاجْعَل لِّي وَزِيرًا مِّنْ أَهْلِي (٢٩) هَارُونَ أَخِي (٣٠) اشْدُدْ بِهِ أَزْرِي (٣١) وَأَشْرِكْهُ فِي أَمْرِي(٣٢)﴾[2].

ناکرێت سەرکردە هەڵسوکەوتی تاکڕەوانە بکات بەبێ پرس و ڕاوێژ و لێکدانەوە، بێگومان دەبێت کە پرس و ڕاوێژ بکات و سەرکردەیەکی خۆسەپێن و دیکتاتۆر نەبێت.

بە پرس و ڕاوێژ دەتوانێت سۆز و خۆشەویستی و ڕێزی ئەوانەی لەچواردەوریتن بەدەستبێنێت، ئەگەرنا دەبێتە دیکتاتۆرێکی توندوتیژ، ئەوە بەڕوونی دەبینین لە مامەڵەکردنی پێغەمبەر - درودی خوای لەسەربێت - لەگەڵ هاوەڵەکانی، هەربۆیە ڕاوێژی بە ئەبوبەکر و عومەر - خوایان لێ ڕازی بێت - دەکرد هەمیشە و متمانەی بە ڕاکانیان هەبوو و دەیفەرموو: " ئەگەر هەردوکتان لەسەر یەك ڕا بوون ئەوان من لەگەڵتانم".

لەبەر هەبوونی متمانە بە ڕاکەیان سەرەتا و لەبەر هۆکاری دووەم کە گرنگترە ئەویش ئەوە بوو کە پێغەمبەر - درودی خوای لێبێت - دەیزانی ئەبوبەکر بەلای نەرمونیانی و سۆز و دانایی و لەسەرخۆییدا دەڕوات و عومەریش مەیلی بەلای توندوتیژی و توڕەیی و کۆڵنەدان و گۆڕانی خێرادا دەڕوات.

هەربۆیە پێغەمبەر - درودی خوای لێبێت - دەیزانی کە هەردووکیان بەو دوو لایەنە دژیەکەوە لەسەر ڕایەك کۆك بوون و ڕێککەوتن ناکرێت لەگەڵیان نەبێت.

---

[1] . آل عمران: ١٥٩.

[2] . طه : ٢٩ - ٣٢.

عەلی – ڕەزای خوای لێبێت – زۆرجار دەیفەرموو: نەمدەبینی پێغەمبەر درودی خوای لێبێت – بەتەنها لەگەڵ ئەبوبەکر یان عومەر بڕوات بەڵکو لەگەڵ ئەبوبەکر و عومەر دەهات، ژیانی لەگەڵ ئەوان کە ئەهلی ڕاوێژ بوون بەردەوام بوو، هەردوکیان تەنها سەربازێك نەبوون بەڵکو سەرکردەیەکی تایبەتمەند بوون.

چونکە ڕاوێژکردن ئەنجامگەلێکی باشتر دەستەبەر دەکات، گەرچی سەرەنجامیش بەزین بێت، ئەوەتا لە غەزای ئوحود دا پێغەمبەر – درودی خوای لێبێت– پرس و ڕاوێژی بە هاوەڵەکانی کرد، هاوەڵان پێیان وابوو بچن بۆ شەڕ، کەچی پێغەمبەر وای بەباش دەزانی کە لە مەدینە بمێننەوە، بەڵام زۆرینە لەگەڵ ئەوە بوون کە دەرچن بۆ شەڕ، هەربۆیە پێغەمبەر درودی خوای لێبێت– چوو بۆشەڕ و ئەنجامەکەشی شکانی سوپاکەی بوو لە ئوحود و مردنی ٧٠ هاوەڵی پێغەمبەریشی لێکەوتەوە، کاتێك پێغەمبەر درودی خوای لەشەڕ گەڕایەوە بۆ مەدینە ئایەتی :﴿ وَشَاوِرْهُمْ فِي الْأَمْرِ﴾ دابەزی.

تەنانەت گەرچی سەرەنجامیش شکست بێت کەچی ڕاوێژکردن ئەنجامگەلی باشتر بەدیدەهێنێت، جا لەکوێ شتێکی باشتر لە ڕێباز و بەرنامەی پێغەمبەری خوا بۆ شوێنکەوتووەکانی دەست دەکەوێت کە ئەو گەورەترین و مەزنترین پێشەوا و سەرکردە بووە.

### دانایی و سەرکردایەتی ڕاستەو:

مەرجە سەرکردەی ڕاستەو یەکێك بێت لە خاوەن دانایی و ژیریەکان، خوای گەورە دەفەرموێت :﴿ يُؤْتِي الْحِكْمَةَ مَنْ يَشَاءُ وَمَنْ يُؤْتَ الْحِكْمَةَ فَقَدْ أُوتِيَ خَيْرًا كَثِيرًا وَمَا يَذَّكَّرُ إِلَّا أُولُو الْأَلْبَابِ﴾[1].

بۆئەوەی سەرکردە فەرمانەکان دەربکات پێویستە بەرنامە و توانای عەقڵی و ژیری و دانایی و زیرەکی و زانیاریی وردی هەبێت تاکو لەسەر پرۆگرامێکی دروست بڕوات لە

---

[1] - البقرة : ٢٦٩.

بڕیارداندا و متمانە بچێنێت لە بڕیارەکانیدا، هەموو ئەمانە سیفاتگەلێکن لە پێغەمبەری هەڵبژێردراودا – درودی خوای لێبێت– دەدرەوشانەوە و بوونیان هەبوو.

پێغەمبەر – درودی خوای لێ بێت _ کردبووی بە پیشە کە لە یەکە سەربازیەکاندا بەدواداچوون و خوێندنەوەی زیاتر بکات پێش ڕودانی شەڕ، گروپە هەواڵگریەکانی دەنارد تاکو بارودۆخەکان چاولێبکەن پێش ئەوەی جموجوڵ دەست پێبکات یان هەڵسوکەوت بکات، تاکو بڕیارەکانی لەسەر زانیاریگەلی دروست بونیات بنێ و هەندێ جاریش خۆی دەرۆیشت بۆ کۆکردنەوەی زانیاریەکان.

هەربۆیە لە یەکێك لە غەزاکاندا پێغەمبەر – درودی خوای لێ بێت - لەگەڵ ئەبو بەکر – خوای لێ ڕازی بێت شوێن پێکانی هەلگرت و پرسیاری لە شوانەکان کرد.

لە شەڕی (بەدر) دا ئەو ڕۆژەی کە خوای گەورە ڕاست و ناڕاستی لێك جیاکردەوە، پێغەمبەر - درودی خوای لێبێت – پرسیاری لە سیخوڕێك کرد کە ڕەوشی بێ باوەڕەکانی دەزانی.

لەم شەڕەدا بەرچویەك (موعجیزە)یەك لەخواوە ڕویدا کاتێك خوای گەورە ژمارەی بێ باوەڕانی لەپێش چاوی بڕواداراندا کەم کردەوە و ژمارەی بڕوادارانیشی لەپێش چاوی بێ باوەڕاندا کەم کردەوە، کە دەفەرموێت :﴿ وَإِذْ يُرِيكُمُوهُمْ إِذِ الْتَقَيْتُمْ فِي أَعْيُنِكُمْ قَلِيلًا وَيُقَلِّلُكُمْ فِي أَعْيُنِهِمْ لِيَقْضِيَ اللَّهُ أَمْرًا كَانَ مَفْعُولًا وَإِلَى اللَّهِ تُرْجَعُ الْأُمُورُ﴾[١].

جا کاتێك ئەم سیخوڕە هات و پێغەمبەر پرسیاری لێکرد ژمارەی بێ باوەڕان چەندە؟ وەڵامی دایەوەو ووتی نزیکەی سەد کەس دەبن، زانیاریەکان بەم جۆرە گەیشتە سەرکردە کە ژمارەکە سەد کەسە و سوپای موسوڵمانانیش سێ سەد کەس دەبن، کەواتە بارودۆخەکە باشە و دەتوانرێت هێرش بکرێت، بەڵام لەبەر پێداگری پێغەمبەر – درودی خوا لێبێت – بۆ بەدەستهێنانی زانیاری وردتر و واز نەهێنان بە هەبوونی یەك زانیاری بە تەنها، پرسیاری کرد چەند وشتر سەردەبڕن؟

---

[١] الأنفال: ٤٤

وەڵامی دایەوە: لەنێوان نۆ بۆ دە وشتر.

کەواتە لێرەدا دوو زانیاری بە پێغەمبەر - درودی خوای لێبێت - گەیشت بە پێغەمبەری سەرکردە.

یەکەمیان دەیخەملێنێت کە ژمارەی بێ باوەڕان سەد کەس دەبێت.

دووەمینیان بە کردەیی هەموو ڕۆژێك نۆ بۆ دە وشتر سەر دەبڕدرێت.

ئینجا پێغەمبەر - درودی خوای لەسەر - سەرکردەکانی سوپاکەی کۆکردەوە و وتەیەکی سەیری پێشکەشکردن... فەرمووی: ژمارەی بێ باوەڕان لەنێوان نۆسەد بۆ هەزار کەس دەبن.

پێغەمبەر درودی خوای لێبێت ئەم زانیاریەی لەکوێوە هێنا؟

لێرەدا مەسەلەکەی بە ڕونی وەڵام داوەوە، بەڕاستی زانیاری خەملاندنی بێ باوەڕان بە سەد کەس ڕون نیە، بەڵام زانیاری نۆ بۆ دە وشترەکە زانیاریەکی وردە، وەك ئاشکرایە یەك وشتر بەشی نەوەد بۆ سەد کەس دەکات، جا گەر ئەوان هەموو ڕۆژێك نزیکەی نۆ بۆ دە وشتریان سەر بڕیبێت ئەوا ژمارەیان دەکاتە نۆسەد بۆ هەزار کەس، ئەگەر ژمارەی وشترەکانمان کەڕەتکرد لەگەڵ سەد کەس بۆ هەر وشترێك، ئەو کات ناشێ ژمارەیان سەد کەس بێت، چون ئەگەر سەد کەس بوونایە ئەوا یەك وشتریان سەردەبڕی نەك دە وشتر!!

پێغەمبەر - درودی خوای لەسەربێت - فێرمان دەکات کە وازنەهێنیت بەو زانیاریانەی بۆت هاتووە بەڵکو فێرت دەکات وردبیتەوە و سووربیت لەسەر ئەوەی زانیاری دروست وەربگریت.

گشت ئەم کاروبارانە لە ژێری ودانایی سەرکردە و پێشەوای ڕاستڕەوەوە سەرچاوە دەگرێت، هەروەها یەکێك لە تایبەتمەندیە کەسێتیەکانی ئازایەتی و ڕێکوپێککردنی کاروبارەکانە بەباشی و ماندانی شوێنکەوتوو و هاریکار و ژێردەستەکانیەتی لەڕوی مادی و مەعنەویەوە.

لەهەموو ئەوانەی پێشووەوە بۆمان دەردەکەوێت کە حەجاجی سەقەفی زۆرینەی سیفات و تایبەتمەندیەکانی سەرکردەی خۆسەپێن تاکڕەو و دیکتاتۆری لەخۆیدا کۆکردبووەوە وە ئامانجە بالأکەی کردبووە جێگیربوونی فەرمانڕەوایەتی بۆ ئەمەویەکان و دەرچوون لێیان بریتیە لە کوفر و بێ باوەڕی، هەربەم جۆرەش هەموو ئەوانەی دەکوشت کە هەڵدەگەڕانەوە لێیان بەبێ بەزەیی پیاهاتنەوەیان، ئەویش بەهۆی ئەوەی پیاوی بەهێزی دەوڵەتی ئەمەویەکان بوو و وێنای خەلیفە و ئەمیری بڕواداراننی دەکرد، خەلیفە هەموو ئەو دەسەلأتانەی پێدابوو کە نادرێت بەهیچ کەس بە سەرکردە و پاشا نەبێت.

حەجاج بە زۆرداری و خۆسەپێنیەکەی توانیی هەلگەڕاوەکان و بەرهەلستکارانی دەوڵەتی ئەمەوی لەناو ببات بەدرێژایی سالأنی فەرمانڕەوایەتی خۆی لە عێراق و ولأتی فارس و (ماوراء النهر[1]).

***

[1] - ناوچەی ماوراء النهر:پشت ڕوبار: ناوچەیەکی مێژووییە و بەشێکە لە ئاسیای ناوەڕاست، عەرەبە موسوڵمانەکان ئەم ناوەیان لێنا کاتێك ئازادیان کرد لە سەدەی یەکەمی کۆچیدا وەك ئاماژەیەك بۆ دوو ڕوباری گەورە کەبریتین لە (جیحون) ئەمودریا و (سیحون) سیردریا، پشت ئەم دوو ڕوبارە ناوچەیەکی بەرفراوانە لای ڕۆژئاواوە لە تورکیاوە درێژ دەبێتەوە بۆ سنووری چین لەڕۆژهەلأتەوە.

(١٢)

# کەسایەتی و ئازادکردنەکان (فتوحات) لەژیانی حەجاجی کوڕی یوسف دا

- خەلیفـەی ئەمەویـەکان عەبدولمـەلیکی کـوڕی مـەروان و هـەڵی ڕاستەقینەی دەرکەوتنی حەجاج.
- خەلیفە وەلیدی کوڕی عەبدولمەلیك.
- موهلەبی کوڕی ئەبو ىوفرە و شـەڕی هەڵگەڕانـەوەکان و فتوحاتـە ئیسلامیەکان.
- قوتەیبەی کـوڕی موسـلیمی بـاهیلی و ئـازادکردنی وڵاتـانی ئاسـیای ناوەڕاست لەلایەن سوپای ئیسلامەوە. لـە سـەدەی یەکـەمی کۆچـیدا و کۆتاییەکی ناخۆش.
- محمدی کـوڕی قـاسمی سـەقەفی و داگیرکـردنی (سـند) و (چـین) و کۆتاییەکی خەمناك.

# خەلیفەی ئەمەویەکان عەبدولەلیکی کوڕی مەروان و هەلی ڕاستەقینەی دەرکەوتنی حەجاج

عەبدولمەلیك وەك جێگرەوە و میراتگری باوکی (مەروانی کوڕی حەکەم) لە سەرکردایەتیکردنی بەنی ئومەییە دەرکەوت بۆ گێڕانەوەی ئەو دەسەڵاتەی کە وەك با پۆیشتبوو پاش کۆچی دوایی (معاویەی کوڕی یەزیدی کوڕی معاویەی کوڕی ئەبو سوفیان) کە خەلافەتی بۆ ماوەی کەمتر لە چل ڕۆژ گرتە دەست و بەنەخۆشی لە کۆشکی خەلافەتدا و هەر لە سەرەتای لاویدا مرد و وەسیەتی بۆ هیچ کەس نەکرد کە لەدوای خۆی جڵەوی دەسەڵات بگرێتە دەست وەك نەریتی شا و خەلیفەکان.

فەرمانڕەوایەتی و دەسەڵات لەدەست بەنی ئومەییەدا نەما پاش ئەو بەیعەتەی کە خەلیفە (عبدالله کوڕی زبێری کوڕی عەوام) بەدەستی هێنا لە شار و ولاتانی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا و حیجاز و عێراق و ولاتی فارس و شام و میصردا، ئینجا بەنی ئومەییە بەیعەتیان دا بە (مەروانی کوڕی حەکەم)ی سەرگەورەیان تاکو فەرمانڕەوایەتی شام بگرێتە دەست، ئەوەشی کە لە دەست ئەمەویەکان چووە لە موڵك و دەسەڵات بگێڕێتەوە، کەچی کات ماوەی نەدا چونکە پاش چەند مانگێکی کەم لە پەیمان پێدانی وەك باسمان کرد مرد و ئەرکەکەی لە دوای خۆی سپاردە (عەبدولمەلیك)ی کوڕی، ئەو کارەی کە نەیتوانی پاشماوە و میراتی گەورەی ئەمەویەکان بگێڕێتەوە ژێر چنگی خۆی عەبدولمەلیك تەواوی کرد، بەجۆرێك میصر و زۆربەی ولاتانی شامی گەڕاندەوە ژێر دەسەڵاتی ئەمەویەکان.

عەبدولمەلیك هەستا بە سەرکردایەتیکردنی سوپاکانی شام بۆ شەڕکردن لەدژی خەلیفە (ئیبن زوبێر) و بەزیرەکی و توانا سەربازیەکانی توانی عێراق و پاشان خۆراسان و ولاتی

فارس بگێڕێتەوە ژێر ڕکێفی خۆیان، ئیتر لەژێر دەستی ئیبن زوبێردا هیچ شوێنێك نەمایەوە بێجگە لە حیجاز، حەجاجی سەقەفی بۆ نارد و ئەویشی لێ سەندەوە.

پاشان عەبدولمەلیك دەرفەتێکی دا بە حەجاج بۆ دەرکەوتن لەسەر شانۆی ژیانی سیاسی لە سەدەی یەکەمی کۆچیدا پاش ئەوەی فەرمانڕەوایەتی مەککە و مەدینە و یەمەنی پێ سپارد فەرمانڕەوایەتی عێراقی دایە دەست بۆ ماوەی نزیکەی بیست ساڵ، وەسیەتی کرد بۆ وەلیدی کوڕیشی کە لەدوای خۆی دەست لە حەجاج بەرنەدات.

کەواتە کێ یە ئەو عەبدولمەلیکی کوڕی مەروانەی کە هۆکاری سەرەکی و ڕاستەوخۆ بوو لە دەرکەوتنی حەجاج و هاندانیدا بۆ حکومڕانیەتی ئەمەویەکان و وەك شمێرێك ملی بەرهەڵستکار و هەڵگەڕانەوەکانی لە دەسەلاتی ئەمەویەکان پێ دەپەڕاند[1].

عەبدولمەلیکی کوڕی مەروانی کوڕی حەکەم پێنجەم خەلیفەی ئەمەویەکان بوو کە پاش کۆچی دوایی باوکی (مەروانی کوڕی حەکەم) ساڵی ٢٦هـ - ٦٤٦ز خەلافەتی گرتە دەست، هەتاکو مردنی لە ساڵی ٨٦هـ – ٧٠٥ز لە خەلافەتدا مایەوە.

زانستێکی فراوانی هەبوو و خواپەرست و ئارا بوو، دەسەلاتی گەڕاندەوە بۆ ئەمەویەکان و دەوڵەتەکەی پێشخست و دیمەشق لە سەردەمی ئەودا پایتەختی جیهانی ئیسلامی بوو.

---

[1]. خەلیفەکانی ئەمەوی لە دیمەشق چواردە خەلیفە بوون ئەوانیش:

( ١- معاویەی کوڕی ئەبوسوفیان ٢- یەزیدی کوڕی معاویە ٣- معاویەی کوڕی یەزید

٤- مەروانی کوڕی حەکەم ...پاشان خەلیفەکانی دوای حزی لە نەوە و ڕەچەڵەکی حزی

٥- عەبدولمەلیکی کوڕی مەروان ٦- وەلیدی کوڕی عەبدولمەلیك ٧- سولەیمانی کوڕی عەبدولمەلیك

٨- عومەری کوڕی عەبدولعەزیز ٩- یەزیدی کوڕی عەبدولمەلیك ١ هشامی کوڕی عەبدولمەلیك

١١- وەلیدی کوڕی یەزید ١٢- یەزیدی کوڕی وەلید ١٣- ئیبراهیمی کوڕی وەلید ١٤- مەروانی کوڕی محمد).

ماوەی حوکمڕانیان لە نێوان ساڵی ٦١١ ز تاکو ساڵی ٧٥٠ زایینی بوو، کە کۆتایی پێهات بە شکانیان بەدەستی عەباسیەکان و پاشان دامەزراندنی دەوڵەتێکی تر بۆیان لە ئەندەلس.

عەبدولمەلیك لە مەدینە لەدایك بوو و گەورە بوو و لەوێش وانەی زانستە شەرعیەکانی خوێند و فێربوو لەسەر دەستی زانایانی ئەوێ، پاشان چوو بۆ دیمەشق و لەوێش دیسان وانەی خوێند و بوویە یەکێك لە بیرمەند و زاناکان و شاعیر و وتاربێژ بوو.

ئەمەویەکان کاتێك کۆنگرەی (جابیە)یان بەست بۆ پەیمان دان بە مەروانی کوڕی حەکەم ڕێککەوتن لەسەر ئەوەی کە ( خالیدی کوڕی یەزیدی کوڕی معاویە) و پاشان (سەعیدی کوڕی عاص) جێی بگرنەوە لەدوای خۆی.

کەچی مەروانی کوڕی حەکەم ئەو پەیمان و ڕێککەوتنەی هەڵوەشاندەوە و خەلافەتی سپاردە (عەبدولمەلیك)ی کوڕی و لەدوای ئەویش (عبدالعزیز)ی کوڕی، چاوی داخست لەئاست (خالیدی کوڕی یەزید) کە لاوێکی کەم ئەزمون بوو لە بەڕێوەبردندا.

عەبدولمەلیکی کوڕی مەروان سەرکەوتوو بوو لە ڕێکخستن و جڵەوکردنی کاروبارەکان و لەناوبردن و دامرکانەوەی ئاژاوەکان دا، دەوڵەت ئیفلیج بوو بوو بەهۆی ئەو ئاژاوە و بێنە و بەردەیەی کە تێی کەوتبوو، کە ئەم هات ئەمن وئاسایشی گەیاندەوە لوتکە.

لە کوفە (موختاری کوڕی عوبەیدولای سەقەفی) بەدیارکەوت و لەدەوریشی شیعەی عەلەوی خڕبوونەوە، ئەم موختارە شوێن بکوژانی حسین کەوت و زۆرێکیشی لێ کوشتن و لەسەرو هەموشیانەوە (عومەری کوڕی سەعدی کوڕی ئەبو وەققاص) ڕابەری ئەو سوپایەی جەنگی دژی حسین کردو (عوبەیدولای کوڕی زیاد)ی ڕابەری عێراقی سەر بە ئەمەویەکانی کوشت، سوپاکەی لە ٤٠ هەزار سەرباز پێکهاتبوو، هەروەها (حصین کوڕی نمیر)ی کوشت و دەستی گرت بەسەر موصڵدا و بانگی (محمدی کوڕی حەنەفیەی کوڕی ئیمام عەلی) بە (ئیمام مەهدی) دەکرد و دەیویست بڵێت (مهدی منتظر)ە.

لە ساڵی ٧٠ی کۆچیدا عبدالملك چوو بۆ عێراق بۆ ئەوەی لە ئیبن زوبێری بسەنێتەوە، لەنێوان ئەو و موصعەبدا چەندین شەڕی گەرم ڕویدا، دواجار عەبدولمەلیکی کوڕی مەروان توانی موصعەبی کوڕی زوبێر لەناوبەرێت و بچێتە کوفەوە کە ملکەچ و گوێڕایەڵی ئیبن زوبێر بوون و بەیعەتیان پێدابوو، ئینجا بەیعەتی لە خەڵکەکەی سەندەوە بۆ خۆی و لەلای خۆیەوە والی و فەرمانڕەوایەکی بۆ عێراق دانا.

هیچ شوێنێك نەمایەوە عبداللەی کوڕی زوبێر دەسەلأتی بەسەریدا هەبێت بێجگە لە مەککەی حیجاز نەبێت، ئیدی کاتی چرکەساتی هەستانەوە هات، ساتەوەختی بڕیاری یەکلاکەرەوە، هەربۆیە عەبدولمەلیکی کوڕی مەروان فەرمانی بە حەجاجی کوڕی یوسفی سەقەفی کرد لە (طائف)ی زێدی لەدایك بوونی خۆی بنکەیەك بۆ کردەوە سەربازیەکانی دروست بکات ، تاکو لەڕوی عبداللەی کوڕی زوبێردا بووەستێتەوە کە لە مەککەی پیرۆز گەمارۆ درابوو.

لەشکرەکەی حەجاج لە (طائف)ەوە بەڕێ کەوت بۆ مەککە و گەمارۆی ئیبن زوبێری دا، وەك چۆن (حصین کوری نمیر) ئەو کارەی لەپێشتردا کرد، بە مەنجەنیق عبداللەی کوڕی زوبێری ئاگرباران کرد و تەواو خۆی و پشتیوانەکانی تەنگیان پێ هەڵچنرا هەتا زۆربەی پشتیوانەکانی لێی جیابوونەوە، بەلأم ئیبن زوبێر خۆی نەدا بەدەستەوە هەتا ساڵی ٧٢ك کوژرا و خەلافەتەکەی تۆ ساڵی خایاند.

بەکوژرانی (ئیبن زوبێر) حیجاز سەرلەنوێ چوویەوە ژێر فەرمانڕەوایەتی کوڕانی ئومەییە و حەجاج وەك والی حیجاز لەلایەن عبدالملکی کوڕی مەروانەوە هەتا ساڵی ٧٥ك مایەوە.

پاشان دوری خستەوە و کردیە فەرمانڕەوای عێراق و پاشان خۆراسان و ولأتی پشت ڕوبار( ماوراء النهر).

حەجاج ڕوبەڕوی شۆڕشی هەلگەڕاوەکان و بێجگە لەوانیش بوویەوە وەك باسمان کرد تاکو کاری ئەمەویەکان جێگیر بوو لە ولأتی عێراق.

حەجاج کەسێکی توندوتیژ بوو، ڕوبەڕوی چەندین شۆڕش بوویەوە کە یەکێك لەوانە بە سەرکردایەتی (عبدالرحمن کوڕی ئەشعەس) بوو.

چەندین شەڕی قورس و ماندوکەر وەکو (دیر الجماجم) ڕویدا لەنێوان سوپای ئەمەویەکان و سوپاکەی ئیبن ئەشعەسدا، کە هەردوولا جارێك سەردەکەوتن و جارێك دەبەزین، شەڕو هەرای نێوانیان بەردەوام بوو و زیاتر لە هەشتا شەڕیان کرد، دواتر ئیبن

ئەشعەس دەشکێت و هەڵدێت و دەچێت بۆ وڵاتی هیند، بەڵام حەجاج دەنێرێت بەدویدا و شوێنی دەکەون تاکو کەللە سەری بۆ دێننەوە بۆ کوفە.

هەربەم جۆرە حەجاج توانی وڵاتی عێراق و ئەوەشی بەدوایدا دێت لە وڵاتانی ڕۆژهەڵات بخاتە ژێر ڕکێفی عەبدولمەلیکی کوڕی مەروانەوە، بەمەش پایەکانی دەوڵەتی ئەمەوی لەسەردەمی ئەمدا بەهێز و قایم بوون، ئەمن و ئاسایش تەشەنەی کرد لە وڵاتدا، عەبدولمەلیک لەلایەکەوە تەواو دەبێت لە چاکسازی ناوخۆیی، ئینجا فەرمانی خۆی دەردەکات بۆ لێدانی دیناری ئیسلامی، کە شایەتومانی لەسەربێت لەگەڵ (بسم الله)، ئەو یەکەم کەس بوو دینار و دراوی ئیسلامیی لێدا، تاکو جێی دراوی بیزەنتی بگرێتەوە، ئینجا سەربەخۆیی دارایی و ئابوری بۆ دەوڵەتەکەی بەدیبهێنێت.

فەرمانی دەرکرد کە زمانی عەرەبی بکرێتە زمانی فەرمی کە لە هەموو دامودەزگاکانی دەوڵەتدا پەڕاوەکان و بەیاننامە و نوسینەکانی پێ بنوسرێتەوە، کوڕەکەی (عبداللەی کوڕی عەبدولمەلیک) کە فەرمانڕەوای میصر بوو ئەم ڕاسپاری و فەرمانانەی جێبەجێ دەکرد، بەجۆرێك کە میصر هێشتا بە زمانی (قیبطی) قیبتی دەینوسی، ئەمەش بووە هۆی بڵاوەپێکردنی زمانی عەرەبی زمانی قورئان و فەرمودە.

پاش ئەوەی دەوڵەتەکە لەناوەوە جێگیر بوو و ئاژاوە و قەیرانەکان لەناو بران، عەبدولمەلیك دەستی کرد بە تەواوکردنی ئەو ئازادکردنانەی (فتوحات) کە پێشینەکان دەستیان پێکردبوو، کاری کرد بۆ پاراستنی ئەو سنورانەی کە ڕووبەڕوی هێرش و پەلامارەکان بووبوونەوە لە هەندێ لاوە لەلایەن ڕۆمەکانەوە، لەو کاتەوەی کە معاویە فەرمانی دەرکردبوو ئەو سوپایەی کە گەمارۆی قوستەنتینیەی دابوو بگەڕێتەوە بۆ وڵات.

عەبدولمەلیك توانی ناوچە ئیسلامیەکان بگێڕێتەوە، ئەرمینیا و کەناراوەکانی سوریا و زۆرێك لەناوچە ئیسلام نشینەکان بخاتەوە ژێر ڕکێفی دەوڵەتی ئەمەوی، ژمارەیەك لە قەڵاکانی ڕۆمی ئازادکرد وەکو ( مرعش) و (عمورية) و (انطاكية)، بۆ ڕۆمی دەرخست کە دەوڵەتی ئیسلامی ماوە و بەهێزە و گاڵتەی پێ ناکرێت.

ساڵی ٦٢ك – ٦٨٢ز نزیکبوویەوە و فەرمان دەرچوو بەوەی کە (عوقبەی کوڕی نافیع) بۆ جارێکی تر ئەفریقیا بگرێتەوە، تاکو جەنگ و ئازادکردنەکانی بەردەوام بێت و درێژە پێ بدات و بتوانێت جەزائیر ئازاد بکات، هەروەها بڕوات بەرەو (سوس) لەوسەری مەغریب.

عوقبە لە سەردەمی معاویەدا بە سوپاکەیەوە ڕۆی بەرەو ئەفریقیا و دەستی گرت بەسەریدا، (قەیرەوانی) کردە بنکەی خۆی، بەڵام پاش کۆتاییهاتنی دامەزراندنی (قەیرەوان) بڕیارێك دەرچوو بە گۆڕینی سەرکردایەتی باڵا لە ناوچەی ئەفریقیا ساڵی ٥٥ك – ٦٧٥ز.

هەربۆیە معاویەی کوڕی ئەبو سوفیان (مسلمة بن مخلد)ی کردە فەرمانڕەوای میصر و ئەفریقیا، پێیان دەوت (ئەبولموهاجیر) کاتێك گەیشتە میصر (عقبە) لابرا.

معاویە مەبەستی ئەوەبوو کە ڕووبەڕووی ئیمپراتۆریەتی بیزەنتی ببێتەوە کە دەستی بەسەر باکوری ئەفریقیادا گرتبوو، لە هەوڵی وەستاندنی پەلامار و هێرشی ئیسلامی چاوەڕوانکراودا بوو لە قەیرەوان.

(ئەبوموهاجیر) توانی پلانی بیزەنیتەکان تێك بدات بە ڕاکێشانی (بەربەر)ەکان بۆلای خۆی و بڵاوکردنەوەی ئیسلام لەناویاندا.

سەرکەوتنی ئەم سەرکردەیە کاتێك درەوشایەوە کە سەرکردەی هۆزی (بەربەر)ی هێنایە ڕیزی خۆیەوە کە ناوی (کسیلة) بوو بانگەوازی کرد بۆلای ئیسلام و ئەویش موسوڵمان بوو و لەویشەوە ئیسلام لەنێو ژۆرێك لە خەڵکی (بەربەر) دا بڵاوبوویەوە، وردە وردە لە ئیسلام تێدەگەیشتن و بەرەو پیری دەهاتن، ئیدی ئازادکردنەکانی سوپای ئیسلام لە باکوری ئەفریقیا درێژەی هەبوو و بڵاوتر دەبوویەوە.

بەڵام سەرکەوتنەکانی سوپای ئیسلام ڕووبەڕوی یەکەم شکستی ترسناك بوویەوە لەبەر ئەوەی دەسەڵاتی ناوەندی دیمەشق زانیاری نەبوو لەسەر ئەو گۆڕانکاریانەی کە بەسەر سیاسەتی بیزەنتیەکاندا هاتبوو لەو وڵاتانە.

جا کاتێك دەسەڵاتداران ساڵی ٦٢ك (عقبە بن نافع) یان گەڕاندەوە بۆ سەرکردایەتی بالای گۆرەپانی ئەفریقی و گەیشتە قەیرەوان، بنکە سەربازیەکەی کە پێشتر دایمەزراندبوو، لێوەی دەرچوو بۆ ئەنجامدانی ئەو ئەرکەی کە بۆ جاری دووەم دیاریکرا لە پێناویدا، عوقبە کاتێك گەڕایەوە بۆ ناوچەی ئەفریقیا سزای ئەبو موهاجیری دا لەسەر ئەوکارەی کە پێیکرد کاتێك ساڵی ٥٥ك لەسەر کار لایبرد ، ئینجا دەستگیری کرد و بە ئاسن کۆت و بەندی کرد، هێنایە دەرەوە بەکۆتکراوی لەنێو زنجیر و قولاپدا، گەیاندیە کەنارەکانی زەریای ئەتڵەسی.

لەپاڵ ئەو ڕووبارەی کە ئەمڕۆکە شاری مەراکیشی لەسەر ڕادەوەستێت عوقبەی کوڕی نافیع ئەسپەکانی حستە نێو زەریاکە و سەری بەرز دەکردەوە بەسەریەرزیەکی بڕوادارانەوە و خۆبەکەمزانینێکی نەکناسانەوە بەرامبەر فەزڵی خودا بەسەریەوە و ووتی: " خودایە تۆ شاهید بە من گەر بمزانیبا لەپشتی ئەم دەریاوە خاکێك هەیە ئەوا بە غەزاکردن و تێکۆشان لەپێناوی تۆدا دەمهێنایە ژێر ڕکێفی ئیسلامەوە".

بەڵام عوقبە ئەوەی لەکیسی خۆیدا کە گوێ لە ئەبو موهاجیر و ئامۆژگاریەکانی بگرێت کە سەبارەت بە بیرەستی و سیاسەتەکانیان و پەنابردنیان بۆ ناپاکی و فێڵ و تەڵەکە پێی ووت، چاوەڕێیان کرد تاکو گەڕایەوە بەرەو قەیرەوان، لە دوای سوپاکەیەوە دەڕۆیشت، بۆسەیەکیان بۆ دانابوو کە لەگەڕانەوەدا بوو بەهاوکاری لەگەڵ (کسیلة) — سەرکردەی بەربەرەکان — کە هاوپەیمانیی بەستبوو لەگەڵ ڕۆمەکان، دەڵێن گوایا عوقبە بڕیاری داوە بەربەرەکان تەمبێ بکات، چونکە گومانی خراپ بووە بەرامبەر ڕاستی ئیسلامبوونیان و دوودڵ بووە لە ئیسلامبوونیان.

هەموران لە شەڕێکدا بەناوی (تهوذة) ساڵی ٦٣ك – ٦٨٣ز ڕووبەڕووی یەکتر بوونەوە ، هێزەکانی بیزەنتی دەوری عوقبەی کوڕی نافیعیان دا و ئەبو موهاجیر وەك پاڵەوانەکان بەرگری لێدەکرد بەڵام ئەوان توانیان بیکوژن، عوقبە شەهید کرا و گەیشتە مەنزڵی خۆی.

خەلافەتی ئەمەوی لەشکرێکی بێ شوماری ڕەوانەکرد بە سەرکردایەتی باشترینی کەسی ناو سەرکردەکانی کە (حسان بن النهمان) بوو، ئەویش هەوڵی خۆیدا بۆ

ئازادکردنی باکوری ئەفریقیا بەتەواوی لەدەست بیزەنتیەکان و لەناوبردنی هۆکارەکانی ناپاکی و غەیانییان.

(حسان) سالّی ٧٣ك - ٦٩٤ز چووبە قەیرەوانەوە ، دەستپێشخەری کرد بە پەلاماردانی (قرطاجة) کە گەورەترینی بنکەی بیزەنتیەکان بوو لە ئەفریقیا – (تونسی ئەمڕۆ) –بەتەواوی وێرانی کرد، پاشان تاکە تاکەی پاشماوەی ڕۆم و بەربەر کە لەوێ مابوو ڕاوینان، لە (صطفورة) و (بنزرت) تێکشی شکاندن، (حسان) هیچ شوێنێکی ولأتەکەیاتی بەجێ نەدەهێشت و بەسوپاکەیەوە دەچووە ناو کون بە کونی، پاشان (حسان) گەڕایەوە بۆ قەیرەوان، لەوێ نیشتەجێ بوو هەتاکو سوپاکەی پشوی دا و بریندارەکان شارێژکران.

حەسان ناچاربوو بنکەکانی لە (برقة) قایم کرد تا سالّی ٨١ك – ٧٠٠ز یارمەتیەکانی لە میصرەوە پێ گەیشت، ئینجا بە سوپاکانیەوە ڕۆیشت بۆ ڕووبەڕووبونەوەی لەگەلّ سوپاکانی بەربەردا بە سەرکردایەتی ژنێك لەوان کە پێی دەوترا (کاهنة)، توانی سەرکەوێ بەسەر بەربەردا و قەیرەوانی گێڕایەوە بۆ نێو باوەشی ئیمپراتۆریەتی ئیسلامی.

حەسان دوای ئەوەش بەردەوام کاری دەکرد بۆ یارمەتیدانی سەرکەوتنەکانی ئیسلام لە باکوری ئەفریقیا، هەربۆیە بنکەیەکی دەریایی ئیسلامیی دامەزراند بە ناوی (تونس).

داوای یارمەتی لە کرێکارانی میصر و شارەزایی و زانیاریەکانی ئەوان کرد لە دروستکردنی ئەو بنکەیەدا، پاشان حەسان چوو بۆ تێکدانی پلانی بیزەنتیەکان، دەستی کرد بە لەناوبردن و کۆتاییهێنان بە فێلّ و گەمەکانیان، ئیسلامی شیرین و جوان کرد لەدلّی کوڕەکانی (کاهنة)دا، پاشان لێیان نزیك بوویەوە، خستنیە ناو سەرۆکایەتی بالأی سوپاوە، لەجیاتی کوڕانی میللەت و تیرەکەی خۆی، بۆ ئەوەی بۆیان ڕونبکاتەوە کە سەربەرزی و سەرکەوتن تەنها بۆ خوا و پێغەمبەرەکەی و موسولّمانانە، بۆی ڕونکردنەوە کە ئیسلام ئامانجی سەربەرزی نەوەکانی ئەفریقیایە و دەرکردنیانە لە تاریکیەوە بەرەو ڕوناکی، هەربەم جۆرە ئەفریقیا گەڕایەوە بۆ لای ئیسلام و موسولّمانان.

لەلایەکی ترەوە لە خۆراسان، موهلەبی کوڕی ئەبو صوفرە بەدوای کاروباری ئازادکردنی ئەو وڵاتانەی پێی سپێردرابوو لەلایەن حەجاجەوە کەوت.

ئەویش (خوجەندە)ی ئازادکرد و دەستیگرت بەسەر (کەش)دا ساڵی ٨٠ک - ٦٩٩ز، ئینجا کردیە بنکەی سەرکردایەتی سوپاکەی؛ لەوێوە کوڕەکانی خۆی نارد بۆ شەڕی زۆرێك لە وڵاتان، بەڵام مانگی (ذي الحجة) لەنزیك (مرو) کۆچی دوایی کرد و پاش باوکی (یەزید)ی کوڕی جێی گرتەوە، کە سەردەمی ئەم بە ئازادکردنی (خوارزم) دەستی پێکرد.

ساڵی (٨٥ک)یە و (مفضل بن أبي صفرە) کاروباری خۆراسان دەگرێتە دەست و (باذغیش) و (أخرون) و (شومان) ئازاد دەکات.

بەڵام حەجاج هەوڵی دا داوا لە عەبدولمەلیك بکات خانەوادەی (مهلب) کەسیان فەرمان نەگرنە دەست، تۆمەتباری کردن بەوەی کە ئەوان لە شوێنکەوتوانی عبداللەی کوڕی زوبێرن، پێشنیاری کرد بۆ عەبدولمەلیك کە (قتيبة بن مسلم الباهلي) بکاتە فەرمانڕەوای خۆراسان، کە لە (باهلة)ی سەر بە (قیس)ە، بەوەش دەتوانێت (قیسیەکان) لە خۆراسان رابکێشێت بۆلای خۆی.

(قتيبة) لە کۆتایی ساڵی ٨٥ک — ٧٠٤ز دا گەیشتە (مرو).

بەڵام زۆر لە خۆراسان جێگیر نەبوو تاکو هەواڵی مردنی عەبدولمەلیکی کوڕی مەروانی پێگەیشت لە ساڵی ٧٦ک – ٧٠٥ز دا و لەپاش ئەویش وەلیدی کوڕی بووە جێگرەوەی.

***

## حەجاج لە سەردەمی وەلیدی کوڕی عەبدولمەلیک دا
## (٨٦ – ٩٦ك / ٧٠٥ – ٧١٤ز)

کاتێك ئەمیری بڕواداران (عەبدولمەلیکی کوڕی مەروان) کۆچی دوایی کرد ساڵی ٨٦ك – ٧٠٥ز وەلیدی کوڕی بوویە جێنشینی، ڕۆژی مردنی باوکی بەیعەت وەرگیرا بۆی.

سەردەمی ئەو، سەردەمی سەرکەوتن فتوحات و ئاسودەیی و خێر و بێر بوو بۆ موسوڵمانان، لە ڕۆژگاری ئەودا خاکی دەوڵەتی ئەمەوی لە ڕۆژهەلات و ڕۆژئاواوە فراوانتر بوو، کاتێك وەلید فەرمانڕەوایی گرتە دەست (عبداللە کوڕی مەروان)ی مامی کردە فەرمانڕەوای ئەفریقا، ساڵی ٨٩ك (حەسان)ی لابرد و لەجێگەی ئەو (موسای کوڕی نەصیر)ی دانا ، ئەویش زۆر توند و تیژبوو مۆ (بربر) بەرپەرەکان کە پاش ڕۆیشتنی (حسان) تەماعیان لە ئەفریقیا دابوو، هەربۆیە (عبداللە)ی کوڕی نۆ ناردن و چوو بۆیان، خەڵکێکی زۆری لێکوشتن و بەدیل گرتن، ئینجا ڕوی کردە دورگەی (مایورکا) و دەستی گرت بەسەریدا و خەڵکەکەی بەدیل گرت.

ڕوی کردە کۆمەڵێکی تر لە بەربەر، نزیکەی شەست هەزارکەسی لێ بەدیل گرتن، پاشان لەوێش دەرچوو بۆ ئازادکردنی (طنجة) و بەربەرەکانی ئەوێی دەویست، ئەوانیش لەترسی ئەو تێك شکان و کەوتە شوێنیان و کوشتنی.

ئەوانەشی کە مانەوە بێ وەی بوون و هاتنە ژێر فەرمانی، بۆ فەرمانڕەوایەتی ئەوان و (طنجة) کاربەدەستێکی خۆی بەناوی (طارق کوڕی زیاد)ی دانا، سوپایەکی لەگەڵی هێشتەوە کە زۆرینەیان بەربەر بوون، کەسانێکی لەگەڵ جێهێشتن فێری قورئان و

ئەرکەکانیان بکات، ئیدی ئەوکات لە ئەفریقیا کەسێك نەمابوو بەربەرەکانێ یان شەڕی لەگەڵ بکات.

وەلید پێی وابوو گرنگترین کار کەپێویستە بیکات بەهێزکردنی کەشتیگەلی ئیسلامیە، هەروەها لێدانی بنکەی بیزەنتیەکانە لە (صقلیة) و بەدەر لەویش لە دورگەکانی دەریای ناوەڕاستی بەرامبەر لەگەڵ ئەفریقادا، بۆ ئەوەی پاڵپشتی ئەم دۆخ و ڕەوشە جێگیر و ئارامەی موسوڵمانانی پێ بکات لە باکوری ئەفریقیا کە بووەتە بەشێك لە دەوڵەتی ئیسلامی.

سەرکەوتنەکانی ئەمەوی چووە قۆناغی کۆتاییەوە لە باکوری ئەمریقیا ساڵی ٨٩ك-٧٠٨ز، بە گرتنە دەستی فەرمانڕەوایەتی (قەیرەوان) لەلایەن (موسای کوڕی نەصیر)ەوە لەجێگەی (حسان کوڕی نعمان).

کە هەماهەنگی دۆڕیەوە لەنێوان کەشتیگەلە ئیسلامیەکان لە ڕۆژئاوای دەریای ناوەڕاست و هێزە وشکانیەکان، دەستی بەسەر ئەو شوێنە دورەدەستانەدا گرت کە بەناوی (المغرب الاقصی) ناسرابوون، بیزەنتیەکانی لە بنکە دەریاییەکانیان کە نزیك لە کەناراوەکانی ئەفریقیا ((تونس)) بوون وەدەرنا، ئەوکات باکوری ئەفریقیا بوویە باڵی چەپی دەوڵەتی ئیسلامی لە سەردەمی ئەمەویەکاندا.

(موسای کوڕی نەصیر) (طارق کوڕی زیاد)ی ڕاسپارد وەك سەرکردایەتی باڵای هێزە ئیسلامیەکان، کە ئەو لە کوڕانی موسوڵمانی بەربەر بوو لە شاری (طنجة).

ئەم هەنگاوەی موسای کوڕی نەصیر بوویە بەڵگەیەك لەسەر جێبەجێکردنی بنەمای یەکسانی لە ئیسلامدا، هەربۆیە (بەربەر)ەکان بینیان کە ئەوەی یەکێك لە هۆزەکانی بەربەر بووەتە سەرکردەی گشتی بەرەی مەغریبی دور (المغرب الاقصی).

لە ئاکامی ئەو کارەوە دینی ئیسلامی ڕاست و دروست، بەری بۆ والا بوو بۆ چوون بەرەو ئازادکردنی ئەندەلوس.

ساڵی ٩١ک – ٧١٠ز، موسای کوڕی نەصیر پرسی بە خەلیفە وەلید کرد بۆ ئازادکردنی ئەندەلوس[1]، دوابەدوای ڕازی بوون (موسا) سەرکردایەتی (طریف کوڕی مالیك) یەکەیەکی پێشڕەوی نارد کە ئەویش خەڵکی لە (بەربەرەکان) بوو، لەهەموو لایەکەوە گەمارۆی باشوری ئیسپانیای دا، چوارسەد جەنگاوەر و سەد ئەسپ سواری لەگەڵ بوو.

توانی بەو سەربازانەوە بچێتە ناو (الجزیرة الخضراء)، پاشان بە هێنانەوەی دەستکەوتێکی زۆرەوە بگەڕێتەوە بۆ کەناراوەکانی ئەفریقیا، ئەوەش لە ڕەمەزانی ساڵی ٩١ک دا بوو.

سەرکەوتنی (طریف) لەو غەزایەدا هانی سەرکردەی باڵا (موسای کوڕی نەصیر)ی دا کە پەل بهاوێت بۆ ئازادکردنی ئەندەلس (ئیسپانیا) و فەرمانڕەوای (طنجة) و سەرکردەی سوپاکەی (طارق کوڕی زیاد)ی هەڵبژارد بۆ گرتنە دەستی ئەرکی ئەم سەرکەوتنە گەورەیە.

لە مانگی ڕەجەبی ساڵی ٩٢ک – ٧١١ز دا (تاریقی کوڕی زیاد) بەخۆی و سوپاکەیەوە کە لە حەوت هەزار جەنگاوەر پێکهاتبوو پەڕینەوە بە گەرووی (جبل تاریق) دا، کرداری پەڕینەوەکە سەری گرت و موسوڵمانان هەموو چیاکەیان داگیر کرد.

تاریق پاش پەڕینەوەکە هەموو هێزەکەی کۆکردەوە وەك تیر بە گەرووی (جبل تاریق) دا دەڕۆیشتن، هیچ شتێك لە ڕێگەیدا خۆی نەدەگرت، پاشای ئیسپانیا (لذریق) هەوڵی دا ئەم پەلامار و هێرشە بوەستێنێت بە لەشکرێکی بێ شومارەوە کە سەد هەزار کەس دەبوون، بەڵام تاریقی کوڕی زیاد داوای یارمەتی لە سەرکردەکەی خۆی (موسای کوڕی نەصیر) کرد و ئەویش پێنج هەزار جەنگاوەری بۆ نارد تاکو سەربازەکانی ببنە دوانزە هەزار.

تاریق بە هەموو بڕوا و متمانەیەکیەوە پەلاماری (قوط) – شانشینی نیوە دوورگەی ئیسپانیا –ی دا، شکستێکی گەورە و ئابڕووبەری بەسەردا هێنان لە شەڕی (رمضانية)

---

[1]. ئیسپانیای ئەمڕۆ.

لەسـەر ڕوبـاری لەکـە (وادي لكـة) لـەخاکی شـەدونە (شَـدُونة)، بـەردەوام بـوو لـە سەرکەوتنەکانی، پاش ئەوەی (لذریق)ی کوشت شکستی دووەمی بەسەر (قوط) هێنـا لـە شاری ئیستیجە (إستِجة) خوای گـەورە ترسـی خسـتە دڵـی دوژمنەکانیـەوە، زۆر زۆر لێـی ترسان، وایان گومان برد کە هەمان کاری ئەوەی پێشی خۆیان بەسەر دێنێتـەوە (طریـف کـوڕی مالیـك)، (طریـف) خسـتبوونیە گومانـەوە کـە دەیـانخوات، ئـەو و ئەوانەشـی لەگەڵیەتی، هەربۆیە لەدەستی هەڵاتن بەرەو (طلیطلة).

تاریق کە لە شاری ئستیجە (إستِجة) بوو بڕیاری دا سوپاکەی بەش بکات و بیان نێرێت بۆ چەند لایەکی تر، بەشێکی نارد بۆ (قرطبة) و چووە ناویەوە و دەستی بەسەریدا گرت ، بەشێکی تری سوپاکەی گەیشتە شاری (غرناطة) چووە ناویەوە و دەستی بەسەردا گرت، بەشێکی تر لە سوپاکەی شاری تـودمیر (تُـدمیر) دەبـەزێنێت و خەڵکەکـەی ناچـاردەکات لەگەڵی ڕێك بکەون.

تاریق ڕۆیشت و زۆربەی سوپاکەشی لەگەڵ بوو بۆ شاری (جیان) و شاری (طلیطلـة)ی دەویست، ئینجا خەڵکەکەی هەڵاتن و شارەکەیان بە چۆڵی بۆ جێهێشت.

سـەرکەوتنەکانی (تـاریق) بـەردەوام بـوو تـاکو (جِلِّقیـة)ی ئـازادکرد لەوپـەڕی بـاکوری ڕۆژئاوای ئەندەلوسەوە، پاشان لە ساڵی ٩٢ك — ٧١٢ز سوپاکەی گەڕایەوە بۆ (طلیطلة).

وە موسای کوڕی نەصیر ترسا هێڵەکانی پەیوەندی و گواستنەوەی سـوپای ئیسـلامی ببچڕێت لەنێوان خۆی و ئەو بنکانەی لێوەی دەردەچێت، دوژمـن هەسـتێ بـە بەزانـدنی و گەمارۆدانی و لەناوبردنی، هەربۆیە بەپەلە فەرمان دەردەکات بۆ تاریق کە چاوەڕێی بکات لە (طلیطلة) تاکو ئەو خۆی بێت بۆلای و هێڵەکانی دواوەی بۆ بپارێزێت و بگاتەوە پێی.

موسا بەهێزەکانیەوە پەڕیەوە بۆ ئەندەلوس، بە ئامـانجی پاککردنـەوەی ئـەو جێگـا و شارانەی کە تاریق لـەدوای خـۆی جێـی هێشتبوون، لێرەدا موسا هەسـتا بـە پاراسـتنی بەشی دواوەی سوپای ئازادکەر، هەربۆیە چەند شار و قەڵایەکی ئـازادکرد کـە مانـەوەیان بەدەستی ئیسپانەوە مەترسی بوو بۆسەر بوونی ئیسـلامی نـوێ لـە نیـوە دورگەکـە تـاکو

گەیشتە (طليطلة) و لەوێ لەگەڵ سوپاکەی تاریق یەکیان گرتەوە، کە ئەوەش کات و کۆششێکی زۆری ویست لە لایەن موساوە تا گەیشتە ئەوێ.

لەوێ لە (طليطلة) هەردوو سەرکردە (تاریق) و (موسا) یەکیان گرتەوە، بە هەماهەنگی هەردوولا ئەو شوێنانەی کە مابوون لە ولاتی ئەندەلوس ئازادیان کرد.

پێکەوە ڕۆیشتن تاکو گەیشتنە (سرقسطة) لەسەر ڕوباری (الإيبرو) لەوێوە تاریق ڕۆی بۆ باکور تا گەیشتە چیای (ألبرت) واتە (دەرگاکان) کە ئەمڕۆ پێی دەوترێت چیای برانس (جبال البرانس) دەڕوانێت بەسەر دەروازەکانی فەرەنسا دا، ئەوە سەرکەوتنێکی گەورە بوو، کە بەیداخ و ئالآی ئیسلامی لەسەر دەروازەکانی فەرەنسا داکوترا و شەکایەوە لەماوەی کەمتر لە سەد ساڵدا لەدوای کۆچی پێغەمبەرەوە بۆ مەدینە.

لەکاتێکدا کە تاریق لەبەر دەروازەکانی فەرەنسادا ڕاوەستابوو موساش لە ڕۆژئاواوە دەڕۆیشت تا گەیشتە ئەو هەرێمەی کە لەسەر کەنداوی (بسكاية) درێژ دەبێتەوە و پێی دەوترێت (أشتوريس) دواجار کۆتایی بە ئازادکردنەکانی هێنا لە کەناری (بسکایە).

خەلیفە وەلید هەریەک لە موسا و تاریقی بانگێشت کرد بۆ دیمەشق ساڵی ٩٥ك – ٧١٤ز.

موسای کوڕی نەصیر کەشتیگەلی ئیسلامی ڕەوانە کرد بۆ ئازادکردنی نیمچە دورگەی (سردينيا) بە مەردانە ئازادیان کرد، دواتر بە دیل و غەنیمەت و دەسکەوتێکی زۆرەوە لەساڵی ٩٢ك دا گەڕانەوە.

***

## سەرکەوتن فتوحاتەکانی ئیسلام لە وڵاتانی ڕۆم دا
## لەسەردەمی خەلیفە عەبدولمەلیک و وەلید دا

لە کۆتاییەکانی ساڵی ۷۳ ك دا، عەبدولمەلیك هەستی کرد کە دەوڵەتی ئەمەوی هێزی بۆ گەڕاوەتەوە، و دەتوانێت دەست بە جیهاد و کۆششی خۆی بکاتەوە و ورەی بەرز بکاتەوە، لەم ماوەیەدا پەیوەندیەکانی نێوان دەوڵەتی ڕۆم و دەوڵەتی ئیسلامی ڕوی لە خراپی کردبوو، ڕۆم دەستیان کرد بە خۆ ئامادەکردن بۆ پەلاماردان، عەبدولمەلیکیش لە بۆسەدا بوو بۆیان و خۆی ئامادەکربوو، (محمد)ی برای کە فەرمانڕەوای جەزیرە و ئەرمینیا بوو دانابوو بۆئەوەی ببێتە سەرکردەی سوپا لەو باڵەوە.

عەبدولمەلیك ڕێگری کرد لەو پارە و دراوانەی کە کاتی پێویست دەیدا، ئەمە ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانیی بیزەنتی توڕەکرد، هەربۆیە جەنگی ڕاگەیاند، بە سوپایەکی گەورەوە هات بۆ شەڕکردن لەگەڵ موسوڵمانان لە لای ئەرمینیاوە، محمدی کوڕی مەروانیش بە سوپاکەیەوە ڕوبەڕوی بوویەوە ، شەڕێکی ترسناك ڕویدا، تیایدا ڕۆمەکان سەرباری زۆریی ژمارەشیان شکان، شکانێکی ترسناك، خودی ئیمپراتۆر هەڵات و زۆربەی سەربازەکانی لێ جیابوونەوە، ساڵی ئەم ڕوداوە ۷٤ك بوو.

ئەم ڕوداوە دەوڵەتی بیزەنتی لەقاند، عەبدولمەلیك ئەم سەرکەوتنەی قۆستەوە و بەدرێژایی سنورەکان فشارەکانی بۆ سەر دەوڵەتی بیزەنتی بەردەوام کرد، غەزاکانی (هاوینە و زستانە )ی ڕێکخست و دەستی کرد بە پێخستنە ناو خاکە نزیکەکانی بیزەنتیەوە، سوپا هاوینیەکان بە ڕێکوپێکی دەردەچوون بۆ گەمارۆدانی ئەم زەویانە کە محمدی کوڕی مەروان سەرکردایەتی دەکردن یان بەدەر لەویش لە فەرماندەکانی بەنی

ئومەییە، لە ساڵی ٨١ک عەبدولمەلیك (عبدالله)ی کوڕی نارد و (قالیقالا)ی ئازاد کرد کە یەکێکە لە شارە گەورەکانی ڕۆم.

لە ساڵی ٨٤ک عبداللەی کوڕی عەبدولمەلیك توانی شارێکی تری سەرەکی لە ناو دەوڵەتی ڕۆم دا لە ئاسیای بچوك ئازادبکات ئەویش شاری (المصیصة) بوو، قەڵاکەی قەڵاکەی دروست کرد و سێ سەد جەنگاوەری ئازا و بە جەرگی کردە پارێزەری، پێشتر موسوڵمانان لەوێ نیشتەجێ نەدەبوون، مزگەوتێکی تیادروست کرد.

هەر بەم جۆرە هێزی موسوڵمانان بەرەو پێش چوو، قەڵاکانی داگیردەکرد و دەستی بەسەر شوراکاندا دەگرت لە ناو خاکی دوژمن لە دەوڵەتی ڕۆمدا، لەو کاتەوەی کە یەکڕیزی لە سەردەمی عەبدولمەلیك دا هاتبووە دی.

بەڕاستی عەبدولمەلیك پاش گێڕانەوەی یەکڕیزیی سیاسی سەلماندی کە دەوڵەت یەك هێزە و بەتوانایە بۆ سەرکەوتن و دەسکەوتنی دەسەڵات بەسەر هەموو ناوچەکان، هەروەها سەرکەوتن بەسەر بیزەنتیەکاندا، سەلماندی کە هێزە یەکڕیزەکەی دەتوانێت بڕوات بەرەو گشت لاکان، سوپای ئیسلام بەردەوام بوو لە سەرکەوتن و جیهادکردنەکانی بەدرێژایی سەردەمی وەلید و پاشان سولەیمانیش.

(مسلم کوڕی عەبدولمەلیك) وەك تاکە سەرکردە و جەنگاوەرێکی گەورە بەدەرکەوت، لە هەموو ساڵێکدا شارێك یان قەڵایەك لەو قەڵا گەورانەی ڕومی داگیر دەکرد کە دایانمەزراندبوو بۆ پاراستنی وڵاتەکەیان و پاسەوانی کردنی لە هێرش و پەلامارەکانی دوژمن، لەگەڵ ئەویش دا و لەسەر دەمی وەلید دا کەسانی تر لەگەڵیان غەزایان دەکرد، وەك (عەباسی کوڕی وەلیدی کوڕی عەبدولمەلیك) کە ئەم قەڵایانەی گرت: قەڵای (عمورية و هرقلية و قمونية و طوانة و سمطية و المرزبانين و طروس) و نۆد قەڵای تریش[1].

هەروەها لە جەمادی کۆتایی ساڵی ٨٨ک – ٧٠٧ز، موسلیمەی کوڕی عەبدولمەلیك و عەباسی کوڕی وەلید قەڵای (طوانة)یان گرت و زستان تیایدا مانەوە، موسوڵمانان

---

[1] . سەیری (تأریخ الطبري ) و (البدایة والنهایة) بکە.

دوژمنانیان تێك شكاند تاكو چوونە كەنیسەكەیانەوە پاشان گەڕانەوە و خەڵكی ترسان و تێكشكان، عەباس مایەوە و چەند كەسێكی لەگەڵ بوو، یەكێ لەوانە (ابن محیریز الجُمحي)بوو، هەربۆیە عەباس بە ئیبن موحەیریزی گوت: كوان ئەهلی قورئان كە بەهەشتیان دەوێت؟

ئیبن محێریز گوتی: بانگیان بكە دێن بەدەمتەوە و دێن بۆلات.

ئینجا عەباس بانگی كرد: ئەی ئەهلی قورئان، هەموویان هاتن بەرەولای و ئینجا خوای گەورە دوژمنی تێك شكاند هەتا چوونە (طوانة)وە.

هەربەم جۆرە ساڵێك تێپەڕنابێت موسوڵمانان هێرش دەكەنە سەر شوێنێكی تری خاكی ڕۆم و دەست بەسەر هەندێك لە قەڵا و شوراكانیدا دەگرن.

شیاوی باسكردنە كە زۆربەی ئەوانەی كە سەركردایەتی ئەم هەڵمەتانەیان دەكرد لە كوڕانی خانەوادەی ئەمەوی بوون، كوڕانی خەلیفە (وەلید) خۆی و براكەی (مسلمة) كە خەریك نەبوو یەك ساڵی تەواوی بەسەردا بچێت لە گرتنە دەستی هێرشكردنە سەر خاكی ڕۆم.

هەروەها مسلمە خۆی سەركردایەتی ئەو سوپایەشی كرد كە گەمارۆی قوستەنتینیە (قسطنطینیة)ی دا كۆتا گەمارۆدان لە سەردەمی سولەیماندا بوو.

بەڵام سەبارەت بە وڵاتانی پشت ڕوبار (ماوراء النهر)، (قتیبەی كوڕی مسلم) ساڵی ٨٦ك – ٧٠٥ز (خۆراسان) ی گرت، لە (مرو) بنكەیەكی بۆخۆی دامەزراند، پاشان وڵاتی ڕوباری ناسراو بە ڕوباری (جیحون) ی گرت، موسوڵمانان چوونە چەند شارێكەوە، خەڵكەكەی بەخێرایی هاتنە ناو دینی ئیسلامەوە و بەرگریان لێكرد وەكو : (الصفد و طخارستان و شاش و فرغانة) لەنزیكەی دە ساڵ دا.

ساڵی ٩٦ك – ٧٥١ز كارە جەنگیەكانی كۆتایی پێهێنا بە گرتنی (كاشغر) لە (توركستان)ی صین، ئیتر بەو سەركەوتنە دەوڵەتی ئیسلامی سنوری صینی تێپەڕاند.

پاشان نەخشەی ئازادكردنی هیند كێشرا لەسەردەمی وەلیدی كوڕی عەبدولمەلیك دا پاش ئەوەی كە موسوڵمانان وڵاتی (فارس) و (خۆراسان) و (سەجستان)یان گرت، وە

مەبەستیان بڵاوکردنەوەی ئیسلام و پاراستنی سنورەکانی باشوری دەوڵەتی ئیسلامی بوو.

هەروەها وەلیدی کوڕی عەبدولمەلیك ئەرکی هێرشکردنە سەر وڵاتی هیندی سپاردە (محمدی کوڕی قاسم).

محمدی کوڕی قاسم ساڵی ٨٩ك – ٧٠٨ز چوو بۆ وڵاتی هیند، شاری (الدیبل) ی گرت (کە یەکێکە لە شارەکانی کەناری ڕۆژئاوای هیند)، پاشان لەوێ دەرچوو و بیدایە بەلای هەر شارێکدا ئازادی دەکرد، تاکو بە ڕوبارەکەدا پەڕیەوە، خەڵکی (سربیدس) لەگەڵی ڕێککەوتن و (سهبان)ی گرت.

پاشا ڕۆیشت بۆ ڕوبەڕووبوونەوەی (داهر)ی پاشای (سند) و (هند)، ڕوبەڕووبوونەوەیەکی دەگمەن بوو، بەپاستی (داهر) و سەربازەکانی لەسەر پشتی فیلەکان شەڕیان دەکرد کاتێك فیلەکان تورە دەبوون هەرچی بهاتایەتە بەردەمیان ڕایاندەماڵی و دەیانپلیشاندەوە.

شەڕێکی گەرم ڕویدا خوای گەورە سەرکەوتنی لە چارەی ئاڵای ئیسلام نوسیبوو، (محمدی کوڕی قاسم) پاشا (داهر)ی شکاند و کوشتی، محمدی کوڕی قاسم بەردەوام بوو لە پێشڕەوی، سەرکەوتنەکانی درێژەی کێشا لە گشت شوێنەکانی وڵاتی (سند) تاکو گەیشتە (الملتان) و چووە ناویەوە و دەستکەوت و غەنیمەتێکی زۆری چنگ کەوت.

وەلیدی کوڕی عەبدولمەلیك ساڵی ٩٦ك – ٧١٥ز کۆچی دوایی کرد پاش ئەوەی ئاڵای ئیسلام شەکاپەوە و بەرزبوویەوە لەسەر دەمی ئەودا لەسەر سنورەکانی فەرەنسا و صین و خۆراسان و سەجستان و سند و وڵاتی هیند، لەسەردەمی ئەودا دەوڵەتی ئەمەوی و ئیسلامی زۆر فراوان بوو.

نابێت ئەوە لەبیر بکەین کە هەستا بە دروستکردنەوە (مسجد الاقصی) وەك چۆن باوکیشی عەبدولمەلیك مزگەوتی (قبة صخرة)ی دروستکرد، لە جێ دەستەکانی وەلید نۆژەنکردنەوەی مزگەوتی ئەمەوی ومزگەوتی نەبەوی (المسجد النبوی) بوو.

یەکەمین کەس بوو کە هەستا بە دروستکردنی نەخۆشخانە لە ئیسلامدا بۆ چارەسەری نەخۆشانی توشبوو بە گولی، هەروەها هاریکاری و یارمەتی پێشکەشکی نەدارەکان دەکرد، هەموو هاولاتیانی دەوڵەت لە موسوڵمانان و نا موسوڵمانانیش.

دەڵێن مردنەکەشی خەمخواردنێکی زۆر بوو لە مردنی حەجاج بە چەند مانگێك، ئەو زۆر خەمی خوارد لە مردنی حەجاج.

چونکە وەلیدی کوڕی عەبدولمەلیك پشتی بە حەجاجی کوڕی یوسف بەست بۆ جێگیرکردنی ئاشتی و ئاسایش لە ڕۆژهەلاتی جیهانی ئیسلامی و فروانکردنی خاکەکەی، وەلید پێگە و ڕۆڵی حەجاجی دەزانی هەربۆیە دەستی لێ نەرنەدا، دەستی حەجاجی کردەوە لە کاروبارەکانی ڕۆژهەلاتی ئیسلامی، کە بنکەی شۆڕشەکان بوو لەسەردەمی ئەمەویەکاندا، بەجۆرێك ڕەوش و بارودۆخی ڕۆژهەلات و شۆڕشەکانی هێورنەدەبوویەوە و دانەدەمرکایەوە بەدەستی حەجاج نەبێت.

هەروەها ڕۆڵێکی گەورەی هەبوو لە جێگیرکردنی دەوڵەتەکەی عەبدولمەلیکی کوڕی مەروان دا، هەربۆیە وەسیەتی عەبدولمەلیك بۆ کوڕەکانی کاتی سەرەمەرگ بریتی بوو لە : ڕێز لەحەجاج بگرن، ئەو کاروبارەکانی بۆ ئێوە جۆر کرد و جێ پێی ئێوەی قایم کرد.

حەجاج کەسێکی دڵسۆز بوو بۆ ئەمەویەکان، ماندو نەدەبوو لە پتەوکردن و چەسپاندنی دەسەلاتیان و بەرقەرارکردنی ئاسایش و هەستان بە چاکسازیەکاندا، بەتەنها سەرکردەیەکی سەربازی شارەزا نەبوو لە ڕێوشوێنەکانی شەڕ و سیاسەت دا، بەڵکو کەسێکی کارگێڕیی کۆڵنەدەر و چاکسازبوو لەبواری داراییشدا، جا کاتێك ئاژاوە نەما و ڕەوشەکان جێگیر بوون حەجاج ڕۆیی بۆ گۆڕەپانە نوێیەکانی تر لە چاکسازی و ئاوەدانکردنەوە، هەربۆیە لە سەردەمی وەلید دا سەرکەوتنەکانی سوپای ئیسلامی درێژە پێدا لە باڵی ڕۆژهەلاتی دەوڵەتەکەوە، کاری کرد بۆ بوژاندنەوەی ئەو ولات و شارانەی کە جەنگ و شەڕ و شۆڕشەکان وێرانی کردبوون، هەروەها گرنگی دا بە چاککردنەوەی ئەو کەناڵانەی کە لە دیجلە و فوراتەوە دەردەچوون، ئەو کەناڵانەشی جارێکی تر کردەوە

پڕکرابوونەوە، کەناڵی نوێی دامەزران، گرنگی دا بە چاککردنەوەی بەنداوەکان و وشك پێکردنی زۆنگ و زەلکاوەکان و بوژاندنەوەی زەویە دێمەکان.

سەردەمی وەلیدی کوڕی عەبدولمەلیك گەورەترین فتوحاتە ئیسلامیەکانی بەخۆوە بینی لە دەوڵەتی ئەمەویدا، موسوڵمانان دەستیان گەیشتە گەورەترین پارچە خاك و زەویەکانی جیهانی دێرینی ناسراوی ئەو سەردەمە و دەوڵەتەکەیان فراوان بوو بەجۆرێك پێشتر شتی وای بەخۆوە نەبینیبوو، لەسەردەمی ئەودا ژمارەیەك لەو سەرکردە بەتواناییانە دەرکەوتن کە تایبەتمەند بوون بە توانای سەربازی و هونەری جەنگی و ناسرابوون بە ئازایەتی و جوامێری و بەرخۆدان، هەربۆیە هەستان بە گرتنە ئەستۆی ئەم ئازادکردنانە و تەواوکردنی ئەو ئازادکردنانەی کە لەسەردەمی خەلیفەکانی ڕاشیدیندا دەستیان پێ کرابوو.

جا بۆیە لە باڵی ڕۆژهەڵاتی دەوڵەتەکەوە حەجاجی سەقەفی خەڵکی عێراقی دایە بەر بۆ بەشداریکردن لە سوپاکەی (قتیبە بن مسلم الباهلی) بۆ گرتنی وڵاتی(ماوراء النهر) و هەوڵەکانی لە گرتنی ئەو شوێنەدا دە ساڵی خایاند ساڵەکانی (٨٦– ٩٦ك/ ٧٠٥-٧١٤ز)، لەماوەی ئەو ساڵانەدا (بوخارا) و (سەمەرقەند)ی گرت و گەیشتە هەرێمی (کاشغر) کە تێکەڵە لەگەڵ سنوری چین.

حەجاج کوڕی مامەکەی (محمدی کوڕی قاسمی سەقەفی) نارد بۆ گرتنی هەرێمی (سند) لە نیمچە کیشوەری هیند ساڵی ٨٩ك – ٧٠٧ز، کەهێشتا تەمەنی نەگەیشتبووە بیست ساڵ، بەڵام سەرکردەیەکی مەزن بوو، لە ئەرکەکەیدا سەرکەوت، دەسەڵاتی دەوڵەتەکە لەم ناوچەیەدا فراوانتربوو و کرایەوە، شاری (الدیبل)ی گرت، کە نزیکەی (٤٥میل[1]) لە ڕۆژهەڵاتی باشوری (کراتشی) پاکستانەوە دورە، سەرکەوتنەکانی درێژبوویەوە بۆ (ملتان) لە باشوری هەرێمی (البنجاب).

***

---

[1] . یەك میل دەکاتە ١٦٠٠مەتر بەنزیکی.

## هەوڵەکانی گرتنی (سەجستان)
## لە سەردەمی عەبدولمەلیک دا

خەلیفە عەبدولمەلیک (ئومەییەی کوڕی عەبدولمەلیکی کوڕی خالیدی کوڕی ئوسەیدی کوڕی ئەبی عاص)ی ڕاسپارد، ئەویش کوڕەکەی کەناوی (عبدالله )بوو نارد بۆلای (روتبیل) ڕێککەوت لەگەڵی لەسەر سێ سەد هەزار دەرهەم، کاتێک ئەمە گەیشتەوە بە خەلیفە لەسەر کار لایبرد، پاشان حەجاج ساڵی ٧٨ك (عبیدالله بن أبی بکرە)ی ڕاسپارد ئەویش ساڵێك بەبێ هێرشکردن مایەوە، لەساڵی دواتردا جوڵا بۆ بەرەنگاربوونەوەی (روتبیل) کە ڕێککەتبوو، بەڵام هەندێك جار سەرانەی دەدا و هەندێك جاریش نەیدەدا.

هەربۆیە عبیدالله کوڕی ئەبی بکرە ساڵی ٧٩ك هەستا و ڕۆی بۆی بۆ پەلاماردانی هەتاکو چوویە وڵاتەکەیەوە، چەندین دەستکەوتی هەبوو و قەڵاکانی ڕوخاند و دەستی گرت بەسەر هەندێك لە خاکەیدا، شوێنکەوتوانی روتبیل لەتورك لەبەردەم لەشکری موسوڵمانەکاندا هەڵاتن ، تاکو نزیکبوونەوە لە پایتەختەکەیان (کابل)، ئینجا تورکەکان ڕێڕەو و دەروازە و تولە ڕێکانیان لە موسوڵمانان گرت، تاکو سەربازی موسوڵمانەکان زۆریان بۆهات کە ئەمە هانی (عبیدالله بن أبی بکرە)ی دا بۆ ڕێککەوتن و ئاگربەست لەگەڵ (روتبیل) تاکو موسوڵمانان بتوانن لە خاکی تورك بچنە دەرەوە بە بێ وەیی، لەناو جەنگاوەرەکاندا یەکێك لە خواپەرستە زاهیدەکان هەبوو کە عەشقی جیهادکردن بوو بەناوی (شریح بن هانئ) ناسرابوو.

(شریح) هەستایەوە و بانگەوازی کرد لە سەربازەکان بەردەوام بن لە شەڕ بۆ داواکردنی پلەی شەهید بوون، دەیگوت : ئەی ئەهلی ئیسلام، هەرکەس لە ئێوە

شـەهیدبوونی دەوێـت بێـتە لای مـن، کەسـانێکی گوێڕایـەڵ و سوارچـاکی نـاو خـەڵك و پارێزەری شوێن دەخەم ئینجا شەڕ لەگەڵ تورك بکەن تاکو دەیانکوژن، بەڵام ئەم هێرشە ئامانجە سەربازیەکانی بەدی نەهێنا، تا وای کرد لە حەجاج پرسی بە خەلیفە عبدالملك کرد بە ناردنەوەی سوپای نوێ تاکو شکۆمەندی و ڕێز بگێڕێتەوە بۆ دەوڵەت.

هەربۆیە حەجاج لە ساڵی ٨٠ك سوپایەکی بەهێزی ئامادەکرد لە خەڵکی کوفە کە ژمارەی سەربازەکانی گەیشتنە چل هەزار، بیست هەزاریان لە کوفە بوون و ئەوەندەی تریش لە بەصرە، وەك هاندانێك بۆ سەربازەکان و بەرزکردنەوەی گیانی مەعنەوییان موچەکانیانی پێشوەخت پێدان، پارەی تیا هەڵڕشت، کۆمەکی کردن بە چەك و ئەسپ، تاکو ئەو سوپایە ناوی سوپای تاوسەکانی لێ نرا.

ئەو پارەیەی کە خەرجی کرد بۆ ئامادەکردن و تەیارکردنی سوپاکەی بێجگە لە موچەکان بریتی بوو لە دوو ملیۆن درهەم، بۆ ئەم سوپا گەورەیە (عەبدولڕەحمانی کوڕی ئەشعەس)ی هەڵبژارد، سوپاکەی برد تا گەیشتە سەجستان، پاشان شێبن ئەشعەس لە حەجاج و عبدالملك هەڵگەڕایەوە و شۆڕشەکەی بەرپاکرد وەك پێشتر باسمان کرد، شۆڕشەکەشی لە (دیرالجماجم) کۆتایی پێهات و (سجستان)یش لەسەر دەستی سەرکردە (قتیبه بن مسلم) ئازادکرا.

هەرکام لە خەلیفەی باوك (عبدالملك) و خەلیفەی کوڕ ( ولید) فەزڵێکی گەورەیان هەبوو لە دەرکەوتنی حەجاج و ناوبانگ پەیداکردنیدا بەجۆرێك ئەوان دەسەڵاتی تەواویان پێدابوو بۆ فەرمانی تاك ڕەوانە و خۆسەپاندن وەك جێگری خەلیفە لە گرنگترین شوێن و ناوچەکانی دەوڵەتی ئەمەویدا، بەڵام ئەمە بوویە هۆی فراوانبوونی خاکی دەوڵەتەکە و بەتایبەت لە ماوەی فەرمانڕەوایەتی وەلید دا وەك باسمان کرد.

ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە پشێوی و ئاژاوەکان ڕاستەوخۆ لەدوای مردنی حەجاج دەست پێدەکاتەوە ، ڕەوشی دەوڵەتی ئەمەوی جێگیر نەبوو و ئاسایشی بەخۆیەوە نەبینی مەگەر لە ماوەی فەرمانڕەوایەتی خەلیفەی ژیر و دادپەروەر (عومەری کوڕی عەبدولعەزیز)دا نەبێت کە دادپەروەی لە دەوڵەتەکەدا جێگیر کرد و سەلماندی کە

دەتوانرێت جڵەوی وڵات و خەڵکی بکرێت و فەرمانڕەوایەتیان بکرێت بە دادپەروەری و چەسپاندنی شەریعەتی ئیسلامی نەك بە زۆر و ستەم و تاك ڕەوی وەك چۆن حەجاج و گەورەکانی لە بەنی ئومەییە وایان کرد.

■■■



نەخشەی دەوڵەتی ئەمەوی لەسەردەمی (وەلیدی کوڕی عەبدولمەلیک) دا

## خانەوادەی
## (مهلب بن أبی صفره الدوسری) و حەجاج

(مهلب کوڕی ئەبو صفرەی دوسەری) ڕۆڵێکی گرنگی هەبوو لە ژیانی حەجاجی کوڕی یوسفی سەقەفی دا، کە یەکێ بوو لەو سەرکردە گەورە سەربازیانەی کاریان کرد لە بەرژەوەندی ئیبن زوبێر و هەروەهاش بۆ ئەمەویەکان، پاش کوژراتی ئیبن زوبێر بەتێڕوانین بۆ کارامەیی و توانا سەربازیەکەی و سەرکەوتنی لە ڕووبەڕووبوونەوەی شۆڕشی هەڵگەڕاوەکان لە عێراق و ولآتی (ماوڕا النهر)، هەربۆیە حەجاج سالّی ٧٨ك – ٦٩٧ز کردی بە فەرمانڕەوای خۆراسان، پاش سەرکەوتنی لە کۆتاییهێنان بە شۆڕشی (هەلگەڕاوەکانی ئەزاریقە) موهلەب هەستا بە گرتنی کۆمەڵێك شوێن لە دەوروبەری ناوچەی (ما وڕا النهر).

(مهلب) کوڕی (أبی صفره الأزدي)ە و نازناوی خانەوادەییەکەشی (أبو سعید)ە، (یەحیای کوڕی معین) لەبارەیەوە دەڵێت: ئەو (مهلب بن أبی صفرة)یە، (مهلب کوڕی ظالم کوڕی سارق)ە و لە چینەکانی (ابن سعد)ەوە هاتووە، کە یەکێکە لە تابیعینی پێغەمبەر و سالّی (فەتحی مەککە) ٨ ك لەدایك بووە.

زنجیرەی ڕەچەڵەك و درەختی خێزانیەکەی بریتیە لە:

(مهلب) کوڕی (ئەبی صفرة –ظالم–) کوڕی (سراق) کوڕی (صحیح) کوڕی (کندە) کوڕی (عمرو) کوڕی (وائل) کوڕی (الحارب) کوڕی (العتك) کوڕی (الأسد) کوڕی (عمران) کوڕی (عمرو–مزیقاء–) کوڕی (عامر المظلوم– ماء السماء–) کوڕی (حارثة) کوڕی (امرئ القیس) کوڕی (ثعلبة) کوڕی (مازن) کوڕی (الأزد) کوڕی (غوپ) کوڕی (نبت) کوڕی

(مالك) کوڕی (یزید) کوڕی (کهلان) کوڕی (سبأ) کوڕی (یشجب) کوڕی (یعرب) کوڕی قحطان الأزدي القحطاني)ە.

موهلەبی کوڕی ئەبو صفرە زۆر سیفاتی جوان و باش و پەسەندی تێدابوو، کە لە زۆرێك لە پیاواندا نیە، گرنگترینیان ئازایەتی و توانای لەرادەبەدری شەڕکردن و بەڕێوەبردنی جەنگەکان بە توانستی و لێوەشاوەیی و بێ هاوتاییەوە، ئەو کەسەبوو کە ڕێگەی خۆش کرد بۆ ئازادکردنی ولاَتی (سند) و شاری (خجندە) لەسەر ڕووباری (سیحون) کە ئەوێ و (سمرقند) دە ڕۆژە ڕێ لێك دوورن، ئەو کەسە بوو کە ناوچەی (الختل)ی گێڕایەوە، بەردەوام ماوەی نۆزدە ساڵ بەرەنگاری هەڵگەڕاوەکان بوویەوە کە بێجگە لەو کەسی تر لە شان و شەوکەتی ئەواندا نەبوو.

یەکێك بوو لە بەخشندەترین خەڵکی زەمانی خۆی، نمونەش لەسەر ئەوە زۆرن، لەوانە: ڕۆژێك لە یەکێك لە شەڕەکان گەڕایەوە، ژنێك چاوی پێی کەوت و پێی وت: ئەی فەرماندە من ئاهم کردووە (نەزرم کردووە) کە ئەگەر تۆ بە بێوەی و سەلامەت گەڕایتەوە مانگێك بەڕۆژوو بم و کەنیزەکێکم بدەیتێ و هەزار درهەمیش، هەربۆیە (مهلب) دایە پێکەنین و وتی: ئاهەکەت بەجێ دێنیی بەلاَم جارێکی تر نەزری وا مەکە چونکە هەموو کەس بۆت بەجێ ناهێنێ.

پیاوێك لەبەرامبەری ڕاوەستا و پێی وت: پێداویستیەکی بچوکم لێت دەوێت، (مهلب)یش وتی: لەپیاوێکی بچوکی داوا بکە، واتە کەسی وەك من پێداویستی گەورە نەبێت هی تری لێ داوا ناکرێت.

(مهلب) فەرمانی بە خزمەتکارەکانی دەکرد کە کاتێك میوان لەسەر سفرە و خوانەکەی ئەمن ئاو کەم دابنێن و نان و خواردن زۆر دابنێن تاکو سکی میوانەکان بە ئاو پڕنەبێت بەڵکو بە خوراك و خواردن و تەعام پڕی بکەن.

بە ڕەحمەت بیّ یەکێك بوو لە هێمنترین و لەسەرخۆترین کەسەکان، نمونەی لەسەرخۆییەکانی: ڕۆژێك بە بەصرەدا تێپەڕی، گوێی لیّ بوو کەسێك دەیوت: ئەم (تاك چاوە[1]) سەرکردایەتی خەڵك دەکات، گەر ببرێتە بازاڕەوە سەد درهەم ناهێنێت.

پاشان (مهلب) سەد درهەمی بۆ نارد و وتی: گەر زیاترت پیّ دابا‌ین زیاترمان پیّ دەبەخشیت، کە ئەو چاوەی لە سەمەرقەند لەدەست دابوو.

زمان پاراو و ژیر و دانا بوو لە بیروبۆچوونەکانیدا، وشەی ناسك و هێمای مانابەخشی هەبوو کە ئاماژە بوو بۆ باشەکانی.

لەوانەش کاتێك کەوتە سەرەمەرگ بانگی کوڕەکانی کرد و وتی: چەند تیرێکم بۆ بێنن، کە بۆیان هێنا، بەستنی بەیەکەوە (وەك چەپکێك گوڵ بەیەکەوەی گرێیدان) ئینجا وتی ئایا دەتوانن هەموویان پێکەوە بشکێنن؟

وتیان: نەخێر.

ئەویش ووتی: دەی یەکڕیزی و یەکگرتنیش تا بەم جۆرەیە، وەسیەتتان بۆ دەکەم لەخوا بترسن و پەیوەندی خزمایەتی بەجیّ بێنن، چونکە ئەم خزمایەتیە تەمەن درێژ دەکات و ماڵ و سامان زیاد دەکات و ژمارە زۆر دەکات، نەکەن پەیوەندی خزمایەتی بپچڕێنن چونکە ئاگر بەدوایدا دێت و زەبونی و کەمبوونەوە دێنێتە ئاراوە، کەواتە یەکتریتان خۆش بوێت و کارتان بکەن بە یەك و جیامەبنەوە لەیەکتر، برزێن بەس لێك مەترازێن.

لە وتەکانی ئەوەبوو دەیگوت: سەرم سوڕماوە لە کەسێك کۆیلە دەکڕێت بە پارەکەی، بەڵام کەسی سەربەست ناکڕێت بە چاکەکانی.

هەروەها وتویەتی: حەزم دەکرد گوێیەکم هەبوایە کە سبەی مردم گوێم لیّ بووایە کە چی دەوترێت.

---

[1] . مهلب چاوێکیانی لە یەکێك لە جەنگەکاندا لەدەست دابوو.

هەروەها هاوەڵانی پێغەمبەر  خوا لێیان ڕازی بێت – ستایشیان کردووە لەو سیفات و ڕەوشتە باشانەی تیایدا بینیویانە، هەربۆیە عەبدوڵلای کوڕی زوبێر لەبارەی (مهلب)ەوە دەفەرموێت: ئەمە گەورە و سەرداری خەڵکی عێراقە.

هەروەها (قطری بن الفجاءة) لەبارەیەوە وتویەتی: ئەو لە شەڕدا شێرێکی ئازا و ڕێویەکی فێڵباز و بەلا بووە.

ئیسحاقی سەبیعی لەبارەیەوە گوتویەتی: (( فەرماندەیەکم نەبینیوە لە مهلب گیان بەختکەر تر بێت ، یان لەو ئازاتربێت لە ڕووبەڕووبوونەوەدا، یان هێندەی ئەو دور بێ لەو کەسەی ڕقی لێیەتی یان، هێندەی ئەو نزیك بێت لەو کەسەی کە چارەی دەوێت خۆشی دەوێت)).

هەروەها (المغيرة بن حبناء) هۆنراوەیەکی پیادەهۆنێتەوە و دەڵێت:

| | |
|---|---|
| أمسى العباد لعمري لاغياث لهم | إلاَّ المهلب بعد الله والمـــطر |
| هذا يجود ويحمي عن ديـــارهم | وذا يعيش به الأنعام والشجر[1] |

حەجاج (ئومەییەی کوڕی عبدالله)ی لە فەرمانڕەوایەتی خۆراسان لابردبوو و (مهلب کوڕی ئەبو صفرە)ی کردە فەرمانڕەوای، (مهلب) هەر لەوێ ساڵی ٨٢ك کۆچی دوایی کرد کە لەساڵی ٧٧ك ەوە فەرمانڕەوای ئەوێ بوو.

کاتێك هێشتا لاو بوو نیشانەکانی ئازایەتی و زیرەکی تیا بەدەرکەوتن، دەگێڕنەوە کە باوکی (مهلب) ڕۆژێك لەگەڵ دە لە کوڕەکانی ڕۆیشت ، بۆلای خەلیفە عومەری کوڕی خەتاب – خوای لێی ڕازی بێت – (مهلب) یەکێك بوو لەوان، ئینجا خەلیفە عومەر سەرسام بوو بە زیرەکی و لەخواترسانی ئەو، بە باوکی فەرموو: ئەمە گەورە و سەرداری کوڕەکانتە.

---

[1] . واتە:خەڵکی و مرۆڤەکان بوونەتە کەسانێك هیچ پشت و پەناو یارمەتیەکیان نیە لەدوای خودا بێجگە لە (مهلب) و باران.ئەمیان دەبەخشێت و ماڵ و لانەکانیان بۆ دەپارێزێت...ئەویش (باران) ئاژەڵ و درەختەکان پێی دەژین.

(مهلب) لە جیهادکردن دژی فارسەکان بەشداربوو، لە جەنگی قادسیە لەژێر سەرکردایەتی هاوەڵی بەڕێزی پێغەمبەر (سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص)دا، لەسەردەمی خەلیفە عەلی کوڕی ئەبو تالیب دا - خوا لێی ڕازی بێت - بووە یەکێك لە سەرکردەکان.

(مهلب) یەکێك بوو لە ئازاترینی کەسەکان، بەصرەی پاراست لە هەڵگەڕاوەکان، لەگەڵیان چەندین شەڕی بەناوبانگی کردووە لە ئەهواز، لەبەر ئەوە بە بەصرەیان وتووەوە (بەصرەی مهلب).

گەورەیەکی وەجاخزادە و خانەدان و شکۆدار بووە، دەگێڕنەوە کە لەسەردەمی خەلافەتی عەبدوڵای کوڕی زوبێردا دەچێت بۆلای بۆ مەککە، عبدالله بە دوقۆڵی پرس و ڕاوێژی لەگەڵ دەکات، ئینجا (عبدالله بن صفوان بن أمیه بن خلف بن وهب القرشی الجمحی) خۆی دەکات بەژوردا و دەڵێت: ئەی ئەمیری بڕواداران ئەمە کێ یە ئەمڕۆ تۆی بەخۆیەوە خەریك کردووە ؟

فەرمووی: ئایا نایناسیت؟!

وتی: نەخێر.

فەرمووی: ئەمە گەورە و سەرداری خەڵکی عێراقە!

وتی: کەواتە مهلب کوڕی ئەبو صوفرەیە!

فەرمووی: بەڵێ.

ئینجا مهلب وتی: ئەمە کێ یە ئەی ئەمیری بڕواداران؟

فەرمووی: ئەمەش گەورە و سەرداری قورەیشە.

وتی: کەواتە عبداللەی کوڕی صەفوانە.

فەرمووی: بەڵێ.

لە سەمەرقەند چاوێکی لەدەست دا کاتێك سەعیدی کوڕی عوسمانی کوڕی عەففان - خوا لێی ڕازی بێت - ئەوێی گرت، لە سەردەمی معاویەی کوڕی ئەبو سوفیان دا - خوای

لێی ڕازی بێت – کە (مهلب)ی لەگەڵی بووە لەو شەڕەدا، هەروەها لەو غەزایەدا چاوی سەعیدیش دەردەهێنرێ.

هەروەها تیایدا چاوی (طلحة بن عبدالله بن خلف الخزاعي) ناسراو بە (طلحة[1] الطلحات)ی بەناوبانگ بە بەخشندەیی و نان بدەیی دەرهێنرا، لەو بارەیەوە مهلب دەڵێت:

لئن ذهبت عيني لقد بقيت نفسي　　　وفيها بحمدالله عن تلك مايئسي

إذا ماجاء أمر الله أعيا خيولنا　　　ولابد أن تعمى العيون لدى الرمس

دەڵێن (مهلب) فەرمانڕەوای خۆراسان بووە هەتا مردن بەرۆکی گرت، کاتی سەرەمەرگ کوڕەکەی خۆی (یەزید)ی کردە جێنشینی خۆی و کاروبارەکانی پێ ڕاسپارد، پێی ووت: کوڕی خۆم زمان و چاوت ببەستەوە.

پاشان لە مانگی (ذي الحجة)ی ساڵی ٨٣ك کۆچی دوایی کرد لە گوندێك پێی دەوترا (زاغول) لە دەوروبەری (مرو الروذ) لە ویلایەتی خۆراسان، دەشڵێن ساڵی ٨٢ك مردووە.

مهلب کوڕی ئەبو صوفرە لەسەر دڵسۆزیەکەی بۆ دەوڵەت و خۆبەختکردنی لە بەرەنگاربوونەوەی هەڵگەڕاوەکاندا خەڵات کرا و کرایە فەرمانڕەوای خۆراسان ساڵی ٧٨ك، لەسەر وەسیەتی خەلیفە عەبدولمەلیك ئینجا لە پایتەختەکە (مرو) دابەزی، پاشان دەستی کرد بە گێڕانەوەی هێمنی و ئاسایش و یاسا بۆ وڵات، بۆ یەکەم جار و پاش چواردە ساڵ.

پاشان سەر لەنوێ ساڵی ٨٠ك سەرکردایەتی سوپاکانی کرد بەرەو ڕۆژهەڵات بۆ وڵاتی تورکمانستان ، مهلب بەخۆی بە ڕوباری (بلخ سيحون) دا پەڕیەوە و لە (كش) دابەزی، پاشان دەستی کرد بە پەلاماردانی وڵاتەکە بەهێرشی بەردەوام و کۆڵی نەدەدا لە جیهاد کردن، ئەسپ سوارەکانی هەندێکی لە سەمەرقەند بوون، هەندێکیشیان لە (بخارستان) و هەندێکی تریان لە (گخارستان) و هەندێکیش لە (بست) بوو.

(مهلب) یەزیدی کوڕی نارد بۆ وڵاتی (الختل)، لەسەر داخوازی و ویستی کوڕە مامی پاشا، پاشاکەی ناوی (شبل) بوو، پاشا (شبل) بەکوڕە مامەکەی زانی و کوشتی.

---

[1] . دەرەختی مۆز.

بەڵام یەزیدی کوری مهلب توانی ئامانجەکانی هەڵمەتەکەی بەدی بهێنێت، ناچاری کرد لەگەڵی رێك بکەوێت و فیدیە بدات، پاش ئەوەی لەڕووی سەربازیەوە بەزاندی و تەنگی پێ هەڵچنی لە گەمارۆدانی قەڵاکەی (شبل).

وە کوری دووەمی بەناوی (حبیب) نارد بۆ (رابنجن)، دای بەسەر فەرمانڕەوای (بخارستان) دا بە چل هەزارەوە، ئینجا بەشێك لە خەڵکی (بخاری) هەستان بە راکردن و خۆشاردنەوە لە یەکێك لە گوندەکاندا، لەوێش هەڵی کەندن و پاشان بەسەرکەوتوویی گەرایەوە بۆلای باوکی[1].

لە وەسیەتەکانی بۆ کورەکانی:

پێویستە لە شەڕدا بە حەرصەڵە و فێڵ باز بن، کە ئەوە بەسود ترە وەك لە ئازایەتی، گەر ڕووبەڕووبوونەوە هەبوو مەرگیش هەیە.... ئامۆژگاریتان دەکەم بەخوێندنەوەی قورئان و فێربوونی سوننەتەکان و ئاکاری پیاوچاکان و نەکەن چپەچپ و قسە زۆر بکەن لە کۆڕ و دانیشتنەکانتاندا[2].

پاش مردنی مهلب حەجاج کورەکەی کردە فەرمانڕەوای خۆراسان، یەزید ساڵی ٨٤ك هەستا بە گرتنی قەڵای (باذنجس یان بازغیس)، کە (نیزك) لەوێ بارگەی خستبوو، پاش ئەوەی چاوی خستە سەر و دڵنیا بوو لە چۆڵ بوونی قەڵاکە بە دەرچوونی (نیزك) لێی بۆی چوو و گەمارۆی قەڵاکەی دا و گرتنی مسۆگەر کرد، هەروەها دەستی گرت بەسەر هەرچی لەناویدا بوو لە ماڵ و سامان و چەك و شمەك.

پاشان حەجاج یەزیدی کوڕ مهلبی لەسەر کار لابرد و بەندی کرد و براکەی خۆی (مفضل) ی کردە فەرمانڕەوای خۆراسان ئەوەش ساڵی ٨٥ك بوو، بۆ ماوەی نۆ مانگ، لەو ماوەیەدا هەستا بە پەلاماردانی (باذنجس) و گرتنی و هەروەها پەلاماری (أخرون) و (شومان)یشی دا و دەستی بەسەردا گرتن.

پاشان حەجاج ئەمیشی لابرد و (قتیبة بن مسلم الباهلی) لەجێگەی دانا لە خۆراسان.

---

[1] - سەیری (الكامل في التأريخ) بكە.

[2] -سەیری (التأريخ الطبري) بكە.

## (قتيبة بن مسلم الباهلي)
# ئەو سەرکردەیەی کە کوشتن و دڵسۆزیشی بۆ حەجاج بوو

(قتیبە) کوڕی (مسلم) کوڕی (عمرو) کوڕی (حصین) کوڕی (الأمیر) کوڕی (أبو حفص الباهلی)ە، باوکی کە موسلیمی کوڕی عەمرە یەکێك بوو لە هاوەڵانی (مصعب کوڕی زبێـر)ی فـەرمانڕەوای عێـراق کـە لەلایەن(عبـدالله کـوڕی زوبێـر)ی برایـەوە دانرابـوو، شانبەشانی ئەو شەڕی کرد لە جەنگی دژ بە عەبدولمەلیکی کوڕی مەڕوان داساڵی ٧٢ك.

قوتەیبە لەسەر پشتی ئەسپەکان و هاوڕێ لەگەڵ شمشێر و ڕمبازیدا گەورەبوو، حەزی لـە سوارچـاکی بـوو، ناوچـەی عێـراق بـەناوبانگ بـوو بـە زۆریـی ئـاژاوە و پشـێوی و شۆڕشەکان، لەبەر ئەوە هەموو فەرمانڕەواکانی عێراق کاریـان دەکـرد بـۆ خـەریك کردنـی خەڵکەکەی بە غەزاکانـەوە بـۆ بەکارخسـتنی وزە جەنگیـەکانیان لـە خزمـەتی ئیسلام و بڵاوکردنەوەی بانگەوازی ئیسلام دا.

خاکی عێراق بنکەی لێوە دەرچوونی هەڵمەت و هێرشـە سـەربازیەکان بـوو لەبـەرەی ڕۆژهەڵاتی دەوڵەتی ئیسلامیەوە، قوتەیبـە هـەر لـە سـەرەتای لاویـەوە لـەم هەڵمەتانـەدا بەشداری کرد و ئازایەتیەکی لەڕادەبەدەر و بەهرەیەکی سـەرکردایەتی نـاوازەی نیشـاندا، سەرنجی هەمووانی بەلای خۆیدا ڕاکێشا بەتایبەتی (مهلب بن أبي صفرە) کـە شـارەزابوو لە ناسینی پاڵەوان و کانزای پیاوەکاندا و لێی خوێنـدەوە و تێـی ڕوانـی کـە ئـەو دەبێتـە یەکێك لە گەورەترین پیاوەکانی ئیسلام، پێشنیاری کرد بۆ حـەجاجی کـوڕی یوسف کـە پاڵەوان و ئازاکانی خۆشدەویست، هەندێك ئەرکی پـێ سپارد تـاکو تـاقی بکاتـەوە پێـی، ڕادەی دروستی هەڵبژاردنەکەی (مهلب) بزانێت لەبارەیەوە.

سەرکردەی فتوحاتە ئیسلامیەکانی کرد لە وڵاتانی ئاسیای ناوەڕاست لە سەردەمی حەجاج دا پاش ئەوەی کە وڵاتی خۆراسانی دایە دەستی لە ساڵی ٨٦ك دا پاش لابردنی (مفضل بن المهلب بن أبي صفره) وەك باسمان کرد.

لە خانەی فەرمانڕەوایەتی و سەرکردایەتی لە ساڵی ٤٩ك لە خاکی عێراق لەدایك بوو، کاتێك پێ گەیی زانستەکان و فیقە و قورئان فێربوو، پاشان فێری ئەسپ سواری و هونەرەکانی جەنگ بوو، کەهێشتا گەنجێکی تازە لاو بوو بلیمەتی و هەڵکەوتوویی تێدا دەرکەوت، دەستی گرت بەسەر خۆراساندا کە ئەو کات کاربەدەستی حەجاج بوو و لەژێر فەرمان و فەرمانڕەوایەتی حەجاج دا بوو، گوێی بەهیچ نەدەدا بێجگە لە جیهاد کردن.

کاتێك گەیشتە خۆراسان ساڵی ٨٦ك بە هەوڵ و هیمەتیەوە لە شەڕی (ماوراء النهرين) دا سەرکەوت لە خۆراسان نیشتەجێ بوو و سیانزە ساڵ مایەوە، ئینجا دەستی کرد بە ڕۆیشتن بۆ گرتنی هەموو ڕۆژهەڵات، ئینجا (مەدائن)ی ئازاد کرد هەروەك (خوارزم ) و (سجستان)، تا گەیشتە (سەمەرقەند) و گەمارۆیەکی توندی خستە سەر، ئینجا خەڵکەکەی ڕێککەوتن لەگەڵی بۆ پێدانی سەرانە.

(صفد) ڕوبەڕووی بوونەوە و کۆبوونەوە لەدژی و ئەویش شەڕی کرد لەگەڵیان لە (شومان) شەڕێکی قورس و ترسناك تاکو تێکی شکاندن، ئینجا ڕۆی بەرەو (بیکند) کە کۆتا شاری (بوخارستان)ە و کۆمەڵیان بەست بۆی لە (صغد) و ناوچەکانی دواتر، لە هەموو لایەکەوە دەوریان دا، سیخوڕی هەبوو لەناو دوژمن هەواڵیان بۆ دەهێنا، ئینجا دوژمن پارەیەکی زۆری پێدان تاکو (قوتەیبە) وازیان لێ بهێنێت، ئەوانیش هاتن و خاویان دەکردەوە لە شەڕکردن و بەربەستیان بۆ دروست دەکرد، ئەویش کوشتنی، پاشان سوپاکەی کۆکردەوە و وتارێکی بۆدان و هانی دان بۆ شەڕکردن، هەربۆیە شەڕێکی توندیان کرد، ناوچەی (طوق)یان گرت و سامان و دەستەکەوتێکیان کە مەزەندە ناکرێت بەدەستیان هێنا.

پاشان ڕوی کردە صین، ئەو شارانەی کە لە دەوروبەریدا بوو هەمووی ئازاد کرد، سەرکەوت بەسەریدا، سەرانەی لەسەر دانان، ئینجا وڵاتی (ماوط النهرين) هەمووی کەوتە

دەستی و خۆیان دا بەدەستەوە تاکو گەیشتە شوراکەی صین، سیانزە ساڵ شەڕی کرد، چەکی تیا دانەنا، تاکو ئەوکاتەی کە خەلیفە وەلیدی کوڕی عەبدولمەلیک مرد، (سولەیمانی کوڕی عەبدولمەلیک)ی برای لەدوای خۆی کردە جێنشین، لەنێوانیاندا ناکۆکیەك هەبوو، ویشتی شۆڕش بەرپا بکات لەدژی سولەیمان هەربۆیە لەنێوانیاندا ناکۆکیەکی توند ڕویدا و یەکێك لەسەربازەکانی خۆی سالّی ٩٦ك لە شارێك کە ناوی (فرغانة) بوو کوشتی.

قوتەیبە لەسەر هەمان نەخشەی خێزان و خانەوادەی (مهلب) دەڕۆیشت، کە بریتی بوو لە نەخشە و پلانی لێدانە خێرا و بەهێز و یەك لەدوای یەکەکان لە دوژمن، ماوەی نەدەدانێ بۆ کۆبوونەوە و پلان دانان بۆ پەرچدانەوەی هێرشی سەر موسوڵمانان، بەلآم لەوەدا باشتر بوو لە (مهلب) کە بۆ هەموو هەڵمەتێك نەخشەیەکی جیاوازی دادەنا، کە ئامانج و مەبەستێکی دیاریکراوی هەبوو، پاشان هەموو هێزی خۆی دەنارد بۆ گەیشتن بە ئامانجەکەی.

قوتەیبەی کوڕی موسلیم هەستا بە دابەشکردنی کارەکانی بەسەر چوار قۆناغدا، لە هەرکام لەو قۆناغانەدا گرتنی لایەك و ناوچەیەکی فراوانی تیا بەدی هێنا کە جێپێی دەوڵەتی ئەمەوی تیا جێگیر بوو، کە بەم جۆرە بوو:

**قۆناغی یەکەم:**

قوتەیبە لەم قۆناغەدا هەستا بە هەڵمەتی هێرشکردنە سەر (طخارستان)ی خواروو و گێڕایەوە ژێر ڕکێفی دەوڵەتی ئەمەوی، ئەوەش سالّی ٨٦ك ڕویدا، (طخارستان) ی خواروو ئێستا بەشێکە لە ئەفغانستان و پاکستان.

**قۆناغی دووەم:**

تیایدا سەرکردایەتی هەڵمەتەکەی کرد بۆ سەر (بوخارا) – کە ئێستا دەکەوێتە ئۆزبەکستانەوە – لەنێوان سالّی ٨٨– ٩٠ك، لەو ماوەیەدا بخارای گرت لەگەڵ گوند و قەلآکانی چواردەوری، کە یەکێك بوو لە گرنگترین شار و ولآتەکانی (ماوراء النهر) و چڕترینیان لەڕوی دانیشتوانەوە و پارێزراوترینیان بەهۆی قەلآکانەوە.

**قۆناغی سێیەم:**

بەردەوام بوو لە ساڵی ٩١ ك ٩٣ك، کە تیایدا قوتەیبە توانی ئیسلام بڵاو بکاتەوە و بیچەسپێنێت لە دۆڵی ڕووباری – جیحون– دا بەگشتی، هەرێمی سەجستانی گرت کە ئێستا لە ئێرانە، هەروەها ناوچەی (خوارزم) و پەلی هاویشت و گەیشتە (سەمەرقەند) لە ناوجەرگەی ئاسیا و لکاندنی بە دەوڵەتی ئەمەویەوە.

**قۆناغی چوارەم:**

لە ساڵی ٩٤ – ٩٦ك درێژەی کێشا، تیایدا قوتەیبە ناوچەی ڕووباری (جیحون) ی گرت بەو شارانەشەوە کە لەناویدا هەبوون، پاشان چووە خاکی صینەوە، پێی خستە ناویەوە و گەیشتە شاری (کاشغر) و کردیە بنکەیەکی ئیسلامی، ئەوەش کۆتا ناوچەبوو کە سوپای ئیسلامی پێ گەیشت لە ئاسیا لە ڕۆژهەلاتەوە، هیچ کام لە موسوڵمانان هەرگیز لەدوای ئەو نەگەیشتە ناوچەیەکی دوورتر لەوێ.

کاتێك موسوڵمانە یەکەمینەکان هەستان بە بزوتنەوەی فەتحی ئیسلامی لە ڕۆژهەلات دا دوو جۆر ڕەگەزی مرۆیی هەبوون لەم ناوچەیە نیشتەجێ بوون، خێڵە ساسانیەکان (فارس) و خێڵە تورکەکان، ڕوباری (المرغاب) بەربەستی جیاکەرەوەی نێوان هەردووکیان بوو، خێڵە فارسیەکان لەسەردەمی خەلیفەکانی ڕاشیدین دا هاتنە نێو ئیسلامەوە.

بەلام خێڵەکانی تورك کە زۆرترینیان لە ژمارە و بەربڵاوترینیان تورکەکانی (الغزیة) و تورکەکانی (القراخطای) و تورکەکانی (قەوقاز) و تورکەکانی (الأیجور) و تورکەکانی (البلغار) و تورکەکانی (المغول) بوون.

قوتەیبە توانی ئەو ولاتانە داگیر بکات کە ئەمڕۆ ناویان (کۆمارەکانی ئیسلامی)ە، کە لەناو یەکیەتی سۆڤیەتدا بوو، چوو هەتا سنورەکانی صین، هیچ شتێك هێرش و هەڵمەتەکانی نەوەستاند مردنی حەجاج نەبێت پاشان خەلیفە وەلیدی کوڕی عەبدولمەلیك کە براکەی (سلیمانی کوڕی عەبدولمەلیك)ی کردە جێنشینی خۆی، ئیدی ئەوەبوو ڕقی لە قوتەیبە بوو، چونکە ئەو لایەنگری وەلید بوو کاتێك ویستی براکەی لە فەرمانڕەوایەتی هێند لابدات.

## کوژرانی قوتەیبەی کوڕی موسلیم - بەڕەحمەت بێت

(ئیبن کثیر) لە پەرتوکی (البداية والنهاية) باسی کوژرانی قوتەیبەی کردووە لە ڕوداوەکانی ساڵی ٩٦کۆچی دا و دەڵێت:

ئەوەبوو سەرباز و سوپاکانی کۆکردەوە و بڕیاری دا سولەیمانی کوڕی عەبدولمەلیک لە خەلیفایەتی لابدات و لێی هەڵبگەڕێتەوە، باسی هەوڵ و شەڕەکانی و دادپەروەری خۆی و پێدانی پارەی زۆری بۆکردن، کاتێك لە قسەکەی تەواو بوو کەس گوێی بە قسەکانی نەدا، ئینجا دەستی کرد بە لۆمە و سەرزەنشتیان، دەستە دەستە و کۆمەڵ کۆمەڵ، ئەوانیش بەوە تووڕە بوون و لێی دورکەوتنەوە و خۆیان جیاکردەوە، کاریان یەکخست بۆ سەرپێچیکردنی، هەوڵی کوشتنیان دا، ئەوەی کەبەو بەرپرسیاریەتیە هەستا پیاوێك بوو پێیان دەوت: (وكيع بن أبي أسود)، کۆمەڵێکی زۆری کۆکردەوە، پاشان لێی ڕاپەڕی وازی لێنەهێنا تاکو لە مانگی (ذي الحجة)ی هەمان ساڵدا کوشتی، هەروەها لەگەڵ ئەودا یانزە پیاو لە برا و برازاکانیشی کوشت.

کەسیان نەمایەوە بێجگە لە (ضرار بن مسلم)، دایکی (غراء بنت ضرار بن القعقاع بن معبد بن سعد بن زرارة) بوو، خاڵۆکانی پاراستیان، هەروەها (عەمری کوڕی مسلم) کاربەدەستی (جوزجان) بوو.

قوتەیبە و عبدالرحمن و عبدالله و عبيدالله و صالح و یەسار ئەوانە کوڕانی مسلم بوون و چوار لە کوڕەکانیشیان هەموویان وەکیعی کوڕی ئەسوەد کوشتنی.

قوتەیبەی کوڕی موسلیم یەکێك بوو لەگەورە فەرماندە و باشترینەکانیان، یەکێك بوو لە سەرکردە وەجاخزادە و گەورەکان، ئازا و بەجەرگ و خاوەن جەنگ و سەرکەوتنە

شادی بەخش و بیروبۆچونە پەسەندەکان بوو، خوای گەورە لەسەر دەستی ئەودا خەڵکێکی زۆری هیدایەت دا کە تەنها خوا ژمارەیان دەزانێت، موسوڵمان بوون و خوایان ناسی، زۆرێك لە وڵات و ناوچە گەورەکان و شارە مەزنەکانی ئازادکرد وەك باسکرا، خوای گەورە هەوڵ و کۆششەکەی لێ وون نابێت و ماندوبوون و جیهادەکەی بێ بەر ناکات.

بەڵام پێی هەڵخلیسکا هەڵخلیسکانێك کە مردنەکەی لەوەدا بوو، کارێکی کرد لوتی تیایدا شکا، هەڵگەڕایەوە و مەرگی خۆی پێشخست، لە کۆمەڵ جیابوویەوە و یەکڕیزی موسوڵمانانی تێکدا، بەڵام پێش خۆی کارە باشەکانی ناردوە کە خوای گەورە خراپەکانی پێ دەسڕێتەوە، باشەکانی پێ زیاد دەکات، خوا دەیبەخشێ و لێی خۆش دەبێت ، — ان شا الله — خوا ئەو فێڵ و هونەرانەی کە لە بەرەنگاربوونەوەی دوژمناندا بەکاری دەهێنا لێ وەردەگرێت.

مردنەکەی لە (فرغانة) بوو لەوبەری وڵاتی خوراسان، لە مانگی (ذي الحجة)ی ساڵی ٩٦ك، کە تەمەنی ٤٨ ساڵ بوو، باوکی (أبو صالح مسلم) یەکێك بوو لەوانەی کە لەگەڵ موصعەبی کوڕی زوبێر دا کوژرا.

ماوەی فەرمانڕەوایەتی ئەو لە خوراسان دە ساڵ بوو، سود و قازانج و خێرێکی زۆری بەخۆی و بەو ناوچەیەش گەیاند.

# چارەنوسی بکوژەکەی قوتەیبە

(وكيع بن أسود) بکوژی قوتەیبە و خانەوادەکەی بوو، کەللە سەری قوتەیبەی نارد بۆ خەلیفە (سليمان) و پایە و بەختیاری لای ئەوەوە بەدەستهێنا، هەروەها (سليمان) بە فەرمانی خۆی کردی بە فەرمانڕەوای خۆراسان وەك بەخشش و دیاریەك بۆ ئەوەی کە کردی.

بەڵام خوای گەورە ویستی وا بوو ڕاستی ئاشکرا بێت و سزای ناپاکە بکوژەکە بدات، لەوکاتە دا (يزيد بن المهلب) دەیویست بگەڕێتەوە سەر کاری خۆی کە فەرمانڕەوای خۆراسان بوو پێشتر و حەجاج لای بردبوو، هەربۆیە وەفدێکی نارد بۆ لای خەلیفە بەسەرکردایەتی (عبدالرحمن بن الأهتم) تاکو بەباش ناوی بهێنن و بەرگری لێ بکەن لای خەلیفە بۆ وەرگرتنەوەی خۆراسان و پێگە و کاری وەکیعی بکوژی قوتەیبەش بێننە خوارێ و بەکەم باسی بکەن.

هەر بەڕاستیش وابوو (ئیبن ئەهتەم) ئیشەکەی خۆی بە سەرکەتوویی ئەنجام دا، کە کەسێکی مێڵ باز و زیرەك بوو، وازی لە خەلیفە نەهێنا تاکو وەکیعی لە سەر کاری خۆراسان لابرد پاش نزیکەی دە مانگ لە فەرمانڕەوایەتی کردنی، (یەزیدی کوڕی مهلب)ی کردە فەرمانڕەوای ئەوێ و عێراقیش.

سلیمان ناردی بەدوای وەکیع دا و فەرمانێکی لەگەڵ نێردەکە ناردبوو بۆ دەستگیرکردنی وەکیع، چونکە بۆ خەلیفە دەرکەوت کە وەکیع فێڵی لێکردووە لەوەی کە گوایا قوتەیبە لێی هەڵگەڕاوەتەوە، بۆی دەرکەوت کە خێڵی (قیس) ڕاستی بۆچون کە

قوتەیبـەی کـوڕی مسـلم وازی لـە گوێڕایـەڵی خەلیفـە سـلیمان نـەهێناوە و لێـی هەڵنەگەڕاوەتەوە.

خەلیفە فەرمانی کرد وەکیع دەستگیر بکرێت و بە کۆت و بەندکراوی بینرێن بۆلای.

ئینجا (مخلد بن یزید بن المهلب) بۆی چوو و وەکیعی گرت و بەندی کرد و پاشان (یزید بن المهلب) چوو بۆ وەرگرتنی خۆراسان و تیایدا نیشتەجێ بوو.

بەم جۆرە بوو پاداشتی وەکیع کوڕی ئەبی ئەسوەد کە سەرکردایەتی ئاژاوەکەی کرد دژی قوتەیبە و هەستا بە ئەنجامدانی قەسابخانەیەکی قێزەون، کە تیایدا خانـەوادەی قوتەیبەی لەناوبرد و قەلاچۆی کردن، کردەوەگەلێکی ئەنجام دا کە خوا و پێغەمبەرەکەی پێی ڕازی نین، وای لە خەلیفە گەیاند کە قوتەیبە لێی هەڵگەڕاوەتەوە، جا چەند مانگێك تێ نەپەڕی و ڕاستیەکەی دەرکەوت، بەڵام پاش کوژرانی ئەو سەرکردە موسوڵمانە، کە لەسەر دەستی ئەو چەندین فەتح کرا و خزمەتێکی زۆری بە ئیسلام کرد.

هەرچی (ئیبن ئەهتەم)یشە (یەزیدی کوڕی مهلب) بەڵێنی سەد هەزار درهەمی پێدا، بـەڵام بەڵێنەکـەی نـەبردە سـەر......هەمیشـە سیاسـەت و دەسـەڵات ئابـەم جـۆرە بووە...!!.

# سەرکردە (محمدی کوڕی قاسمی سەقەف) و ئازادکردنی (السند) - پاکستان - و هیندستان و کۆتاییهاتنی پاش مردنی حەجاج

ولاتی (سند) پاکستان و هیندستان عەرەب هەر لە سەردەمی خەلیفەکانی ڕاشیدینەوە پێـی ئاشـنابوون، پـاش گرتنـی ولاتـی فـارس و هـەلاتنی (کیسـرا)ی پاشـای فـارس و پەنابردنی بۆ پاشاکانی دراوسێی ولاتەکەی، لەسەروشیانەوە پاشای (السـند) پاکسـتان، بەجۆرێك ئەم پاشایە هاوکاری (کیسرا)ی فارسی کرد بە ماڵ و سامان و چەك؛ (البلاذري) باسـی دەسـپێکی هەڵمەتـەکانی ئیسـلامی کـردووە بۆسـەر ولاتـی (سـند) پاکسـتان لـە سەردەمی خەلیفەی ڕاشید (عومەری کوڕی خەتاب)دا، پاشان لەسەردەمی پێشەوا عـەلی کوڕی ئەبو تالیب دا[1].

(بلاذري) لە پەرتوکی (فتوح البلدان) دا باسی کردووە کە ئەو هۆکارانەی بوونـە هـۆی ئـەوەی موسـوڵمانان ولاتـی (سـند) ئـازاد بکـەن بـریتی بـوو لـەوەی بۆیـان دەرکـەوت هاوپەیمانێتی لە نێوان (سند) و (تـورك) هەیـە، بـەجۆرێك (مهلب بـن أبـی صـفرە) دەری خست کە لە سەردەمی معاویەی کوڕی ئەبو سوفیان دا هـەژدە ئەسـپ سـواری تـورك لـە شاری (قەیقان)ی هیند بوون.

---

١ . سەیری ( فتوح البلدان) ی (بلاذري) بکە، ولاتـی (سـند) لای عـەرەب دەکرێت بـە دوو ناوچـەوە، ئـەوانیش (هەرێمی ڕۆژهەلاتی چیای سلیمان) کە ئێستا بە (سند و سجاب ) ناسراوە و هەرێمێکی بە پیت و بە گەشـەیە و شوێنی نیشتەجێ بوونـە، ناوچـەکەی تـر دەکەوێتـە (ڕۆژئـاوای چیای سلیمان) کە ئـەمڕۆ بـە ئەفغانستان و بلوچستان ناسراوە کە ناوچەیەکی وشك و بێ ئاو و ڕەقان و پڕ لە شاخە ، کە بێ پیتە و هیچی لێ ناڕوێت.

ئەوەش بوویە هۆی ناردنی چەند هەڵمەتێکی سەربازی بەسەرکردایەتی (عبدالله کوڕی سوار) و (سەنان کوڕی سەلەمەی کوڕی حبق الهذلي) و (مکران) ئازادکرا و کردی بە یەکێك لە شارە ئیسلامیەکان.

هۆکارێکی گرنگتر لەوە ئەوە بوو کە لەسەردەمی هەڵگەڕاوەکاندا هەندێك لە چەتە و ڕێگرەکانی هیند هەڵیان کوتایە سەر کەشتیەك کە ئافرەتی موسوڵمانانی هەڵگرتبوو و پاشای دوورگەی (یاقوت) ناردبوونی بۆلای حەجاجی سەقەفی و یەکێك لە ئافرەتەکانی ناویان بە دەنگی بەرز هاواری کرد ، هۆی حەجاج لەکوێی؟.

هەواڵەکە گەیشتەوە بە حەجاج و ئەویش ووتی: بەڵێ سەرم لە ڕێتە و ئامادەم[1].

حەجاج ناردی بۆلای پاشای هیند (واهر) و داوای لێکرد ئافرەتە موسوڵمانەکان ئازاد بکات، ئەویش گوتی: کۆمەڵێك دز و ڕێگر گرتویانن کە توانام ناشکێ بەسەریاندا.

هەربۆیە حەجاج (عبیدالله کوڕی بنهان)ی نارد بۆ (دیبل) – کە بریتیە لە شاری کراتشیە – بەڵام کوشتیان، ئینجا دووبارە فەرمانی کردەوە بەسەر (بدیل کوڕی طهفة

---

[1] پەرتوکە مێژووییەکان باسیان کردووە کە ئەم ڕوداوە ساڵی ٨٨ك ڕویداوە کە کەشتیەکی عەرەبی لە دوورگەی یاقوتەوە – وڵاتی سیلان – هاتبوو کۆمەڵێك ئافرەتی موسوڵمانی لەسەر بوو کە باوکیان مردبوو بەخێوکەریان نەمابوو لەوێندەر، هەربۆیە بڕیاری گەشتکردن دەدەن بۆ نیشتەجێ بوون لە عێراق، پاشای سیلان ئەمەی بە دەرفەت زانی بۆ نزیك بوونەوە لە عەرەب هەربۆیە ڕازی بوو بە گەشتەکەیان، چەندین خەڵات و دیاری کردە کەشتیەکەوە و بۆ حەجاج و خەلیفە وەلیدی کوڕی عبدالملك.

کاتێك کەشتیەکە لەڕێگادا بوو بۆ بەندەری بەصرە، بە بەندەری (دیبل)ی وڵاتی (سند) پاکستان دا تێپەڕی هەندێك ڕێگر لە (سند)ەوە دەرپەڕین بۆیان و دەستیان گرت بەسەریدا.

ئینجا حەجاج نامەی نوسی بۆ پاشای (سند) داوای لێکرد ئافرەتە موسوڵمانەکان و کەشتیەکەش بەر بدات کەچی ئەو داوای لێبوردنی کرد بەبیانوی ئەوەی کە ڕفێنەرەکان چەتە و ڕێگرەکانن و دەسەڵاتیان نیە بەسەریاندا.

پاشان حەجاج زانی و بۆی دەرکەوت کە ئافرەتەکان لە بەندیخانەی شای (السند) لە بەندیخانەی (دیبل) بەندکراون، هەربۆیە حەجاج چەند هەڵمەتێکی یەك بەدوای یەکی ڕەوانە کرد بۆ ئازادکردنی ئافرەتە موسوڵمانەکات، تەنانە سوپایەکی ڕەوانە کرد بە سەرکردایەتی (محمد کوڕی قاسم) ئەو ناوچەیەی گرت و سەرکەوتنی بەدەستهێنا.

البجلي) كه لـه عەممانـەوه بـڕوات بـۆ (دیبـل) ئـەویش ڕۆی، بـەڵام هینـدەكان توانیـان گەمارۆی بدەن و هەروەها ئەویش بكوژن.

لێرەوه حەجاج ساڵی ٨٩ك ئەم سەركرده گەنجه كـەم تەمەنـەی نـارد (محمدی كـوڕی قاسمی سەقەفی) تاكو سەركردایەتی سوپایەك بكـات بـۆ گرتنـی ولاّتـی (سـند) و (هند) ، هەروەها شەش هـەزار جەنگاوەری لـه شـام بـۆ كۆكردەوه بـه باشـترین شـێوه تـەیار و ئامادەی كردن.

ئەو سەركرده گەنجه (محمد كوڕی قاسمی سەقەفی) كێیه كـه ڕەوانـەی (سـند) كـرا بـۆ داگیركردنی لەكاتێكدا ئەو هێشتا تەمەنی حەڤده ساڵ بوو؟

بریتیه له سەركردەی گەنج (محمد) ی كوڕی (قاسـم) كـوڕی (محمـد) كـوڕی (حەكـەم) كوڕی (ئەبی عەقیل)ی سەقەفی، ساڵی ٧٢ك له عێراق لەدایك بووه، (قاسم)ی باوكی هـات بۆ عێراق بۆ بەشداریكردن لـه جەنگی نێـوان ئـیبن زوبێـر و عەبدولمەلیك دا هـەر لـەوێ مایەوه و نیشتەجێ بوو، شایانی باسه ئەو كوڕی مامی حەجاجی سەقەفی بوو.

خانەوادەی محمدی كـوڕی قاسـم بـەوه بـەناوبانگ بـوون كـه خانـەوادەی سـەركرده و فەرمانده و ئەمیرەكان، هەربۆیه ئەم گەنجه هـەر لەمنداڵیـەوه ناوبـانگی بـه ئازایـەتی و بەجەرگی ڕۆیشتبوو و تەنانەت شاعیرێك له بارەیەوه دەیووت:

إن المنـايا أصبـحت مـختالة ..........بمحمد بن القاسم بن مـحمد

ساس الجيوش لسبع عشرة حجة ........يا قرب ذلك سؤدداً من مولد

حەجاج باوكی محمد (قاسم)ی كـرده فـەرمانڕەوای بەصـره[1]، (محمـد)یش هـەر لـەوێ گەورەبوو و هەروەهاش له شاری (واسط) كه حەجاج دروستی كرد.

---

[1] . باوكی محمدی كوڕی قاسم و مامی حەجاجیش بوو لەهەمان كاتدا.

حەجاج محمدی کوڕی قاسمی هەڵبژارد بۆ سەرکردایەتی سوپاکەی گرتنی (سند) و (هیند) کە هێشتا تەمەنی حەفدە ساڵ بوو، ئەو ساڵەش ساڵی ٨٩ك بوو، بەجۆرێك وەرزی شکۆمەندی و پاڵەوانێتی لە ژیانی ئەم سەرکردە بچوکەدا دەستی پێکرد.

کاتێك محمدی کوڕی قاسم سەرکردایەتی هەڵمەتە جیهادیە ئاراستەکراوەکەی وڵاتی (سند) پاکستان و هیندستانی کرد چەند مەرجێکی بۆ حەجاج دانا کە بەڵگەن لەسەر رادەی توانا و لێوەشاوەیی سەرکردایەتی و پاڵەوانێتی محمدی کوڕی قاسم لەوانەش:

- سوپاکە بەتەواوی تەیار و ئامادەباش و بە تفاق بێت، تاکو رێڕەوی ئازادکردنەکە نەوەستێنێت، هەربۆیە حەجاج سوپایەکی پێدا کە بە شەش هەزار جەنگاوەری ئامادە بەهەموو شتێکەوە دەخەملا تەنانەت وشتر و ئەسپیان پێ بوو، هەر بەڕاستی حەجاج ئەو سوپایەی ئامادەکرد بەهەموو شتێکەوە.
- شانبەشانی سوپاکە وشکانیەکە سوپا و کەشتیگەلێکی دەریایی لەگەڵیدا یاوەر بێت بۆ ئەوەی هێرشەکە تێکەڵ بێت و لە دوو تۆڵەوە بێت، حەجاج رازی بەو مەرجەش رازی دەبێت.
- جیهادکردنە بەردەوام بێت تاکو لە ئازادکردنی (سند) پاکستان تەواو دەبێت، دیسان حەجاج رازی بوو.

دوای ئەوە شەش هەزار سەربازی تر هاتنە سوپاکەی محمدی کوڕی قاسمەوە لە (شیراز) ئیدی ژمارەی سوپاکەی گەیشتە ١٢ هەزار جەنگاوەر و ڕۆیشتن بەرەو وڵاتی (سند) پاکستان.

ڕۆیشتنی محمدی کوڕی قاسم بۆ ئەو فەتحە پیرۆزە دوو ئامانجی نزیك و دوری هەبوو، نزیکەکەیان تۆڵەسەندنەوە لە هەریەك لە (داهر) ی بت پەرستی پاشای (سند) کە موسوڵمانەکانی لە خاکەکەی خۆیدا کوشت و هەروەها تۆڵەسەندنەوە لە (محمد بن هارون النمری)، ئامانجە دورەکەش گرتنی وڵاتی سەند و ئەوەی لەدوای ئەوە دەبێت لە وڵاتی هیندستان و بڵاوکردنەوەی ئیسلام لەم ناوچە بەرفراوانەدا.

محمدی کوڕی قاسم بە سوپا بەهێزەکەیەوە جوڵا بەرەو (مەکران) چەند ڕۆژێك تیایدا مایەوە، هێزەکەی کۆکردەوە پاش ڕۆیشتنێکی دوورودرێژ، ئەوەش بۆ گرتنی شاری (دیبل) قایمترین شاری (سند)، لەڕێگەکەیدا بەرەو ئەوێ شاری (قنزبور) و (أرمائیل)ی گرت، پاشان بەردەوام بوو لە ڕۆیشتن تاکو لە شاری (دیبل) دابەزی، ئەو ڕۆژە ڕۆژی هەینی بوو، کەشتیگەلە دەریارییەکان ئامێر و کەرەستەکانی گەمارۆدانیان بۆ هێنان لەناو ئەوانەشدا ئەو ئاگربار (مەنجەنیق)ە گەورەیە بوو کە ناسرابوو بە (العروس) (مەنجەنیقی بوك) کە پێویستی بە ٥٠٠ پیاو هەبوو بۆ ئیش پێکردنی.

محمدی کوڕی قاسم ئابلۆقەیەکی قورسی خستە سەر شاری (الحصینة)، هندۆسەکان کۆڵیان نەدا لەبەرگریکردن لە شارەکەیان، محمدی کوڕی قاسم بیری لە بیرۆکەیەکی بلیمەتانە کردەوە بۆ ئازادکردنی شارەکە، لەوێندەر پەرستگایەکی زۆر گەورە هەبوو بۆ بتێکی ناسراوی خۆیان، لەسەر لوتکەکەی (دارئاڵایەك)ی زۆر درێژ هەبوو کە کۆتاییەکەی ئاڵایەکی سوری گەورەی پێوە بوو، کە با هەڵی دەکرد ئەم ئاڵایە دەکەوتە جوڵە وەك ئەوەی پانکەیەك بخولێتەوە، لای ئەوان شتێکی پیرۆز بوو، هەربۆیە محمدی کوڕی قاسم فەرمانی کرد بە ئاڕاستەکردنی بەردە گەرم و ئاگرینەکانی مەنجەنیقەکە بۆ ئەم دارئاڵایە تاکو شکاندی، ئەو دەیزانی کە هندۆسەکان ڕەش بین لەو دیاردەیە و ورەیان دەڕوخێت.

هەر بەڕاستی لەگەڵ شکانی دارئاڵەکەدا ورەی بێ باوەڕانیش هاڕەی کرد و موسوڵمانەکان سەرکەوتن بەسەر شارەکەدا، پاش شەڕێکی قورس گرتنیان ، ئیدی محمدی کوڕی قاسم مزگەوتێکی لێ دروست کرد، چوار هەزار موسوڵمانی هێنا و لەو شارە نیشتەجێی کردن بۆ دڵنیابوون لە موسوڵمان بوونی ئەم شارە و سڕینەوەی ناسنامەی بتپەرستی.

پاش گرتنی شاری (دیبل)ی بەهێزترین و قایمترین قەڵا و شاری پاکستان، محمدی کوڕی قاسم درێژەی دا بە ڕۆیشتنەکەی، بیدایە بەلای هەر شارێکدا دەیگرت، پەرستگای بتپەرستەکانی (وثني) و بوزی هەموو دەڕوخاند، دروشمەکانی ئیسلامی تیا جێگر دەکرد

و موسوڵمانی تیا نیشتەجێ دەکرد و مزگەوتی تیا دروست دەکرد، تاکو نەخشەی وڵاتی بەتەواوی گۆڕی و بە ڕەنگێکی ئیسلامیی تەواو ڕەنگی کرد.

محمەدی کوڕی قاسم توانی هندۆسەکان سەرسام بکات بە کەسێتیە بەهێز و بەجەرگەکەی، سەریان سوڕما لە ئازایەتی و سەرکردایەتیکردنە باشەکەی بۆ سوپایەکی هێندە گەورە کە هێشتا تەمەنی نەگەیشتۆتە هەژدە ساڵ، هەر بەڕاستی ژمارەیەکی زۆر لەخەڵکی (الزط) موسوڵمان بوون کە لە کۆچەریەکانی هیند بوون، لەوان چوار هەزار جەنگاوەر چوونە سوپاکەی محمەدی کوڕی قاسمەوە و شانبەشانی ئەو دەجەنگان و کاریگەریەکی گەورەیان هەبوو لە شەڕەکەدا لەبەرئەوەی شارەزای وڵات بوون و زمانی هیندیان دەزانی.

هەواڵەکان گەیشتنەوە بە پاشای بتپەرستی هیند (داهر)، هەربۆیە خۆی ئامادەکرد بۆ ڕوبەڕووبوونەوەی موسوڵمانەکان بە سوپایەکی گەورەوە، لەگەڵ سەرباز و سەربازە زلە بەناو بانگەکانیدا کە بریتی بوون لە فیلەکان، فیز و بەخۆ سەرسامبوون چووبوویە ناخیەوە بەهۆی گەورەیی سوپاکەی و بە کەم تەماشای موسوڵمانەکانی دەکرد.

بەڵام لەناکاو واقی وڕما و توشی شۆک بوو بە گەردەلولی ئیسلامی کە لە ڕوباری (مهران) دەپەڕیەوە، ئەو ڕوبارەی لەنێوان ئەو و موسوڵمانەکاندا بوو، (داهر) کە بەسەر پشتی فیلێکی زەبەلاحەوە بوو خۆی بینیەوە لە ڕوبەڕوی محمەدی کوڕی قاسم و سەربازەکانیدا، هەردوو لا بەشەڕهاتن شەڕێك کە پێشتر خاکی (سند) پاکستان شتی وای بەخۆوە نەدیبوو.

(داهر) کە دەبینێت سەربازەکانی بەچواردەوریا دەکەون و شمشێری موسوڵمانەکان دەیاندا بەزەویدا، ئینجا لەسەر پشتی فیلە بەهێزەکەی دێتە خوارەوە و بەخۆیشی شەڕدەکات تاکو چارەنوسی کۆتایی دێت و موسوڵمانان دەیکوژن و بکوژەکەشی ئەم چەند دێرە هۆنراوەیە دەبێژێت:

الخيل تشهد يوم داهر والقنا ... ومحمد بن القاسم بن محمّد

أنّي فرجت الجمع غير معرّد ... حتى علوت عظيمهم بمهنّد

فترکته تحت العجاج مجندلا ... متعفّر الخدّين غير موسّد

بەکوژرانی ئەو پاشایە موسوڵمانان تۆڵەی خۆیان کردەوە و سەرکەوتنیان بەدی کرد و لەبەردەمیان وڵاتی (سند) پاکستان واڵابوو، ژنەکەی (داهر) هەستا بە سوتاندنی خۆی و (صیتا)ی کچی (داهر) کەوتە ناو دیلەکان.

پاش کوشتنی (داهر) محمدی کوڕی قاسم درێژەی بە کاروانەکەی دا تاکو ئامانجە گەورەتر و دورەکە بەدی بهێنێت وەك باسمان کرد پاش ئەوەی کە تۆڵەی سەندەوە لە دوژمنەکەی ئیسلام (داهر) هەربۆیە شاری (راور) و پاشان (رهمانابـاذ)ی گـرت و دواتر هـەرێمی (ساوندری) خۆیان دا بەدەستەوە و موسولمان بوونی خۆیان ڕاگەیاند و پاشانیش (سمند).

پاشان محمدی کوڕی قاسم شاری (ملتان)ی دوای شەڕێکی ترسناك کە پەناگە و قەڵای بوزیەکان بوو لە (سند) گرت، دەستکەوتێکی زۆر و زەبەندی بەدەست هێنا و هەمووی هەلگرت بۆ حەجاج کە بە سەد و بیست ملیۆن درهەم دەخەملا ، لەگەڵ دەستکەوتەکانیشدا سەری پاشا زۆردارەکە (داهر)یشی لەگەڵ بوو.

کە هەڵمەتەکە شەست ملیۆن درهەمی تێچوو بوو، هەربۆیە حەجاج وتە بەناوبانگەکەی خۆی ووت : (( ڕق و تورەیی خۆمان سارێژکرد و دامرکاندەوە، تۆڵەی خۆمان کردەوە، پاشانیش شەست ملیۆن درهەممان زیاد کرد و سەری –داهر–یش)).

پاش ئەوەی محمدی کوڕی قاسم سەرکەوتووبوو لە لەناوبردنی پاشا گەورەکەی پاکستان – سند– کە (داهر) بوو، پاشایەکی تر بەدیارکەوت کە لەجێی دەستە ڕاستی (داهر) بوو و ناوی (دوهر) بوو، پاشای هەرێمی (کیرج) بوو، ئەو شوێنە لەوپەڕی وڵاتی پاکستانەوە بوو لە سەر سنوری وڵاتی هیند، هەربۆیە (دوهر) خۆی ئامادەکرد بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی موسوڵمانەکان و شەیتان فریوی دا و بوغرای کرد بەوەی کە ئەوەی (داهر) نەیتوانی بیکات و بەدی بهێنێت ئەم دەیکات، لەگەڵ موسوڵمانەکان بەریەك کەوتن، کارێکی بەسەرهات بەهۆی شمشێرە گەرمەکانی موسوڵمانانەوە کە بەرگەی نەگرت، هەربۆیە هەوڵی ڕاکردنی دا بەڵام شمشێری موسوڵمانەکانی پێگەیشت و کوژرا

وەك چۆن ئەوی پێش ئەویش کوژرا، سەری گەیشت بە سەری هاوڕێکەی پێش خۆی، بکرژەکەی سیسان ئەم هۆنراوەیەی گوت:

نحن قتلنا داهرا و ودوهر          والخيل تروى منسراً فمنسراً.

لەم ماوەیەدا حەجاج کە ئامۆزای محمدی کوڕی قاسم بوو مرد، بەلام ئەمە وورەی محمدی کوڕی قاسمی نەڕوخاند لە درێژەدان بە (فتح) ئازادکردنەکان، بەجۆرێك ڕێگا والا بوو لەبەردەمی بەرەو ولاتی هیندستان، هەر بەڕاستی محمدی کوڕی قاسم دەستی کرد بە ئازادکردنی شارەکانی هیند بە شاری (سرست) دەستی پێکرد، خەلکەکەی بوونە گوێڕایەلی موسولمانان و دەریاوانێکی زیرەك و بەتوانابوون و موسولمانان سودیان لێ وەرگرتن.

بۆ هەمووان دەرکەوت کە محمدی کوڕی قاسم ناگەڕێتەوە تاکو ولاتی هیندستانیش فەتح نەکات، بەلام گۆڕانێکی خەمناك و خێرا لە ژیانی محمدی کوڕی قاسم دا ڕوویدا...



## کۆتاییە خەمناک و تراژیدیەکەی محمدی کوڕی قاسم

وەرزی ئەم تراژیدیا و میحنەتە گەورەیە کە ڕوبەڕوی پاڵەوانە مەزنە کەم تەمەنەکەمان بوویەوە کاتێك دەستی پێکرد، کە خەلیفە وەلیدی کوڕی عبدالملك مرد ساڵی ٩٦ك و لەجێی ئەو سولەیمانی کوڕی عەبدولمەلیکی برای جێی گرتەوە، کە زۆر ڕقی لە حەجاج بوو، بەهۆی ئەو تاوان و خوێن ڕشتنانەی ئەنجامی دابوون بە بچوکترین گومان.

کاتێك چوویە سەر تەختی فەرمانڕەوایی هەستا بە دامەزراندن و دانانی یەکێك لە سەرسەختترین ڕکابەرەکانی حەجاج کە بریتی بوو لە (صالح بن عبدالرحمن) وەك فەرمانڕەوای عێراق، ئینجا ئەم پیاوە هەستا بە لابردنی هەموو پیاوەکانی حەجاج لە پێگە و پۆستەکانیان، لەناو ئەوانەشدا (محمدی کوڕی قاسم) ی فەرماندەی (سند) و ئازادکەرەکەی، لەجێگەیدا (یزید بن أبی کبشة السکسکی) دانا.

کاتێك هەواڵی لابردنەکەی گەیشتەوە بە محمدی کوڕی قاسم هەندێك کەس هەوڵیان دا قایلی بکەن بە سەرپێچی و یاخی بوون لەم وڵاتە دورە لە مەڵبەندی خەلافەتەوە، بەتایبەت کە ئەو سەربازەکانی خۆشیان دەویست و هەروەهاش ئەوانەی کە موسوڵمان بووبوون لە خەڵکی هیند و پاکستان، هەوڵیان دا ڕازی بکەن کە ئەو ستەملێکراوە و تاوانێکی نیە، پێیان ووت دەترسێت لە صالحی کوڕی عبدالرحمن.

بەڵام محمدی کوڕی قاسم لەو مۆدێل و شێوازە دەگمەن و دانسقەیەی سەرکردەکان بوو کە هەوڵیان بۆ خزمەتی ئیسلام بوو و هیچ شتێکیان لە دونیا ناوێت، نە پۆست و دەسەڵاتی بەلاوە گرنگ بوو نە فریوی دونیاشی خواردبوو و بوغرا ببێت، هەروەها

دەشترسا لە چارەنوسی هەڵگەڕانەوە لە خەلافەت، ئەوەشی کە دەبێتە هۆی پەرتەوازە بوونی ئۆمەت و دوبەرەکی موسوڵمانان و لێک هەڵوەشانیان و خوێنڕژان لەنێوان موسوڵمانانلدا لە ئاژاوەی هەڵگەڕانەوەدا، هەربۆیە ڕازی بوو بە بڕیاری لەسەر کار لابردنەکەی ئەگەرچی توانای بەرهەڵستی و یاخی بوونیشی هەبوو، لەو بارەیەشەوە ئەم هۆنراوەیەی ووت:

ولو كنت أجمعت القرار لوطئت ... إناث أعدت للوغى وذكور

وما دخلت خيل السكاسك أرضنا ... ولا كان من علج علي أمير

هەر بەم جۆرە کاروانی ئازادکردن و گرتنی هیندستان وەستا، بە لابردنی ئەم پاڵەوانە، بەڵام ئەوەی پاش ئەمە رویدا بەئێش تر و ئازاربەخش و تراژیدی تر بوو.

هەندێک لە گێڕانەوەکان باس لەوە دەکەن کە هۆکاری کوژرانی محمدی کوڕی قاسم پیلانێک بوو کە (صیتا)ی کچی (داهر) گێڕای، کەتبووە ناو دیلەکانەوە پاش کوژرانی باوکی، لە شکۆ و کەش و فش و پاشایەتی و دەوڵەمەندی و دەسەڵاتەوە بارودۆخ گۆڕا بۆ کوشتنی باوکی و خۆکوشتنی دایکی و لەدەست چوونی ماڵ و موڵک و دەسەڵاتیان، بوویبوویە ژێردەستەیەک پاش ئەوەی شازادە بوو، هەربۆیە دڵی پڕ بووبوو لە ڕق و کینە و هەستی تۆڵەکردنەوە لەم پاڵەوانە گەنجە (محمدی کوڕی قاسم) جا کاتێک محمد لەپۆستەکەی لابرا و ئەو کچەش زانی کە ڕۆژەکانی محمد تەواو بووە، ویستی تۆڵەی لێ بسێنێتەوە و ڕقەکەی دامرکێنێتەوە، هەربۆیە چوو بۆلای فەرمانڕەوای نوێ (یەزید بن أبی کبشە) بە سکالایەکەوە کە وای دەرخست گوایا محمدی کوڕی قاسم بەزەبری هێز دەستدرێژی کردۆتە سەری پاش کەوتنە ناو دیلەکانەوە، کە ئەوە تۆمەتێکی گەورە و پیس و قێزەون بوو لە ئافرەتێکی بتپەرستی هاوبەشی پەیداکەرەوە بەرامبەر پاڵەوانێکی گەورە.

لەبەر ئەوەی تۆمەتەکە گەورە بوو فەرمانڕەوای نوێ بڕیاری دەستگیرکردنی محمدی دا و ناردی بۆ فەرمانڕەوای عێراق (صالح بن عبدالرحمن) بۆ لێکۆڵینەوە، هەر بەڕاستی محمدی کوڕی قاسم بە کۆت و تەوق و بەندکراوی نێردرا بۆ عێراق، دێرە بەناوبانگەکەی

خۆی وت کە پاش ئەو ڕوداوە بویە وانەیەک گوزارشتی لە ڕاستی و دڵسۆزی ئەم پیاوە و ڕادەی خەمباربوونی دەکرد بۆ ڕاوەستاوبی لە جیهادکردن لە پێناوی خوادا، فەرموی:

أضاعوني وأيّ فتى أضاعوا ليوم كريهة وسداد ثغر

دیمەنی دەرچونی محمدی کوڕی قاسم بە کۆتکراوی کاریگەری زۆری هەبوو لەسەر خەڵکی سند، بەگریانەوە ڕیزیان بەستبوو بۆ ماڵئاوایی لێکردنی و جیابوونەوەی و ئەوەی بۆی هاتە پێش، سەیرتر لە هەموو ئەوانە خوای گەورە وەک بڵێی نیشانە و بەڵگەیەکی خێرا و نایابی پیشان دان بۆ بێ تاوانی ئەم پاڵەوانە گەورەیە، بەجۆرێك تەنها حەفدە ڕۆژ تێپەڕی بەسەر ماوەی دەسەڵاتی (یەزید بن أبی کبشە)ی جێگرەوەی دا بۆ ویلایەتی (سند) پاکستان و پاشان کتوپڕ مرد.

بێ باوەڕەکانی سەند دڵخۆش بوون بە دەرچوونی محمدی کوڕی قاسم دا بەجۆرێك هەناسەیەکی قوڵیان هەڵکێشا و هەڵگەڕانەوە و گەڕانەوە بۆ بێ باوەڕیی خۆیان و ئارەزویان چوو بەلای دەرکردنی موسوڵمانەکاندا، هەموو ئەوانەش لەبەر ئەوە بوو چونکە گوڕەپانەکە شێرە نەبەردەکەی خۆی تێدا نەمابوو.

بەڵام ڕاستر ئەوەیە کە لە پشت کوژرانیەوە ئەوەبوو کە خەلیفە سولەیمان خوازیاری ڕزگاربوون بوو لە خانەوادەی حەجاجی سەقەفی و پشتیوانەکانی وەک چۆن وایشی کرد لەگەڵ قوتەیبەی کوڕی مسلم دا[1].

هەروەها فەرمانڕەوای نوێی عێراق (صالح بن عبدالرحمن) زۆر ڕق و کینەی هەبوو بەرامبەر حەجاجی سەقەفی، ئەوەش چونکە حەجاج (ئادەم)ی برای (صالح)ی کوشتبوو، چونکە ڕای هەڵگەڕاوەکانی هەبوو، هەربۆیە ساڵح ویستی تۆڵەی براکەی لە حەجاج بسەنێتەوە ئەوەش بە تۆڵەکردنەوە نزیکەکانی، کە ئەوەش هەمان ئەو دەمارگیری و زۆر

[1] . وە گێڕانەوەیەکی باوەڕپێنەکراو کە ڕاست نیە باسی کردووە کە ئەو کەسەی محمدی کوڕی قاسمی کوشتووە خەلیفە وەلیدی کوڕی عبدالملك بووە.

و ستەمەیە کە حەجاج لەگەڵ نەیارەکانی دەیکرد، هەروەها خوای گەورە دەفەرموێت :﴿ وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَىٰ﴾، کەس تاوانی کەسی تر هەڵناگرێت.

صالحی کوڕی عەبدولڕەحمان هەستا بە بەندکردنی محمدی کوڕی قاسم لە بەندیخانەی شاری (واسیت) کە بەردەوام حەجاج نەیارەکانی تێ دەهاویشت بە بچوکترین گومان و بەهەمان ئامێر و کەرەستەکانی سزادان صالح فەرمانی کرد سزای محمدی کوڕی قاسم بدەن تاکو دان دەنێ بەوەی کە ئایا ئەم تاوانە قێزەونەی ئەنجامداوە کە ئافرەتە (وثني)ەکە (صیتا) بۆی هەڵبەستووە، محمدی کوڕی قاسم سوێندی دەخوارد کە بێ بەری و دورە لەو کارە و سور بوو لەسەر سوێند و قسەکانی، چەندین دێڕە هۆنراوەی کاریگەری چڕی و تیایدا دەیوت:

فلئن ثویت باسطٍ وبأرضها ... رهن الحدید مکبلاً مغلولا

فلرب فتیة فارسٍ قد رعتها ... ولرب قرنٍ قد ترکت قتیلاً

محمدی کوڕی قاسم بەرگەی سزادانەکەی دەگرت و پابەند بوو بە بێ گوناهی و ئەستۆپاکی و بێ تاوانی خۆیەوە بەرامبەر درۆهەڵبەستنە سوك و قێزەونەکە، هیچ تاوانێکی نەبوو بێجگە لە فتوحاتە گەورەکانی و مەردایەتیەکەی بەسەر پاشا بێ باوەڕەکاندا، لەبەر ئەوەی کە ئامۆزای کەسێکی زۆردار بوو کە خێڵ و هۆزەکەی خۆی بەتاوانەکانیەوە گلاندبوو، ئیدی ئەوەبوو ساتەوەختی خەمباری و جەرگبڕ هات و محمد گیانی سپارد بە مەزڵومی و ستەملێکراوی، مۆمێك کوژایەوە، گەر بیتوانیایە بمێنێت دەبوویە خۆرێك دوژمنانی ئیسلامی دەسوتاند، پاش ئەم ئازادکردنی ولاتی هیند بۆ چەند سەدەیەك دواکەوت.

هەربۆیە هۆنیارەکانی زەمانی خۆی ستایشیان کردووە و لاواندویانەتەوە و گریاون بەسەریدا، (حمزە بن بیع الحنفي)ە دەڵێت:

إن المروءة والسماحة والندى ... لمحمد بن قاسم بن محمد

ساس الجیوش لسبع عشرة حجةً ... یاقرب ذلك سؤدداً من مولد[1]

ساخوا ڕەحمەتێکی فراوان برێژێت بەسەریدا و گەنجێتیەکەی بۆ قەرەبوو بکاتەوە بە سەوزایی و تەڕوو پاراوی بەهەشتی بەرین و فیردەوسی ئەعلا.

زۆر سەیرتر لە هەموو ئەوانە (صیتا)ی کچی (داهر) کاتێك بەوەی زانی کە محمدی کوڕی قاسم لەژێر گوشار و سرادا مردووە ویژدانی حولاو دەستی بەگریان کرد و چوو بۆلای فەرمانڕەوای عێراق و دانی نا بە تاوانەکەیدا، ئەویش کێشەکەی بەرزکردەوە بۆلای خەلیفە سولەیمانی کوڕی عبدالملك، فەرمانی کرد بە کوشتنی وەك پاداشتێك لە تۆڵەی ئەم پاڵەوانە مەزنەدا. بەڵێ ئابەم جۆرە خوای گەورە بە زیندویی و مردوی سەری خست و پشتیوانی لێ کرد – بەڕەحمەت بێت –[2].

***

[1] . واتە: جوامێری و لێبوردن و بەخشندەیی هی محمدی کوڕی قاسمی کوڕی موحەممەدە.سوپاکانی سەرکردایەتی کرد بە حەڤدە ساڵ تەمەنەوە. .لە ناوچەرگەی سەرکردە و خانەدانەکان لەدایك بووە.

[2] . ئێمە ئەو ڕوداوەمان بە کورتی و پوختی باس کرد. تۆ دەتوانی سەیری ئەم پەرتوکانە بکەیت: (تأریخ الطبري – الکامل في التأریخ - البدایة والنهایة - المنتظم في التأریخ - فتوح البلدان - سیر أعلام النبلاء – وفیات الأعیان – شذرات الذهب – العبر في خبر من غبر).

(١٣)

# چەندین هەڵوێست و بەسەرهات لە ژیانی حەجاج دا

- چەند هەڵوێست و بەسەرهات و وشەگەلێك لەژیانی حەجاج دا.

- قوربانیەکانی دەستی حەجاج.

- فتوای زانایان لەبارەی حەجاجەوە و پرسی نەفرەت لێکردن و بە بێ باوەڕ زانینی

- حەجاج و لەیلای ئەخیلی.

## چەند هەڵوێست و بەسەرهات و وتەیەك لەژیانی حەجاج دا

یەكێك لە بیرتیژی و فیراسەتەكانی حەجاج و زیرەكی و داناییەكانی حەجاج ئەوەبوو: لەماوەی شەڕكردنیدا لەگەڵ ئیبن جارود دا كە سەركردایەتی شۆڕشێكی دەكرد دژی حەجاج لە بەصرە و خەریك بوو بەسەریدا سەربكەوێت و گەمارۆی دابوو، ئیبن جارود نێردەیەك دەنێرێت بۆلای حەجاج و پێی دەڵێ: " حەجاج خۆت بدە بەدەستەوە و پاراستن و سەلامەتیت مسۆگەرە".

جا كاتێك نێردەكەی ئیبن جارود دەرچوو حەجاج لەناو سوپاكەیدا هاواری كرد و وتی:

– چیان لەمن دەوێت؟

– دەیانەوێ من متمانە و باوەڕ بە ئیبن جارود بێنم و خۆم بدەم بەدەستیەوە

– ئەمە چیە.... پێی بڵێ ئەمە هەرگیز نابێت..

– ئینجا وره و گوڕوتین كەوتە نێو پیاوەكانی حەجاجەوە و وتیان نزیك بووینەتەوە لە سەركەوتن.

ئیدی شەڕەكە لە شكانەوە گۆڕا بۆ سەركەوتن.

دەگێڕنەوە لە بارەی زیرەكی و بیرتیژیی حەجاجەوە و دەڵێن: جارێك سەركەوتە سەر بڵندگۆ تاكو وتاری هەینی بدات ، پێش ئەوەی دەست بكات بە وتارەكەی، دەستنوێژەكەی شكا، حەجاج ترسا كە جەیای بچێت و بیبێتە لەكە و عەیب بۆی ئەگەر پێیان بڵێت دەستنوێژەكەی شكاوە، هەربۆیە وتی: پێم ڕا گەیشتووە كە ئێوە دەست

نوێژ بە باشی ناگرن، هەربۆیە ئەمڕۆ نیازمە فێری چۆنیەتی دەستنوێژی پێغەمبەرتان بکەم – درودی خوای لێبێت  هۆی خزمەتکار تەشتێك و کەمێك ئاویشم بۆ بێنە تاکو فێریان بکەم کە چۆن پێغەمبەری خودا – درودی خوای لێبێت - دەستنوێژی دەگرت.

لەوەش کە لەبارەی بەخشندەیی و دەست کراوەییەوە دەیگێڕنەوە ئەوەیە کاتێك بوویە فەرمانڕەوای عێراق هەموو ڕۆژێك هەزار خوانی ئامادە دەکرد و لەسەر هەر سفرەیەك دە کەسی خڕ دەکردەوە، ئینجا نێردەکانی دەناردە ناو خەلك : ئەی خەلکینە وەرن بۆلای من بۆ قاوەڵتی[١]".

ئەگەریش خۆر ئاوابووایە :" ئەی خەلکینە وەرن بۆ نانی ئێوارە".

جارێکیش لەناو خەلکیدا قسەی دەکرد و دەیوت: نێردەی من بۆ ئێوە خۆرە، ئەگەر هەڵهات..ئەوا وەرن بۆ قاوەڵتی، ئەگەریش ئاوابوو ئەوا وەرن بۆ ژەمی ئێوارە".

لەوەی لێی دەگێڕنەوە لە لێخۆشبوونی لەو کەسەی کە خراپەی لەگەلکردووە ئەوەیە جارێك حەجاج چوو بۆ ڕاوکردن، تەنها کەوت لەگەڵ دەشتەکیەك، حەجاج لێی پرسی:

ئەی پیاو: لەبارەی حاڵ و ڕەوشی خەلکی شارەوە هەواڵم پێ بدە

پیاوەکە وتی:.. ناخۆشترین حاڵە

حەجاج وتی: بۆچی؟

پیاوەکە وتی: زۆردار و ستەمکار لە شارەکەیە.

حەجاج لێی پرسی: مەبەستت کێ یە؟ حەجاج دەڵێیت؟

پیاوەکە وەلامی دایەوە: بەڵێ.

ئینجا حەجاج وتی: باسی ژیانی ئەو فەرماندەیەم بۆ بکە.

پیاوەکە ووتی: ستەمکارێکی... زۆردارە.. خوا بیکوژێت.

ئینجا حەجاج ووتی: گەر سکالآتان لێی کرد لای ئەمیری بڕواداران......

---

[١]. بەرچایی... یاخود ژەمی بەیانی.

پیاوەکە قسەکانی پێ بڕی وتی: زۆر دورە... خۆ (عبدالملك) خۆیشی لەو زۆردارترە بە نەفرەت بێت.

حەجاج ووتی: ئابەم جۆرە؟

پیاوەکە وتی: ئەرێ بەم جۆرە... ئایا تۆ ڕێبوار و بێگانەی وا نازانیت..

کاتێك حەجاج فەرمانی کرد بە دەستگیرکردنی پیاوەکە، پیاوەکە وتی:

ئەی حەجاج...ئەو نهێنیەی نێوان من و تۆ.. هیوادارم لای کەس باسی نەکەیت.

ئینجا حەجاج دەستی کردە پێکەنین و لێی خۆش بوو.

دەگێڕنەوە لێی لە خۆشەویستی بۆ ئەهلی زمان و ڕەوانبێژی کە ئەو ڕۆژێك (الغضبان بن القبعثري) لەگەڵی دادەنیشێت، حەجاج لێی دەپرسێت:

ئەی (غضبان).. کێ بەڕێزترینی ناو خەڵکە؟

وەڵامی دایەوە: تێگەیشتوترینیان لە دین، ڕاستترینیان لەسوێندخواردندا، بەڕێزترینیان لەگەڵ بەسوك سەیرکراوەکان، نان بدەترینیان بە هەژاران.

حەجاج وتی: ئەی کێ بێ ڕێزترینە؟

وەڵامی دایەوە: پیاوی ناپاك... قین لەبرای چاك، چەن ڕەنگ و ڕوو.

حەجاج وتی: ئەی کێ ئازاترینە؟

وەڵامی دایەوە: ئەوەی بە شمشێر لێدەرترینە... بۆ میوان بەڕێزترینە... لە ستەم دورترینە.

حەجاج وتی: کێ ترسنۆك ترینە؟

ئەویش وتی: ئەوەی لەڕیز جێ دەمێنێت... کاتێك ڕادەوەستێت دەلەرزێت..ڕقی بە لێدانی شمشێرە.

حەجاج وتی: کێ باشترین کەسە؟

وەڵامی دایەوە: ئەوەی چاکەی زۆرترینە... تای تەرازوی یەکسان و دادپەروەرترینە..لە مەیداندا ناوەندگیرترینە..لە داوای لێخۆشبووندا بەردەوام ترینە..

حەجاج کۆشکێکەی بۆخۆی قیت کردووییەوە، تیایدا گومەزێکی گەورەی دروستکردبوو، حەجاج وتی:

سەیری ئەو گومەزە بکە و بۆم وەصف بکە.

(غضبان) وتی: ئەو شتەیە کە نامێنێتەوە نە بۆ خۆت نە بۆ کوڕەکەشت... لەشارێك بێجگە شاری خۆت دروستت کردووە، هەموو مولکی دونیاش هی خوایە.

ئینجا حەجاج توڕەبوو و فەرمانی کرد بیخەنە بەندیخانەوە.

کاتێك سەربازەکان هەڵیان گرتبوو و کێشیان دەکرد بەرەو بەندیخانەکە .. بە دەست بەستراوی و ڕاوەستاوی وتی:

﴿سبحان الذي سخر لنا هذا وماكنا له مقرنين﴾.ئەم ئایەتە کاتی سواربوونی هۆکارەکانی گواستنەوە دەخوێنرێت..

ئینجا حەجاج وتی: دایبگرن.

غەزبان گوتی: ﴿ربِّ أنزلني منزلا مباركا وأنت خير المنزلين﴾

ئینجا حەجاج وتی: بیخەنە سەر زەوی.

کاتێك خستیانە سەر زەوی وتی:

﴿مِنْهَا خَلَقْنَاكُمْ وَفِيهَا نُعِيدُكُمْ وَمِنْهَا نُخْرِجُكُمْ تَارَةً أُخْرَى﴾

ئینجا حەجاج وتی: بە پێکانی بیهێنن بۆ بەندیخانە.

عەزبانیش وتی: ﴿بِسْمِ اللَّهِ مَجْرَاهَا وَمُرْسَاهَا إِنَّ رَبِّي لَغَفُورٌ رَحِيمٌ﴾

ئینجا حەجاج وتی ئازادی بکەن. لێی خۆش بووم، بەڕاستی سەرسامی بە ئارامگری و زیرەکیەکەی.

دەگێڕنەوە حەجاج فەرمانی کرد بە سەرۆکی پاسەوانەکانی کە بەشەو بگەڕێت و هەرکەسی لە پاش عیشا بینی بدات لەملی، شەوێك دەخولایەوە دوو لاوی بینی بەم لاولادا دەکەوتن، کاریگەری سەرخۆش بوون و مەی خواردنەوەیان پێوە دیار بوو، ئەویش دەوری گرتن و پێی وتن ئێوە کێن وا سەرپێچی فەرماندەتان کردووە؟ یەکەمیان وتی:



**أنا ابن الذي دانت الرقاب له ......... ما بين مخزومها وهاشمها**

**تأتي اليه الرقاب صاغرة .......... يأخذ من مالها ومن دمها**

وازی هێنا لە کوشتنی وتی: ڕەنگە یەکێك بێت لە خزمانی ئەمیری بڕواداران، دووەم وتی:

**لنا ابن الذي خاض الصفوف بعزمه ......... وقومها بالسيف حتى استقامت**

**ركاباه لاتنفك رجلاه عنهم......... اذا الخيل في يوم الكريهة ولت**

ئینجا وازی لە کوشتنی ئەویش هێنا و وتی ڕەنگە یەکێك بێت لە ئازاکانی عەرەب، جا کاتێك کێشەکەی بەرزکردنەوە بۆلای حەجاج، هێنانی و دەری خست کە کێن، یەکەم (ابن حجام) بوو، دووەمیش (ابن فوال) بوو، هەربۆیە سەری سوڕما لە زمان پاراوی و ڕەوانبێژیەکەیان، بە دانیشتووەکانی دەوروپشتی خۆی وت: منداڵەکانتان فێری ئەدەب بکەن، سوێند بەخوا گەر ڕەوانبێژیەکەیان نەبووایە دابووم لە گەردنیان...پاشان بەری دان و ئەم هۆنراوەیەی گوت:

**كن ابن من شئت واكتسب أدباً**

**يُغْنِيكَ مَحْمُودُهُ عَنِ النَّسَبِ**

**إن الفتى من يقول ها أنا ذا**

**ليسَ الفَتَى مَنْ يقولُ كان أبي**[1]

مەدائینی دەڵێت: دوو دیلیان لە هاوەڵانی ئیبن ئەشعەس هێنا بۆلای حەجاج و ئەویش فەرمانی کرد بیانکوژن، ئینجا یەکیان هاتە قسە و وتی: من حەقێکم لای تۆیە..

حەجاج گوتی: ئەو حەقە چیە؟

وتی: ڕۆژێك ئیبن ئەشعەس باسی دایکتی دەکرد منیش وەڵامم دایەوە.

---

[1] واتە، کوڕی هەر کەس دەبی ببە و ڕەوانی ئەدەبت هەبێ و (وێژە زان) بە..کە ئیتر ناوبانگی ئەم سیفەتە بێ نیازت دەکات لە ڕەچەڵەك. بەڕاستی ئەو لاوەی کە دەڵێت ئامە منم وەك ئەو لاوە نیە کە دەڵێت باوکم وابوو...

ئەویش گوتی: کێ دەڵێت ڕاست دەکەیت (شایەتت کێیە؟).

وتی: ئەم هاوڕێیەم (مەبەستی دیلی دووەم بوو).

دووەم وتی: سوێند دەخۆم کە ڕاست دەکات.

حەجاج پێی وت: ئەی بۆچی تۆیش وەك هاوڕێکەت بەرپەرچی ئیبن ئەشعەست نەدایەوە.

دووەم وتی:

چونکە من ڕقم لێتە.

حەجاج وتی: ئەمیان بەریدەن لەبەر ئەو کارەی کە کردی.... ئەمیشیان لەبەر ڕاستگۆییەکەی..

هەروەها لەبارەی پیاوەتی حەجاجەوە تایبەت بە ناموسی خەڵکی و شەرەفی ئافرەتانەوە دەگێڕنەوە لێی کاتێك سەرکەوت بەسەر نەیارە شۆڕشگێڕەکانیدا لە شەڕی (الزاویە) و چووە عێراقەوە، هۆشداری دایە سوپاکەی و وتی:

یەك پیاوتان نەچێتە ماڵی هیچ ئافرەتێکەوە، من (غیور)ی کوڕی( غیور)م. غیور: واتە ئەو کەسەی کە غیرەی زۆرە –

بۆنەوەی سەربازەکانی ناموس و حورمەتی ئافرەتان لەکەدار نەکەن، وەك چۆن سەربازانی سەرکەوتوو لەشەڕێکدا ئەو کارە دەکەن.

دەگێڕنەوە برازاکەی حاکم دەبێت لە (واسط)، دڵی دەچێت بە ئافرەتێکدا ئەو ئافرەتە خۆی نادات بەدەستەوە، کاتێك پێداگری دەکات براکانی ئافرەتەکە دەیکوژن، کاتێك ئەوە بۆ حەجاج دەرکەوت خوێنەکەی نەویستەوە و وتی:

ئەو خوێنی خۆی بەفیڕۆدا، کەس لەبری ئەو ناکوژرێتەوە.

حەجاج مەی نەدەخواردەوە، کە ئەوەش یەکێکە لە چاکە و لایەنە باشەکانی حەجاج کەلێوەی باس کراوە، ئیبن کەسیر باسی کردووە کە خەلیفە زۆری کرد لە حەجاج بۆ خواردنەوەی جامێك مەی، ئەویش ڕازی نەبوو و وتی:

من کاربەدەستەکانم قەدەغە دەکەم لە مەی خواردنەوە، ئینجا چۆن خۆم پێچەوانەی شتێك دەکەم کە نامێڵم ئەوان بیکەن.

لەو هۆنراوانەی کە حەجاج لەبارەی نەخۆشی و مردنەکەیەوە وتویەتی کە خەڵکی دڵخۆش بوون لە نزیکبوونەوەی مردنی:

ربّ إنّ العباد قد أيأسوني ورجائي لك الغداة عظيم،

يارب قد حلف الأعداء واجتهدوا أيمانهم أنني من ساكني النار

أيحلفون على كل عمياء ويحهم ماظنهم بعظيم العفو غفار[1]

پاشان وتی:

خودایە لێم خۆش بە خەڵکی پێیان وایە تۆ لێم خۆش نابیت.

خودایە لێم خۆش بە خەڵکی پێیان وایە تۆ خۆش نابیت.

خودایە لێم خۆش بە خەڵکی پێیان وایە تۆ خۆش نابیت.

ئەم دوعایەی دوبارە دەکردەوە هەتا مرد.

کاتێك مرد کەنیزەکێك چویە دەرەوە و هاواری دەکرد و دەیگوت:

ئیتر بەڕاستی ناب بدەکە

بەناگەی هەتیوانەکە،

هۆنەرە بە ئیلهامەکە

---

[1] . واتە: خودایا خەڵکی بێ ئومێدیان کردووم، وە تکای من لەتۆ بۆ سبەی گەورەیە.

خودایە خەڵکی سوێندیان خواردووە کە من پیاوێکم لە دانیشتوانی دۆزەخ.

ئایا کوێرانە سوێند دەخۆن، مەلا لێیان دا دیارە هیچ نازانن دەربارەی گەورەیی لێبوردەیی و لێخۆشبوونی تۆ.

گەورەی خەڵکی شام .. مرد

ئەمڕۆکە ئیدی ئەوەی کە ڕقی لێمان بوو بەزەیی پێماندا دێتەوە..ئەوەشی کە لێمان دەترسا دەبێت لێی بترسێن.

خەلیفە وەلید دڵتەنگ بوو بۆی و دەیوت:

باوکم دەیفەرموو حەجاج پێستی نێوان دوو چاوانیەتی، بەڵام من دەڵێم ئەو پێستی هەموو ڕوخسارمە.

خەلیفە وەلیدیش پاش حەجاج تەنها هەشت مانگ لە ژیاندا مایەوە و مرد.

بەڵام عومەری کوڕی عبدالعزیز کاتێک بەمردنی حەجاجی زانی، سوژدەی سوپاسگوزاریی برد بۆ خوا، هەروەها حەسەنی بەصریش.

حەجاج لەدوای خۆی هیچی جێ نەهێشت بێجگە لە سێ سەد درهەم، و قورئانێک، و زینێك و خانویەك و سەد قەڵغان هەمووی وەقف بوو بۆ خوا، کاتێک سولەیمانی کوڕی عبدالملك چوویە سەر تەخت لە بەندیخانەکانی حەجاج دا هەشتا و یەك هەزار کەسی بەردا کە (سی) هەزاریان ئافرەت بوون.

پێشەوا زەهەبی لەبارەی حەجاجەوە دەفەرموێت: حەجاج زۆردارێکی ... ستەمکاری ... بەدکرداری .. خوێن ڕێژبوو... هەروەها ئازا و بوێر و خاوەن فێڵ و زمان پاراو و ڕەوانبێژ و ڕێزگر بوو لە قورئان.

پاشان دەفەرموێت: ئێمە سەرزەنشتی دەکەین و خۆشمان ناوێت، بەڵکو ڕقمان لێیەتی لەبەر خودا، کە بەڕاستی بێ بەش بوو لە باوەڕ، کردەوە گەلێکی باشی هەیە کە لەناو دەریای تاوانەکانیدا نقوم بوون. خواش خۆی لەگەڵی ئەوانە یەکلایی دەکاتەوە.

دەگێڕنەوە ڕۆژێك حەجاج دەیوت: هەرکەس دەستێکی وەشاندبێت و کارێکی کردبێت هێندەی ئەوەی پێدەبەخشین، پیاوێك هەڵدەستێتەوە و دەڵێت: من بووم حسەینم کوشت، حەجاج وتی: چۆن کوشتت؟

ئەویش وتی: ڕمێکم پیاکرد، بە شمشێر لەت لەتم کرد، کەسیشم لەگەڵ نەبوو لە کوشتنەکەیدا.

ئینجا حەجاج وتی: برۆ بەخوا تۆ و ئەو لەیەك شوێنیشدا کۆنابنەوە. هیچ شتێکی پێ نەدا.

(هەیسەمی[١] کوری عودەی) وتی پیاوێك هات بۆلای حەجاج و گوتی: براکەم لەگەڵ (ئیبن ئەشعەس[٢]) چوە بۆ شەر کەچی خەت هێنراوە بەسەر ناوی مندا لە دادگادا (نوسینگەی میریدا) و موچەکەی من براوە و ماڵەکەم روخێنراوە.

ئینجا حەجاج گوتی: ئایا ئەو شیعرەت بیستووە کە دەڵێت:

| | |
|---|---|
| جنانیك من یجني علیك | وقد تُعدي الصحاح مبـــارك الجُرب |
| ولرب مأخوذ بذنب قریبه | ونجا المقارف صـــــــاحب الذنب[٣] |

ئینجا پیاوەکە گوتی: من بیستومە خوای گەورە جیاواز لەمە دەفەرموێت، بێگومان قسەی خوداش راسترە نەك ئەمە.

حەجاج وتی: خودا دەفەرموێ چی؟

وتی: خودا دەفەرموێت:﴿ قَالُوا يَا أَيُّهَا الْعَزِيزُ إِنَّ لَهُ أَبًا شَيْخًا كَبِيرًا فَخُذْ أَحَدَنَا مَكَانَهُ إِنَّا نَرَاكَ مِنَ الْمُحْسِنِينَ (٧٨) قَالَ مَعَاذَ اللَّهِ أَنْ نَأْخُذَ إِلَّا مَنْ وَجَدْنَا مَتَاعَنَا عِنْدَهُ إِنَّا إِذًا لَظَالِمُونَ﴾[٤].

وتی: هۆی خزمەتکار ناوەکەی بنوسەوە و خانوەکەی بۆ دروست بکەرە و موچەکەشی بدەرەوە، هەروەها برۆ لەناو خەڵکی دا جاڕ بدە و بانگەواز بکە: خودا ڕاستی فەرموو و شاعیر درۆی کرد[١].

---

[١] . هیثم.لەبەر ئەوەی لە زمانی کوردیدا پیتی (ث) مان نیە ئەوا دەکرێت بە (س).

[٢] . ابن أشعث.

[٣] . واتە . خاوەنی تاوانەکە خۆی تاوانەکە دەخاتە ئەستۆی تۆ ..وەك چۆن وشتری گەڕ وشترەکانی چواردەور و دراوسێشی توشی گەڕی دەکات (یان چۆن وشتری ساغ توشی گەڕی دەبێت لە وشتری گەڕەوە ئاوا کەسێك بەتاوانی خزم و نزیکێکی بگیرێت و خاوەن تاوانیش بۆی دەربچێت....

٤ . یوسف: ٧٨ — ٧٩.

( هەیسەمی کوڕی عودەی) لە (ئیبن عەیاشەوە) دەگێڕێتەوە: عبدالملك نامەی نوسی بۆ حەجاج کە سەری (ئەسلەم کوڕی عبدالبکری)م بۆ بنێرە، کاتێك حەجاج هێنایان بۆلای حەجاج (ئەسلەم) گوتی: ئەی فەرماندە تۆ لێرەیت (شاهیدیت) و ئەمیری بڕواداڕانیش لێرە نیە (غائیبە)، وە خوای گەورە دەفەرموێت:﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِنْ جَاءَكُمْ فَاسِقٌ بِنَبَإٍ فَتَبَيَّنُوا أَنْ تُصِيبُوا قَوْمًا بِجَهَالَةٍ فَتُصْبِحُوا عَلَى مَا فَعَلْتُمْ نَادِمِينَ﴾[٢].

ئەوەی لەبارەی منەوە پێی ڕاگەیەندراوە درۆیە و پوچە، من بەخێوکەر و سەرپەرشتیاری بیست و چوار ئافرەتم هیچ کاسبێکیان نیە من نەبێت، هەمویان ئێستا لەبەر دەرگان، ئینجا حەجاج فەرمانی کرد بیانهێنن.

کاتێك هێنایانن یەکیان وتی: من پوریمی، ئەویان گوتی: من مامۆژیمی، یەکی تر: من خوشکیمی، ئەوی تر من کچیمی، یەکێکی تیکەیان : من ژنیمی....

ئینجا کچۆڵەیەکی هەشت نۆسالآن لێی هاتە پێشەوە و حەجاج پێی گوت: ئەی تۆ کێی؟

ئەویش گوتی: خوا چاکت بۆ بکات فەرماندە منیش کچیمی، پاشان چۆکی دادا و گوتی:

أحجاج لم تشهد مقام بناته ... وعماته يندبنه الليل أجمعا

أحجاج كم تقتل به إن قتلته ... ثمانا وعشرا واثنتين وأربعا

أحجاج من هذا يقوم مقامه ... علينا فمهلا إن تزدنا تضعضعا

أحجاج إما أن تجود بنعمة ... علينا وإما أن تقتلنا معا[٣]

---

[١] .البداية والنهاية لابن كثير.

٢ . الحجرات: ٦.

[٣] . واتە: ئەی حەجاج مەگەر حاڵی کچەکانی نابینیت، هەروەها پورەکانی هەمویان بەگشتی ئەم شەو شینی بۆ دەکەن.

دەڵێن:حەجاج دەستی بەگریان کرد و وتی: بەخوا سەرتان لێ ناشێوێنم و زیاتر ئاتان خەمە تەنگانەوە.

پاشان نامەی نوسیەوە بۆ عبدالملك و هەمان قسەی پیاوەکە و کچۆڵەکەشی بۆ باسکرد لە نامەکەیدا، ئینجا عبدالملك فەرمانی پێ کرد ئازادی بکات و پەیوەندی باش بێ لەگەڵیان، لەگەڵ ئەم کچۆڵەیەشدا چاکەکار بێت و هەموو کات بەسەریان بکاتەوە.

دەڵێن: حەجاج ڕۆژێك وتاری دەدا و دەیگوت: ئەی خەڵکینە، ئارامگرتن لەسەر قەدەغەکراوەکانی خودا ئاسانترە وەك لە ئارامگرتن لەسەر سزاکانی خودا.

ئینجا پیاوێك بۆی هەستایەوە و وتی: بەلا لێت دا ئەی حەجاج، چەند ڕودار و کەم شەرمی، چی دەکەی دەیکەیت و ئەم جۆرە قسانەش دەکەیت؟ سەرت لێ تێکچووە.

ئینجا بە پاسەوانەکەی گوت: بیگرن...کاتێك لە وتارەکەی لێ بوویەوە بەپیاوەکەی گوت: چی وای لێکردی بوێریت ئەو قسەیە بکەیت؟

ووتی: بەلا لێت دا ئەی حەجاج تۆ دەوێریت قسە بەخوا بڵێیت من چۆن نەوێرم بەرامبەر تۆ هیچ بڵێم! جا تۆ چیت تا نەتوانم بەرامبەرت دەم بکەمەوە لەکاتێکدا تۆ بەرامبەر خودای هەموو جیهان دەمت دەکەیتەوە؟!

ئینجا ووتی: لێگەڕێن بڕوات بەرێی خۆیدا و بەری دا.

دەگێڕنەوە حەجاج ڕۆژێك لەسەر بڵندگۆ دەی وت[1]: لەخوا بترسن چەند دەتوانن، هەروەها گوێڕادێرن و گوێڕایەڵ بن بۆ ئەمیری بڕواداران عبدالملك، بەخوا گەر فەرمانم کرد

---

ئەی حەجاج چەند کەسی تر دەکوژیت ئەگەر ئەوت کوشت؟ هەشت و دە و دوو و چوار( مەبەستی ئەوەیە کە ئەگەر ئەو بکوژیت وەك ئەوە وایە هەر بیست و چوار ئافرەتەکەت کوشتبێت کە ئەو بەخێویان دەکات).

ئەی حەجاج کێ هەیە جێی ئەو بگرێتەوە بۆ ئێمە، بەزەییت هەبێ ئەکەی زیاتر بێ دەسەلات و داماومان بکەیت.

ئەی حەجاج یان بەخشندە بە یان هەموومان پێکەوە بکوژە.

[1] . (ئەبو داود( لە (محمد بن العلا (ئەویش لە (ئەبو بەکر)ەوە و ئەویش لە (عاصم)ەوە گێڕاویانەتەوە.

خەڵك لەدەرگایەکی مزگەوتەکەوە بڕۆنە دەرەوە لە دەرگایەکی ترەوە بچنە دەر ئەوا خوێن و ماڵیان بۆم حەلاڵ دەبێت.

(سوفیانی پوری) لە (اسماعیل بن أبی خالد)ەوە، ئەویش لە (الشعبی)ەوە دەڵێت: سەردەمێك دێت خەڵکی درود بۆ حەجاج دەنێرن[1].

ئەبو نەعیم لە یونسی کوڕی ئەبی ئیسحاق ئەویش لە ئەبی سەفەرەوە دەڵێن: شەعەبی گوتویەتی: بەخوا گەر بمێنن ئاوات بە حەجاج دەخوازنەوە.

ئەصمەعی دەفەرموێت: بە حەسەنیان گووت: تۆ دەڵێیت ئەوەی دواتر دێ خراپترە لەوەی پێش خۆی، دە ئەمە عومەری کوڕی عەبدولعەزیزە لەپاش حەجاج.

حەسەن فەرمووی: بێگومان دەبێ خەڵکیش هەناسە و پشویەك بدەن.

مەیمونی کوڕی مهراب ووتی حەجاج ناردی بەدوای حەسەنی بەصریدا ئەویش چوو بەدەمیەوە و کاتێك چووە بەردەمی و ڕاوەستا فەرمووی: ئەی حەجاج لەنێوان تۆ و ئادەمدا چەند پشت هەیە؟

وتی: زۆر.

فەرمووی: دەی لەکوێن؟

ووتی: مردن.

ووتی: ئیدی حەجاج سەری داخست و حەسەنیش ڕۆیشتە دەرەوە.

ئەیوبی سەختیانی فەرمویەتی کە حەجاج چەند جارێك ویستویەتی حەسەنی بەصری بکوژێت بەلام خوا پاراستویەتی لەدەستی.

چەندین گفتوگۆی لێ دەگێڕنەوە کە حەسەن لەو کەسانە نەبووە کە دەرچون و لادان لە خەلافەتەکەی حەجاج بە باش بزانێت، بگرە هاوەڵەکانی ئیبن ئەشعەسی قەدەغە دەکرد لەو کارە، بەلام کاتێك چووە ناویشیان بەنابەدڵ دەچوو، دەیفەرموو ئەو حەجاجە

---

[1]. واتە بۆی دەپاڕێنەوە و ڕەحمەتی بۆ دەنێرن لەبەر ئەوەی کەسانێك پەیدا دەبن لەو زۆردار و دڵڕەقتر دەبن.

نیقمەته ( پێ نواندنی خواییه)، کەواته به شمشێر ڕووبەڕوی نیقمەتی خودا مەبنەوه بەڵکو ئارام بگرن و بپاڕێنەوه.چونکه خوا دەفەرموێت ﴿ وَلَقَدْ أَخَذْنَاهُمْ بِالْعَذَابِ فَمَا اسْتَكَانُوا لِرَبِّهِمْ وَمَا يَتَضَرَّعُونَ ﴾[1]

له ئیبن عائیشەوه فەرمووی: پیاوێك له هەڵگەڕاوەکان هێنرا بۆلای وەلیدی کوڕی عبدالملك و پێیان وت: چی دەڵێی لەبارەی ئەبوبەکر و عومەرەوه؟

ئەویش ستایشی کردن و به باشه باسی کردن.

ئینجا گوتی: ئەی عوسمان..دیسان به باشه باسی کرد... هەتا پێی گوترا: ئەی عەبدولمەلیکی کوڕی مەروان؟ فەرمووی: ئێستا کاتی هاتووه بڵێم حەجاج یەکێکه له هەڵەکانی[2].

ئەصمەعی دەگێڕێتەوه: ئافرەتێکی خەواریجیان هێنا بۆلای حەجاج و حەجاج هەر قسەی لەگەڵ دەکرد و ئەویش نه سەیری دەکرد و نه وەڵامی دەدایەوه، هەندێك له پاسەوانەکانی حەجاج وتیان فەرماندە قسه لەگەڵ تۆ دەکات و تۆش ڕوی تێناکەیت.

فەرمووی: من شەرم دەکەم لەخوا که سەیری کەسێك بکەم خودا سەیری ناکات.

ئینجا فەرمانی کرد کوشتیان.

هەروەها دەگێڕنەوه: به سەعیدی کوڕی جوبەیریان گووت: ئایا لەفەرمانڕەوایەتی حەجاج لاتدا و هەڵگەڕایتەوه؟

فەرمووی: لاریم نەبوو له فەرمانڕەوایەتیەکەی هەتا بوویه بێ باوەڕ

دەڵێن: حەجاج لەدوای ئەو تەنها یەك پیاوی کوشت ناوی (ماهان) بوو، هەندێکیش دەڵێن کەسی نەکوشت، بەڵام پێش ئەوه خەڵکانێکی زۆری کوشت، زۆرتریبیان لەوانه بوون که لەگەڵ ئیبن ئەشعەسدا لایان دا له فەرمانڕەوایەتی حەجاج.

---

[1] . المؤمنون: ٧٦.

[2] .البداية والنهاية. سەرچاوەی پێشو

هیشامی کوڕی حەسان فەرموویەتی: بە لەسەرخۆیی ئەو کەسانەی حەجاج کوشتونی بژمێرن ژمارەیان گەیشتۆتە سەد و بیست هەزار کەس.

ئەصمەعی دەڵێت: گێڕایانەوە کە سولەیمانی کوڕی عبدالملك لە یەك بەیانیدا هەشتا و یەك هەزار دیلی بەردا، لەدوای مردنی حەجاج بەندیخانەکانیان کردەوە بینیان سی و سێ هەزار بەندیی تیایە، یەکێك لەوانەی کە بەندکرابوو دەشتەکیەك بوو، بینیبوویان لەبنی گەوڕێکی شاری واسیت دا میزدەکات، یەکێك بوو لەوانەی ئازادکرا و ئەم هۆنراوەیەی گوت:

اذا نحن جاوزنا مدينة واسط خرينا وصلينا بغير حساب

ئیبن ئەبی دونیا و ئیبراهیمی حەربی لە سولەیمانی کوڕی ئەبی سەنحەوە ئەویش لە صالحی کوڕی سولەیمانەوە دەگێڕنەوە کە : عومەری کوڕی عەبدولعەزیز گوتی گەر هەموو نەتەوەکان پیسترینی ناو نەتەوەی خۆیانیان هێنا و ئێمەش حەجاجمان هێنا ئەوا ئێمە لێیان دەبەینەوە.

عومەری کوڕی عبدالعزيز نامەی نوسی بۆ (عدي بن أرطاة): پێم گەیشتۆتەوە کە تۆ لەسەر ڕێبازی حەجاج دەڕۆیت، وەکو ئەو مەبە، چونکە ئەو نوێژی لەکاتی خۆیدا نەدەکرد، زەکاتی وەردەگرت لە بەدەر لە جێی و حەقی خۆیدا.

ئەبوبەکری کوڕی عەیاش لە عاصمی کوڕی ئەبی نەجودەوە دەگێڕێتەوە کە گوتوویەتی: خودای گەورە هیچ حەرامکراوێکی نەبووە کە حەجاج ئەنجامی نەدابێت.

لە (السري بن يحيى) دەگێڕنەوە کە ڕۆژێکی هەینی حەجاج تێدەپەڕی گوێی لەهاوار و دادو بێدادێك بوو، ووتی: ئەمە چیە؟ وتیان: خەڵکی ناو بەندیخانەکانن دەڵێن گەرما کوشتینی.

وتی: پێیان بڵێن: کڕبن تیایدا و قسە مەکەن.

وتی: دوای ئەوە کەمتر لە حەوتویەك نەژیا تاکو خوای گەورە تۆڵەیەکی بەزەبری لێکردەوە و لوتی شکان وەك شکاندنی لوتی هەموو زۆردار و ستەمکاران.

هەنـدێك وتویانــە: دەمــانبینی کــە دەهــات بــۆ نوێــژی هــەینی شــەکەت بووبــوو لەبەرنەخۆشیەکەی.

ئەصمەعی دەفەرموێت: کاتێك حەجاج بەخۆش کەوت خەڵکی هەموو خرۆشـان بـە هەواڵی مردنی، جا کاتێك ئەوەی پێگەیشتەوە، چوویە سەر بلندگۆ و وتی:

بەڕاستی کۆمـەڵێك لـە خـەڵکی عێراق ئـەهلی دوبـەرەکی و ونیفـاق، شـەیتان چـووتە بنکلێشەیانەوە و تۆوی خراپەی چاندووە لەنێوانیاندا و ووتویانە حەجاج مردووە!

بەخوا بەوە دڵخۆش نابم نەمرم و دونیا و هەموو ئەوەی لەناویدا هەمبێت، نەشمبینیوە خودا ڕازی بێت بە نەمری و هێشتنەوەی هیچ کـەس مەگـەر بـۆ سوکترین دروستکراوی خۆی کە (ئیبلیس)ە نەبێت: ﴿قَالَ أَنظِرْنِي إِلَى يَوْمِ يُبْعَثُونَ. قَالَ إِنَّكَ مِنَ الْمُنظَرِينَ﴾[1].

هەربۆیە بەندەی خودا داوای لەخوا کرد و فەرمووی:﴿ قَالَ رَبِّ اغْفِرْ لِي وَهَبْ لِـي مُلْكًا لا يَنْبَغِي لأَحَدٍ مِنْ بَعْدِي﴾[2].

خوای گەورەش ئەوەی پێدا بێجگـە لـە مانـەوەی هـەتا هـەتایی (نـەمری)، بـەخوا مـن بەهەموو زیندوییەکەوە لەئێوە وەك مردو وام، بەهـەموو تـەڕ و تازەیەکـەوە وەك وشـکبوو وام.. . ئەوانەی کە زیرن دەزانن چی دەڵێم.... پاشان هاتە خوارێ.

لـە عومـەری کـوری عەبدولعـەزیزەوە دەگێڕنـەوە فەرمویـەتی: ئێـرەییم بـە حـەجاجی دوژمنی خودا نەبردووە لەسەر هیچ شتێك هێندەی ئەم سێ شتە: حەزکردنی بـە قورئـان، پێدانی ئەو حەقەی لەسەریەتی بە مـاڵ و منداڵەکـەی، وتەکـەی کاتێـك لـە سـەرەمەرگ د بوو. خودایە لێم خۆش بە چون خەڵکی بێیان وایە تۆ وا ناکەیت (اللهم اغفرلي فإنّ الناس يزعمون أنّك لاتفعل).

[1]. الأعراف:١٤ – ١٥.

٢ . ص: ٣٥.

(محمد بن المنكدر) گوتویە کە عومەری کوڕی عبدالعزیز ڕقی لە حەجاج بوو بەڵام لە وشەیەکیدا ئێرەیی پێ دەبرد کە کاتی سەرەمەرگی وتبووی: خودایە لێم خۆش بە چون خەڵکی پێیان وایە تۆ وا ناکەیت (اللهم اغفر لي فإنّ الناس يزعمون أنّك لاتفعل).

لە ئەصمەعیەوە دەگێڕنەوە کە وتویە کاتێک حەجاج کەوتە سەرەمەرگ ئەم هۆنراوەیەی دەگوت:

يارب قد حلف الأعداء واجتهدوا أيمانهم أنني من ساكني النار

أيحلفون على كل عمياء ويحهم ماظنهم بعظيم العفو غفـار[1]

دەڵێت: ئەوە گەیشتەوە بە حەسەنی بەصری ئەویش فەرموی: ئەگەر بەو دوو دێڕە ڕزگاری بوو ئەوا ئێوەش پێی ڕزگارتان دەبێت.

ئیبن ئەبی دونیا لە ئەحمەدی تەمیمیەوە دەگێڕێتەوە کە: کاتێك مرد کەنیزەکێك چویە دەرەوە و هاواری دەکرد و دەیگوت:

ئیتر بەڕاستی ناب بدەکە

پەناگەی هەتیوانەکە،

هۆنەرە بە ئیلهامەکە

گەورەی خەڵکی شام .. مرد

اليوم يرحمنا من كان يبغضنا والیوم يأمننا من كان يخشانا

ئەمڕۆکە ئیدی ئەوەی کە ڕقی لێمان بوو بەزەیی پێماندا دێتەوە..ئەوەشی کە لێمان دەترسا دەبێت لێی بترسێن.

زیاتر لە کەسێك گێڕاویانەتەوە کە کاتێك حەسەنی بەصری مژدەی مردنی حەجاجی پێ درا سوژدەیەکی سوپاسگوزاریی برد بۆ خوای گەورە، خۆی شاردبوویە و پاش

---

[1] . واتە: خودایە خەڵکی سوێندیان خواردووە کە من پیاوێکم لە دانیشتوانی دۆزەخ.
ئایا کوێرانە سوێند دەخۆن..بەڵا لێیان دا.. نیارە هیچ ئاراس دەربارەی گەورەیی لێبوردەیی و لێخۆشبوونی تۆ.

حەجاج دەرکەوتەوە، وتی: خودایە وەك چۆن مراندت ڕێبازەکەشی بمرێنە و لێمانی دوریخەوە.

(شهاب بن خراش) وتی مامم (یزید بن حوشب) بۆی باسکردم کە (ئەبوجەعفەری مەنصور) ناردی بەشوێنما و گوتی: باسی وەسیەتەکەی حەجاجی کوڕی یوسفم بۆ بکە، دەڵێت گوتم. بمبەخشە ئەی ئەمیری بڕواداران، دەڵێت وتی پێم بڵێ دەی: منیش وتم: بەناوی خوای گەورە و میهرەبان، حەجاجی کوڕی یوسف وەسیەت دەکات کە گەواهی دەدات هیچ خودایەك جگە لە (الله)ی تاك و بێ شەریك بوونی نیە و محمدیش بەندە و پێغەمبەریەتی، گەواهی دەدات کە هیچ نازانێت بێجگە لە گوێڕایەڵیکردنی وەلیدی کوڕی عبدالملك، لەسەر ئەو گوێڕایەڵیە دەژی و دەمرێ و زیندو دەبێتەوە، رادەسپێرێت کە نۆسەد قەڵغانی ئاسنی هەیە، شەش سەدیان بۆ دوو ڕووەکانی خەڵکی عێراق تاکو شەڕی پێ بکەن، سێ سەدیشیان بۆ (میراتگرەکانی)، دەڵێت: ئەبو جەعفەر سەری بەرزکردەوە بۆلای (ابی العباس الطوسي) — کە لەپاڵ سەریەوە وەستابوو — وتی: ئەمە بەخوا دەست و پێوەندە نەك دەستوپێوەندەکەی ئێوە.

هەروەها ئەصمەعی لەباوکیەوە دەگێڕێتەوە کە گوتویە: لە خەودا حەجاجم بینی، پێم وت خوا چی پێکردیت، ئەویش وتی: بۆ هەرکەسێك کە کوشتومە کوشتومیەتەوە.

**لە قوربانیەکانی دەستی حەجاجی سەقەفی:**

(الترمذي) دەگێڕێتەوە پێغەمبەری خوا فەرموویەتی کە "لە سەقیف درۆزنێك و خوێنڕێژێك پەیدا دەبن" دەڵێن درۆزنەکە (موختاری کوڕی ئەبو عوبەید)ە و (خوێنڕێژەکە)ش (حەجاجی کوڕی یوسف)ە.

لە هیشامی کوڕی حەسانەوە فەرمووی: لەسەرخۆ ئەوانەی حەجاج کوشتونی بژمێرن گەیشتوەتە سەد و بیست هەزار کەس.

پێشەوا زەهەبی دەفەرموێت: وەك باسمان کرد خوای گەورە لە ڕەمەزانی ساڵی ٧٥ك لەناوی برد، حەجاج زۆردارێکی ... ستەمکاری ... بەدکرداری .. خوێن ڕێژبوو...

هەروەها ئازا و بوێر و بەفێڵ و زمان پاراو و ڕەوانبێژ بوو، مێژوییەکی گەورە و لەهەمان کاتدا خراپی بۆخۆی تۆمارکرد لە گەمارۆدانی ئیبن زوبێر و کابەی پیرۆز و ئاگربارانکردنی بە مەنجەنیق (ئاگر بار) و سوکایەتی کردنی بە خەڵکی مەککە و مەدینە (حرمين) و پاشان فەرمانڕەوایەتیکردنی عێراق و هەموو ڕۆژهەڵات بیست ساڵ و شەڕەکانی لەگەڵ ئیبن ئەشعەس و دواخستنی نوێژەکانی، هەتا خوای گەورە لەبێخی هێنا، هەربۆیە ئێمە سەرزەنشتی دەکەین و خۆشمان ناوێ، بەڵکو ڕقمان لێیەتی لەبەر خودا، کە بەڕاستی بێ بەش بوو لە باوەڕ، کردەوە گەلێکی باشی هەیە کە لەناو دەریای تاوانەکانیدا نقوم بوون. خواش خۆی لەگەڵی ئەوانە یەکلایی دەکاتەوە.

یەکێك لە قوربانیەکانی حەجاج (محمدی کوڕی سەعیدی کوڕی ئەبی وەققاص) پێشەوای متمانە پێکراو (ئەبو قاسم الزهری)ە، برای عومەری کوڕی صالحە، کۆمەڵێکی باشی تێراو کردووە بە زانست، یەکێك بوو لەوانەی لەگەڵ ئیبن ئەشعەس دژی حەجاج وەستانەوە، ڕۆژی (ديرالجماجم) بەدیل گیراوە (الشيخان) و (أصحاب السنن) فەرمودەیان لێوە گێڕاوەتەوە[1].

دەڵێن کە (نافع بن جبير بن مطعم بن عدی) دەچێ بۆلای حەجاج، حەجاج پێی دەڵێت: ئیبن زوبێر و عبداللەی کوڕی صەفوان و ئیبن مکیم کوشت خۆزگەم خواست ئیبن عومەریشم کوشتبا.

یەکێکی تر لە قوربانیەکانی دەستی حەجاج ئەوەیە: ئەعمەش دەڵێت: (ئیبن ئەبی لەیلا)م بینی حەجاج لێی دابوو وەك ئەوەی پێستی پشتی لێکرابێتەوە، پشتی نابوو بەپشتی کوڕەکەیەوە دەیان ووت: نەفرەت لە درۆزنان، ئینجا دەی وت: نەفرەتی خوا لە درۆزنان.. ئای .. پاشان بێدەنگ دەبوو و ئینجا دەیگوتەوە: عەلی کوڕی ئەبو تالیب و عبداللەی کوڕی زوبێر و موختاری کوڕی ئەبو عوبەید.....خەڵکی شام پێیان وابوو کە ئەو قسانە بەوان دەڵێت بەڵام ئەو ئەوانی لێدەردەکرد و ستایشی دەکردن.

---

[1] . سير أعلام النبلاء...الذهبي.

(زەهەبی) فەرمویەتی: لە (ابن حصين)ەوە گێڕاویانەتەوە کە حەجاج (ابن أبي ليلى) کردە دادەوەر، پاشان لایبرد، پاشان دەستگیری کرد و لێیدا بۆ ئەوەی جنێو بە (ئەبو تراب) بدات — مەبەستی علی کوڕی ئەبو تاڵیبە — کەکاتی خۆی لە نەهرەوان بوو بوو لەگەڵ عەلی کوڕی ئەبو تاڵیب دا – خوای لێی ڕازی بێت — .

یەکێکی تر لە قوربانیەکانی دەستی حەجاج: ئیبن سەعد گوتویەتی: (عطية العوفي) لەگەڵ ئیبن ئەشعەس ڕاپەڕی ئینجا حەجاجی نامەوی نوسی بۆ (محمدی کوڕی قاسم) کە پێشنیاری جنێودان بە عەلی بۆ بکە ئەگەر وای نەکرد ئەوا سەد قامچی لێ بدە و ڕیشی بتاشە، ئەویش ناردی بەشوێنیا و پێشنیارەکەی خستە بەردەمی ئەویش ڕازی نەبوو، ئیدی فەرمان و بڕیارەکەی حەجاجی بەسەردا جێبەجێ کرد.

یەکێکی تر لە قوربانیەکانی حەجاج: (ماهان الحنفي الكوفي) بوون دەگێڕنەوە لە ئیبن ئەبی حەنەفیەوە دەڵێت: ماهانی حەنەفیم بینی حەجاج کردبووی بە قەنارەدا، ئیبراهیم دەیگوت: ئێمە فەرمانمان پێکرابوو پاسەوانیی ئەو شوێنە بکەین، دەمانبینی ڕوناکیمان لەلایەوە دەرەچوو.

ئەبو داود فەرمویەتی: حەجاج هەردوو دەست و قاچی بڕی و لە قەنارەی ، کە دەڵێن ئەمە کۆتا کەس بوو حەجاج کوشتی، بەڵام زۆرینە دەڵێن کە (سەعیدی کوڕی جبیر) کۆتاهەمین بوو.

یەکێکی تر لە قوربانیەکانی دەستی حەجاج: (مصدع أبو يحيي الأعرج) ناسراو بوو بە (معرقب الأنصاري) ، پێی وتراوە (معرقب[1]) چونکە (حەجاج) یان (بشر بن مروان) پێی وت کە جنێو بە عەلی کوڕی ئەبو تاڵیب بدات ئەویش بەگوێی نەکرد، هەربۆیە دەماری پاژنە پێی بڕی، کە یەکێك بوو لە بگێڕەوەی فەرمودەکانی (مسلم).

[1]. معرقب: بەو کەسە دەوترێت کە دەماری گەورەی پاژنە پێی بڕابێت.

## فتوای زانایان دەربارەی حەجاجی سەقەفی و پرسی نەفرەت لێکردن و بێ بڕواکردنی

ئایا حەجاج لەئیسلام دەرچووە؟! هەندێك بە ڕاشكاوی لەئیسلام دەری دەكەن (نەفرەتی لێدەكەن) و هەندێكی تر بێ باوەڕی دەكەن (تكفیر)، ئەی زانایانی ئاینی و فەقیهەكان لەم بارەیەوە چیان وتووە؟

شێخی ئیسلام ئیبنوتەیمیە دەفەرموێت: ئەهلی زانست بە ستەمكار و هاوشێوەكانی ناوی دەبەن، لەبەر ئەوەی موسوڵمانە بە ڕوكار و كردەوەی باشیشی هەیە، چونكە نەفرەت لە كەسێك ناكەن بەدیاریكراوی، بەڵكو نەفرەت لە ستەمكار دەكەن وەك خوا دەفەرموێت :﴿ألا لعنة الله علي الظالمين﴾، هەربۆیە نەفرەت لەو شت و سیفاتانە دەكەن كە خوای گەورە و پێغەمبەرەكەی نەفرەتیان لێكردووە بەگشتی، وەك پێغەمبەر – درودی خوای لێبێت – دەفەرموێت :" خوا نەفرەتی كردووە لە مەی و ئەوەش تریكەی گوشیوە و ئەوەشی بۆی گوشراوە، فرۆشیارەكەی و كڕیارەكەی و تێكەرەكەی و بخۆرەوەكەی و هەڵگرەكەی و بۆ هەڵگیراوەكەی و ئەوەشی پارەكەی دەخوات" بەڵام نەفرەت لەفلان كەسی دیاریكراو ناكەن.

وەك چۆن لە صەحیحی بوخاری و بێجگە لەویشدا هاتووە كە : " پیاوێك مەی دەخواردەوە، پێغەمبەریش – درودی خوای لێ بێت – داری حەد (جلد)ی لێ دا، جارێك هێنایان و پیاوێك نەفرەتی لێكرد ئینجا پێغەمبەر فەرمووی: نەفرەتی لێ مەكە، ئەو خوا و پێغەمبەری خۆش دەوێت".

چونکە نەفرەت لێکردن (لعنة) بەڵێنی ترسە، بەڵێنی ترساندنیش گشتیەوە نابڕێتەوە بۆ کەسێکی دیاریکراو.

لەفەتوای زانایانی سەردەم لەسەر وێب سایتی (طريق الإسلام) ئەو فەتوایانە دراون:

سوپاس و ستایش بۆخوای گەورە و درود و سەلامیش لەسەر پێغەمبەری خوا و یار و یاوەرانی و لەپاشان:

نەفرەت: واتە بێ بەشکردنی کەسێك لە ئیسلام و لە ڕەحمی خوا.

بە نەفرەت کردنی حەجاج پێویستە وازی لێ بهێنرێت لەسەر بنەمای ئەوەی کە (الفاسق المعين خراپەکاری دیار ) بەدیاریکراوی نەفرەتی لێ ناکرێت، خۆ ئەگەر کەسێك وتی: ئەی ئایا ستەمکار نەبووە؟ ئایا هاوەڵانی نەکوشتووە؟ ئیدی بۆچی نەفرەتی لێ نەکەین؟ وەڵامی دەدەینەوە بەوەی کە شێخی ئیسلام ئیبنو تەیمیە فەرمویەتی: ئێمە گەر باسی ستەمکارانی وەك حەجاجی کوڕی یوسف و هاوشێوەکانی کرا ئەوە دەڵێین کە خوا فەرموویەتی :﴿ ألا لعنة الله على الظالمين﴾، حەزناکەین هیچ کەس نەفرەت لێ بکەین بەدیاریکراوی، وەك چۆن هەندێك زانا – یەزیدی کوڕی معاویەیان – بە نەفرەت کردووە (واتە لە ئیسلام بێ بەش کردووە)، کە ئەمە ڕێباوەڕێکە (مذهب) شیاوی ئیجتیهاد تیاکردنە، بەڵام ئەو وتەیەمان لا پەسەند و باشترە....کۆتایی.

بەڵام باسکردنی ستەم و خراپە و تاوانکاریەکانی، هیچ ڕێگرییەك نیە لە باسکردنیان، یا کردەوەی چاکە و فتوحاتیشی هەبێت، پێشەوا زەهەبی ئەوەی بۆ وەرگێڕاوین و دەفەرموێت: حەجاج خوای گەورە لە ڕەمەزانی ساڵی (٩٥ك) لەناوی برد کە هێشتا پیر نەبووبوو، زۆردارێکی ... ستەمکاری ... بەدکرداری ..فێڵبازی.. خوێن ڕێژبوو..پاشان دەفەرموێت: ئێمە سەرزەنشتی دەکەین و خۆشمان ناوێت، بەڵکو ڕقمان لێیەتی لەبەر خودا، کە بەڕاستی بێ بەش بوو لە باوەڕ، کردەوە گەلێکی باشی هەبوو کە لەناو دەریای تاوانەکانیدا نقوم بوون. خواش خۆی لەگەڵی ئەوانە یەکلایی دەکاتەوە...کۆتایی.

حەجاج لەدەستەی ستەمکارەکە نەبوو، بەڵکو فەرمانڕەوای عێراق و هەموو ڕۆژهەڵات بوو لەلایەن ئەمیری بڕواداران (عبدالملك بن مروان)ەوە دانرابوو..خوداش زاناترە[1].

بەڵام مەسەلەی کافرکردنی حەجاجی کوڕی یوسف ئەوە ناکرێ و کافرکردنی ڕەوا نیە بەڕای دروست و زۆرینە، لای ئەهلی زانست، چون کردەوەی هاوەڵانی سەردەمی ئەو پێچەوانە و هەڵوەشێنەرەوەی ئەوە بووە، لەدوایەوە نوێژیان کردووە، لەگەڵیدا حەجیان کردووە، لەوانە: ئیبن عومەر، ئەنەسی کوڕی مالیك، عبداللەی کوڕی زوبێر، دەشیان زانی چی لەم کابرایەدا هەیە لە زۆر و ستەم و خوێنڕێژی، لەگەڵ ئەوەشدا حەجاجیان کافر نەکردووە.

لە سەعیدی کوڕی جوبەیرەوە فەرمووی: لەگەڵ ئیبن عومەر بووم کاتێك نوکی ڕم چوو بە بنی پێیدا، ئیدی پێی بە (ئاوزەنگ[2])ی زینی ئەسپەکەیدا دەلکا، برینەکەی کیمی دەکرد، ئەو ڕوداوەش لە مینا بوو، ئینجا حەجاج گەیشت و گەڕاندیەوە.

حەجاج گوتی: گەر دەمزانی کێ وای لێکردوی؟

ئیبن عومەر فەرموی: تۆ بریندارت کردم.

حەجاج گوتی: جا چۆن؟

فەرموی: چەکت لە ڕۆژێکدا هەڵگرت کە قەدەغەبوو، هەروەها چەکت هێنایە کابەوە و چەکیش پێشتر نەدەهاتە کابە.

لەگێڕانەوەیەکدا کە ئیسحاقی کوڕی سەعید لەباوکیەوە دەگێڕێتەوە.

وتی: حەجاج چوویە لای ئیبن عومەر و منیشی لا بووم.

وتی: کێ برینداری کردیت؟

---

[1] . المفتي: مەڵبەندی فەتوا بە سەرپەرشتی (د.عبدالله فەقیە).
www.islamweb.net\web\fatwa showsinglefatwa

[2] . چوارچێوەیەك یان ئەڵقەیەکە و دەبەسترێت بە زینی ئەسپەوە بۆ ئەوەی سوارەکە قاچی بکاتە ناوی لەکاتی ئاودان و ڕۆیشتندا و بە ئاسانیش سواری ببێت.

فەرمووی: ئەو کەسە برینداری کردم کە فەرمانی بە هەڵگرتنی چەك کرد لە ڕۆژێکدا کە ڕەوا نیە تیایدا چەك هەڵبگیرێت.

– واتە حەجاج–.

لەبەرئەوەی ئەمە لە ڕۆژگاری گەمارۆدانی ئیبن زوبێردا بوو لەلایەن حەجاجەوە[1].

(عمیر بن هانئ) دەگێڕێتەوە: ئیبن عومەرم بینی و حەجاج گەمارۆی ئیبن زوبێری دابوو، شوێنی ئیبن عومەر لەنێوان هەر دوولایاندا بوو، وەك ئەوەی ڕەنگە ئامادەی نوێژی ئەمیان بووبێت و ڕەنگە ئامادەی نوێژی ئەویان بووبێت.

(زبیر بن عدی) دەگێڕێتەوە: چووین بۆلای ئەنەسی کوڕی مالیك و سکاڵامان کرد لە حەجاج و کردەوەکانی، فەرمووی: ئارام بگرن، بەڕاستی ڕۆژ بەڕۆژ زەمانی خراپتر دێت، تاکو دەگەنەوە بەخوای خۆتان، من ئەوەم لە پێغەمبەرەکەتان بیستووە – درودی خوای لێبێت – .

بەڵام لەبارەی نوێژدواخستنی حەجاجەوە لەکاتی خۆیدا چەند گێڕانەوەیەك ئاماژەیان پێداوە لەوانەش:

لە گێڕانەوەیەکی (مسلم) دا هاتووە کە " حەجاج نوێژەکانی دوا دەخست".

(الحافظ ابن حجر) لە (فتح الباري) دا باسی کردووە لە گێڕانەوەی ئەبی عەوانەوە ئەویش لە (شعبة)ەوە، دەڵێت: پرسیارمان کرد لە جابری کوڕی عبدالله لە سەر حەجاج، وتی نوێژی لەکاتی خۆی دوا دەخست.

دەربارەی زیادەڕۆییکردن لە کوشتنی نەیارەکانی بەنی ئومەییەدا دەگێڕنەوە:

حەجاج ڕۆژێك لەسەر بڵندگۆ دەی وت: لەخوا بترسن چەند دەتوانن، گوێڕادێرن و گوێڕایەڵ بن بۆ ئەمیری بڕواداران عبدالملك ، بەخوا گەر فەرمانم کرد خەڵك لە دەرگایەکی مزگەوتەکەوە بڕۆنە دەرەوە ئەوان لە دەرگایەکی ترەوە بچنە دەر ئەوا خوێن و ماڵیان بۆم حەلاڵ دەبێت.

---

[1] . بوخاری گێڕاویەتیەوە.

دەڵێت: ئەمەم باسکرد بۆ (ئەعمەش) ئەویش گوتی: بەخوا منیش ئەم قسەیەم لێ بیستووە[١].

بەڵام گێڕانەوەکەی (مسلم بن ابراهیم) لە (صلت بن دینار) ووتی: بیستم حەجاج لە سەر بڵندگۆی شاری (واسط) دەیگوت: عبداللەی کوڕی مسعود سەرۆکی دووڕووەکانە و گەر پێی بزانم لەکوێیە ئەوا زەوی ئاو دەدەم بەخوێنی ئەو[٢].

***

---

[١]. (ئەبو داود) لە (محمد بن العلا (ئەویش لە (ئەبو بەکر)ەوە و ئەویش لە (عاصم)ەوە گێڕاویانەتەوە و وە ئەلبانی لە صەحیحی سوننەنی ئەبی داود دا ڕاستی کردۆتەوە.

[٢]. (صلت بن دینار) متروك الحدیث... ......واتە فەرمودەکانی وازلێهێنراوە یاخودا پەڕێنراوە.

## حەجاج و لەیلای ئەخیلی

هاوسەری (توبة بن الصمة) بوو، لەسەردەمی حەجاج دا بووە، هەندێك سەرچاوە باسیان کردووە کە حەجاج دەکات بە لەیلای ئەخیلی و ئەویش هۆنراوەیەکی بۆ دەڵێت.

دەگێڕنەوە: لەیلای ئەخیلی دەچێت بۆلای حەجاج و ئەم هۆنراوەیەی پیا دەڵێت:

فنعم فتى الدنيا لئنْ كانَ فاجراً ... وفوق الفتى إن كان ليسَ بفاجرِ

فتىً هو أحيا من فتاةٍ حييّة .......... وأشجعُ من ليثٍ بخفانَ خادرِ

فتىً فيه فتيانيةٌ أريحيّةٌ .............. بقيّةُ أعرابيّةٍ من مُهاجرِ[1]

ئینجا یەکێك لە گەنجەکانی مەجلیسەکەی حەجاج ووتی: بەخوا ئەی فەرماندە (تەوبە) ئەوەی لەیلا دەڵێت لە تەوبەدا نەبووە.

لە (أيوب بن مسلمة الهمذاني)ەوە، وتی: باپیرم لای حەجاج بوو، باسی کرد ئافرەتێك هات بۆلای و سڵاوی کرد و ئەویش وەڵامی دایەوە، ئینجا پێی گوت: تۆ کێی؟

وتی: من لەیلام.

وتی: هاوسەری (توبە بن حمیر)؟

وتی: بەڵێ.

وتی: توخوا چیت بە (تەوبە) گوت؟

---

[1] . واتە: باشترین لاوی دونیایە با خراپەکاریش بێت.. خۆ گەر خراپەکار نەبووایە لەسەرو هەموو لاوەکانەوەبوو..لاوێکە زیندو و چالاکتر لە کچێکی دڵتەڕ.. ئازاتر لە شێرێکی نەبەرد...ڕوخۆشی و لاوێتی تێدایە و پاشماوەی ئەعرابیەکە لە کۆچکردوان.

لەیلا وتی: وتم:

فإنْ تكنِ القتلى بواءً فإنَّكم ... فتىً ما قتلتُم آل عوفِ بن عامرِ

چەند دێڕێکی لێ یاد کردەوە.

ئینجا (ئەسمای کوڕی خاریجەی فەزاری) پێی وت: خانم تۆ بەڕاستی ئەم پیاوە بە شتێك وەصف دەکەیت کە عەرەب پێی نەزانیوە.

وتی: لەیلا وتی: ئەی پیاو تۆ (توبة) ت بینیوە؟

وتی: نەخێر.

وتی: خوا چاك بۆ فەرماندە بکات، دە بەخوا گەر کەسێك (توبە)ی بدیایە، دڵی لێ دەچوو.

هەروەها لە (عبدالله بن مشهور)ەوە دەگێڕنەوە، وتی: لەیلای ئەخیلی چویە لای حەجاج، حەجاج پێی وت: ئەو هۆنراوەیەم بۆ بخوێنەوە کە بۆ (توبە)ت وت، ئەویش وتی:

كأنَّ فتى الفتيان توبةَ لم ينخْ ... قلائصَ يفْحصْنَ الحصى بالكراكرِ

ولمْ يبْنِ أبراداً رقاقاً لفتيةٍ .......... كرامٍ ويرحلْ قبْلَ فيءِ الهواجرِ

لەگێڕانەوەیەکی تردا لە (ئەبی عەمری شەیبانی)ەوە دەڵێت: ڕۆژێك حەجاجی کوڕی یوسف هاوڕێ خانەدان و گەورەکانی خۆی لەدەورپشت دەبێت ئینجا ئافرەتێك لە هەموو ئافرەتان جوانتر و خۆش ڕەفتارتر و خۆش بێژتر هاتە ژوورەوە و سڵاوی لە حەجاج کرد و وتی: ئەی فەرماندە ڕێ دەدەیت؟

وتی: بەڵێ، ئینجا ئەویش ئەم هۆنراوەیەی گوت:

| | |
|---|---|
| أحجاج إنّ الله أعطاك غاية | يقصر عنها من أراد مداها |
| احجاج لايفلل سلاحك إنّما | المنايا بكف الله حيث يراها |

واتە: ئەی حەجاج خوای گەورە ئامانج و مەبەستێکی پێداویت هەرکەس بیەوێت دەستی پێی ناگات.

ئەی حەجاج شمشێرەکەت (چەکەی تۆ) کول نابێت، بەڵام ئاوات و ئامانجەکان بەدەستی خوایە هەرچۆنێك پێی باش بێت..

ئینجا حەجاج بەوانەی چواردەوری وت: ئایا دەزانن ئەمە کێ یە؟

وتیان: نایناسین، بەڵام هەرگیز ئافرەتێك زمان پاراوتر و جوان ڕوخسارتر و خۆش گفتترمان لەم ئافرەتە نەبینیوە، کەواتە ئەو کێ یە خوا چاك بۆ فەرماندە بکات؟

حەجاج وتی: ئەمە لەیلای ئەخیلیە هاوسەری (توبە بن الحمیر العقیلی)یە، کە لەبارەی لەیلاوە دەڵێت:

فلو أنّ لیلی الأخیلیة سلمت   علی وفوقي تربة و صفائح

لسلمت تسلیم البشاشة أو زقا   إلیها صدی من جانب القبر.

واتە گەر لەیلا سڵاوی لێکردم و بەخۆڵیش داپۆشرابم لە گۆڕدا ئەوا بەڕوخۆشی و شادیەوە وەڵامێکی دەدەمە لای گۆڕەکە دەنگ بداتەوە.

پاشان وتی: ئەی لەیلا هەندێك لەو هۆنراوانەمان بۆ بڵێ کە (توبە) بۆتۆی وتووە، ئەویش وتی:

نأتْكَ بلیلی دارها لا تزورها ... وشطَّتْ نواها واستمرَّ مریرها

وكنت إذا ما زرْت لیلی تَبَرْقَعَت ... فقد رابني منها الغداة سُفورها

تاکو تەواو بوو لە هۆنراوەکە.

ئینجا پێی وت: ئەی لەیلا چی عەقڵی تێکدا بۆ جوانیەکەت کە بەبێ داپۆشراوی تۆی بینی؟

وتی: خوا چاك بۆ فەرماندە بکات! هەمیشە بە پەرچەوە منی بینیوە جارێك هات وتی شێتم بووە، خەڵکی پێیان زانی و خۆیان بۆ داگرت، کە هەستی بەوە کرد تەنها سڵاوێکی کرد و ڕۆی.

ئینجا حەجاج وتی: خوا نەتکوژێ لەیلا ئایا هەرگیز گومانێك کەوتۆتە نێوانتان؟ وتی: نەخێر بەوەی کە (لێی دەپاڕێمەوە چاکت بۆ بکات) هیچ نەبووە لەنێوانمان بەس ئەو جارێك شتێکی وت، گومانم وابوو کەوتۆتە ژێر کاریگەریی هەندێك شتەوە هەربۆیە وتم:

وذي حاجة قلنا له لا تبح بها ... فليس إليها ما حييت سبيل

لنا صاحب لا ينبغي أن نخونه ... وأنت لأخرى صاحب وخليل

تخالل تهوى غيرها فكأنما.....لها من تظنيها عليك دليل[1]

هەربۆیە دوای ئەوە هیچ گومانێکی لێ نەکردم تاکو مردن کەوتە نێوانمانەوە.

وتی: دوای ئەوە کوژرا.

حەجاج وتی: هەندێك لە لاواندنەکانی خۆتمان بۆ بڵێ بەسەر ئەودا، چەند کۆپلەیەکی زۆری بۆ وتن، لەوانەشی کە وتی ئەو کۆپلەیە بوو کە تیایدا لەیلا دەڵێت:

كأنَّ فتى الفتيان توبةُ لم ينخْ ... قلائِصَ يفْحصْنَ الحصى بالكراكرِ

کاتێك تەواوی کرد پیاوێك لەناو کۆڕەکە وتی: بەخوا وانازنم کە گەیشتبێتە دەیەکی ئەو وەصفەی تۆ کردت، ئینجا لەیلا سەیرێکی پیاوەکەی کرد و وتی: خوا چاك بۆ فەرماندە بکات، بەڕاستی ئەم قسەکەرە گەر (توبە)ی بدیایە شێت و شەیدای دەبوو.

ئینجا حەجاج وتی: پێویستی و داواکاریت چیە؟

لەیلا وتی: داواکاریم ئەوەیە بە نێردەیەك بمبەی بۆ لای قوتەیبە و بۆ خۆراسان، ئەویش هەڵیگرت و بردی بۆلای قوتەیبە بەڕێك و پێکی و گەیاندیەلای، ئینجا پاش ماوەیەك لەیلا گەڕایەوە و لە (ساوە) مرد و گۆڕەکەشی لەوێ یە.

وە دەگێڕنەوە[2] کە لەیلای ئەخیلی چوو بۆلای حەجاج و هۆنراوەیەکی بۆ وت.

پاشان حەجاج پێی وت: حەزدەکەی ئەم شەو لەلای کام لە هاوسەرەکانم بمێنیتەوە؟

لەیلا وتی: ژنەکانی تۆ کێن ؟

---

[1] . واتە: ئەوەی داواکەی هەبوو پێمان وت هەر باسی مەکە ئێمە ڕێی ئەو شتانە ناگرینە بەر هاوسەرێکمان هەیە پێویست ناکات ناپاکی لێ بکەین تۆش بۆ یەکێکی تر هاوەڵ و هاوسەری.

[2] . (محمد بن أبي الأزهر) لە (محمد بن يزيد النحوي)موە دەگێڕنەوە.

حەجاج وتی: ئوم گێلاس کچی سەعیدی کوڕی ئەلموعاسیری ئەمەویە، هیند کچی ئەسمای کچی خاریجەی فەزاری، هیند کچی مهلبی کوڕی ئەبی صوفرەی عەتکی.

لەیلا وتی: حەزم لێیە لای قیسیەکە بمێنمەوە.

کاتێك سبەی هاتەوە بۆلای حەجاج، ئەویش وتی هۆی خزمەتکار، پێنج سەد درهەمی بدەیە.

ئەویش گوتی: ئەی فەرماندە بیکە بە (أدم)ێك، (أدم) واتە وشتری سپی.

کەسێکیش وتی: من بۆت دەکەم زیاد دەکەم.

لەیلا بەشەرمێکەوە وتی: فەرماندە زۆر لەوە بەخشندەترە، ئەگەرنا خۆم سەرەتا داوام لێدەکرد.

دەگێڕنەوە کە لەیلا چووە سەردانی حەجاج، حەجاج وتی بەهاوڕێکانی، بۆتانی تەریق بکەمەوە؟

وتیان: بەڵێ.

وتی: لەیلا.

لەیلا وتی: سەرم لەرێتە فەرماندە.

وتی: ئایا تۆ (توبة بن الحُمَیر)ت خۆشدەویست؟

ئەویش وتی: بەڵێ ئەی فەرماندە، گەر تۆش بتدیبایە خۆشت دەویست!.

دەگێڕنەوە لە (عەمری کوڕی سەعید)ەوە کە باوکی بۆی گێڕاوەتەوە: لەیلای ئەخیلی هات بۆلامان و وتی دەمەوێت ستایشی حەجاج بکەم و پیای هەڵبدەدم ئێمەش کردمانە ژوورەوە بۆ لای، ئەویش وتی:

لقد وجد الحجاج أرضاً مریضةً ... فطبَّق أعلى دائها فشفاها

تتبَّعها الداء العضال الذي بها ... غلامٌ إذا هز القناة سقاها[1]

---

[1] واتە حەجاج خاکێکی نەخۆشی دۆزیەوە و دەستی خستە سەر بەرزترین دەردی و سارێژی کرد.

پاشان حەجاج وتی: لای کام لە ژنەکانم ئەم شەو دەمێنێتەوە؟

وتی: ژنەکانتم پێ بڵێ.

وتی: کچی (سعید بن عبدالرحمن بن عتاب بن أسید) و (ئوم سەلەمەی)ی کچی (عبدالرحمن بن سهیل بن عمرو) و کچی (المهلب بن أبی صفره) و کچی (أسما بنت خارجه الفزاری) هەموو ژنی منن.

ئەویش (ئەسمای کچی خاریجە)ی هەڵبژارد، لەبەر دۆستایەتی و نزیکایەتی لێیەوە، لای ئەو مایەوە.

دەگێڕنەوە لە محمدی کوڕی حەجاج خۆیەوە کە وتویەتی: حەجاج دانیشتبوو لەناو کۆمەڵێکدا و لەوکاتەدا لەیلا پرسی کرد کە بێتە ژورەوە، حەجاج وتی، کام لەیلا؟

وتیان: ئەخیلی.

وتی: خێزانی (توبة) بیهێنە ژورەوە.

ئینجا ئافرەتێکی باڵا بەرز چاو ڕەش، خۆش ڕەوت، خۆش گفت هاتە ژورەوە، سڵاوی کرد، حەجاج بەخێرهاتنی کرد، نزیك بوویەوە و حەجاج وتی: ئەی خزمەتکار پاڵپشتێکی بۆ دابنێ لەپشتیەوە، ئەویش دانیشت، حەجاج وتی: چ کارێکت هەیە لای ئێمە؟

ئەویش وتی: سڵاوکردن لە فەرماندە، بەجێ گەیاندنی مافی بەسەرمانەوە، هەروەها هاتن بۆ بەخششەکانی.

ئینجا حەجاج ووتی: هۆی خزمەتکار بڵێ پێنج سەد درهەمی بدەنێ، پێنج بەرگی بدەنێ یەکیان وەك عەزی بێت، بیبەنە لای کچە مامەکەی (هیند کچی ئەسمای کوڕی خاریجە) پێی بڵێن: خزمەتی بکات و دیاری بداتێ.

ئەویش وتی: خوا چاك بۆ فەرماندە بکات.

ئینجا (ئیبن مەوهیب) وتی: خوا پایەدارت بکات فەرماندە ئایا خەڵات و دیاری بدەینێ؟

وتی: بەڵێ، ئەویش چوارسەد درهەمی پێدا، (هند)یش سێ سەد درهەمی پێدا، محمدی کوڕی حەجاجیش پێی دا.

وتی: حەجاج چوو بۆلای هاو کوڕەکانی و وتی: ئایا دەزانن ئەمە کێ یە؟

وتیان: نەبەخوا ئافرەتێکمان نەبینیوە هەرگیز لەو زمان پاراوتر و زمان شیرینتر و جوانتر لەم هۆنراوە بلێت، ئەو کێ یە؟

وتی: لەیلای ئەخیلی، هاوسەری (تەوبەی کوڕی حومەیر).

پاشان چووە پێشەوە لێی وتی: ئەی لەیلا توخوا شتێکت لە (تەوبە) بینیوە ڕقت لێی بێت یان داوای شتێکی لێ کردوی نەشیاو و جێی شەرم بێت؟

وتی: نەخێر، بەو زاتەی داوای لێخۆشبوونی لێ دەکەم، ئەو لەو کەسانە نەبوو.

حەجاج وتی: بەڵام ئەگەر وانەبووبێت ئەوا خوا ڕەحم بە ئێمە و ئەویش بکات.

حەجاج ووتی: هەندێك کۆپلە هۆنراوەی خۆتمان بۆ بڵێ کە بۆ (توبة)ت گوتووە، ئەویش وتی:

لعمرك ما بالموت عار على الفتى * اذا لم تصبه في الحياة المعاير

وما أحد حي وان عاش سالما * بأخلد ممن غيبته المقابر

فلا الحي مما أحدث الدهر معتب * ولا الميت ان لم يصبر الحي ناشر

وكل جديد أو شباب الى بلى * وكل امريء يوما الى الموت صائر

قتيل بني عوف فيا لهفتا له * وما كنت اياهم عليه أحاذر

ولكنني أخشي عليه قبيلة * لها بدروب الشأم باد وحاضر

وتی : ئینجا حەجاج بە دەرگەوانەکەی وت: بیبە زمانیم بۆ برە.

ئەویش چوو (حجام)ی بۆ بانگ کرد تاکو زمانی بڕێت، لەیلا وتی: بەڵا لێت دا فەرماندە پێی وتی زمانی برە بە بەخشین و دیاری و خەڵات نەك بە چەقۆ، ئینجا گەڕایەوە بۆ لای پرسیاری لێ بکات، هەروەها گەڕایەوە بۆلای لەیلا بەتوڕەییەوە و دەیویست زمانی ببڕێت.

ئینجا لەیلا داوای لێکردەوە کە بیبەنەوە بۆلای حەجاج، چوویە ژوورەوە بۆلای، وتی:

ئەی فەرماندە ئەو بێ دینە خەریك بوو زمانم ببڕێت، ئەم هۆنراوەیەشی بۆ وت:

حجاج أنت الذي مافوقه أحد إلاّ الخليفة والمستغفر الصمد

حجاج أنت شهاب الحرب إذا لقحت وأنت للناس نور ضوؤه يقد[1].

ئینجا حەجاج پێی وت: نیازی کوێت هەیە، ئایا دەگەڕێیتەوە بۆ شاری خۆت ئامادەکاریت بۆ بکەم؟ وتی: نەخێر، نیازی لای (باهلی)م هەیە واتە (قوتەیبە) – کە ئەوکات لەخۆراسان بوو– ، ئینجا لەوێ دەرچوو بۆ لای قوتەیبە و دەڵێن لە (الری) یان پێش (الری) مرد.

بەڵام ئەحمەد لە (ئەبی عەمری شەیبانی)ەوە دەڵێت لەیلا کە حەجاج بردی بۆ لای قوتەیبە لە خۆراسان، قوتەیبە پێشوازی لێکرد و ڕازاندیەوە و خەڵاتی کرد، ئینجا پاش ماوەیەك لەیلا گەڕایەوە و لە (ساوە) مرد و گۆڕەکەشی لەوێ یە

***

---

[1] . واتە: حەجاج تۆ ئەو کەسەی کە لەسەروبەوە هیچ کەس نیە، بێجگە لە خەلیفە و لێخۆشبووی ئەمر (مەبەستی خوایە).

حەجاج تۆ بزیسکە و کڵپەی ئاگری و شێری لەشەڕدا گەر گەیی بەگیانت، تۆ بۆ خەڵکی ڕوناکیەکی ڕۆشناییەکەی داگیرساوە.

# ژنانێك لە ژیانی حەجاج دا

- چوار ژنەکەی حەجاج:

١-هیند کچی (المهلب).

٢-هیند کچی ئەسمای کچی خارجە.

٣-ئوم گێلاس کچی عبدالرحمن

٤-(رمە اللە) کچی (عبدالرحمن بن جریر).

## چوار ژنەکەی حەجاج و هەڵسوکەت و حاڵی لەگەڵیان

(ابن عبد ربه) له (العقد الفريد)دا بەشی پێنج، دەڵێت: باسی ژنیان لای حەجاج کرد، ئەویش وتی، من چوار ژنم هەیە: هیند کچی (المهلب) ، هیند کچی ئەسمای کچی خاریجە، ئوم گێلاس کچی عبدالرحمن کچی ئوسەید، (أمه الله) کچی (عبدالرحمن بن جرير).

شەوم لەگەڵ هیندی کچی موهەلەب دا شەوی لاوێك بووە لەنێوان لاوەکاندا کە یاری و گەمە دەکات و ئەوانیش یاری لەگەڵ دەکەن، شەوم لەگەڵ هیند کچی ئەسما دا شەوی پەشایەك بووە لەنێو پاشاکاندا، شەوم لەگەڵ ئوم گێلاس دا شەوی ئەعرابیەك بووە لەنێو ئەعرابیەکاندا لە قسەو هۆنراوەکانیاندا، شەو بەسەربردنم لەگەڵ (أمة الله)دا شەوی زانایەك بووە لەنێو زانایان و فەقیهاندا.

بەڵام دوو ژنە ناودارەکەی ژیانی حەجاج کە لێیان جیابوویەوە و تەڵاقی دان، ئەوانیش هیند کچی موهەلەب و هیند کچی ئەسمای فەزاری، دەڵێن: کە کچەکەی موهەلەبی تەڵاق دوە پێش ئەوەی (یەزید)ی برای لابرد لە فەرمانڕەوایەتی خوراسان و بەندی کرد ئیدی ئەویش دڵتەنگ بوو بۆی، هەربۆیە حەجاج تەڵاقی دا.

هیندی کچی ئەسمای لەبەر ئەوە تەڵاق دا کە خۆشەویستیی لەدڵ مابوو بۆ مێردی یەکەمی (عبیداللە بن زیاد) کە ساڵی ٦٧ك کوژرا، دەشڵێن خۆشی ویستووە بەڵام نەبووەتە ژنی؛ بەڵکو شوی کردووە بە (بیشر کوری مەروان) برای خەلیفە عبدالملك کە فەرمانڕەوای عێراق بووە پێش حەجاج.

ڕاستی ئەوەیە کە ڕاجیایی هەیە لەبارەی ئەوەی کە ڕوویداوە لەنێوان حەجاج و ژنەکانیدا، تەنانەت وتراوە هەردوو هیندەکەی لەبەر یەك هۆکار تەڵاق داوە ئەویش ئەوەیە کە لەخەودا دەبینێت چاوەکانی (چاوی خۆی) ئەجوڵێن، ئەویش ئەو خەونەی لێکدایەوە بە جیابوونەوەی ژنەکەی، هەربۆیە تەڵاقی دا.

هەر پاش ئەوە هەواڵی مەرگی (محمد)ی برای کە فەرمانڕەوای یەمەن بوو بۆهات لەو ڕۆژەی کە (محمد)ی کوڕی تیایدا مردبوو، ئینجا وتی: دوو محمد لە یەك ڕۆژدا... إنا لله وإنّا إليه راجعون[1].

هۆکاری باس نەکرانی خێزانەکانی حەجاج لەلایەن مێژوزان و مێژونوسانەوە ئەوەیە کە حەجاج پیاوی فەرمان و شەڕ و جەنگ بووە، بەڵام لەبارەی ژنی دووەمیەوە(هیند کچی ئەسمای فەزاری)، پێشتر ژنی (عبیدالله بن زیاد) بووە یان دەڵێن خۆشەویستی بووە و نەبوونەتە ژن و مێرد[2]، بەڵکو شوی بە (بیشر کوڕی مەروان) کردووە وەك باسمان کرد، جا کاتێك مێردەکەی دەمرێت، شو بە حەجاجی سەقەفی دەکات کە فەرمانڕەوای عێراق دەبێت و مارەییەکی گەورەی بۆ دەنێرێت.

حەجاجی کوڕی یوسف حەزی لێ بوو لە ماڵەکانی عەرەب ژن بهێنێت، خەڵکی بەو بۆنەیەوە لێی نزیك دەبوونەوە ، (محمد بن عمیر الدارمی) ڕێی بۆ دادەنێت کە هیند کچی ئەسما بخوازێت و بۆی وەسف دەکات و دەڵێت: ئەو بخوازە ئەی فەرماندە ئەو لە ماڵێکی قیسیە.

هەربۆیە حەجاج (أیوب بن القریە) دەنێرێت – کە یەکێك بووە لەزمان شیرینەکانی عەرەب –پێی وت- هیند کچی ئەسمام بۆ بخوازە و سێ وشە (یان سێ قسە) زیاتر مەکە.

---

[1] . سەیری (الکامل – للمبرد) و (وفیات الأعیان – لإبن خلکان) بکە.

[2] . هەروەها دەڵێن: ئەو لەکەڵی بووە کە ساڵی ٦٧ك کوژراوە لەسەر ڕووباری (حازر) نزیك موصل، ئینجا سواری ئەسپەکەی دەبێت و دەچێتە کوفەوە، بەردەوام دڵتەنگ دەبێت بۆی و ئاوات دەخوازێت کە قیامەت بەرپابێت بۆ ئەوەی لەوڕۆژی دوایی پێی شاد بێتەوە، هەمیشە دەبوت. من بەڕۆشی قیامەتم بۆئەوەی (عبیدالله کوڕی زیاد)ی تیا ببینمەوە، لەبەر ئەمە ڕاستتر وایە کە شوی پێ کردووە.

ئەویش هات بۆلایان و وتی: هاتوم بۆلاتان لەلای ئەوکەسەوە کە خۆتان دەزانن، فەرماندە ئەوەی داوای دەکەن پێتانی دەدات، ئایا کچەکەتانی دەدەنێ یان ڕەدی دەکەنەوە؟

ئەوانیش وتیان: بەڵکو پێمان دا و پیرۆزمان کرد.

(ئیبن القریە) گەڕایەوە بۆلای حەجاج و وتی: چاوت ڕۆشن، خوا کۆت بکاتەوە، بەرهەمدارت بکا، پیت و فەڕ بخاتە ژیانتەوە تاکو مردن، خوا بۆت بەسۆز و خۆشەویست بکات، لەسەر خێر و بەرەکەت و خۆشی کۆتان بکاتەوە.

حەجاج کۆشکێکی دروست کردبوو لە بەصرە ناسرابوو بە کۆشکەکەی حەجاج، لەوێ دادەنیشت، ڕۆژێك بە (هیند)ی وت. ئایا باشتر و جوانترت لەم کۆشکە بینیوە؟

هیند وتی: چەند خۆشە!

وتی: بەڕاست؟

هیند وتی: بەڵام گەر ڕاستیت بووێت، بەخوا هیچ کۆشکێکی خۆشترم لە (قصر الأحمر) نەبینیوە! -کە خانوی فەرمانڕەوا بوو لە بەصرە، مێردی یەکەمی (عبدالله بن زیاد) دروستی کردبوو-.

دەست بەجێ حەجاج توڕە دەبێت، فەرمان بە (ئیبن القریە) دەکات کە بچێت بۆلای هیند کچی ئەسما تەڵاقی بدات بە دوو وشە، دە هەزار درهەمی بداتێ.

ئەویش هات بۆلای و پێی وت حەجاج پێت دەڵێت: (کنتِ فبنتِ)[١]، ئەمەش دە هەزار حەق و ماڵ خۆتە بۆتۆ، ئەویش وتی: تۆیش بە حەجاج بڵێ: سەرەتا سوپاسی خوامان نەکرد کە بووینە ژنی حەجاج ئێستاش تەڵاقەکە پەسەند دەکەین بەبێ پەشیمانی، ئەمەش دەهەزارەکە بۆخۆت کە مزگێنی تەڵاقدانەکەمت پێدام.

کاتێك حەجاج مرد هیند وتی:

---

[١] (بنت) وشەیەکە واتای تەڵاقێك دەگەیەنێت کە گەڕانەوەی نیە. (وەك ئەوەی بڵێی تۆ بویتە کچم یان وەك کچم وای...... هتد...وەرگێڕ)

**ألا يا أيها الجسد المسجّى........لقد قرت بمصرعك العيون**

**وكنت قرين شيطان رجيم........فلما مت سلّمك القرين**[1]

دەڵێن: ئەوەی ئەم هۆنراوەیەی گوتووە (هند بنت المهلب)بووە، دەشڵێن: وتەی (هند بن النعمان) بووە لە حەقی پیاوەکەیدا (روح بن زنباع) ووتویەتی، لەکاتێکدا (الأبشيهي) دەگێڕێتەوە کە حەجاج مەبەستەکەیە و (هند بنت النعمان) دوای (روح بن زنباع)ی وەزیر ژنی بووە.

بەڵام (ئەصفەهانی) لە (ئەغانی)دا باسی کردووە کە (هند بنت النعمان) پاش (روح بن زنباع) شوی کرد بە (الفيض بن محمد الثقفي) و ئەم هۆنراوەیەشی بۆیە پیا ووتووە چونکە دەیخواردەوە و سەرخۆش دەبوو و دەرشایەوە لە ماڵەکەیدا ، بەڵام حەجاج کچەکەی هێناوە نەك خۆی[2].

باسی چیرۆکی (هند بنت المهلب) و شوکردنەکەی ئەو بە حەجاج و پاشان جیابوونەوەی لێی کراوە، کەچۆن دواتر شو بە خەلیفە عبدالملیك و وتراویشە وەلیدی کوڕی عبدالملك دەکاتەوە، دەڵێن ئەوە حەجاجی بێ تاقەت کردووە کە تەڵاقی داوە، سەبارەت بەم چیرۆکە هیچ بنچینە و بنەڕەتێك نازانین ئەوە نەبێت کە بڵاوبۆتەوە و ئێمەش لێرەدا بەبێ دڵنیابوون لە ڕاستی و دروستیەکەی باسی دەکەین.

بەڵام با سەرەتا (هند بنت المهلب) بناسین:

بریتیە لە (هیند) کچی (المهلب بن أبی صفره)ی ئەزدی بەصری، باوکی سەرکردەی سوپا و یەکە سەربازیەکان بوو، فەرماندە (مهلب بن أبی صفره) فەرمانڕەوای خۆراسان

---

[1] واتە: ئەی جەستەی داپۆشراوی کش و مات، بە مردنت چاوەکانت ڕوون کرد (شاد کرد)، تۆ دۆست و دەریکی شەیتانی ڕەجم کراو بووی، کاتێك مردی دۆستەکەت سڵاوت لێدەکات

[2] . سەیری (المستطرف في كل فن مستظرف – للأبشيهي) بکە.

بوو، کە بەرەنگاری هەڵگەڕاوەکان بوویەوە و چەندین سەرکەوتنی هەبوو وەك پێشتر باسمان کرد.

هیند ناسرابوو بە ژیری و وریەبەرزی و زمان پاراویەکی دەگمەن و ڕەوانبێژیەکی ناوازە و داناییەکی ئامانج پێك و وێژە زانی و خۆش ڕەفتاری و ئەزموونیانی و جوامێری، هیند ناودارترین ئافرەتی سەردەمی خۆی بوو، خاوەن ژیری و زیرەکیەکی زۆر بوو، هۆنەر بوو، بانگکراوی کۆڕو کۆبوونەوەکان بوو، کچێکی ڕەسەن و خانەدان بوو، ڕوخسار جوان و دڵڕفێن بوو، وێڕای ئەوەی خوا پێی بەخشیبوو لە زمان پاراوی و ژیری و تێگەیشتن لە شیعر.

کاتێك حەجاج بوویە فەرمانڕەوای عێراق لەسەر فەرمانی عبدالملك و پاش چەند مانگێکی کەم، کاروباری عێراقی بۆ تەخت بوو، دەنگی ڕۆیشت بەوەی کە کەللە ڕەق و توندوتیژە، وای لێهات خەڵکی ئاسایی و تایبەتیش لێی دەترسان و لەترسا ڕێزیان دەگرت، ئەوانەی کە ئامۆژگاریان دەکرد دەیان وت: بۆچی لەخەڵکی عێراق ناخوازیت، بۆئەوەی خزمایەتی بەهێز بکەیت لەنێوان خۆت و ئەوانیش دا بەشکو ببێتە هۆی خۆشەویستی و سۆزی ئەوان بۆت، یەکێك لەوان (هند بنت المهلب)ی بۆ هەڵبژارد کە یەکێك بوو لە (خانمە گەورەکانی) بەصرە لە زیرەکی و زانستیدا، ئینجا ناردی بۆ خوازبێنیکردنی، هیندیش ڕازابوو چونکو نەیدەناسی بەباشی، حەجاج مارەییەکی وای دایە کە پێشتر عەرەب شتی وایان نەبیستبوو، کاتێك وەڵامەکەی دواکەوت ٢٠ هەزار دیناری عەرەبی ئەو کاتی پێشنیار کرد بۆ مارەییەکەی، ئینجا ڕازی بوو.

پاش هاوسەرگیری (هند) هەستی کرد هەڵبژاردنەکەی باش نەبووە، چونکە پیاوێکی توند و تووڕەی هەڵبژاردووە، کاتێك حەجاج زانی سکی پڕ نەبوو لێی پاش تێپەڕینی ساڵێك بەسەر هاوسەرگیریەکەدا بە دزیەوە بردی بۆلای یەکێك لە پزیشکەکانی عەرەب کە خاوەن زانست و شارەزایی بوو و بەئەزموون بوو، کاتێك چووە ژوورەوە بۆلای پزیشکە پیرەکە لێی پرسی، دەتەوێ لە کێ سکت پڕ بێت؟

هیند وەڵامی دایەوە:

وما هند إلاّ مهرة عربية سليلة أفراس تحللها بغـــل

فإن ولدت فحلاً فلله درها وإن ولدت بغلاً فجاء به البغل[1].

بۆیە حەجاج گوێی لەوە دەبێ، تێك دەچێ و دەگەڕێتەوە، بەیەکێك لە هاوکارەکانیدا دوو سەد هەزار دیناری بۆ نارد، پێی وت بە دوو وشە تەلاقی بدە، ئینجا هاوکارەکەی وتی: (كنتِ فبنتِ)[2] — دەستەواژەیەکە بۆ تەلاقدانێك بەکاردێت کە پەشیمان بوونەوە و گەڕانەوەی نەبێت — و ئەمەش مارەیی و مافەکەت.

ئەویش بە سوپاسەوە وەلامی دایەوە و وتی: بووین و سوپاسگوزار نەبووین، تەلاقەکەمان وەر گرت و پەشیمانیش نین.

تۆیش ئەی خۆش مژدە. . ئەم دوو سەد هەزار دینارە مزگێنی بۆ خۆت و ئەوەی لەگەڵتە بۆ ڕزگاربوونم لەهەموو بەنی سەقیف.

دەڵێن: خەلیفە عبدالملك سەرسامی زیرەکیەکەی و شەیدای جوانیەکەی دەبێت، نامەیەکی بۆ دەنێرێت و بۆخۆی دەیخوازێت، ئەویش وەلامی دەداتەوە و دەڵێت:

دەست نوێژەکەم شکاوە و بێ نوێژم[3].

خەلیفە لە مەبەستەکەی تێدەگات و ڕازەکەی دەزانێت، وەلامی دەداتەوە و دەڵێت: دەستنوێژ بگرە و حەوت جار خۆت بشۆ یەکیان بە قوڕ ئیدی لێوانەکە پاك دەبێتەوە بە یارمەتی خودا.

---

[1] واتە:هیند هیچ نیە مارەکراوێکی عەرەبی نەبێت...لەڕەگەزی ئەسپ ...هێسترێك تێکەڵی دەبێت.. جا ئەگەر حا ئەگەر ئەسپێکی بوو ئەوا ئافەرین بۆی.. ئەگەریش هێستری بوو ئەوا هێستر هێناویەتی

[2] . واتاکەی: واتە تەلاقم دایت تەلاقێکی ڕوون (بائن) و بۆ جیابوونەوە بەتەواوی، دەشڵێن: حەجاج دەچێتە ماڵەکەی ئەو کۆیلامەی دەوت و قژی دادەهێنا، ئەویش لەپشتیەوە بوو و هەستی پێ نەکرد، هەربۆیە تەلاقی دا بەتەواوی.

٣ . مەبەستی ئەوە بووە پێشتر ژنی حەجاج بووە و ئەو هاتۆتە لای و لەگەڵی خەوتووە و گلاوی کردووە.

هیند مەرجی دانا کە خودی حەجاج خۆی کەژاوە و تەختەڕەوانەکەی هەڵبگرێت و ببیات بۆ شام، پاش ئەوەی پێی وت: خۆم شۆرد و پاك بوومەوە.

بەم جۆرە خەلیفە عبدالملك فەرمانی بە کاریەدەستەکەی خۆ (حەجاج) کرد کە خۆی کەژاوەی هیند پێشڕەوی بکات بۆ دیمەشق، ئەویش گوێڕایەڵ و گەردن کەچ بوو بۆ فەرمانەکەی پاش ئەوەی ڕق و توڕەیی خۆی خواردەوە، پاش ئەوەی کەژاوەکە چووە دیمەشق، حەجاج هات تا پێی بڵێت تەنها کاتژمێرێك ڕێ ماوە بۆ گەیشتنە کۆشکی خەلیفە، گەر دەتەوێ پشو بدە پێش گەیشتن ئەگەر نا بەردەوام دەبین لە ڕۆیشتن؟

لەم کەین و بەینەدا هیند لەگەڵ کەنیزەکەکەی پێدەکەنی، دینارێکی فڕێ دابوویە زەوی و کاتێك حەجاج هات پێی وت: درهەمێکم لێ بەربوویەوە بۆی بگەڕێن، ئەویش درهەمەکەی نەدۆزیەوە بەڵکو دیناری دۆزیەوە.

هیند مەبەستی ئەوەبوو خوا درهەمەکەی (کە حەجاج بوو) بۆ کرد بە دینار (کە مەبەستی خەلیفە بوو!!

حەجاج پێی وت: ئەی کچی مهلب درهەمەکەمان نەدۆزیەوە بەڵکو دینارێکمان دۆزیەوە، ئەویش وتی: سوپاس بۆ خوا درهەمێکمان لێکەوت (دانا) و خوای گەورە دینارێکی پێ بەخشین.

ئەویش وتی:

فإن تضحكي مني فيا طول ليلة تركتك فيها كالقبا تبكين.

واتە: گەر بەمن پێدەکەنیت ئەوەشت لەبیربێت بەدرێژایی ئەو شەوەی جێم هێشتی تیایدا وەك لەسەر گۆڕ بیت دەگریای.

ئینجا ئەویش کۆتایی بە قسەکەی هێنا بە وتنی:

فمال يكتسب والعز مرتجع إذا النفوس وقاها الله من عطب.

واتە: ماڵ و سامان بەدەستدێت و شکۆمەندی و سەربەرزیش دەگەڕێتەوە، ئەگەر خوا دەروونەکانی پاراست لە پیسی و خراپ بوون.

هیند چیرۆکێکی هەبوو لەگەڵ عومەری کوڕی عبدالعزیز دا – بەڕەحمەت بێت - دەرخەری بیرفراوانی و ژیری ئەو بوو هەروەها ڕادەی توانایی ئەو لە ڕەوانبێژیی پەیوەستکراو بە بەڵگە و بیانوی جوان.

ئیبن عەساکر باسی کردووە کە، هیند کچی مهلب هات بۆلای عومەری کوڕی عبدالعزیز – بەڕەحمەت بێت –کە (یەزید)ی برای بەند کردبوو، پێی وت: ئەی ئەمیری بڕواداران لەسەرچی براکەمت بەند کردووە؟

وتی: ترسام یەکریزی موسوڵمانان تێك بدات.

ئەویش گوتی: ئەی باشە سزا پاش تاوانە یان پێش تاوان؟

هەروەها زیادی قورەیشی دەچێت بۆ سەردانی و دەسنێت ئەشیەکی بەدەستەوەیە، ئەویش پێی دەڵێت: ئایا تۆ ئەشی دەپێسیت لەکاتێکدا ژنی فەرمانڕەوای؟

هیند وتی: بیستم باوکم دەیفەرموو: پێغەمبەر دوردی خوای لێ بێت فەرموویەتی: واتە: هەرکامتان پشو درێژبێت و تاقەتی زۆر بێت ئەوا پاداشتی لەهەموو گەورەترە، پشودرێژی شەیتان ڕاو دەنێت و دەروون پاك و هێور دەکاتەوە – بۆ نمونە تاقەت و پشو درێژی لەگەڵ ڕستن دا – .

دەڵێن: (مسلمە کوڕی عبدالملك) خەڵکی ناردووە بۆ خوازبێنی هیند بۆ خۆی، ئەویش بە خوازبێنیکەرەکە دەبێژێت: گەر ئەوانەشم بۆ زیندو بکاتەوە لە کەسوکارەکەم کە کوشتوونی، هێشتا دەروونم پاك نابێتەوە شوی پێ بکەم، بەڵکو چۆن لەمن دڵنیا دەبێت، کە من لەو پیاوترم و خوێنم لایەتی.

(ئوم عبدالله) باسی کردووە کە چوومە ژوورەوە بۆلای هیند بە دەنکی مرواری ویردی دەخوێند (تەسبیحاتی دەکرد)، کە تەواو بوو لە ویردەکانی دەنکە مرواریەکانی بۆ بەڵداین و وتی بەشی بکەن لەنێو خۆتاندا.

لە وتەکانیشی: نەمبینیوە بۆ ئافرەتانی باش و خراپیش هیچ شتێك باشتر لەوە هەبێت بەپیاوێك بگەن کە بە دڵیان و لای دەحەوێنەوە، گەرچی مانەوەشی لەگەڵی درێژە نەکێشێت " مانەوە لای ئەو جۆرە پیاوە بە هەرجۆرێك بێت سەرکەوتووترە".

لە جوانترین وتە و داهێنراوەکانی لەبارەی ئافرەتەوە ئەوەیە کە دەڵێت: دوو شت ئافرەت لێیان بێ وەی نابێت: پیاو و بۆنی خۆش، ئەم یاسایە لەسەر ژیری و دانایی دامەزراوە، دەرناچێت لە تەوەری دین، چونکە دین تێکەڵبوونی پیاوانی قەدەغە و حەرام کردووە وەك چۆن بۆنی خۆشی بۆ ئافرەتان حەرام کردووە کاتی چوونە دەرەوە.

هەروەها دەڵێت: ئافرەتان جوان نابن بەهیچ ئارایشتێك کە جوانتربێت لە دڵێکی پاك و پەروەردە و پەوشتێکی تەواو و بێ کەموکوڕی.

سەجستانی دەڵێت: ئافرەتێکم نەبینیوە لە هیندی کچی مهلب ژیرتر بێت، دەیوت: ئافرەت بەهیچ جوان نابێت بە پەروەردەیەکی جوان نەبێت کە لەژێریدا دڵێکی پاك هەبێت.

پاش باس کردنی ئەوەندەی ژیانی و وتەکانی کەسایەتی و هێزی ئەو ئافرەتەمان بۆ دەردەکەوێت، بۆیە ئەوەی کە کردویەتی لەگەڵ حەجاجی سەقەفی شتێکی سەیر نیە، چونکە ئاسن بە ئاسن نەبێت ناکوترێت!!

چیرۆکی ئەو لەگەڵ حەجاج و جیابوونەوەکەی هەروەهاش شوکردنی بە خەلیفە وەك باسمان کرد ڕای جیاوازی لەسەرە، بەجۆرێك دەڵێن شوی کردووە بە عبدالملك و دەشڵێن بە وەلیدی کوڕی.. خوا خۆی زاناترە.

بەڵام لەبارەی منداڵ و کوڕەکانی حەجاجەوە سەرچاوە مێژووییەکان باسیان کردووە کە (محمدی کوڕی حەجاج)ی یەکیان بوو، کە هەر خۆی لە ژیاندا بوو مرد، وەك باسمان کرد کاتێك هەواڵی مردنی (محمد)ی کوڕی و (محمد)ی برای پێگەیشت، ئیبن جەریر باسی کردووە کە حەجاج کوڕێکی تری هەبووە ناوی (عبدالله) بووە، لەدوای مردنی باوکی ژیاوە و وە ڕای سپارد کە نوێژ بۆ خەڵکی بکات کاتێك نەخۆشیەکەی خستبوویە سەرەمەرگ.

قوتەیبە باسی کردووە کە (محمد)ی کوڕی حەجاج ئەوەی لە شام هەبووە، هەروەها کوڕێکی تری هەبووە بەناوی (عبدالملك) ئەوەی لە بەصرە هەبووە [1].



[1]. سەیری (عیون الأخبار – لإبن قتیبة) بکە.

١٥

# کۆتایی پێهاتنی حەجاج و کەسوکار و دەستوپێوەندی حەجاج

- مردنی حەجاج پاش کوشتنی سەعیدی کوڕی جوبەیر
- تۆڵەسەندنەوەی خەلیفە سولەیمان لە دەستوپێوەندی حەجاج پاش گرتنە دەستی خەلافەت

## مردنی حەجاج و لەناو چوونی
## پاش ئەوەی (سەعیدی کوڕی جوبەیر)ی کوشت

وەك باسمان کرد حەجاج ساڵی ٤٠ك، یان دەڵێن ٣٩ك یان ٤١ ك لە دایك بووە، لە (تائیف) وەك گەنجێکی زمان پاراوی ڕەوانبێژی قورئان لەسنگ گەورەبوو، هەندێك لەپێشیان وتویانە کە هەموو شەوێك قورئانی دەخوێندەوە.

ساڵی ٩٥ك حەجاجی سەقەفی (سەعیدی کوڕی جوبەیر)ی دەستگیرکرد و لەنێوانیاندا مشتومڕێك ڕویدا و کۆتایی هات بە کوشتنی ئیبن جوبەیر، ئیبن جەریری تەبەری دەڵێت ساڵی ٩٤ك کوژراوە.

کۆتا وشەکانی ئیبن جوبەیر کاتێك حەجاج بە سەربازەکانی وت بدەن لەملی ئەوەبوو: دەیوت: شایەتی دەدەم کە هیچ خودایەك نیە جگە لە الله و محمدیش پێغەمبەری خودایە، ئەمەت لەبیر بێت تا دەتبینمەوە ڕۆژی دوایی، ئەوکات من دوژمنی تۆ دەبم لای خوا.

ئینجا ئیبن حوبەیر – بەڕەحمەت بێت – لە پشتەملەوە سەربڕا، ئەوە گەیشتەوە بە حەسەنی بەصری و فەرمووی: ( اللهمّ یاقاصم الجبابرة اقصم الحجاج)...واتە خوایەگیان ئەی شکێنەری زۆردارەکان لوتی حەجاج و حەجاج بشکێنە.

ئیبن کەسیر دەفەرموێت: تەنها سێ ڕۆژ مایەوە – واتە حەجاج – تائەو کاتەی کرمێك کەوتە هەنا و سکیەوە و بۆگەنی پێکرد و دایرزاند و پاشان مرد.

سەعید پێکەنی کاتێك گیرا بۆ ئەوەی بدرێت لەملی، حەجاج پێی ووت: چی تۆی خستە پێکەنین؟

فەرمووی: پێدەکەنم لەبەر ئەو بوێرییەی کە تۆ بەرامبەر من هەتە و ئەو لەسەرخۆیی و بەئارامییەی خوداش کە بەرابەر تۆ هەیەتی [١].

چەندین گێڕانەوە لەم بارەیەوە هەن، هەموویان لەسەریەك شت کۆکن کە ئەوەیە لەناوچوونی حەجاج لەپاش کوشتنی سەعیدی کوڕی جوبەیر بووە بە چەند ڕۆژێکی کەم، ئەوەش لە مانگی ڕەمەزانی ساڵی ٩٥ك دا بووە پێش پێنج ڕۆژ یان سێ ڕۆژی کۆتایی ڕەمەزان، دەشڵێن لە شەوالی ساڵی ٩٥ك دا مردووە.

باسکراوە کە سەعیدی کوڕی جوبەیر پێش ئەوەی بمرێت لەخوا دەپاڕێتەوە کە دوای ئەم حەجاج زاڵ نەکات بەسەر هیچ کەسێکدا، هەربۆیە دەڵێن حەجاج پاش ئیبن جوبەیر کەسی تری نەکوشت یان دەڵێن تەنها یەك پیاوی کوشتووە.

ئەصفەهانی لە پەرتوکی (ئەغانی)دا ئەوەی باسکردووە کە حەجاج نامەی نوسی بۆ (قتيبه بن مسلم)ی کاریەدەستی خۆی، ڕازی خۆی بۆ کردبوو کە بیری کردۆتەوە لە تەمەنی و بۆی دەرکەوتووە گەیشتۆتە پەنجا و سێ، بەڕاستی هەرکەس گەیشتە پەنجا ئیدی لە کۆتایی نزیك بۆتەوە.

هۆکاری ئەو قسەیەی حەجاج ئەوەبووە کە نەخۆشیەکەی بە بەهێزی دەستی بە تەنینەوە کردوە لە جەستەیدا کە ناسراوە بە شێرپەنجە، وای لێهاتبوو کرمەکە لە گەدەیەوە دەهاتە دەرێ، پزیشکەکەی کە ناوی (تیاذوق) بوو سەرپەرشتی و چاودێری نەخۆشیەکەی دەکرد، پزیشکێکی بەتوانا بوو، گەورە و پاشاکانی دەرمان دەکرد، چەندین پەرتوکی هەیە لە بواری پزیشکیدا، بەڵام بۆ حەجاج چارەسەرێکی نەدیتەوە، هەتا حەجاج ڕاپێچی مەرگ بوو، خەڵکی عێراق دڵخۆش بوون بە نەخۆشیەکەی و نزیکبوونەوەی مەرگی.

تەنانەت (أبا المنذر يعلي بن مخلد المجاشعي) دەچێتە سەردانی لەو نەخۆشینەیدا و پێی دەڵێت: ئەی حەجاج ئەو گیاندان و سەرەمەرگەی کە هەتە چۆن دەبینیت ؟

---

[١]. البداية والنهاية.

ئەویش پێی دەڵێت: ئەی (یعلی) خەمێکی قورس، ئازارێکی بەسوێ، گیانکێشانێکی خنکێنەر، گەشتێکی دوورودرێژ و خەرمانێکی کەم و هەمیانەیەکی خاڵی، هاوار بۆمن هاوار ئەگەر خوای جەبار ڕەحمم پێ نەکات.

(یعلی) پێی وت: ئەی حەجاج خوا بەزەیی بە بەندە بەبەزەیی و چاکەخواز و بەسۆز و دڵ نەرمەکانیدا دێتەوە بەرامبەر خەڵکەکەی، بەڵام من شایەتی دەدەم کە تۆ نزیك و خزمی فیرعەون و هامانیت بۆ بەدکرداری و وازهێنانت لە مەبەستی ڕاست و ڕێبازی پیاوچاکان.

چاکەکارانی ناو خەڵکت کوشت و لەناوت بردن، ملی تابعین و شوێنکەوتوانت بڕی، گوێڕایەڵی دورستکراو بوویت و سەرپێچی دروستکەرت کرد.

خوێنەکانت ڕشت، ئابڕووەکانت تکاند، سیاسەتێکت پیادە کرد نەدینت هێشتەوە نە بەدنیاش ڕاگەیشتی.

بەنی مەروانت بەرزکردەوە و خۆتت سوك و نەوی کرد، ماڵی ئەوانت ئاوەدان کردەوە و ماڵی خۆتت وێران کرد، ئەوا ئەمڕۆکە نە بەفریات دەکەون و نە ڕزگارت دەکەن، بەجۆرێك بۆ ئەمڕۆ و دوای ئەمڕۆش چاکەیەکت نیە.

بۆ ئەم ئۆمەتە مایەی بێزاری و خەم و کوێرەوەری و کارەسات بووی، سوپاس بۆخوا کە خوا ئەم ئۆمەتەی بە مردنی تۆ ئاسودەکرد و بە لەناوچونت ئاواتەکانی هێنانە دی.

وشەکانی قورس و توند بوون، وەك گێژەڵوکە و زریان داباریینە سەر حەجاج، بێدەنگ بوو، هەناسەیەکی قوڵی هەڵکێشا و هەتا سنگی پڕکرد و ئینجا سەری بەرز کردەوە و سەیری ئاسمانی کرد و ئەم هۆنراوەیەی گوت:

ربِّ إنَّ العباد قد أيأسوني ورجائي لك الغداة عظيم.

واتە: خودایا خەڵکی بێ ئومێدیان کردووم، بۆیە تکای من لەتۆ بۆ سبەی گەورەیە.

پاڕایەوە لەخوا و وتی: خودایە لێم خۆش بە چون خەڵکی پێیان وایە تۆ وا ناکەیت (اللهم اغفر لي فإنّ الناس يزعمون أنّك لاتفعل)، بەردەوام ئەم دوعایە و ئەم کۆپلەیەی دەوتەوە:

| | |
|---|---|
| یارب قد حلف الأعداء واجتهدوا | أيمانهم أنني من ساكني النار |
| أيحلفون على كل عمياء ويحهم | ماظنهم بعظيم العفو غفـار[١] |

(طـبري) لـە (مێژوەکـەی) دا و بێجگـە لـەویش لـە (سـالم الأفطـس)ەوە دەگێڕنـەوە سەعیدی کوڕی جوبەیریان هێنا بۆلای حەجاج کە دەیویست سواری ئەسپەکەی ببێت و قاچێکیانی کردبوو بەناو ئاوزەنگی زینی ئەسپەکەیدا قاچەکەی تریانی هێشتا لە سەر زەوی بوو وتی بەخوا سوارنابم تاکو شوێنی خۆت لە دۆزەخ دەبینیت، ئینجا وتی بدەن لەملی.

دەشڵێت: حەجاج لەبەر خۆیەوە دەیگوت (قیودنا.. قیودنا) واتە کەلەپچەکانمان.. کەلەپچەکانمان. .ئەوانیش وایانزانی کۆت و کەلەبچەکانی دەوێت کە لە دەست و قاچی ئیبن جوبەیر تەوق کرابوون، هەربۆیە هەردوو قاچیان لەنیوەوە بڕیەوە و کۆتەکانیان هەڵگرتەوە.

لە (هلال بن خباب)ەوە دەگێڕنەوە کە وتی: سەعیدی کوڕی جوبەیریان هێنا بۆلای حەجاج و وتی: ئایا تۆ نامەت نوسیوە بۆ موصعەبی کوڕی زوبێر؟

وتی: بەڵکو ئەو بۆ منی نوسیوە.

حەجاج وتی: بەخوا دەتکوژم.

سەعید وتی: کەواتە من سەعیدم وەك دایکم ناوی نام (سەعید واتە شادومان یان بەختەوەر واتا ئەگەر بمکوژی بەڕاستی من شادومانم وەك دایکیشم ئەو ناوەی لێناوم).

دوای کوشتنی ئەو، حەجاج نزیکەی چل ڕۆژ زیاتر نەمایەوە، کە دەخەوت سەعیدی لەخەودا دەبینی و چمکی کەواکەی ڕادەکێشا و دەیوت ئەی دوژمنی خودا بۆچی کوشتمت؟

---

[١] . واتە: خودایە خەڵکی سوێندیان خواردووە کە من پیاوێکم لە دانیشتوانی دۆزەخ. ئایا کوێرانە سوێند دەخۆن..بەلا لێیان دا.. دیارە هیچ نازانن دەربارەی گەورەیی لێبوردەیی و لێخۆشبوونی تۆ.

حەجاج دەیووت: من و سەعیدی کوڕی جوبەیر چیمان بەسەرهات، من و سەعید چیمان بەسەرهات!!

مێژوزانان کۆدەنگن لەسەر ئەوەی کە مردنی حەجاج لەدوای کوشتنی سەعیدی کوڕی جوبەیری تابیعی و زانارە بووە بە چەند ڕۆژێك، کە نەخۆشی دەیخاتە سەرجێ، سەعیدی کوڕی جوبەیر دەپاڕێتەوە لەخوا کە پاش مردنی ئەو حەجاج بەسەر کەسی تردا زاڵ نەکات.

کاتێك مرد خەڵکی بەمردنەکەی دڵخۆش بوون، عومەری کوڕی عبدالعزیز کڕنوشی سوپاسگوزاریی بۆ خوا برد، هەروەهاش حەسەنی بەصری و ئیبراهیمی نەخەعیش لە خۆشیدا دەستیان کردە گریان.

لە شاری (واسط) واسیت ئەسپەردە کرا، گۆڕەکەی دیارنەما و لافاو بردی.

بەس حەجاج وەك ئیبن عەساکر و بێجگە لەویش باسیان کردوە لەدوای خۆی هیچی جێ نەهێشت بێجگە لە سێ سەد درهەم و قورئانێك و زیێك و خانویەك و سەد قەڵغان هەمووی وەقف بوو بۆ خوا، کە ئەمەش یەکێك بوو لە سەیر و سەمەرە و شتە دەگمەنەکانی حەجاج.

خەلیفە وەلیدی کوڕی عبدالملك بە مردنی حەجاج دڵتەنگ دەبێت و ئەویش پاش حەجاج بە نزیکەی نۆ مانگ دەمرێت، بەڵام وەلید پێش مردنی حەجاج توشی نەخۆشی ببووبوو، تەنانەت بوویە دەنگۆ کە مردووە، ئەو دەنگۆیەش پێش مردنی حەجاج بوو، بەڵام کاتێك وەلید هێزی هاتەوە بەر و هەستی کرد چاکبۆتەوە حەجاج زۆر دڵخۆش بوو هەتا وەلید بە عومەری کوڕی عبدالعزیزی وت: کەس هێندەی حەجاج دڵخۆش و شادومان نەبووە بە چاکبوونەوەی ئەمیری بڕواداران.

عومەریش پێی وت: بەخششەکانی خودا چەندە گەورەیە بەسەرمانەوە بە چاکبوونەوەی تۆ، وەك ئەوەی نامەی حەجاجت بۆ بێت تیایدا هاتبێت کاتێك هەواڵی چاکبوونەوەتی پێگەیشتووە کڕنوشی سوپاسگوزاریی بردووە و هەموو بەندەکانی تۆی کە دلوتە بەو ئازاد کردووە.

هەر بەڕاستی هەواڵ هات بۆ خەلیفە کە حەجاج وای کردووە.

وتاری کۆتایی حەجاج پێش مردنەکەی بۆ خەڵکی عێراق کاتێك دڵخۆش بوون بە نەخۆشیەکەی و نزیکبوونەوەی مەرگی ئەوەبوو وتی:

بەڕاستی کۆمەڵێك لە خەڵکی عێراق ئەهلی دووبەرەکی و دووڕوویی، شەیتان چووەتە بنکڵێشەیانەوە و تۆوی خراپەی چاندووە لەنێوانیاندا و ووتویانە حەجاج مردووە

بەخوا بەوە دڵخۆش نابم نەمرم و دونیا و هەموو ئەوەی لەناویدا هەمبێت، نەشمبینیوە خودا ڕازی بێت بە نەمری و هێشتنەوەی هیچ کەس مەگەر بۆ سوکترین دروستکراوی خۆی کە (ئیبلیس)ە نەبێت: ﴿قَالَ أَنظِرْنِي إِلَى يَوْمِ يُبْعَثُونَ. قَالَ إِنَّكَ مِنَ الْمُنظَرِينَ﴾[1].

هەربۆیە بەندەی خودا (صالح) داوای لەخوا کرد و فەرمووی:﴿ قَالَ رَبِّ اغْفِرْ لِي وَهَبْ لِي مُلْكًا لا يَنْبَغِي لأَحَدٍ مِنْ بَعْدِي﴾[2].

خوای گەورەش ئەوەی پێدا بێجگە لە مانەوەی هەتا هەتایی (نەمری)، بەخوا من بەهەموو زیندوویەکەوە لەنێوە وەك مردو وام، بەهەموو تەڕ و تازەیەکەوە وەك وشکبوو وام...... ئەوانەی کە ژین دەزانن چی دەڵێم.... پاشان هاتە خوارێ.

خەلیفە وەلید دڵتەنگ بوو و دانیشتبوو پێشوازی لەو کەسانە دەکرد کە دەهاتن بۆ پرسەکە، پاشان دوای ئەو بە چەند مانگێکی کەم مرد، ئەوەش ساڵی ٩٦ك بوو.

پاش ئەو سولەیمانی کوڕی عبدالملك خەلافەتی گرتە دەست و زۆر ڕقی لە حەجاج بوو، سەرباری ئەوەش (يزيد بن المهلب) دوژمنی حەجاج بوو و یەکێك بوو لە هاوڕێ دڵسۆزەکانی خەلیفەی نوێ و هاونشینەکانی.

---

[1]. الأعراف:١٤ — ١٥.

[2]. ص: ٣٥.

# کۆتایی دەستوپێوەند و خانەوادەی حەجاج بەدەستی خەلیفە سولەیمانی کوڕی عبدالملك

وەلید پێش مردنی بڕیاری دابوو کە (سولەیمان)ی برای لە جێنشینی و میراتگری لابەرێت، کە وەلید و سولەیمان جێگرەوە و میراتگری باوکیان (عبدالملك کوڕی مەروان) بوون، کاتێك کارەکە جۆر بوو بۆ وەلید ویستی کوڕەکەی خۆی بکاتە جێنشین و سولەیمان لابەرێت، سولەیمان ڕازی نەبوو، ئینجا وەلید ناردی تاکو پەیمان و بەیعەت بۆ کوڕەکەی وەربگرێت لە کاربەدەستەکانی، کەس وەڵامی نەدایەوە و بەدەمیەوە نەهات حەجاج و قوتەیبە و چەند کەسێکی تایبەت نەبێتَ لەناو خەڵکی تەنانەت (عباد بن زیاد) پێی وت:

خەڵکی بۆ ئەم کارە نایەن بەدەمتەوە، ئەگەریش هاتن بێ وەی نابێت و دڵنیا نابێت لێیان کە ناپاکی و غەدر لە کوڕەکەت نەکەن، هەربۆیە نامە بنوسە بۆ سولەیمان با بێت بۆلات، ئەگەر بۆهاتن بەگوێی کردیت ئەوا پێشنیازی بەیعەتدانی بۆ بکە بە کوڕەکەت (عبدالعزیز) لەپاش خۆت، ئەو ناتوانێت لەلای خۆتا بەگوێت نەکا، ئەگەریش ڕازی نەبوو ئەوا خەڵکی چاویان لەسەریەتی.

ئینجا وەلید نامەی نوسی بۆ سولەیمان و داوای لێکرد بێت بۆلای، ئەویش خاوەخاوی کرد، هەربۆیە وەلید بڕیاری دا بڕوات بۆلای، لایبەرێت لە جێنشینی، بەڵام نەخۆش کەوت بەو نەخۆشیەی کە بەهۆیەوە مرد، پێش لابردنی سولەیمان مرد.

لەبەر ئەم ڕوداوە هەمووی سولەیمان پاش گرتنە دەستی خەلافەت تۆڵەی سەندەوە لەوانەی کە پشتیوانی و پشتگیریان کرد لە وەلیدی برای بۆ لابردنی سولەیمان لە جێگری

و میراتگری، لەسەروشیانەوە حەجاجی سەقەفی و سەرکردەکەشی قوتەیبەی کوڕی مسلم.

وێڕای ئەوەش یەزیدی کوڕی مهلب یەکێك بوو لە هاوڕێ دڵسۆزەکانی و هاونشینە خۆشەویستەکانی، تەنانەت ئەو هەر دیاریەکی بۆ بهاتبایە دابەشی دەکرد لەنێوان خۆی و یەزید دا، کاتێکیش خەلافەتی گرتە دەست لەهەموو کاروبارەکاندا ڕاوێژی پێدەکرد و گەڕاندیەوە سەر فەرمانڕەوایەتی عێراق و خۆراسان.

ئەم یەزیدە ڕقی لە حەجاج بوو چونکە ئەو لایبردبوو لە فەرمانڕەوایەتی خۆراسان کە (المهلب)ی باوکی فەرمانڕەوای بوو، بەڵکو خستیشیە بەندیخانەوە، ئەگەرچی حەجاج مێردی خوشکەکەشی (هیند)بوو، وەك باسمان کرد، ئەوەش یەکێك بوو لە هۆکارەکانی جیابوونەوەی لە حەجاج، جابۆیە کاتێك سولەیمان کاری خەلافەتی گرتە دەست یەزید خاوەن پێگە و بەخت بوو لای هەربۆیە تۆڵەسەندنەوە لە خانەوادەی حەجاج شتێکی سروشتی بوو لە سەردەمی سولەیمان دا.

بەڵام ژیان و گوزەرانی خانەوادەی حەجاج پاش مردنی لەسەر باشترین حاڵ و بار بوو لەماوەی ئەو چەند مانگە کەمەی کە خەلیفە وەلید ژیا پاش مردنی حەجاج بەجۆرێك ماوەی ژیانی وەلید لەپاش حەجاج زیاتر لە هەشت یان نۆ مانگ درێژەی نەکێشا و وەلید ساڵی ٩٦ك مرد.

سولەیمان کاروباری عێراقی دایە دەست یەزیدی کوڕی مهلب قوتەیبەی لابرد لە فەرمانڕەوایەتی و دواتریش کوژرا وەك باسمان کرد.

سولەیمان فەرمانی کرد بە دانانی (صالح بن عبدالرحمن) لەسەر ناوچەی عێراق، ڕای سپارد کە تۆڵە لە خانەوادەی حەجاج بکاتەوە و بەڵکو بشیان کوژێت، هەربۆیە صالح بە هاوکاری براکەی یەزید هەستا بە ئازار و سزادانی دەستوپێوەندی حەجاج، ئینجا هەستا بە بەندکردنی (حەکەم کوڕی ئەیوب کوڕی ئەبی عەقیل) و سزای دا هەتاکو مرد لەژێر ئەشکەنجەدا.

سولەیمان هەستا بە ئازادکردنی هەموو ئەوانەی کە حەجاج بەندی کردبوون لە بەندیخانەکانی دەوڵەتدا و چەندین هەزار دەبوون.

ئیبن مهلب هەستا بە دەستگیرکردنی کەسوکار و خێزانی حەجاج و گواستنیەوە خۆیان و ئەوانەشی لەگەڵیان بوون لە شامەوە بۆ عێراق، کە لەناویاندا خوشکەکەی حەجاج کە ژنی یەزیدی کوڕی عبدالملك بوو هەبوو و ئەشکەنجەشیان دا، سولەیمان فەرمانی بە فەرمانڕەوا و والیەکان کرد نەفرەت لە حەجاج بکەن لە بڵنگۆکانەوە و ئەوانیش وایان کرد.

ئابەم جۆرە دەستوپێوەند و خانەوادەی حەجاج تەواوبوون پاش مردنی خۆی و وەلیدی کوڕی عبدالملك واتە پاش نزیکەی ساڵێك لەمردنی حەجاج خۆی، سەرگوزەشتە و چیرۆکی ژیانی خۆی جێهێشت بۆ مێژوزان و مێژونوسەکان و نوسەرەکان بەدرێژایی سەدەکان و ئەوانەی نەفرەت و ڕەخنەبارانیان کرد کەمێکی کەم نەبێت کە پێیان وابووە ئەوەی حەجاج کردوویەتی بەڵگە و بیانو و پاساوی سیاسیی خۆی هەبووە لە سەردەمی خۆیدا، ئەو وەکو پیاوان و کاربەدەستانی هەر دەوڵەتێکی تر وایە لەهەر سەردەمێك دا بێت، ئەو کەسی شیاو بوو بۆ کات و شوێنی شیاو.

***

# وتەی کۆتایی
# حەجاج لە ئەستۆی مێژودا

مێژونوسان لە کۆن و نوێ دا پێشبڕکێیان کردووە و زمانیان داوە لەهەسان بۆ قسەکردن لەبارەی حەجاج و هێرشکردنە سەر سەرگوزەشتە پڕ لە زۆر و ستەم و خوێن و خوێنڕێژیەکەی و ئەو کەللەسەرانەی بەدەستی ئەو پەڕێنران، لەوەی پێشەوا زەهەبی لەبارەیەوە گوتویەتی: حەجاج زۆردارێکی ... ستەمکاری ... بەدکرداری .. خوێن ڕێژبوو... هەروەها ئازا و بوێر و بەفێڵ و زمان پاراو و ڕەوانبێژ و ڕێزگر موو لە قورئان. کە ئەوەمان بابەتیانە باسکرد لەمیانەی خستنە ڕوی ژیننامەکەیەوە.

هەندێکیش وەک حەسەنی بەصری بە سزای خواییان داناوە بۆ بەندەکانی.

هەندێک وای دادەنێن کە حەجاج لە دوو توێی کەسایەتی خۆیدا شتانی دژ بەیەکی هەلگرتووە بەوەش خەلکی سەرسام کردووە، چەندین کاری گەورەی هەبووە وەکو ئەو سەرکەوتن و ئازادکردنە گەورانەی کە لە ڕۆژهەلاتدا بەرپای کردووە، وە پرۆژەی (تنقيط)ی قورئانی پیرۆزی دانا (حاڵ دانان بۆ قورئان) تاکو خوێندنەوەی بۆ خەلکی ئاسان بێت، هەروەها هەستانی بە دروستکردنی شارێکی نمونەیی کە شاری (واسط)بوو، بەدەرلەوەش زۆر کاری دیکە لەماوەی ساڵانی فەرمانڕەوایەتی خۆیدا لە عێراقی عەرەبی و عێراقی فارسی، کە بیست ساڵ بوو لە سەردەمی خەلیفە عبدالملك و وەلیدی کوڕیدا.

بەلام ئەو چاکەکاریانە ون بوون و نقوم بوون لە کێو و دەریای ئەو خوێنانەی کە ڕشتنی.

ئێمە وای دەبینین کە کەسێتی حەجاج بەوەی تێیدا دەبینرێت لەزۆر شتی دژ بەیەك هیچ نیە جگە لە کەسێتی پیاوێکی دەوڵەت و فەرمانڕەوایەکی خۆسەپێن و تاکڕەوی بەهێز و توندوتیژ، کە پێی وایە هەڵگەڕانەوە و دەرچوون لە فەرمانی فەرمانڕەوا بێ باوەڕی و کوفرێکە کوشتن پێویست دەکات، هەربۆیە ئەو هەموو دەرچوو و هەڵگەڕاوە و بەرهەڵستکارەی فەرمانڕەوای دەکوشت و کردبوویە ڕێبازی خۆی.

حەجاج لەوەدا تازە نەبوو، بەڵکو دڵسۆزی بۆ گەورەکانی هەموو سنورێکی تێپەڕاندبوو، تەنانەت ئەو لەو هەڵسوکەوتەیدا زیادەڕۆیی دەکرد و گەیشتە ئەوەی کە لەسەر گومانیش بکوژێت و ببڕێت، ئەمە وای کرد ژمارەی ئەوانەی کە حەجاج کوشتنی لەپێناوی چاوەکانی بەنی ئومەییەدا لە سەد وبیست هەزار کەس زیاتر بن، لە بەندیخانەکانیدا زیاتر لە پەنجا هەزار لە پیاو و ژن هەبن.

عومەری کوڕی عبدالعزیز خەلیفەی ڕاشیدی ئەمەوی ڕقی لە کردەوەکانی حەجاج و فەرمانڕەوایەتیەکەی و زۆر و ستەمەکەی بووە، لێی دەگێڕنەوە کە فەرمویەتی:

گەر هەموو نەتەوەکان پیسترینی ناو نەتەوەی خۆیانیان هێنا و ئێمەش حەجاجمان هێنا ئەوا ئێمە لێیان دەبەینەوە.

عومەری کوڕی عبدالعزیز نامەی نوسی بۆ (عدي بن أرطاة): پێم گەیشتۆتەوە کە تۆ لەسەر ڕێبازی حەجاج دەڕۆیت، وەکو ئەو مەبە، چونکە ئەو نوێژی لەکاتی خۆیدا نەدەکرد، زەکاتی وەردەگرت بەدەر لە جێی حەقی خۆی.

لەگەڵ ئەوەشدا عومەری کوڕی عبدالعزیز لەماوەی فەرمانڕەوایەتی خۆیدا ستەمی لە خانەوادە و دەستوپێوەندی حەجاج نەکرد، دەگێڕنەوە لە (الريان بن مسلم)ەوە وتویەتی:

عومەری کوڕی عبدالعزیز خانەوادەی ئەبی عەقیلی – کە کەسوکاری حەجاج بوون – نارد بۆلای فەرمانڕەوای یەمەن، بۆی نوسی: ئەوا من کەسوکاری ئەبی عەقیلم بۆ ناردیت کە خراپترین ماڵی عەرەبن، کاریان پێ بسپێرە بەئەندازەی سوکایەتیان بە خوا و ئێمە.. وعليك السلام.

واتە عومەری کوڕی عبدالعزیز نەیکوشتن و ئەشکەنجەی نەدان وەك چۆن سولەیمانی کوڕی عبدالملك ئەو کارەی کرد، بەڵکو دوری خستنەوە.

ئەو پرسیارەی دێت بە مێشکدا ئەوەیە ئایا ڕێباز و شێوازی حەجاج لە حوکمڕانیدا کۆتایی پێهات؟

بێگومان نەخێر، چون حەجاج وەك باسمان کرد تازە نەبوو و لەنێو فەرمانڕەوا و وەزیر و پیاوەکانی دەوڵەت و زۆردارەکاندا، بەڵکو پێش حەجاج نمونەی زۆری وەك ئەو هەبوون، لەدوای ئەویش زۆرن، چون ململانێ لەسەر دەسەلآت و کورسی بەردەوام دەبێت تا ڕۆژی دوایی، تەنانەت هەندێك پێیان وایە کە هاوشێوەکانی حەجاج پێویستە بوونیان هەبێت تاکو کاروبارە سیاسی و ئاسایشیەکان جێگیربن، لە هەر وڵاتێك دا و بەتایبەت لە جیهانی سێیەم دا.

تەنانەت هەندێك کەس گرەویان کردووە بەرگری لە حەجاج و کردەوەکانی بکەن و بیانوی بۆ دێننەوە و چاکەکانی دەڕازێننەوە و گەورەی دەکەن، وەك دەڵێن ڕاجیایی هیچ لە پرسەکە ناگۆڕێت.

بێگومان حەجاج کردەوەی چاکەی هەبووە، بەلآم وەك پێشەوا زەهەبی فەرمویەتی ئەو چاکانە لە دەریای ستەم و تاوانەکانیدا نقوم بوون و ون بوون ، هەربۆیە حەجاج چوویە ئەستۆی مێژووەوە و دادگایشی لای خوایە، گەر بیەوێت سزای دەدات و گەریش بیەوێت لێی خۆش دەبێت.

ئێمە لەم پەرتوکەدا قسەناکەین لەبارەی ئەوەی حەجاج لە ئەهلی دۆزەخە یان بەهەشت، بەڵکو ژیننامە و مێژوەکەی دەخەینە ڕوو تاکو پەندی لێوەربگرین و بەرپەرچی ئەوانە بدەینەوە کە ڕێبازی حەجاج دەگرنە بەر لە حوکمڕانیاندا.

دیسان بۆ ئەوانەی کە باوەڕیان وایە ڕێبازی حەجاج لە حوکمڕانێتیدا ڕێبازێکی ئاسایی بووە، دەڵێن پێویستە توندوتیژی هەبێت تاکو کاروباری فەرمانڕەواکان و حوکمڕانیەتی وڵات جۆر بێت، ئەوا مێژوو شاهیدە کە لە هەندێك لە سەردەمەکاندا فەرمانڕەوایانی دادپەروەر بە هەمان دۆخ و ڕەوشی سیاسیدا تێپەڕیون کە تیایدا حەجاج دەرکەوت و

ئەوانیش وڵات و خەڵکیان بە داپەروەریەکەیان بەڕێوەبرد و ئیدی کاروبارەکان ئاسایی و جێگیر بوونەوە بژیان، لەوانەش عومەری کوڕی عبدالعزیز – بەڕەحمەت بێت – .

حەجاج و هاوشێوەکانی پێیان وابووە کە هەر کەس لە فەرمانی فەرمانڕەواکان دەربچێت کافر بووە و دەکوژرێت بۆ نزیک بوونەوە لەخوا و بەدەستهێنانی پاداشت، ئەمەش ئەو دوو جەمسەری و دژیەکیەی ناو کەسێتی حەجاج و بەدەر لەویش لە هاوشێوەکانی ڕاڤە دەکات، کە لە وەسیەتەکەیدا دڵسۆزیەکی توند دەردەخات بۆ وەلیدی کوڕی عبدالملك بەوەی کە فەرمانڕەوای شەرعیی وڵاتە.

ئەوەی کە حەجاج بڕوای پێی هەبوو نیسان ڕێباوەڕی هەڵگەڕاوەکانی ئەزاریقەش بوو کە حەجاج بەرەنگاریان بوویەوە، لە ڕێبازی خەواریجەکاندا بەگشتی کافرکردنی فەرمانڕەوای تێدا بوو، ڕێبازی حەجاجیش کافرکردنی نەیارانی فەرمانڕەوا بوو! !

ئەم بیروباوەڕەی حەجاج لەگەڵ بەنی ئومەییە و هاوشێوەکانیان دەگونجێت.

لە ڕێبازی حەجاج دا پڕوپاگەندەی بە کافرکردنی هەرکەسێك لە فەرمانڕەواکان هەڵبگەڕێتەوە هەبوو لەپاش خۆی بڵاو بوویەوە، تەنانەت لەناو گشت خەڵکدا بڵاوبوویەوە تاکو ئەمڕۆ کە فەرمانڕەوا و خەلیفەکان هەڵبژاردەکانی خودان و دەرچوون لێیان ناکرێ و نەشیاوە، هەرکەسیش لێیان هەڵگەڕێتەوە و لەفەرمانیان لابدات خوێنی حەڵاڵە و ناوی لێنراوە کافر و هەڵگەڕاوە و دەرچوو لەدین، هەربۆیە حەجاج و ئەوەشی لەدوای ئەو هاتن زیادەڕۆییان کردووە لە گەورەکردنی حاکم و فەرمانڕەواکان دا.

داوا لەخوای گەورە دەکەین ڕێبازی حەجاج بمرێنێت و وەك چۆن خۆی مراند ، هەر ئەو خوایە بەتوانا و دەسەڵاتە لەسەر ئەو کارە.

داوا لەخوا دەکەین ئەم کارەمان لێ وەربگرێت و گشت کارە باشەکانی تریشمان و لێمان خۆش بێت..... درود و سڵاو لە گەورە و سەروەرمان محمد و یار و یاوەر و شوێنکەوتوانی...

***

بەپشتیوانی خودا تەواو بوو

٢٠١٥/٦/٨ سەیدصادق

# بەرهەمەکانی وەرگێڕ

١- کەسایەتی کاریگەر... نوسینی هانی سلیمان

٢- چۆن دەبیتە سەرکردەیەکی سەرکەوتووی دلهێنەر.... دیل کارنگی

٣- هێزی بیرکردنەوە...ابراهیم فەقیە

٤- چۆن گەشە بەبیرت دەدەیت... هانی سلیمان

٥- چۆن ئامانج و ئارەزووەکانت بەدی دەهێنێت..ابراهیم فەقیە

٦- چۆن دەبیتە کەسایەتیەکی کۆمەلایەتی....ابراهیم فەقیە

٧- توانا هزریەکانت گەشە پێ بدە...ابراهیم فەقیە

٨- هونەری ڕوو خوێندنەوە و دەرخستنی نهێنیەکانی دەرون...د.أیمن أبو روس

٩- هێزی عەقڵی شاراوە : نوسینی : دکتۆر جۆزیف مێرفی

١٠-کتێبی ژن (تۆشۆ).

١١- ڕۆمانسیەت لە ژیانی هاوسەریدا.

١٢- ڕوخانی مارکسیەت و تەنگژەی سەرمایەداری.

